# دیوانی عارفی ربانی شیخ احمدی جزیری

مەشهور:

# مەلای جزیری

قدس سره العزیز



هەژار، شەرحی لی کردوە.

# دیوانی عارفی ربانی شێخ احمدی جزیری

مەشهوربە: # مەلای جزیری

قدس سره العزیز

«هەژار» شەرحی لێ کردوە

سروش

تهران - ۱۳۶۱

بسم الله الرحمن الرحيم

**هاوزمانه ئازیزەکەم!**

خۆت لەمن باشتر دەزانی، کە ئێمەی کورد، چەند گەلێکی هەژارو هەناسە ساردین. چەند لەکاروانی ژیارو شارستانی، بەجێماوین. ترسێنراوین، رەتێنراوین، بەشخوراوین. وا پترلە هەزارساڵە خراوینە ناو چاڵەوەو قەتیس ماوین. دەرەتانی رزگاربونمان بۆ نەماوە. داگیرکەران هەردەمەی بەناوێکەوە بەناوی دین، بەبیانوی هاونەژادیەوە، راویان کردوین، خواردویانین، بەیەکتر سپاردویانین، کوشتویانین، بە هەزاران دەریان بردوین. تەنانەت رێگە نەدراوین هەتا ژیاوین بەزمانی خۆمان هاوارکەین. ئەو مافە رەوایەی کە خوا، بۆ بەندەی خۆی رەوا دیوە، کورد خۆرانیێ کە بە خۆیان گوتوە موسوڵمان و خودا پەرست بە نارەوایان زانیوە. لەرۆژیش ئاشکراترە کە قەباڵەی بون‌و مانی هەمو گەلان لەم سەرزەمینە زمانە. ئەگەر زمان لەناو درا، بون‌و مانیش لەناو دەچێ.

ئێستا کە لەم برانەوەی چەرخی بیستا هەوای ئازادی‌و رزگاری هەڵیناوین‌و هەوڵ دەدەین ئێمەش وەك گەلانی دیکە، خواپێداو بین‌و ناوێکمان لەدنیا هەبێ. چاوەچاوین بەخەباتمان بگەینە بستوی ئاواتمان‌و خۆمان رەگەڵ کاروانی گەلانی ئازاد بخەین... هاوار بکەین: کاکە بەجێمان مەهێڵن، ئێمەش گەلێکین وەك ئێوەو شێوەمان لەخۆتان دەکاو بائێمەش وەك ئێوە بژین.

لێمرۆنە لێمان دەپرسن: کواپێناستان؟ تاباوەریتان پێ بکەین. نازانم دەبێ چی بڵێین؟ پێناس زمانە، فەرهەنگە، مێژوی کەوناراو تازەیە، وێژەو شیعرو ئەدەبیاتە، بە هەمو لك‌و پۆپیەوە. بەناشکوری خودا نەبێ ئێمەی کلۆڵ‌و چارەرەش، تائێستا بۆمان نەلواوە، زمانە بەستەزمانەکە بەتەواوی لەشوێنێکدا کۆ کەینەوە. بێتاریخین؛ هەرچی دەربارەی کوردەوە لە تاریخاندا نوسراوە هیچی بەزمانی کورد نەبوە. ئەمەواتا هەرکوردێکی لەعارەبی‌و فارسی‌و ترکی تێنەگەیوە ئاگای لەمێژوی خۆی نیەو ژینامەی رابردوەکانی، بەگوێچکە ئاشنا نەبوە.

هەمو چەرخێك، بەسەتان‌و هەزاران بوێژمان هەبوە. بەڵام بە فەرمودەی **حاجی‌قادر** «لەبەر بێ

دەفتەری ونبونو فانی». ئەگەر تاك وتەرایەکیان، لێرو لەوێ بەسەر زارانەوە ماونو بەیەکجاری نەفـەوتاون و دەماودەم بەئێمە گەیون؛ تێیان ناگەین، هەوڵیش نادەین تێبگـەینو بزانین ئـەو کەلەپورەی کە بوئێمە بەجێماون چەند بەنرخن.

هەزاران کوردی وا هەیە، لە ویژەو مێژوی گەلاندا هێند شـارەزان بونە دەریا. بەڵام لەمەر ئەدەبیاتو فەرهەنگی کورد، تلّپاتی تەڕیش شـكنابەن. رەنگـە بڵێن جـا ئێمە وەکو خـوت گوتت داگیرکەر رێگەی نەداوە خـزمەت بەخـومان بکـەینو پەرە بە زمانەکە بدەین!! چـارمان چیە؟ من عەرزیان دەکەم وا نیە. جـولەکە دو هەزارسـاڵان دەربەدەرو لانەوازبون. زمانو ئـەدەبیاتەکەیان پاراستوە. یا بەگفتی حاجی قادر: ئەرمەنی بەخەتی خـواری، ئـەوە هیچ کە زمانەکەی پاراسـتوە، بگرە پەرەشی پێداوە. دەی ئەوانیش وەکو ئێمە کەئێستا لێمان قەوماوە، لێقەوماو بون.

جا با ئیستا لە لومەو سەرکونەگەڕێین، ئەوی چو، چو. مردو بەگریانو شیوەن ناژیتەوە. ئیستا چی بکەین؟ چون خومان زیندو کەینەوە؟ دەسا با شنگلّ لەخودەین. ئەم چـەند بەڵگـە پەرپوتانەی کەپێناسـی زیندویەتی گەلی کوردە، کو کەینەوە. هەر خـوێندەوارێکـی دڵسـوز بەپێی توانا، لە سوچێکەوە بوی بچێ. ئـەدەبیاتی کەونارامان، ژینامەی رابردوەکانمان بزانینو بیانکەینە مایەی شانازی. زمانە شیرینەکەمان بەتەواوی بخەینە سەر قاقەزانو لەنەزانی رزگارمان بێ.

دەسـا وامن بەپێی توانای هەژارانەم، خـەریك دەبم: دیوانی مەلای جـزیری شـیکەمەوەو بەکوردیەکی خوماڵیانەی کە ئەمرو لەناومان باوە، شەرح بکەم... گوتم بەگوێرەی توانای خـوم. واتا ئـەوەندی دەیزانم دریغ ناکەم. چـونکە دەزانم جـزیری زور لەوە بەمایەترە، کە هەژارێکـی کوڵەوار لەخوێندندا لەو عیرفانە صوفیانەیەو لەو دڵداریە گەرمو پرشنگدارە کە لای مەلای جزیری بو سەر دەر بکـا. بویە لەبەر خـوێندەوارە کوردەکان دەپاڕێمەوە یاریم بدەن خـەڵەتم بو راسـت کەنەوەو لە هەرکوێدا رێم هەڵە کرد بمگەڕێننەوە راستەڕێ، خوا راستەو، راستی لێخوش دێت.

# کوردو خزمەت بە ئیسلام

ئەگەر توزێك بەوردی‌و پشو درێژی، کتێبە مێژوییەکانی چاردە چەرخی ئیسلامەتی بپشکنین‌و وەخوێنین. نوسەران‌و بەهونەران، وێژەوانان‌و هوزانان... ئەوانەی کە زور خزمەتیان بەدینی ئیسلام کردوەو لە ناو هەمو موسوڵمانان ناوو ناوبانگیان کردوە، لەبەر چاوانیان رابنێین، سەرنج بدەین کە هەریەك لەو موسوڵمانە زانایانە بەبنیچە لەکام گەل بون‌و لەکام نیشتمان گوراون. ئەوسا بومان دەردەکەوێ، کە بەشی کورد لەم ناوەدا هەتا چەندەو چەندی دەستە چیلەی زانست، خستوتە سەر ئەو گرو بڵێسە پاكو پیروزەی ئیسلامەتی. بروانیە هەر کتێبخانەیەك سەتان کتێب دەربارەی ئیسلامەتیەوە، لەنوسەرانی کوردەوە دێتە بەر چاو، بەعارەبی، بەفارسی‌و ترکی نوسراون‌و خاوەنەکانیان کوردبون‌و هەر نەشیان فەرموە کوردین.

**ئیمام محمدی غەزالی** فەرمویەتی: دینی ئیسلام لەسەر سێ ستون وێستاوە. ئەگەر خودا ئەو سێ کوڵەکەی نەدابا؛ لەوانەبو تێك بتەپێ. ئەم سێ دیرگە ئەستورانەش **«دینەوەری»**و **«ئامێدی»**و **«شارەزوری»** بون. کام موسوڵمانی خوێندەوار هەیە هەر کوێرە سیوادێکی بێ: ناوی پیاوی بەناوبانگی وەکو **ئیبنوخەلەکان**، **ئەبوالفیدا**، **ئیبنوحاجیب**، **ئیبنوصەلاح**، هەرسێ **ئیبن ئەثیرە** کانی بلێمەت‌و سەتان ئیین‌و ئەبوی دیکەی نەبیستبێ، کە کوردبون‌و بە عەرەبی نوسیویانە؟ کام دەشتەکی‌و شوانە وێڵەی نەخوێندەوار، لە هەمو دنیای ئیسلامدا دەس دەکەوێ کە ناوی **ئیبنوسیرین**ی نەبیستبێ. ئەو کابرایەی داهێنەری خەونامەیەو لە خەون لێکدانەوەدا هەتا ئێستا هاوتای نەبوە. کێ دەزانێ ئەو زیرەكو بلیمەتەی کە خەونامەی هەمو روژێ سەر بەهەمو ماڵی موسوڵمان‌دا دەکاو خەونیان بو لێك دەداتەوە، کوڕە کوردەو خەڵکی مەڵبەندی باڵەکە لە کوردستانی عیراقداو ئێستاش گوندێك لەجێگەی سیرین ئاوایەو ناوی بەرسیرینی هەیە.

خەلەکانی نیشتمانی مێژونوس **ئیبنوخەلەکان** لە نێوان هەولێرو کویە هەڵکەوتوە. **ئیبنوحاجب** کە واتا کوڕی پەردەدار. لەجزیری ئیبنو عومەر ژیاوەو کوڕی پەردەداری میربوە کە

جزیریش مەڵبەندێکە لە کوردستانی سوریە.

پێی ناوێ لەسەری بڕۆم. ئەگەر بە دورو درێژی، ناوی هەمو ئەو کوردانەی کە لەڕێی زانستو هونەر لەدرێژایی هەزارو ئەوەندە ساڵدا لەڕای ئیسلامدا کۆشاونو ناویان تێدا دەرکردوە، بیرخەمەوە؛ وشتر لەبنیا نرکەی دێ.

هەر دور نەڕۆین لەم چەند چەرخانەی دواییدا کەسانی وەك مەلا عەبدوالله بێتوشی، **ئیبنولحاج** و **ئەبوبەکری موصەننیف** و **مەلاجامی** و صەتان کوردیوا هەڵکەوتون، کە بونەتە مایەی شانازی عەرەبو پێشرەوی موسوڵمانان بون.

هەر لەم چەرخی بیستەمەدا، سەتان کەسی وەك **زەرقلی** خێوی کتێوی **الاعلام**، **ئەحمەد شەوقی** کە نازناوی امیرالشعرای عەرەب زوانانی پێ درا، **رصافی** شاعری عەرەب کە کۆتەڵی لە بەغدایە بۆ چەقاوە. مێژونوس: **محمد کورد عەلی**، **عەبباس مەحمود عەققاد** کە بە مامۆستای بێهاوتای وێژەی تازەی عەرەب زمانان ناسراوە. چیرۆك نوسانی بەناوبانگ لەمیسرو دنیای عەرەبدا: **مەحمود تەیمور**، **عایشە تەیمور** کە کورد بونو بونە جێی شانازی عەرەبو کورد هیچ بەهرەی لێ نەدیون!!

## با بزانین بۆچیو لەبەر چی؟

زوربەی ئەو پیاوە گەورانەی کە باسکرانو کران بە نمونەی مشتێك بۆ خەڵوارێك؛ یان هەر لەناو عەرەباندا لە دایك بونو لەناو عەرەب زمانانشدا پەروەردە بونو جیا لەزمانی عارەبی فێری زمانێك نەکراون. یا خۆ خۆیان لە زمانە زگماکەیان شاردوٚتەوەو بەو زمانەی کە پەرەو ڕەواجی هەبوە، نوسیویانە. نوسراوەکان کە زۆر بەنرخو هێژابون عەرەب زوان پێی خەنیبونو کتێب خانەکانی خۆیان پێ ڕەنگاندونو بە شانازی گوتویانە ئەو کەسانەی کە ئەوەندە خذمەتیان بەزمانەکەمان کردوە بە عارەبیان دەژمێرینو هەرکەسیش دەڵێ وا نەبو، تێر ئاوی سارد بخواتەوە!! (دکتور طه حوسین؛ ئەو زانا بەناوبانگە کوێرەکەی میسری. لە بیرەوری ئەبوعەلی سینادا لە وتارێکا گوتی: ئەبوعەلی سینا بە عەرەبی نوسیویەتیو ئێمە بە عەرەبی دەزانین. جا با ئێرانیەکان هەر هاوارکەنو بڵێن لەخۆمانە).

دە ئۆباڵ بەستۆم هەقیانە. زمان پێناسی گەلانە. هەرکەس لە هەر ڕەگەزێك بێ، بە هەر زمانێك باخێوێ یان بنوسێ، دەگەڵ خاوەن زمانەکە بوٚتە یەكو ئەشێ بەربەی ئەو بپێوێ. ڕاستت نەوێ کەسانیوا وەك تاڵان کرابن وایە. بەرهەمەکەی خەڵك دەیباو منەتیشی لێ نازانن و ناشی ناسنو بەهرەی بە بێگانە دەگاو خزمی خۆی هەڵاواردوە.

بۆنمونە حاجی قادری هەر زیندو کە دیتویە عەزرەتی کاك ئەحمەدی شێخ، کتێبی شەرعو وەعظەکەی کە ناوی ناوە: مەکتوبات، بە زمانی فارسی داناوە؛ ویستویە بەگژیا بچێ، نەی وێراوە. زورێ بە خشکەو دە پەردەدا لە سێ بەیتا گەیاندویەو فەرمویەتی:

وەك مریشكێك كە بەختی نەیهێنێ | بێتو جوچكەی مراوی هەڵبێنێ
هەر بگاتە كەناری جوگەلەیەك | نایەتەشوێنی، بمرێ، جوجەڵەیەك
ئەم لەوشكانی ئەو لەناو ئاوە | تێ دەگـا... درانی پێ مـاوە

جا ئەگەر حاجی قادری نەمر. ئـەوەندە بۆ كوردی نوسـین بە تاسـە بوەو بەلایەوە كفـر بوە كوردێك بزانێ بنوسـێو بەزمانی كوردی نەنوسـێو تەوس‌و توانجـی تێ گرتون. ئێمە هەر دەربارەی كەسـێك كە وەكو كاك ئـەحمەدی شـێخ لەناو جـەرگەی كوردا ژیاوەو بە تەما بوە ئاموژگاری كوردان بكاو دە قورعان‌و حەدیثانیان بگەیەنێ. كەچی بچێ بەزمانێك بۆیان بنوسێ كە تێ نەگەن. حەق دەدەین بە حاجی قـادر. نەك دەربارەی هەمو كەس لەو نوسـەرانەی كە بەزمانی بێگانە كتێبیان هەیەو بە خۆیان نەگوتوە كوردین. وەك كورد دەڵێ: پیاو نابێ جوانان بشكێنێ. یان وەك دەڵێن با قسێكیش بۆ دز بكەین. ئـەگەر توزێك بە وردی‌و لە سـەرە خـۆیی رابردوی ئـەو پێشینانەمان، تەرزی ژیانیان، باری رامیاری‌و كۆمەڵگای كە ئـەوانی تیا ژیاون، بێنینە بەر چـاوی خـۆمان بۆمان روشـن دەبێتەوە كە زۆریش خـەتابار نەبون. هەركامێك لە ئێمەی ئـەمرۆش وەك ئەوان باین؛ ناچار بوین وەك ئەوان بكەین.

زۆر لەو نوسـەرە گەورانە وا رویداوە دایك‌و باوكیان لەبەر نەداری‌و هەژاری یان لەترسـی داركاری‌و بێگاری زۆردار، سیپاڵە شرەی ناوماڵیان بە كوڵیانەوە گرتوەو بەرەو وڵاتی غەریبی بگرە هاتم. لە وڵاتانی كەس نەناس گیرساونەوە. لە رێی بژێوی منالیان رەنجیان داوەو زۆر بە هەژارانە ژیاون. دیارە منالی ئـەوانە فێری زوانی منالانی دەوروبەری خـۆیان دەبن. یان منال لە وڵاتی نامۆ پای ناوەتە سـەر دنیاوە. دایك‌و باوك خـواخوایانە كورەكەیان فێری زوانی ئـەوانە بێ. كە ئـەو كاریان لە لا دەكاو هەولبدا بەچكە ئاغا تێ بگەن‌و تێیان بگا.

بۆ نمونە چیروكی دولەو كوردانە دەگێرمەوە.

پەیام نێرێكی گوڤـاری روزالیوسـف وتووێژی دەگەڵ **عەبباس مەحمود عەققاد** دا كردبو. یەك لە پرسەكان ئـەمە بو: تۆ لەكام مەڵبەندی میسـرا لە دایك بوی؟ عەققـاد گوتی: كچـم من میصری‌نیم، كوردم. باوكم خەڵكی دیاربەكر بو، چەرچی ئاوریشم فرۆش بو. كەڵافـە ئـاوریشمی دیناو لە میصر دەیفرۆشتەوەو بەوە دەژیاین. دواجار لە چەرچی گەریەتی وازی هێناو دەگەڵ دایكم ئێمەشی هێنا قاهرەو بە یەكجاری نیشتەجێ بوین. خوێندم‌و پێ گەیشتم‌و بومە نوسەر بە عارەبی. كەڵافەش چونكە لای عارەب عوقدەی ناوە نازناوی خۆم كردە عەققاد.

جارێكی‌تر، رۆژنامە نوسێكی دیكە، ئەو پرسیارەی لە **شیخ عبدالباسط عبدالصمدی** قـورعان خوێنی ناوداری میصری كردبو. كە تۆ لە كام عەشیرەتی. گوتبوی باوكی من كوردێك بو لە ژیانی ئاوارەیی دا هاتبوە شاری قاهیرەو ببوە مجێوری مزگەوت‌و من لە میصر لەدایك بوم.

جا ئێستا چخوابەرداره گلەیی لە عەققاد بكەین، بۆچی بەكوردی نەنوسـی؟ یان بە عبدالباسـط بێژین: كوا مناجاتی بەكوردیت؟

پێویسته له بیرمان نەچێ؛ مرۆ وەك فرشته نیه، كه بژیوی نەبێ‌و بژی. هەمو كەسێك وردو درشتو خاوو گشت، چكەوتبێته ناو چاڵا،یان حەوتەبەقە باڵا بێ؛ نان‌و ژیانێكی هەر دەوێ. بەرگ‌و پێڵاوی گەرەكە. ئاتاجی ئەنواو بانێكە له بورانی بپارێزێ‌و شەوانه تێ‌ی‌دا بسرەوێ. هەموكەس بۆ كەرستەی ژین پێویسته ئەرك بكێشێ‌و چەند بوی دەلوێ بۆ خوشی ژیان بكۆشێت. هونەرمەند هونەری دەرخاو پلەو پایەی خۆی وەسەرخا.

دەسا با لێكی دەینەوە: ئەو كوردە خاوەن جەوهەرەی دەبەر حوكمی عەرەب‌و تورك‌و فارسدا. نوسینی بە زمانەكەی خۆی نەك هیچ‌كەس پەرەی پێ نەدا، بگرە بەتاوان حەساو بێ؟

ئەگەر سواری سەری خۆی بێ‌و لەسەر كوردی نوسین سوربێ؛ كێ ئافەرینی لێ دەكا؟ كێ كتێبەكەی لێ دەكڕێ؟ بەچی بژی؟ بەچی جێگەی له كۆمەڵگادا خۆش بكات؟ دەپێناوی كوردی نوسین‌دا بیگرن. كێ‌یە لەسەری وەجواب بێت؟ كوردی خزمی؟! ئەوان بۆخۆیان لەچاڵدان پێویستیان بەخەڵكی هەیە دەستیان بگرێ.

رەنگە ئێستا لەبەرخۆتەوە بپرسی: گەلۆ ئێمەش وەك عەرەب‌و تورك‌و فارس موسوڵمانین، خاون بڕوا بە قورعانین. بۆچی ئێمە زمانمان لێ قەدەغەیەو ئەو برا موسوڵمانانە بەزمانی خۆیان دەنوسن قەیدی نیە؟!.

وەرامەكەشت ئەمەیە:

---

دەستوری ئیسلامی بەراست كەقورعانە دەڵێ: موسوڵمانان بران. پێغەمبەری خودا فەرموی: هەرگیز عەرەب له ناعەرەب زلتر نیه. كێ له گوناه به پارێزترە له لای خودا بەرێزترە.

سەلمانی فارسی ناوێك، كەس نەناس‌و روت‌و پێخواس كۆیلەی زەلامێ جولەكە، لای پێغەمبەر له خزمە نیزیكەكانی بەرێزتربو. فەرموی سەلمان كەسی‌منه.

له دوای كۆچی پێغەمبەریش هەتا نیزیكەی چل‌ساڵێك كەس گوێی نەدەدا به نەژاد، به خوێن، به نەجیمی‌و نانەجیمی. هەر له خوا ترسان مەرجبو بۆ گەورەیی‌و قەدرو حورمەت. بەڵام به هەزار داخەوە هەر لەو ساوە حوكم كەوتە دەست بەرەی ئەمەویەكان‌و پادشایەتی به كەلەپور له ناو ئیسلامدا دامەزرا. برایەتی گەلانی ئیسلام توایەوەو بەناخی هەردا رۆییە خوار. كار بوبە زۆردارو بێ‌زۆر. هەركەس، هەرتیرە، هەربەرەی دەستەڵاتی وەدەس كەوت خۆی‌و خزم‌و هاونەژادی بڵند كردو وەكو ئاژەڵ له هاودینە نامۆیەكانی دەڕوانی. خەلیفەكانی ئەمەوی ئەگەر تەرمێكیان بدیبا، دەیان پرسی: كێ‌یە؟ ئەگەر دەیانگوت قورەیشە، هاواریان‌دەكرد خزمەرۆ. ئەگەر بیان گوتا عەرەبە، دەیانگوت له هۆز كەمی كرد. بیانگوتایە عەرەب نیەو موسوڵمانە، دەیانگوت ها، ماڵی خوایە دەیداو دەشی سێنێتەوە.

دراو خۆش‌بێ‌و مەلا خۆش‌بن؛ درۆ كردن بەزمانی پێغەمبەرەوەو به بوختان حەدیث هەڵبەستن، له توڵەكە هەزرانتربو. گوتیان پێغەمبەر فەرمویە: خوا له ناو جانەوەراندا، ریزی لەبابە ئادەم‌نا. له زاروزیچی ئادەم‌دا، هۆزی عەرەبی هەڵبژارد. له ناو هەمو هۆزی عەرەب، قورەیشی زۆر پەسند

کردو کردیە گەورەی بەرەی مرۆ.
گوتیان عەرەب دەگەڵ ناعەرەبدا هاو کوف نیە. واتا ئەگەر ژنێکی دەشتەکی عەرەب، مێرد بە یەکی وەکو ئەبوعەلی سینا بکا دروست نیە. چونکە پایەی ژنی عەرەب زۆر لەوپلە بەرز ترە. گوتیان پێمێرد لەناو گۆردا، بە عارەبی مردوی ناعەرەب دەدوێنن، جا با مردو کۆنە ترکێکی بیلمەز بێ. گوتیان لە رۆژی قیامەتا هەمو کەسێك دەبێ عارەبی بزانێ دەنا بەشەق دەری دەکەن. گوتیان، گوتیان... و...
کاری خۆ بەزل زانینو نەژاد پەرستی عارەبی خاوەن دەستەڵات، هەر بەوەندەوە نەوەستا کە بڵێ: دەبێ بە عارەبی فێربنو بەس. گوتیان: هەرکەس بڕوای وابێ دەتوانێ بەزانستو خوا پەرستی بگاتە رێزی عارەبان. کافر دەبێو نێویان لێ دەنێین (شعوبی). و لەسەر ئەو تۆمەتە گەورە بش‌کوژرێن، بە فیرۆ دەرۆن.
جا وەختێ حاڵ ئەو حاڵەبیو دنیاو دینێ هەمو کەسێك، بە عەرەبی نوسین بەندبێو بە عەرەبی گوتن بژیو لە قەبرو قیا مەتیشمان‌دا، عەرەبی نەزانین لاڵ‌بین؟ چۆن دەکرێ گلەیی بکەین کە فلانکەس بۆچی نەیگوتوە عەرەب نیم. یان فیسارکەس بۆ بە زمانی خۆی نەنوسی؟! جا نەك هەر کورد بگرە هیندیو فارسو ترکو ئەفغانیو گەلانی تریش، کە ژێر چەپۆکەی عەرەب بون؛ خوێانو زمانەکەیان لەبیر خۆیان بردۆتەوەو بەختەوەریان ئەو کەسە بوە کە بتوانێ خۆی وا بە عەرەب نیشاندا کە بە عارەبی بزانن ـ هیچ نابێ پێمان سەیر بێ کە پیاوێکی زاناو دانای وەك صاحیبی‌بنی عەبباد کە لە چەرخی چوارەمی کۆچی‌دا ژیاوە؛ بڵێ نارۆانمە ئاوێنە چونکە بیچمی ئێرانیەکم نیشان‌دەدا، بێزم لەخۆم دەبێتەوە. یان شێخ محمدی زاهید، کە نازناوی تاج‌العارفینی هەبوەو باپیری ئەو شێخ حیسام‌الدین چەلەبیەبوە کە مەولانا جەلال‌الدین لە مەثنەوی پێی هەڵدەڵێ، لە هۆزی گاوانی کوردو لە سەرەتای چەرخی شەشەمیندا ژیاوە. فەرمویەتی: «شەو کورد بومو هەر کردیە رۆژ بوم بە عەرەب».
هەوڵدان بۆ بونە عەرەب، یان فێربونی زمانی پاراوی عەرەب کە قورعانی سەرینچاوەی دینەکەمان بەو هاتوە. ئەوەندە کاریگەر بوە، کە یەکجاری خۆمان لەبیر بەرێتەوەو کەس ئاور وە سەر زمانو رەچەڵەکو نەریتی نەتەوایەتی نەداتەوە.
ئەگەر لە پاش نەمانی عەبباسیەکانو نەژادپەرستانی عارەب؛ گەلانی فارس یان تورك یاخۆ موسوڵمانانی تر، دەپاڵ عەرەبی فێربوندا، زمانی زگ ماکی خۆشیان ژیاندۆتەوە هەر خزمەتیان بەزمانی قورعان کردوە. بەو زمانەی کە عەرەبی نەزانەکان زانیویانە قورعانیان بۆ تەفسیر کردون. حەدیسیان پێ وەرگێڕاوە، هەڵبەستو پەخشانەکانیان، با بە عارەبیش نەبوبێ هەر باسی خودا ناسینو قورعان بە پیرۆز زانین‌بوە. کە دیتوشیانە ئیمانیان بە دەکارکرنی زمانیان لەدەست نادەن. هێدی هێدی مێژوی نەتەوایەتی خۆیان، ئەدەبیاتی میراتی رابردوەکانیان. هێناوەتە سەر کاغەزو شناسنامەی سەربەخۆیی نەتەوەی خۆیان سازداوەو پێی بونە پیاو.

بەڵام بەناشکوری ناڵێم! ئێمەی کوردی موسوڵمانی بەستەزمانی هەمیشە ماف پێشێل کراو، قەت عاسمانی ساومان نەدی. شەشەکان یان رەمەزان بو. بەشمان هەر ژەمی بێنان بو، ئاغاکانمان ئەگەر عەرەب یان تورك یاخۆ فارس بون، هەرچەند بە دەم گوتویانە: ئێمە برای دینیتانو موسوڵمانینو هەمو پەیرەوی قورعانین. لەراستیدا خواردویانین. تەنانەت زمانەکەشمان لەلای ئەوان بویتە مایەی گوناهباری. کورد هەرگیز لە هیچ کاتێکدا لە ژێر حوکمی ئەو موسوڵمانە جوانانە! نەی وێراوە تەفسیری قورعانی خوداش بەزمانی کوردی بنوسێ. چجای باسی ژانو کوانی دەردی ژێردەستەییو پەستیو دادو هاوار لەدەس برایانی هاودین بە زمانە خواپێداوەکەی لە بارەگای خودا رانێ. کورد ئەگەر پێی خوێندرابێ، هەرگیز بە زمانی خۆی نەبوە. زمانی خەڵکی خوێندوە. ئەگەر جەوهەرو هونەری لەپاڵ خۆیدا شكبردوە؛ ناچاربوە بەزمانی لەخۆی بێگانە نیشانیدا. ئەوکابرایەی لەبەرحوکمی فارس یان تورك یان گەلێکی دیکە دایەو جگەلە زمانی ئاغاکەی، زمانیتر رەواجو برەوی نیە. ئەگەر بەتەمابێ بژیو مایەی بژیوی پەیداکا. گەرەك بەزمانی رەواجدار رمێنێك بۆخۆی پەیداکا. وا دەبینین کە هەزاران لە نوسەرو هونەرمەندانی بەچکە کورد، لە فارسیو ترکیو عەرەبیو تەنانەت روسی نوسیندا، خاوەن ناونو لە زمانە زگماکەکەشیان بەش براون.

بەڵێ ئەو داگیرکەرانە موسوڵمانە بەدەمانە ویستویانە گەلی کوردمان، کە خاوەنی کوردستانە بتوێننەوەو توانەوەشی بەنەمانی زمانیەتی. تا بتوانن کوردستانی داگیرکراو بەیەکجارەکی قوتدەنوماڵخوراو بەکوێ زوخاڵ بێ.

بەڵام خواستی خودای گەورە، دەگەڵ ویستی ئەو گەلە کوردخۆرانەدا، یەکتریان نەگرتوتەوە. لە هەر دەورو زەمانێکدا، لەکوردستان چەند کوردێکی وا هەڵکەوتون؛ کە بە زمانە خودا پێداوەکەی خۆیان، بە شیعری ناسكو پاراو، لە بەر خودا پاڕاونەوەو ئاسەواری بایەخداری وەهایان لێ بەجێماوە کە بە لافاوی زۆرداران نەروخاوەو هێندە خۆشو دڵبزوێن بون، گەلی کورد لەناو دڵیاندا هەڵیان گرتوەو سینە بەسینەو دەستاو دەست، باب بە روڵەو پیاو بە نەوەی خۆی ئەسپاردون. بەڵگەی مانو نەتوانەوەی زمانەکە لەناو شیعرو ئاسەواری ئەو چەند کوردە بلیمەتە، گەیشتوتە دەستی ئێمەو ئێستا زۆر بە شانازی دەڵێین: ئێمەش خاوەنی زمانو ئەدەبیاتی گەشەدارینو دەتوانین بە خۆمان بێژین: ئێمەش چتین...

یەك لەو پیاوە کەڵەپیاوە بەناوانەی کە بونە هۆی نەکوژانەوەی بڵێسەی گڕی بەتینی زمانمان، **شیخ ئەحمەدی جزیری** بو. ئەگەر لە نیوە بەیتێکیا فەرمویەتی: «شەوچرای کوردستانم» زۆر دوروستەو هیچ گومانی تێدا نیە.

ئەو شەوچرا تیشکدەرەی کە خودا لە رۆژگارێکدا، بۆ گەلی کوردی ناردوە؛ لەسێ لاوە تیشکیداوەو تاریکی لەسەر رەواندوین. یەکەمینیان، خودا ناسینی بەراستی، کە ناومان لێناوە عیرفان. دوهەمینیان، شیعری تەڕی دڵدارانە واتا غەزەل. بەشی سێهەم، هەرچەندە خۆی ئەو

نیازەشی نەبوبێ. دەکار هێنانی زمانی خودا پێداوی خـوێەتی کە کوردییەو زمانەکەی بەشـیعری ناسكو دڵگـر بۆ هەڵگـرتین. چـۆنە لەناو هەزاران‌و هەزاران کوردی خـوێندەوار، کە هامدەوری جزیری بون؛ ئـەو پیاوە بڕیاری داوە هەڵبەسـتی بە کوردی بڵێ‌و بەڵگـەی هەرگیز نەمردنی لەناو دڵی هەمو کوردی خوا پەرستا کەبیناسن تۆمار بکا؟

وەرامەکەی زۆر هاسانە. مەلا لە قورعان‌و حـەدیث شـارەزای بێ‌هاوتا بوە. زانیویەتی خـودای گەورە هەر وەك دە عارەبی دەگا، لەو زمانە کوردیەش دەگا کە خـوی بە بەندەی بەخشـیوە. رازو نیاز دەگەڵ خوادا، بە هەر شێوەو زمانێك بێ فەرقی نیە.

مەلا لە پلەی عیرفاندا گەیشتۆتە چڵە پۆپە، دەگەڵ خودا تێکەڵ بوەو بە فەرمودەی ئـەولیایان، گەیوەتە وەحدەتول‌وجـود. عارف کە گەییە ئـەو پایە، ئیتر دنیاو قیامەت‌و خـۆشی‌و ناخـۆشی‌و هەژاری‌و سامان داری، لای ئەو نرخـی پوشـە کایەکی نامێنێ. لە هەر چیەکی رادەمێنێ خـودای تێدا بەدی دەکا. وەکو حافظ پێمان دەڵێ:

لەمەیخانەی‌مەجوسان‌رۆشنی‌خواهاتەبەرچاوم　　دەبڕۆانەچتۆتیشکی‌لەکوێداخوی‌نیشانداوم

مەلا لە شێعریکیا دەڵێ:

میننەت ژخودایێ کو بەعەبدی خۆ مەلایێ　ئیکسیری غەمی عیشق نە دینارو درەم دا

کەسێ کە سوپاسی خوا دەکا لە جێگـەی دینارو درەم، ئیکسـیری ئـەوینی هەیە، کێ دەتوانێ حوکمی لیبکا واهەستە یان وا دانیشە.

دەبا بزانین ئەو ئەوینە پاكو بەنرخ‌و هێژایەی یەکسەرە یا دوسەرە بو؟ واتا ئەوینی خودابو، یان دڵداری کیژێکی خەڵکی دنیابو. یان هەردولا؟... ئـەو کەسـانەی لەعیرفـان زۆر شـارەزابون‌و لە هەرچی سەرزەمینی‌بێ تەکیونەوەو سـەرتاپا هەر بۆ خـودابون. لایان وایە ئـەو رێبوارەی کە ئـەم رێگە دژوارە دەگرێتە بەری، دەبێ خۆی بۆ ئامادە بکات. دەبێ دڵی بە ئەوینی مەجـازیەوە خـەریك بکا تا وا نەرم‌و ناسك بیێ، کە بتوانێ سوزی ئەوینی خوداییش وەخۆ بگرێ.

مەولانای رۆمی فەرمویە: صوفی کە عیشقی مەجازی نەچێشتبێ گایەکی مێزەر بەسەرە.

جامی دەڵێ: لاوێك داوای لە پیاوێکی خودایی کرد، لە عیرفـاندا مامۆسـتای بێ. لێی پرسـی: هەرگیز گیرۆدەی داوی ئەوینی جوانان بوی؟ گوتی: نەخێر. گوتی: برۆ ببە عاشق. ئەوسا وەرە تا بە شاگردت وەرگرم.

مەلای ئێمەش، کە بێگومان لە عیرفاندا، مەلا جامی‌و مەولانای رۆمی بەلخیشی پێ راناگەن. لەو فێرگە سەرەتاییەوە، ملی لەو سەفەرە ناوە. دڵی داوە بە کیژە کوردێکی نازدار کە خوای گەورە هەرچی جوانیو هەرچی نیشانەی صەنعەتی بێ چون‌و وێنەی خوێەتی بەوی داوە. کورەی ئـەوینی مەجازی، دڵی مەلای قاڵ کردوەو خشت‌و خـاڵی سـوتاندوەو دوبارە دای رشـتۆتەوە. تا بە پاکی‌و بەوپەری ئامادەییەوە بچێ بەپیر ئـەوینی خـودای تاکەوەو لەو کرەوە کرگاری بێتە بەرچـاوان‌و لە جۆگەوە پێ هەڵگەرێ تا دەگاتەوە بناوان‌و لە سۆنگەی دڵۆپە ئاوێك، دەریا بە چاوان ببینێ. ئەوسا

بۆ هەتاهەتایە تێکەڵ بە دەریا بێتەوەو بەرەو بەژ نەگەڕێتەوە.

ئێستا بۆمان دەردەکەوێ، کە بۆ مەلا هەستی گەرمی دەرونی خـۆی بە کوردی بۆ هۆندوینەوە. هیچگا چاوی لەوە نەبوە، رێزو قـەدری لە سـایەی نوسـینەکانی لە لای خـەڵك بۆ پەیدا بێ. ماڵی دنیاو ئافەریمو بارەقەڵڵای خەڵکی لەلای ئەو هیچ نرخی نەبوە. لە رێزی ئەو کەسانە بوە کە دەڵێن مانای ئایەتی «هەردوك سوڵەکەت فڕێدە» کە خـوا بە موسـای فـەرموە. واتا دنیاو قیامەتیشـت لەبیر بچێ. نە بۆ بەهەشت چون خواناس بە، نە لە ترسی جەهەندەمێ. نە بۆ قەدرو رێز لە ژیاندا. ئەو ئەوینداری خودایەو؛ خواش لە کوردیەکەی تێدەگا. بە رواڵەتیش ئەوینداری کیژە کوردێکـی جوانچاکە. کە صنعەتی یاری گەورەی، لە روخساری ئـەودا دیوەو پێیهەڵدەڵێ... بە کیژە کوردا هەڵدانیش خـۆناشێ بە کوردی نەبێ. دەبێ هیچ نەبێ بە خـەیاڵ لەلای وابێ ئـەگەر یارە دنیاییەکەی، ناڵەی دڵی ئـەو ببیسـێ، کەمێك لەزۆرێك تێبگـا. بۆیەش دەڵێم: یاری دنیای بە رواڵەتی. چونکە سەرلەبەر دیوانی شیعری مەلا بپشکنی هەمو شیعرو هەڵبەسـتێکی، هەم غەزەلە هەم عیرفانە. وەهای ئەم دوە لێکداوە کە نازانی مەبەستی سەرەکی کامە. واتا ئەوینی مەجازی وا بۆتە عیشقی حەقیقـی، کە هەرگیز لێك هاوێر نەبون. لە مەنزڵگـای وەحـــدەتول وجـــودیشیدا، خودای لە تیشکی روخساری ئەو کیژە کوردەدا دیوە. دەیسا با مەلا بناسین...

# مەلای جەزیری :

## عارف و شاعری پایە بەرزی کورد .

چەندین چەرخە ناوی ئەو خواناسە گەورەو شیعرەکانی، لە چوار قورنەی کوردستاندا، بە سەردەمو زارانەوە. شەوانی هەینی لەمزگەت، لە کۆبونەوەی دەرویشان، لە تەکیەکان، لە بەزمی مەولودنامەدا، شیعری مەلا گوڵی سەرسەلەی جڤاتە.

هەمو کوردێکی خوێندەواری خودا پەرست؛ ناوی ئەو پیاوە خواناسەی، لە دڵدا جێ کردوتەوە. بەڵام تا ئەم ئاخرو ئوخریانەش، کەس ئاوری وەسەر ژینامەی ئەو شێخە نەداوەتەوە. لە سەرەتای ئەم چەرخەوە، جاروبارە لێرو لەوێ، چەند کەسێك بوی تێکوشاون، کە بیناسن وبزانن کەنگێ ژیاوەو چون ژیاوە. جا چونکە زور درەنگ بوی چون، ژینامەی ئەو پیاوە گەورە، هێند ئالوزو پرگریو گرفنچك بوە؛ کە زوری زانایی دەوێ تا باش بومان ئاشکرابێ. مەلا کەی ژیاوەو چون ژیاوەو کەی هاتوتە سەر دنیاوەو کەی کوچی دوایی کردوە؟...

بەگشتی ئەو نوسەرانەی کە دەربارەی مەلا دواون. لە سەر ئەمەندە پێك هاتون: کە ناوی «شیخ ئەحمەد» بوەو خەڵکی جزیرو بوتانە، کە شارێکە لە کوردستانی تورکیاو کەوتوتە بن چیای جودی. ئەو جودیەی کە گەمیەی نوح پێغەمبەری لێ گیرساوەو ناوەکەی لە قورعاندایە.

لە سەر ئەمەندەش پێك هاتون، کە نازناوی لەشیعردا، جارجار مەلا، جارجار مەلێ، هێندێك جاریش «نیشانی» بوە. مەلاو مەلێکەی ئاشکران؛ کە بە مانای زانا لەعیلمی عەرەبین. بو نیشانی‌یەکەشی دەڵێن: نیشان یان ئامانجی تیرە، کە مەلا نیازی وابوە: بەتیری ئەوین پێکراوە یان مەبەستی خاڵی سەر گونای یار بوە، کە کرمانجان بە خاڵ دەڵێن نیشان. واتا خوی بەو خاڵەوە ناو ناوە کە لە رومەتی سەلماوە دیاری داوە.

ئیتر لەسەر دیاری دانی دەورانی ژیانی مەلاو هاتنە دنیاو کوچ کردنی، زوریان قسە تێك‌گیراوەو لەسەر زورشت پێك نەهاتون.

ئەوا ئێمە هەرچی مێژو نوسەکانی خوییو نامو لەو بارەوە نوسیویانە، بو ئێوەی دەگێرینەوە.

بیرو بڕوای هەژارانەی خۆشمانتان لەبەردادەنێین. بەهومێدم کە ئێوەی خـوێندەواری ژیر، بتوانن ژینامەی مەلا لەو ناوەدا رون کەنەوە. مامۆستا عەلائەالدینی سەجادی، خوا دەس بە عومریەوە بگرێ. لە مێژوی ئەدەبی کوردا، زوربەی بڕوای جۆربەجـۆری مێژو نوسـانی پێشـە خـۆی تۆمار دەکا. کە بۆتانی رادەگوێزم:

لەژێرناوی جـزیری‌دا مامۆسـتا عەلائــەالدین، ژمارەی ۱٤۰۷-۱٤۸۱- ی داناوە کە وادیارە لای‌وابوە، لە چەرخی پازدەی میلادی، مەلا ژیاوە، واتا بەو حەسابە دەبێ، تەمەنی حـەفتاو چـوار سال رابردبێ جا مردبێ. ئـەم جـار هاتوە زۆر رەنگین‌و سـەنگینانە، پێشـەکیەکی دەربارەی مەلا نوسیوە، کە لە راستی‌دا زۆر جوانەو لەپاش ئەو پێشەکیە دەڵێ: بولبولی سـەرچڵی ئـەم داسـتانە، ناوی شیخ ئەحمەد، کوڕی شیخ محمدە. لە جزیرا بۆتان «گزرتادوقـردو» هاتۆتە دنیاوە. هەر لەو شارەش مردوە.

بەڵام هەرچەندە وەك گوتمان ساڵی بون‌و نەمانەکەی بەژمارە لەبن ناوەکەی نوسـیوە. کەچـی هەر لەم باسەی خۆیدا، خـودی اسـتاد عەلائـەالدین پێمان دەڵێ: لاپەڕەی مێژوی ژیانی شـیخ ئـەحمەدی جـــزیری، زۆرتاریکــە. تۆژینەوەو وردبونەوەی، زۆر وزانایانەی دەوێ. دەســا وامن بۆگەیشتن بە ئامانجێك، هەرچی دەربارەی ژیانی شیخ ئەحمەدەوە نوسراوە. لە کتێبە مێژوە کەی خۆمدا کۆم کردەوە. لام وایە رەنگبێ ئەوساکە مێژوی ئەوپیاوە هێژایە تۆزێك باشتر رون بێتەوە.

دوکتور بلەچ‌شیرکۆ- بلەچ شێرکۆ ناوی نهێنی خوا لێ خـۆشبو، جـە لادەت عالی بەدر خـانە- لەکتێبی، «القضیەالکردیە»دا دەڵێ: مەلای جزیری، ناوی شیخ ئەحمەدو خەڵکی بۆتانە. لە ساڵی ۱۱٦۰ میلادی‌دا لە شـاری جـزیرو بۆتان مردوە، شـیعری زۆری لەغەزەل‌و الهیات‌و عرفـان‌دا هەیە.

مامۆسـتا ئـەمین زەکی بەگ، بە رەحمەتبێ. لە هەردو کتێبەکەی‌دا واتا «مێژوی کوردو کوردستان»و مێژوی خاوەن ناوانی کورد «مشاهیر الاکراد»دا دەڵێ: مەلای جـزیری ناوی شـیخ ئەحمەدە. لە دوانیمەی سەدەی شـەشـەمی کۆچـی‌دا، لەرۆژگاری دەسـتەڵاتی عیمادالدین، کە فەرمانرەوای موصل بوە ژیاوە. دیوانی شیعرەکانی خـۆی بۆ فـەرمانرەوای (تەوریز)ی کە ناوی، خانی خانان بوە، بە دیاری‌و پیشکەش ناردوە. کەچـی هەر ئـەو مێژو نوسـەش لە شـوێنێکی‌تر فـەرمویە: مەلا کەوتۆتە دوای جـامی. واتا لە پاش مەرگی مەولانا عبدالرحمانی جـامی، مەلا ژیاوە. کە ئەم دو ریوایەتانە هەرگیز یەکتر ناگرنەوە. چونکە جـامی لە چـەرخـی نۆهەمی کۆچـی ژیاوە.

مامۆسـتا محمدعەلی‌عەونی رەحمەتی. کە ناودارانی کوردی ئـەمین زەکی بەگی بە عارەبی وەرگێڕاوە. دەربارەی ژیانی مەلاوە چەند پەڕاوێزێکی هەیە. لە یەکێکداوای نوسیوە:

ئەو شیعرانەی، کە لە دیوانی جزیری، ناوی سەعدی‌و حافظو جامی تێدایە. هیچیان شـیعری جزیری نین. ئاوەکین‌و لاوەکی، هەروا سەربەخۆ رەگەڵ دیوانیان خستوە.

مامۆستای رۆژ هەڵات ناسی روس: **ئۆگست ژابا** لە کتێبە ناودارەکەیدا، کە بەناوی حکایاتی کوردە، دەربارەی جــزیری ئێژێ: مەلا خــەڵکی جــزیری ئیبنو عومەرە، لە دەورانی عیمادالدینی زەنگیدا، واتا لەنێوان ساڵانی ٥٤٠-٥٥٦ دا ژیاوە. مامۆستا عەلاءالدین لە یەکەم چاپی مێژوی ئەدەبی کوردیدا، لەروپەر ١٦١، بایداوەتەوە سەرباسی مامۆستا عەونیو فەرمویە: بەرلەوە باسی ژینامەی مەلای جزیری تەواوکەم. چــەند بەیتێکــی گرانی مەلای جــزیریم، کە خــۆم مانام نەدەزانین، نارده میســریێ بۆلای مامۆســتا **محمد عەلی عەونی**؛ کە بۆمیان لێك بداتەوەو بە پەلە بیان نێرێتەوە. ماڵم هەقــە زۆر پیاوەتی دەگەڵ کردم. رۆژی ٩٥١/٥/٤ وەرامەکەم بۆهاتەوە. جیا لە مانای شیعرەکان، دەربارەی ژیانی مەلاش شتێکی نوێی بۆ نوسیبومو فەرموبوی: دەمێك ســاڵە هەر خەریکم کە دەربارەی ئەو شیعرانەی لە دیوانی جــزیریداو، ناوی ســەعدیو حــافظو جــامی دەهێنێ دەتوژمەوە.

داخۆ راست هەر هی مەلابون؟ یاخۆ بەناوی ئەوەوە خراونە ناو دیوانەوە. تا خــواوراستان، لەم ئاخر ئۆخریانەدا، چاوم بە دەســخەتێك کەوت کە لەســاڵی ١٣٢٢ کۆچــیدا نوســیویانەو لەکوردستانی جەنوبی، ماوەتەوە. لەپێشــەکی ئــەو دەسـخەتە ژینامەی مەلا نوسـراوە. تیا دەڵێ: «شاعیری بەرێز جزیری، هاو زەمانی سوڵتان محمد فاتیحی عوسمانی بو. کە وابو ئەبێ جزیری، لە پیاوە ناودارەکانی سەدەی نۆهەمی کۆچــی بێت. ئیتر گومانم نەماوە ئــەو شــیعرانەی کە تیاندا ناوی سەعدیو حافظو جامی هێناوە، هی مەلایەو لاوەکیو دەسەرخــراو نین. دیســان مامۆســتا سەجادی لەسەر ئەم باسەی خۆی دەرۆاو دەڵێ: رۆژهەڵات ناسی ئەڵمانی **فــۆن هارتمان** ســاڵی ١٩٠٤ میلادی، دیوانی مەلای جزیری کە لە برلین لەچاپ داوەو بە خەیاڵیش وێنەیەکی سیمای جزیری کێشــاوەو خســتویەتە ســەر بەرگەکەی ئــەویش دەربارەی ژیانی مەلا هەروەك ژابای ێ زانیوە. سەجادی لەپاش ئەوهەمو باسو خواسە هەمە جــۆرە بۆرو زۆرەی رایگــوێزاوە. ئــەمجــا بۆخۆی بیروڕای خۆیمان پێ دەڵێو فــەرمویەتی: مەلا لەناو قصیــدێکــدا، بەیتێکــی هەس، بەم جورەیە:

گەر لوءلوئی مەنثور ژنەظمێ تە دخوازی    وەر شیعری مەلێ بین تە بە شیرازی چحاجەت؟

گەلۆ، نیازی لە شیرازی، سەعدی بوە یا نە حافظ؟ حــافظ ســاڵی ١٣٩١ میلادی بە رەحمەتی خودا چوە. ئەگەر مەبەستیش سەعدییە ئەویش خەڵکــی سێزدەهەم سەدەی میلادە. کە وابو، ئەو ریوایەتەی کە گوتویە مەلا لە چەرخی دوازدەهەمی میلادا لە دنیا دەرچــو، پوچ دەردەچــێ. لە لایەکی تریشــەوە، وا دەزانین کە مەولانا عبدالرحمانی جــامی، ســاڵی ٨٧٧ کۆچــی (١٤٧٢ میلادی) لە کوردستان رابردوەو لە هەولێرەوە رەدبوەو بۆ حەج چوە. لە باسی ســەفــەرەکەیدا. لە شوێنێکدا فەرمویەتی: لە جزیر چــومە دیاری پیاوێ پیر. نیوە پیاوێکــی دیش هەبو لە حــەریر. وا دیارە پیرە مێردەکە مەلای جــزیری بوبێو لەو کاتەشدا، عەلی حــەریری لە تافــی جــوانیدا بوە، بۆیە بە نیوەپیاوی ناودەباو دەبێ جامی ئەو دو کەسەی بەکەیفێ بوبێ، بۆیە باسی کردون.

خۆ دیاریشـه تا پیاو له تەمەنی شـێصت سـاڵانه تێ نەپەڕێ، به پیرەمێرد ناوی نابەن. که وابێ دەبێ دەوروبەری ساڵی ۸۲۰ ی کۆچی پێی نابێته سەر دنیاوە.یان توزێ کەمتر، یا زیاتر.

خۆ ئەگەر ئەمین زەکی بەگ، بەڵگەی ژیانی جزیری، له چەرخی شەشـەمی کۆچـی دو بەیتی ناو دیوانەکەس. که به خـەیاڵ لای وایه دۆزیویەتەوەو بێ‌گومانە. ئێمه دەڵێین: نەی‌پێکـاوەو لەم دوبەیتەی نەزانیوە. با بزانین چون؟!

مەلا لەشوێنێکا فەرمویە:

ئەی شەهەنشاهی موعەظظەم حەق نیگەهەداری تەبێ

سورەیی «انافتحنا» دەور ماداری تەبێ

له شوێنێکی تریشا، له سەرەتای قەسیدەیەکا دەڵێ:

خانی خانان لامعی نەجماته هەر پڕنور بێ    کەشتی‌یا بەختی‌ته ئەز بایێ موخالیف دوربێ

ئەمین زەکی پێ دادەگرێ، که ئەم شەهەنشا زەبەلاحـەو ئـەو خـانی خـانانە، له زەمانی دەستەڵاتی ئەتابیك عیمادالدین زەنگی‌دا، که فەرمانڕەوای موصل بوە، له تەورێز حـوکمی کردوە. مەلا ئەو دو بەیتانەی خۆی دەگەڵ دو قەسیدەکەدا بۆ خانی خانان ناردوە. ئەتابیك عیمادالدینیش، له چەرخی شەشەمی کۆچی ژیاوە. کەوابو مەلای جزیریش دەبێ خەڵکی ئەو چەرخه بێ.

ماموستا ئـەمین زەکی‌بەگ، هیچ بۆی رون نەکردوینەوە؛ ئـەو خـانی خـانانه کێ‌بوە؟ کەی له تەورێز بەو ناوە حاکمێك هەبوە؟ مەلا کاری به خـانەکەی تەورێز چبوە؟ تا به شـیعر باسـی بکـا. ئەمجار ئەم واتەی شاهەنشاهە هەر بۆ شێرە کوللەی خـەڵکـی ئێران، بویته نازناو، هەرگیز خـانی والی تەوریز، نەی‌وێراوە بەوناوەوە خۆی نیشان‌دا. ئێمه دەبێ بۆ ناوی خـان له تورکیا پتر بڕوانین تا ئێران. بۆ نمونه بوچی نابێ مەبەستی مەلا لەو خانە، سوڵتان محمد خانی فـاتح‌بێ که له سـاڵی ۸۵۵ را تا ۸۸٦ سوڵتانی ئەستەنبوڵ بوەو ناوی خەلیفەی ئیسلامی لەخۆ ناوە؟ یان بوچ سـوڵتان بایەزید خانی دوهەم نەبێ که ۸۸٦ چـویته سـەر تەختی پاشـایی‌و تا ۹۱۲ ی کۆچـی ماوەتەوە. ئەگەر هەربشڵێن شاهەنشا، مەبەست حـاکمی ئێرانە؛ خـانی تەوریز ئـەوناوەی لێ ناوەشـێتەوە، بۆچی نەڵێین مەبەستی مەلا لەوناوە، سوڵتان حوسێن بایقرایە که له تەیموریەکان بوە له چەرخـی ۹ تا سەرەتای چەرخی دەیەم بەسەر ئێران‌را دەگەیشت؟

جا وەك ماموستا سـەجـادی، لەم بوچـی‌و چـەبویانەی هەڵدەکرێنێ؛ وا دەنوێنێ که دەبێ، به هەمو بەڵگان، جزیری له چەرخـی نۆهەم له سـاڵانی نزیك ۸۱۱ دا هاتبێته ناو ژیانەوەو له دەوری ۸۸٦ دا به رەحمەتی خوا شادبوبێت. ئەمجار ماموستای سەجادی، بۆ پوچاندنەوەی ئەو قسەی که وتراوە: مەلا له چەرخی شەشەمدا باوی بوەو هەر لەو چـەرخـەدا مردوە. بەڵگـەیەکی تری هەیە، که بەراستی جێ سەرنجـە. دەڵێ: ئـەگەر چـاوێك به کتێبو پەڕاوەکانی دەورانی پێش مغـولاندا بخشێنین؛ له هیچ شوێنێك توشی وشەی مەلا نابین. پیاوە گەورەکانی دینی‌و هۆزانەکانی ئـاینی، نازناوی خواجەیان هەبوە یان پێ‌یان گوتون: مەولانا.

مغولەکان کە وڵاتی موسوڵمانانیان گرتوەو خۆیان بونە هەمەکارە، بەپیاوی زاناو ڕێبەری دینی خۆیان گوتوە؛ لاما. دیارە هەمیشە ژێردەستان، دەیانەوێ لە هەموشت لاسای خاوەن دەستەڵاتان بکەنەوە. ئەوانیش بە خواجەی خۆیان گوتوە لاما. وردە وردە دو پارچەکەی ئەم وشەیە جێگەیان گۆڕیوەتەوەو لاما لێمان بۆتە مالاو مایەکەش هەڵقرچێنراوەو مەلاکەی لێ سازدراوە. جا ئەگەر لەپاش مغولان، هێندێك کۆلکە خوێندەواری غەیرە عەرەب، پینەیان پێدا گرتوەو گوتویانە ناوی مەلا، لە میلئـی عەرەبانەوە پەیدابو. کە واتا پڕ. یانی ئەگەر گوتیان مەلا وەك پێی بڵێن پڕ لە عیلمو دارماڵ لە زانستی وایە؛ بە هەڵە چون. چونکە عەرەب بە زانیاران ناڵێ مەلا. ناوی موللا لەناو عەرەباندا هەیە، بە مامۆستای قوتابخانەی منالانی جزمی عەممە خوێن دەڵێن‌و تۆزێك گاڵتە پێ‌کردنیشی تێدایە.

سەجادی لەدوای ئەم باسەش لەسەر وتار دەڕواو دەڵێ: بۆ ڕون‌بونەوەی ژینامەی مەلا زۆرم حەول‌و تەقەلا دا. لە هەمو کەسم دەپرسی. لە هەرکەس هەرچیەکم دەبیست دەم‌نوسیەوە. لەم پرسیارو تێ‌کۆشانە زۆرانەمدا دەسنوسێکی دیوانی مەلای جزیریم وەدەس کەوت. کە لە ساڵی ١٣٣٨ کۆچێدا پیاوێ وەناو عبدالقادری ئامێدی نوسیویەتی‌و لە پێشەکی دیوانەکە ژینامەی مەلای جزیری بەم جۆرەی‌دا دی‌نوسیوە:

جزیری ناوی ئەحمەدەو فرزەندی شیخ محمدە. ساڵی ١٤٠٧ میلادی لەشاری جزیری بوت لەناو بنەماڵەیەکی هۆزی بوختی، چاوی بەژیان هەڵێناوە. باب‌و باپیرانی مەلا هەمو شیخی سەربەرماڵ بون‌و سەر بە شێوەی نەخشبەندی. ئەحمەد کەبێچوە مەلابوە. بە منداڵی لەلای باوکی خۆی خوێندوە. بە لاوەتی وەك هەمو فەقێلەی دیکەی کوردەواری. بەرەو خوێندن دەرکەوتوەو گەلێك شارودێ گەڕاوەو لەزۆر سەرچاوەی جۆربەجۆر، پاراو بوەو تەمەنی سی‌ودوساڵ بو. کە لای مەلا «تەها» ناوێك، لە فێرگەی گوندی «ستڕباس» ئیجازەنامەی وەرگرت‌و لە گوندێك بەناوی «سەربا» کە نیزیکی دیاربەکرە، دامەزراوەو بۆتە دەرس بێژی دینی. لەوێشەوە چوتە مەڵبەندی «حەسەن کێف»و لەوێش دەرسی گوتوتەوەو زۆری مەلای پایەبەرز، پێ گەیاندون. لەنەکاوێك، تیری ئەوینی خودایی، دڵ‌و دەرونی پێکاوەو قودرەتی خوا لە چاوی کچە کوردێکدا خۆی نیشانی مەلا داوەو لەوسایەوە بۆتەعارفێکی‌دڵدار. یان دڵدارێکی خوداناس‌و سەرەنجامی ئەو ئەوینە دڵ تەزێن‌و پڕلەتینە، کارێکی بەسەر هێناوە، کە خۆی‌و دنیاو قیامەتی وەلا ناوەو دەستی لە تەدریس بەرداوەو هەر بە هەڵوەدایی ژیاوە. تا لە ساڵی ١٤٨١ میلادیدا، کە حەفتاو چوارساڵ ژیاوە بەرەو ژیانی بێ خەزانی دنیای هەرمان بارگەی سەفەری تێك‌ناوەو لە شاری جزیر نێژراوەو هەتا ئێستاش گۆری پڕلەنوری مەلا، جێ زیارەتی حەشاماتەو لە لایەن دڵدارانەوە، لەسەر قەبری گوڵ‌بارانە. سەجادی پاش ڕاگوێزانی ئەو ژینامە هەمەجورەو لێك‌جیاوازو سەرەولێژو پڕ لە کۆست‌و هەورازانە، کە خۆشی پێمان دەفەرموێ: زۆر چەتونە، قسەی ڕاست‌و نیگرێمان لەو ژینامانە دەس کەوێ!. بە بەکاو با دەداتەوەو سەروسیماو بچم‌و کەسمی مەلای جزیری

باس‌ده‌کاو فه‌رمویه‌تی:

دەمو چاوی سپی‌و سوربو، قەد زراو بو، چاوی گەشی هەر پرشنگی بەری دەکرد، بروی رەش‌و کەوانی بو، تویلی تەسك‌و رومەتیکی پان‌و پورو ریشیکی سپی‌و تەنك‌و خشپیلانەو کەپویەکی کورتی هەبو.

رانك‌و چوخەی دەبەر دەکرد، ریشوی جوانی لە میزەرەکەی هەل دەبەست. هەتا بلیی، مەشرەف خوش‌و قسە خوش‌بو. هەمو کەسیك خوشی دەویست. لە دواروژانی پیریشدا، کەوای شوری دەبەردابو، زوریشی لی دەوەشاوە. هەر دەگەری‌و قەلەندەری ببوە خوی‌و نەی‌دەکرا دەستی لی بەردا.

کەسیش نەبو لەو دەمەدا بە کاکە سەجادی بیژی: ئەری قوربان، تویەك کە ئیستاش نەت‌زانی، ئەو شاعیرە لە چەرخی شەشەم‌دا ژیاوە، یان لە سەدەی نویەمین‌دا. چونت زانی رەنگی رانك‌و چوغەکانی‌و ریشوی بادراوی شەدەکەی وا باس بکەی؟ ئەو باسەی کە تو لیی دەکەی، وا دەردەخا کە هەزار جار شەرە کەوچکتان کردبی‌و لە ناو حوجرەی فەقیکاندا لە پەنا یەکتر نوستبن‌و لەسەر بەشە نان‌و دویەك بەگژ یەکتری‌دا چوبن‌و ئاشت بوبنەوە.

ئیتر ماموستا سەجادی، لەپاش ئەو وردە کاریانە! چەند چیروکی گوی ئاگردانی لادیشمان، لەو بارەوە بو باس دەکا، کە ئەمانەن:

مەلا تەمەنی سی‌سال بو ـ واتا دوسال بەرلە خویندن تەواو کردن ـ لەدیی «دیرهان»، لە نزیك قەلای حەسەنکیف. دەچیتە سەر زەماوەندی ئیجازەنامەی فەقی‌یەك. کیژو لاوانی ئەو ناوەش، هاتونەوی کە لەو دیلان‌و بەزمەدا بە سەیرانەوە هاوبەش بن. سەلما ناویك، کیژی حاکمی حەسەن‌کیف؛ کە ناوی مەلیك کامیل بو ـ دەگەل دەستە خوشکانی خوی، هاتبونە سەیری ئەو بەزمو ئاهەنگە. مەلا کەسەلما دەبینی، بە یەکجاری هەرچی چەندسال‌و زەمانە فیری بوە لەدەست ئەدا. بەزەیی خودای بی هاوتا لە سیلەی چاوی سەلماوە دلی مەلا بو خوی دەباو یەکجارەکی لە بون‌و نەبونی دەکا. لە باری ئەویندارى‌دا، قەیسە شیتەکەی عامیری‌و پیری سەنعان دەسك‌و گولیان لەدو دەکرد. ذکرو فکری شەوو روژی، هەر بیر لە سەلما کردن‌و هەر ناوی سەلما بردن بو.

لە سایەی عیشقی مەلاوە ناوی سەلما کەوتە سەر هەمو زمانان‌و لە هەمو دەرو کولانان، باس هەر باسی چاوی سەلماو تاووتینی دلی مەلای دلداری بو. ئەم باسە گەیشتەوە میر. زور دلگیر بو. چون مەلایەکی هەرجایی‌و هەژارو بیکەس‌و بی‌ناو، ریی دەکەوی ئەویندارى کیژی من بی؟ ناوی لەناو حەشامەتا بزرینگینی؟! مەلا بگرن تا بیکوژم. خیرەومەندو کەیخودایان، تکایان بردە بەر میرو تی‌یان گەیاند، کە ئەو پیاوە پیاوی خوایەو لە خوا بەدەر کەس ناناسی‌و ئەگەر ناوی سەلما دەبا، خوا لە چاوی جوانی سەلمای کیژی تودا بەدی دەکا. میر بو راستی‌و چەوتی قسەی لاگیرانی مەلا، دەکەویتە ئەزمون‌و تاقی کرنەوە. دەزانی وەك دەلین وایەو ئەو خواناسە حیا لە

خـوا، چیتری بەبیردا نایەو لەپەڵەو هەڵەی دنیاییو داوێن پیسـیو هەرزە کاری نەك هەر بێزارو بەبێزە، بگـرە هەرگیز بە دڵیشـیا تیٚپەڕ نەبوە. واز لە کوشـتنی دەهێنیٚ تەنانەت هێندێك کەس دەڵێن: میر مەلای لاواندوٚتەوەو بوٚ ماوەیەك لەلای خوٚی حاواندوٚتەوەو دڵی چوٚتە سـەر ئـاکاری پاكو لەباری ئـەو پیاوەو بەڵینی داوە، کیژەکەی لیٚمارەکاو پارەو دراوی داوەتیٚ کە بچـیٚ جلکـی بوٚبکریٚو بوك وەگوێزیٚ.مەلا بە پوڵی زوٚرەوە، روی کردوٚتە شاری موصل. هەمو بازاری گەڕاوەو بەبیٚ ئەوە هیچ بکـریٚ گەڕاوەتەوەو پوڵەکەی گێراوەتەوە. میر گوتویە: بوٚ بە دەسـتی واڵاو بەتاڵ گەڕایتەوە؟ مەلا لەجواباگوتویە: میرم، سەرانسەری راسـتە بازارو قـەیسـەری موسـڵ گەرام. هەزاران توٚپ کیمخواو خاراو خامەكو مەخمەرو داراو ئـەتڵەسو دەسـرەی سـرکەییو حـەریرو ئاوریشمم دیتن. بەڵام هیچیان بە بڕوای من شیاوی بەژنو باڵای تەرزو ریٚکی سەلما نەبون. ئەو قوماشەی، بوٚ بەژنی سەلما دەسبدا لە هەمو دنیادا نیە.

دەماودەمیش دەگیٚڕنەوە، کە مەلا لە شـاری جـزیر ئێوارانە چـوٚتە ناو گوٚرسـتانەوەو پاڵی وەکێلێکی مەڕمەڕ داوەو رازونیازی دڵدارانەی دەگەڵ خودای خوٚی کردوە.

پیرێژنێکی جـزیری، هەر کە مەلای دیوە دەڕوا بوٚ گورسـتان؛ هەویرەکەی خـوٚی شـێلاوەو چاوەنوٚری مەلا بوە، کەی کێلەکە بەجیٚ دێلیٚ. هەر کە مەلا بەرەو ماڵان هاتوٚتەوە. ژنە دەرفـەتی هێناوەو ئـەنگـوتکە هەویرەکانی بە مەڕمەڕەکەوە داوە. کێلە مەڕمەڕ، کە بەتینی دەرونی ئـەو ئەویندارە، وەك تەندوری سورەوەبوی نێل دراوی لیٚ هاتوە. نانەکانی برژاندوە.

وا لێرەدا گردەوەکوٚیی سەجادی، کە لە مەرژینامەی مەلا، لە مێژوی ئەدەبی کوردا هێناویەتی، دەبریٚتەوە.

کتێبێکی دیکـەش هەیە بەعارەبی. بە قـەڵەمی ئـەحمەد کوری مەلا محمدی بوٚتانی زڤنگـی - مفتی باژێری قامیشلی ـ لە سوریا. شەرحێکە لە سەر دیوانی هەڵبەستەکانی جـزیریو ناوی ناوە: «العقد الجوهری فی شرح دیوان الشـیخ الجـزری». واتا: گەر دانەی گەوهەرین، لە شـەرحـی دیوانی شیخی جزیریدا.

نوسەری کتێب بەرلەوە مانای شیعرەکانی مەلا بە عەرەبی لێداتەوە، ژینامەی مەلای هێناوە بە عەرەبی کردویەتە پێشەکی شەرح نامەکەی.

لە دوای ئەوە کە سوپاسی سەیدا عەلائەالدین دەکا. چونکە بەهرەی لە مێژوی ئەدەبی کوردی وەر گرتوە، دەڵیٚ: هەرچەند ماموٚستا سەجادی ماڵم هەقە رەنجی زوٚریشی کێشاوەو بوٚ دوٚزینەوەی ژینامەی جزیری، ماندوبوەو گەلێك شتی پڕبایەخی دەسکەوتوە. بەڵام من بەش بە حـاڵی خـوٚم، هیچ سەبوریم پیٚیان نایەو دڵ ئاویان لیٚ ناخواتەوە. ئەوا بوٚخوٚم، لە لێکوٚڵینەوەی فـرەو پشکنینی شیعرەکانی دیوانەکەی، شتێکم هەڵکراندوە. کە پیٚموایە بەڵگـەی راسـتن بوٚ دینەوەی روٚژگارانی ژینی مەلاو لیٚم رونە کە من زوٚر باشتر لە ماموٚستا عەلاءالدین ئەم مەتەڵەم هەڵێنابیٚو وەستایانەتر بوٚی چوبم. ئەمجا دەس پیٚدەکاو دەڵیٚ:

مەلا لە شوێنێك فەرمویە:

ژرەعنا نێر گزێن تەی مەستو خونریز     زەمان بو عەهدی جەنگ ئەنگیزی چەنگیز

لەجیٚیەکیش ناوی تەیموری لەنگ دەبا. لە شیعرێکیشدا دەڵێ:

ژ حافظ قوطبی شیرازی، مەلا ئەر فێم بکی رازی. لە بەیتێ دیش داگوتویە:

ژرەنگی سەعدیو جامی.

کەوابو، مەلا بێگومان کەوتوتە دوای چەنگیزەوەو تەیموریشی جێهێشتوە، کە یەکەمیان لە ٦٢٥ و دوهەمینیان لە ساڵی ٨٠٧ کوچی فەراقی رەشی لێ براوە. حافظیش جامی گوتەنی ساڵی ٧٩٢ ی کوچی لەدنیا کوچی کردوە. جـامیش کە لە دیوانەکەدا ناوی هەیە دیارە پێش مەلا کەوتوە.

ئەوکەسانەی وتویانە، ئەو شیعرانە هین مەلا نین. وادیارە لەوێژەوانیو شیعر ناسین، کوڵەوار بون. چـونکە هەرکەس هەروا توزێك لە مرخو چێژەی هەڵبەسـتەی مەلای جـزیری تێ گەیبێ، سور دەزانێ کە ئەم شیعرانە هی مەلانو مافی کەسیان پێوە نیە.

هەرکەسێکیش شارەزای فەرمودەکانی سـەعدیو حـافظو جـامی بێت، زو تێدەگا کە مرخـی مەلای جزیری چەند لەوانەوە نزیکەو چـەندە نرخـی بو داناون. سـەرەڕای هەمو ئـەمانەش، هەڵبەستێکی مەلا هەیە بە عارەبی. لەسەر بەندەکەیا دەڵێ: یارامی قلبی بسهام النظرات. هیهات نجاتی. ئەی ئەوکەسەی بە تیلەی چاو دڵت وەبەر تیران داوم. تازە دەرناچم فەوتاوم.

کێشو رەوتی ئەو هەڵبەستەی تەواو لاسای هەڵبەستێکی ماموستا ئـەحمەد پاشـایە، کە وەك بوێژێکی ناودار، هەتا ساڵی ٩٠٢ ی کوچی لە وڵاتی ترکاندا ژیاوە. مسـیو ژاباو ئـەمین زەکی کە دەڵێن مەلا لە نیوەی چەرخی شـەشـەمیندا ژیاوە؛ ئـەو ناوی عیمادالدینە لێی تێك داون. ئـەوان هەردوك هەر عیمادالدینی زەنگی، فەرمانرەوای شاری موسڵیان ناسیوە. کە لە چەرخی شـەشـەم ژیاوە. بیستویانە کە وا عیمادالدین ناوێك، دەگەڵ مەلا دوستیو شناسایی هەبوەو شیعریان پێك گوریوەتەوە. دەی کەوابو عیمادالدین هەریەکێکە. ئەویش لە بەرەی زەنگـیەو ئـەتابەکێك بو لە موسڵ. موسڵیش لە جزیر نزیکەو رەنگە ئەو فەرمانرەوایە، دەگەڵ ئـەو پیاوی خـودایە نێوانێکـی خوشیان بوبێت.

بەڵام خـوم لە توژینەوەمدا، بوم دەرکەوت، کە ئـەو پیاوەی بەو ناوەوە دەگەڵ مەلا شـیعر شـیعرێنی کردوە، ناوی زەنگـی لێ نەنراوە. پێی وتراوە عیمادالدینی جـزیری. گش لەمێژو شارەزایەك باش دەزانێ، کە عیمادالدینی زەنگـی کوری ئـاق سـنقرناو بوەو هەرگیز لە جـزیر نەژیاوەو کەسیش هەرگیز پێی نەگوتوە عیمادالدینی جزیری. ئـەوا عیمادالدینە کە: قـت. دەچینە سەر خانی خانان، کە ئەمین زەکی لای وایە فـەرمانرەوای تەورێز بوەو مەلاشیعری بوناردوەو بە بەژنو باڵای هەڵدەڵێ. بەراسـتی ئـەمەش هەڵەیە... هەرچـونکە ناوی تەورێزێ لە شـیعرەکەدا هاتوە، هێندێك لە مێژو نوسانی وەسەر تەڵە پەراندوە.

ئەگەر ئێمە بە تەواوی لە شاری جزیری بۆتان شارەزابین، وەکو من بۆخۆم شارەزام: زۆر بە هاسانی دەیزانین، کە ئەو هەڵبەستە رەنگینەی خانی خانانی تێدایە باسی فەرمانڕەوای کوردی شاری جزیرا بۆتانە. بابزانین بوچ:

شاری جزیری کەونارا، کە پاتەختی دەسەڵات داری کورد بوە. زۆر ئاوەدان‌و زۆر جوان‌و زۆر لە بارو تەیار بوە. وەك ئێستاش شوێنەوارەکەی نیشان‌دەدا. وارشێکی بە هەر چواردەورا کێشراوە، بەردی وارش لە مەڕمەڕی تاشراو بوە. بەشی زۆری ئایەتەکانی قورعانێ، لەو سەربەردە مەڕمەڕانە هەڵکەنراوە. سورەتەکانی فاتیحاو ئەنعام‌و ئیننا فەتەحناو ئەو عەشەرەی ئایەتەلکورسی تێدایە: زۆر زەق نەقاری کراون. کە زۆر بەودم زانراون‌و ویستویانە لەپیتی ئەو سورەتانە، خوا شارەکەو موسوڵمانانی شارەکە، لە بەڵایان بپارێزێ. ئەگەر هەڵبەستەکەی مەلا بە وردی بخوێنینەوە سور دەزانین، کە مەبەستی لەشوێنی خانی خانانی جزیرەیەو مەبەستی لە خانی خانان میری جزیرو بۆتانە.

دەبڕوانە فەرمویەتی: «ئایەتەل‌کورسی‌و ئەنعام هەیکەلاتۆخێ تەبن». یان فەرمویە: «سورەیی ئوممول‌کیتاب ماداری حەضرەت سوربێ».

یاخۆ لەو قەسیدەیە کە میری جزیرێ بە ناوی شاهەنشای موعەظەم، ناو دەبا دەڵێ: «سورەیی ئیننا فەتەحنا دورو ماداری تەبێ». کە ئەم ئایەتانە، دەگەیەنێ لە دەوری وارشی شارن‌و مەبەست شاری جزیرەیە، ئەگەر مەلا میرەکەی خۆی پەسند بداو بە ناوی خانی خانان‌و شاهەنشای زلی ناوبەرێ، چی‌تیایە؟ بەڵگەی هەرە ئاشکراتر هەر لەو هەڵبەستەدا هەیە. لە پەسنەکەی میردا دەڵێ: «گەرچی دەر ئیقلیمی رابیع هاتە تەختی سەڵتەنەت». خۆ دیاریشە جوغرافی زانانی پێشین، درێژی‌و پانی زەمینیان بە حەو بەش دابەش کردبو. هەر بەشەی ناوی ئیقلیم بو. شاری جزیر لەو دابەش دابەشێنەدا. لەسەر ئیقلیمی چوارەم‌بو. ئەمجار ئەو بەیتەی کە ناوی تەورێزی تێدا هاتوە، هەرگیز ئەوە ناگەیەنێت، کە روی قسە دەحاکمی تەورێزێ بێ. نەخێر. مەلا ویستویە لە خوا بخوازێ ئەو میرە کوردەی جزیرێ کە رەواج بە ئیسلام دەداو فەقێ‌و مەلای زۆری هەیە، دەرسی قورعان‌و حەدیثان دەڵێنەوە؛ خوا هەر باڵادەستتری بکاو دەڵێ: لە خودام تەڵبە، تۆ کە لە شاریکا دەژی لە ئیقلیمی چوارەم دایە، خاوەنی حەوت ئیقلیمان‌بی. جگە لە هەمو کوردستان، تەوریزیش بێتە بەر حوکمت خاوەنی موڵکی خوراسانیش خۆی بداتە بەر داڵدەی تۆ.

نە تەنێ تەبریزو کوردستان لبەر حوکمێ تەبن

صەد وەکی شاهی خوراسانێ دفەرواریێ تەبێ

دەبابزانین عیمادالدینەکە کێ‌بو، کەوا ئەو چەند مێژو نوسە لە ناسینی بە هەڵە چون؟! هەتا ساڵی هەزارو پێنج کە **شەرەفخانی بدلیسی**، لە نوسینی شەرەفنامەکەی بوتەوە. دیارە میرێك لە جزیر هەڵ‌نەکەوتوە ناوی عیمادالدین بوبێت. چونکە نەك هەر لە جزیرە، لە هەر سوچێکی کوردستان، بەرلە ساڵی‌هەزارو‌پێنج میرو دەستەڵاتدار بوبێت. شەرەفخان ناوی‌نوسیوەو دەشەرەفنامەی‌ئاخنیوە.

دەیسا منیش لە چەند دیوانی دەسخەتی خەڵکی جۆراوجۆرا دیومە، کە ئەو دۆستەی دەگەڵ مەلا شیعر شیعرێنی کردوە، عیمادالدین جزیری‌یە.

لە دەورانی شەرەفخانی مێژونوسداو لە ساڵانی هەزار هەتا هەزارو پێنج، میری جزیرو بۆتانێ میر شەرەفی کوری ئەبدال، لە میرانی خانەدانی ئازیزان‌و باپیری بەدرخانیان بو. هەروەك ناوی میرشەرەف بو، خان شەرەفیشیان پێ دەگوت.

میر شەرەفخانی بدلیسی لە شەرەفنامەکەی خۆیدا، زۆر بە خان شەرەف هەڵدەڵێ: دەڵێ: زۆر پیاوێکی دەست‌و دڵ‌و دەرون پاکە. فەقێ‌و مەلای زۆر خۆش دەوێن. زۆر مەدرەسەو مزگەوتی تازەی لە شاری جزیر سازداوە کە یەکێك لەو مەدرەسانە مزگەوتی سوری پێ دەڵێن. لە پەنای شورەی شارەوەو کەوتۆتە لای رۆژ واکەی. مەوقوفەجاتێکی زۆرو پرداهاتی، بۆ ئەو مزگەوتە داناوە. کە لە پاش نەمانی خۆشی مزگەوت هەر لە برەودابێ‌و هەر فەقێ‌و مەلای تێدابێ.

دەیسا کەسیش گومانی لەوەدانیە کە شیخ ئەحمەدی جزیری، لەو مزگەوتە دەرس بێژو پێش نوێژ بوەو گەلێك مەلای لەوێدا ئیجازە داوەو دیارە هەر لەوێش مردوەو هەر لەو مزگەوتەش نێژراوە.

ئیستا ئەگەر مەلای عارف، مەلای شاعیرو ئەویندار، مژۆڵی چاوەمەستانی کورد؛ بە تیرەبێ ئامانەکەی خان‌شەرەفی بشبهێنێ. بۆناسینی خانی‌مەلا کە هەر دەبێ خان‌شەرەف بێ چی دەمینێ؟؟ دەبرۆانە ئەم شیعرەی مەلا چەند جوانە، کە فەرمویە:

خەفوان رەشاندن دل‌خەدەنگ ـ تەشبیهی‌تیرێن خان شەرەف.

جا دەشبێ ئەو عیمادالدینەی کە زۆر ئاشنای مەلا بوە، خزم‌و کەسی خان‌شەرەف بێ‌و لە جزیرێ دەگەڵ مەلا بوبن بە دۆست‌و شیعریان بۆیەکدی نوسیبێ.

سەرباری ئەو بەڵگانەشم، شتێکی سەرنجراکێشی دیکەش هەیە. لە هەمو دیوانەکانی جزیری‌دا، وتوویژی شاعیرانەی نێوان مەلاو فەقێ تەیران دەست دەکەوێ. فەقێ‌تەیران بەشیعرنامەی نوسیوەو مەلاش جوابی فەقێی هەر بە شیعرداوەتەوە. فەقێ تەیران، لە هۆنراوەیەکی خۆی‌دا، لەژێر ناوی: «دلۆرابە، دلۆرابە» مێژوی ئەورۆژە دەنوسێ کە ئەوەی تێدا نوسیوە. لە نیوە بەیتێکا دەڵێ:

هەزارو چل‌و یەك چونە. ئیتر من تەواو لێم رونە، مەلا لە ئاخرو ئۆخری سەتەی دەیەمی کۆچیدا هاتۆتە مەیدانی ژیان‌و مەودایەکی تەواویشی لە چەرخی یازدە بریوەو هیچ بە دوریشی نازانم کە هەمو نیوەی ئەو چەرخەش زیندو بوبێت. هێندێکیش بەولاوە چوبێت. واتا ژینامەی دەسخەتی عبدالقادری ئامێدی، کە عەلاءالدین دیویەتی، دەبێ راست بێ کە مەلا حەفتاو چوار ساڵ تەمەنی لە دنیا بوبێ. لە دەوری هەشتای چەرخی دە هاتبێتە سەر دنیاوەو لە نێوان پەنجاو شیصت پلەش، لە چەرخی یازدە مردبێ.

شەرح نوسی بە عارەبی، کە ئەم چەند بەڵگە رونەمان دەربارەی دەورانی ژیانی نیشان دەدا؛

دێته سەر باسی چۆنیەتی زانستو بلیمەتیەکەی. دەڵێ: مەلا لە هەر دوازده عیلمەکاندا دەریایەکی بێ پەی بوه. لە زانینی زمانەکانی عارەبیو فارسیو ترکی تاقە سوارەیە لەمەیدان. بەو سێ زمانەو بە کوردیش ـ کە هەر زمانی خـۆی بوه ـ هەڵبەســتو هۆنراوی هەیە، کە بۆ رەوانیو پاراوی تاکیان نیە. دیوانەکەی بۆیەکەمجـار لە برلینی ئـەڵمانیا، چـاپ کراوه. زۆر جـاری دیش لە ئەستەمبوڵ، لە کوردستان، لە روسیاش دیسان چاپ کراوەتەوه. رۆژ هەڵات ناسـان لە لاوه، زۆر بەجێ گەورەی دەزانن. دەشلێ مەلا کە دەرس بێژی مزگەوتی سوری جـزیر بو؛ پاش مەرگیشـی لەژێر زەمینێك هەر لەو مزگەوتی سوره نێرژاوەو زیارتگایە.

پێشەکی شـەرحـی عارەبیش، دەربارەی ژینامەی مەلا کۆتایی هات. منی وەرگێری هەژاریش چەند قسێکم هەیە بیکەم.

ئەگەر ژابا، فـۆن هارتمانی ئـەلمانی، یان ئـەمین زەکیو بلەچو عەلی عەونیو مامۆسـتا عەلا سەجادی، بەرلە ژینامە نوسینی ئەو عارفە. دیوانەکەیان بەوردی خوێندبایەوە؛ تەنیا ئەو شـێعرەی کە باسی تیرەکانی خان‌شەرەفە، بەس‌بو کە بۆیان دەرکەوێ، مەلا لە چـەرخـی یازدەدا زیندو بوه. ئەو گۆرەی تێی‌دا نێژراوە ژێرزەمینی مزگەوتێکە، کە خان شـەرەفـی جـزیری لە پاش هەزارەمی کۆچی سازی داوه. ئیتر ئەو هەمو شـێوانو ئـاڵۆزبونەی تێ نەدەچـو. قسـە هێنانو بردنی پێ نەدەویست.

قسەی دوهەمم ئەمەیە: لە ساڵانی ١٩٥٦ را ماوەی سێ سـاڵ، بۆخـۆم ماڵم لە گوندێك بو لە جزیرەی ابن عمر، لە کوردستانی سوریە. کە ناوی «قبور البیض» ەو لە نزیك شاری «قـامیشلو» هەڵکـەوتوه. دەگەڵ مەلاو شـاعیرانو وێژەوانانی ئـەو ناوە هاتو چـوی یەکترمان دەکرد. لێم دەبیستن، مەلا عبدالسلام ناوێك خەریکە دیوانی مەلا بە عەرەبی شـەرح دەکا، دەشـیان‌گوت زۆر مەلای چاکەو کرمانجیش بەشێوەی بۆتان باش دەزانێ، چونکە خـۆی خـەڵکـی بۆتانە. بەڵام زۆر روتو نەدارە، هیچ ئاشتەبای خـوا شـك نابا. لە حـوجرەی مزگەوتێك‌دایە سـەڵتو سپات. مەلا ئەحمەدی زڤنگی کە بۆتە مفتی قامیشلیو ئەو مزگەوتەشـی بەدەسـتەو ـ خـوا نەیبری ـ زۆریش داراو دەوڵەمەندە. خێر بە مەلا سـەلام دەکاو نانو چێشـتی بۆ دەنێرێ. دەمانگـوت: خـوا خێری بنوسێ.

مەلا سەلام ساڵی ١٩٥٨ مرد. پاش ماوەیەك شەرحـی دیوانی جـزیری بە عارەبی لەچـاپ درا.. مەلا ئەحمەدی زڤنگی مفتی لە شاری قامیشلوی لەسـەر بەرگەکەی نوسـرابو. وێنەیەکی جـوانی مفتیش دەبیندرا. ئیتر یادێك لە مەلا سـەلام نەکرابو. وەباڵ بەسـتۆی ئـەوانەی کە من لێم بیستون. مفتی لەجیاتی شۆرباکەی کتێبی مەلا سەلامی بەناوی خۆی لەچـاپ داوه. جـائێستا کە ئەو جەنابەش وەك مەلا سـەلام بۆتە خـۆڵو هەردوك چـونە بەر بەزەیی خـودای گەورە. من سوپاسی مفتیش دەکەم، کە ئـەم گەنجینە بەنرخـەی لەدەس نەمان پاراستوەو نەیهێشـتوە لەناو بچـێ. دوامین قسـەم، پاڕانەوەیە لە لاوان، لە پیاوانی وێژەوانی کوردی زانی لە شـێعری

ئەویندارانەو باری عیرفانی شارەزا. لەوکارەدا کە من شانم وەبەر داوە، دەستم بگرن. سەرنج بدەن، بزانن لەکوێدا هەڵەم، خوارایيم بۆ راستکەنەوە، یا بە کۆششی هەموانی، کارێك بکرێ دیوانی مەلای جزیری وەك پێویستە، هەمو کوردێکی خوێندەوار لێی تێبگا. کێ هەرتێبینیەکی هەبێ، یا بە نامە بۆم بنوسێ، تا بەوپەڕی سوپاسەوە، بیخەمە ناو پەڕاوێزی دیوانەوە. خۆشیتان لەخوا دەخوازم. ئەوا ئێوەو ئەوەش دیوانی جزیری بەشەرحەوە.

**هەژار**

٥٩/١١/٢٤

# فهرست

بیست‌وشەش

| ناوی قەصیدە | یەکەم لەت | لاپەڕە |
| --- | --- | --- |

مینه‌ت ژ خودایێ کو بعه‌بدی خوه‌ مه‌لایێ

ئیکسیری غه‌می عیشق نه‌ دینار و دره‌م دا

مه‌لای جزیری

## قەصیدەی یەکەم

# «هەری مەیگێر!»

١ نەوایا موطریبو چەنگێ فغان ئاۆیتە خەرچەنگێ
وەرە ساقی حەتا کەنگێ نەشوێین دل ژڤیێ ژەنگێ

٢ حەیاتا دل مەیا باقی بنوشین‌دا بە موشتاقی
«الا یا أیّها الساقی أدِر کاساً وناولها»

**مانای وشەکان:**
**نەوا**: ئاواز؛ **موطریب**: بەزمگێڕ؛ **چەنگ**: ئامرازێکی‌موزیکە؛ **فغان**: هاوار؛ **ئاۆیتن**: هاویشتن؛ **خەرچەنگ**: قرژاڵ ـ برجێك‌لەعاسمان؛ **ساقی**: مەیگێر؛ **حەتا**: هەتا؛ **ژڤیێ**: لەوێ. **حەیات**: ژیان؛ **باقی**: هەرماو؛ **دا**: تا؛ **موشتاق**: بەتاسە؛ **الا**: هەرێ؛ **ایها‌الساقی**: هۆی‌مەیگێڕ؛ **أدر**: بگەڕێنە؛ **کاسا**: پیاڵەیەك؛ **وناولها**: بیشیدە.

**مانابەتێکرایی:**
دەنگ‌و صەدای چەنگی بەزم‌گێر، جۆش‌و خرۆشی گەیاندە عاسمان. دەمەیگێر وەرە، هەتاکەی دڵمان لەوژەنگە نەشوێینەوە؟ ئەومەیە کە هەرهەیەو قەت نافەوتێ، با بەتاسەوە بیخوێنەوە. هەرێ مەیگێر، دەبا پیاڵەکەت بگەرێو بیشمان‌دەرێ.

٣ کو کاتب دیمێ جەدوەل‌کەت شکستەخەت موسەلسەل کەت
ژیەك حەرفان موفەصصەل‌کەت کێ‌یەوێ موشکلێ حەل‌کەت؟

٤ دزانی رودو عود ئەووەل چتاڤیتن سرود ئەووەل؟
«که عشق آسان نمود اول ولی افتاد مشکلها»

**مانای وشەکان:**

**کو:** کە؛ **کاتب:** نوسەر؛ **دیم:** روخسار؛ **کەت:** بکات؛ **شکستە:** شکاو؛ **موسەلسەل:** بە زنجیرە؛ **ژیەك:** لەیەکتر؛ **حەرف:** کەنار؛ **حەرف:** پیت؛ **افتاد:** کەوت؛ **مشکلها:** چەندئیشکال.

**مانا بەتێکرایی:**

**هەرگا نوسەری ئەزەلی ـ کە خودایە ـ خەت‌وخاڵی روخسار دابرێژێ، بسکان چین‌چین‌کاو بە زنجیرەیان بکاو لاجانگان لێك جیاکاتەوە؛ کێ دەتوانێ ئەو دژواریە چارە بکات کە توشی ئەویندار دێ؟ تۆ دەزانی رودو عود کە دو کەرستەی موزیکن هەر سەر لە هەوەڵەوە بە گۆرانی گوتویانە: دڵداری سەرەتاکەی هاسانە، بەڵام زۆری دژواری لەدوە.**

**شیاوی باسە: کە خەتی شکستەو موسەلسەل دو جۆرە شێوە خەتن.**

**٥ ژمیهراوێ شەفەق سەعدێ شرین لەعلێ، شەکەر وەعدێ**
**دنالم شبهەتێ رەعدێ عەجیبم لێ ژوێ جەعدێ**

**٦ کە دلرا تاب هر چینش بکفری میبرد دینش**
**«ز تاب جعد مشکینش چەخون افتاد در دلها»**

**مانای وشەکان:**

**میهر:** خۆشەویستی؛ **شەفەق:** تیشك؛ **سەعد:** پیرۆز؛ **سەعد:** ناوی ئەستیرەیەکە سەعدالسعودیشی پێ دەڵێن، دیتنی بە ودمە؛ **شرین:** شیرین؛ **لەعل:** لاڵ، لێوی یاری پێ شبهاوە؛ **وەعد:** بەڵێن؛ **شبهەت:** وەکو؛ **رەعد:** گرمەی هەور؛ **عەجیبم:** سەیرماوم؛ **لێ:** بەڵام؛ **ژێ:** لەو؛ **جەعد:** موی لول‌خواردو؛ **تاب:** پێچ. چین. بەسەریەکدا هاتو؛ **بە کوفری:** بۆ کافربونێك؛ **میبرد:** دەبا؛ **دینەش:** دینی ئەو؛ **مشکین:** وەك میشك رەش‌و بۆن خۆش؛ **خون:** خوێن، **دەر:** دەناو؛ **دلها:** دڵان

**مانای تێکرایی:**

**لە خۆشەویستی ئەو کەسەی کە تیشکی روخساری وەك شەبەقی ئەستێرەی سەعدالسعود، بە ودمو پیتەو لێوی شیرینی بەرەنگی لاڵەو گفتو بەڵێنی وەك شەکر لەدم دەبارێ. وەك هەورەتریشقە دەنگی ناڵەم بەرزە. بەڵام دیسان سەیر ماوم لەو کەزیو پرچە لولانە کە هەر چینەی، دڵی عاشق بەرەو کفرێك رادەکێشێ. ئای کە لە تاوی پێچی کاکۆڵی چین لەسەرچینی رەش‌و بۆن‌خۆشی میشك ئاسایی چەندەخوێن تزاوەتە دڵانەوە!!.**

**٧ دڤێ طاقێ، دڤێ خانێ مەعەیش‌و ئەیمەنی کانێ**
**کەسێ دەستدەت ژ دەورانێ نیهالەك ڤێ گولستانێ**

## قصیدەی حەوتەم

# «ئاگری جیایی»

١ بناریٚ فیرقەتیٚ صوهتم ژفەرقی سەر حەتا پیٚدا
خەدەنگا غەفلەتی نوهتم ژبەرقا لامیعا تیٚ دا

**مانای وشە:**

**نار:** ئاگر؛ **فیرقەت:** جیایی؛ **صوهتم:** سوتام؛ **ژ:** لە؛ **فەرقیسەر:** تەپڵی سەر؛ **حەتا:** هەتا؛ **پیٚ:** پا؛ **خەدەنگ:** تیر، ناوی دارێکی سەختو پتەو کە تیریان لەو دەتاشی. بەو هۆیەوە خەدەنگ، هەر بۆتە ناو بۆ تیریش؛ **غەفلەتی:** لەناکاو؛ **نوهتم:** پێکامی؛ **بەرق:** بروسکە؛ **لامیع:** بریقەدار؛ ورشەدار.

**مانا بەتێکڕایی:**

بەبێ ئەوە هیچ ئاگام لەخۆم بێ، کوتوپڕو لەناکاو تیری جیایی یار پێکامی. تیری جودایی بە ورشەو گرشەیەكبو، کە وەك بروسکە لێی دامو گڕی لێ بڵند کردمو سەر تاپامی سوتاندو کردمیە خوڵەمێش.

٢ خەدەنگا فیرقەتیٚ رەعدە دلیٚ ئەو غەفلەتی لیٚ دەت
دبیژم وەر جەبەل بت ئەو بکەربت ویٚ دگاڤیٚ دا

**مانای وشە:**

**خەدەنگ:** تیر؛ **رەعد:** هەورەتریشقە؛ **غەفلەتی:** کتوپڕ؛ **دبیژم:** دەڵێم؛ **وەر:** حتێئەگەر؛ **جەبەل:** کێو؛ **بت:** بێت؛ **بکەربت:** لەت لەت دەبێ؛ **ویٚ:** ئەو؛ **دگاڤیٚدا:** هەر لەجێ، فورأ.

**مانا بەتێکڕایی:**

ئایەتێك لە قورعانی پیرۆزدایە، کە فەرمویە:

«ئەگەر ئێمە ئەم قورعانەمان ناردبایەتە سەر کێوێك؛ دەت دی کە لە ترسی خودا، سەری کز کردوەو قەڵشی بردوەو لەبەر یەك چوە. ئەم مەسەلانە بۆ خەڵك ئەهێنینەوە، شایەتا بیر بکەنەوە.»

مەلا دەیەوێ تێمان بگەیەنێ، کە هەیبەتی جیا بونەوە لە یاریش لەوانەیە ئەگەر بکەوێتە دڵی کێوەوە، لەبەر یەکی هەڵ دەتەکێنێ. دەفەرموێ:

تیری جودایی لەیار وەك هەورە تریشقەیە؛ ئەمما هەورە تریشقەیەکی زۆر لە زەبرو حەستەم. ئەگەر کتوپڕ لە هەردڵێك بدات، من دەڵێم ئەگەر ئەو دڵە دڵ نەبێو کێوبێ، هەر دەست بەجێ لەتو پەت دەبێو لەبەریەك دەچێ.

**٣ هەچی فیرقەت نەدی هجران نەبێ من داغو کەی لێنە**
**ژبل دەربێ دهجرانێ فیراقا روحو جان کێ‌دا**

**مانای وشەکان:**

**هەچی:** هەرچی، هەرکێ؛ **فیرقەت:** جیایی؛ **نەدی:** نەدیت؛ **هجران:** دور کەوتنەوە، ئاوارەیی؛ **نەبێ:** نەڵێ، نەبێژێ؛ **داغ:** داخ؛ **کەی:** داغ؛ **ژ:** لە؛ **بل:** بێجگە، غەیر؛ **دەرب:** زەربەت وێکەوتن؛ **روح:** گیان؛ **جان:** گیان.

**مانا بەتێکڕایی:**

کەسانێکی کە هیچ لە دەردی دڵو ئەویندار نازانن‌و بە دەردی دور کەتنەوە لەیار دوچار نەبون، نابێ بڵێن ئێمە داخ کراوی خەمانین‌و دەردو ئازارمان دیتوە. بێجگە لە دەردی دور کەتنەوە لەیار، هیچ ژانێك نیە کە روحو گیان لێك جیا کاتەوە. لێرەدا پێویستی بە درێژەدانێك هەیە.

بە اصطلاحی صۆفیان‌و ئەوانەی لە ناسینی خوادا وردەکارن، فەرقێك لەنێوان روحو نفس‌دا هەیە، کە لە فارسی‌دا بە «جان»و «روان» تەعبیر کراون. روح سەرچاوەو ماکی ژیانە. نوێنەری ئافەریدگاری توانایەو هیچ گۆڕان‌و نەمانی بەسەردا نایە. گیان، یان نەفس، نوێنەرێکی خزمەتکارەو لەلایەن روحەوە پێی سپێراوە، کە کارگای لەشی زیندو بەرێوە بەرێت. ئەویش هەتا سەرێکەو هەرگا روح ارادە بکا، دەس لەکار هەڵدەگرێو ژیان دەپوچێتەوە. جا صۆفیەکان‌و لەپێش ئەوانیشدا، پەیرەوانی مانی، زۆرجار دەردی دڵیان لەوە کردوە کە لەروحی ماكو بنچینە، کە ئەویش پاژێکە لە ذاتی خودا جیا بونەوە. هەمیشە پاڕاونەوە کە زۆر زو ئەو لەشە قوڕینەیان، کەبۆتە قەفەسی گیانیان، لەبەین بچێو بچنەوە مەوتەنی هەرە پێشوی گیانی گەورە. ئەوانە هەتا لەسەر دنیا بون، خۆیان بە غەریب‌و ئاوارە زانیوەو دەردی دڵیان لە هجران‌و دوری کردوە. لە

شێعری صوٚفیانەی عارفان‌دا، زوٚر لەم نمونەیەمان دێتە بەرچـاو. هەر وەك لە سـەرەتای «مثنوی مولوی»دا کە لە زمان بلوێرەوە پێمان دەڵێ:

زێدی من قامیشەڵان‌و گویٚ چەمە    دابڕاوم بوٚیە ناڵەو زاڵەمە

**٤ ژهەر بیٚ داغو بیٚ دەردیٚ  مەپرسن میحنەتا عیشقیٚ**
**چزانن بیٚ خەبەر ژانا دلیٚ  داغو کەسەر تیٚ‌دا**

**مانای وشە:**

**ژهەر**: لەهەر؛ **داغ**: داخ؛ **دەرد**: ئازار؛ **میحنەت**: پەژارە؛ **عشق**: ئەوین؛ **چزانن**: چـەزانن؛ **بیٚخـەبەر**: ئاگالە هیچ‌نا؛ **ژان**: ئێش؛ **کەسەر**: غەم‌و حەسرەت.

**مانا بەتێکڕایی:**

وەك لە کوردی‌دا مەسـەلەو دەڵێن «تێر ئـاگای لە برسـی نیە»؛ مەلاش دەفـەرمویٚ نابیٚ لە کەسێکی کە هەرگیز عاشق نەبوەو تیری ئەوین نەی پێکاوەو بەداغی دڵ‌داریەوە هەڵ نەچـزاوە، بپرسن: ئەریٚ بوٚمان باس‌کە داخـوا دەردی دڵداری چـوٚنە. کەسـێك دەزانیٚ دەردی ئێمە چیە، کە بوٚخوٚی عاشق بوبیٚ‌و بەدەردی ئەوینەوە تلابێتەوە. بە دەردی **بابەتایر** گوتەنی:

وەرن سوتەدڵان گەردین هەم ئایوم    کە دەردی سوتەدڵ دڵ‌سوتە زوٚنوٚ

**٥ کەسیٚ میحنەت دی‌و فیرقەت قەخواری جورعەیا هیجریٚ**
**گری وان تیٚ بـحالی من دقیٚ هیجران‌و زەجری‌دا**

**مانای وشە:**

**کەسیٚ**: کەسێك؛ **میحنەت**: پەژارە؛ **دی**: دیت؛ **فیرقەت**: جیایی؛ **قەخواری**: خواردیەوە؛ **جورعە**: قـوم، فڕ؛ **هیجر**: دوری؛ **گری**: گریان؛ **وان**: ئەوان؛ **تیٚ**: دێت؛ **دقیٚ**: دەئەو؛ **هجران**: ئاوارەیی؛ **زەجر**: ئازارو کولٚ.

**مانا بەتێکڕایی:**

ئەمن ئێستا هەزار هاوار بکـەم، ئـەوانەی بەدەردی ئـەوین‌و دوری یارەوە نەچـزاون، نازانن من چیمە. بەڵام ئـەو کەسـانەی کە عاشـق بونو لەیار دور کەتونەوەو ژاراوی دوری دیداری یاریان بە گەرودا چوە ئەگەر چاویان بە من بکـەویٚ، کەوا لە دیداری یار بیٚبەش‌و ئـاوارە بوم؛ گریانیان بوٚ حاڵی من دێت‌و دەزانن چیم بەسەر هاتوە.

**٦ بداما موحبەتێ بەندم خەدەنگا فیرقەتێ دل نوهت**
**بشوبهی مورغی نیم بەسمەل دهەڤ وەرتێم دِخونێدا**

**مانای وشەکان:**

**دام:** داو؛ **موحبەت:** خۆشەویستی، دڵداری؛ **بەند:** ئـەسـیر؛ **خـەدەنگ:** تیر؛ **نوهت:** پێکـای؛ **شوبهی:**وەکو؛ **مورغ:** مەل؛ **نیم بەسمەل:** نیوە بسم‌اللّه، تازە سەر بڕاو (لە فارسی‌دا بەحاڵی حەیوانێکـی کە تازە سەری دەبڕن‌و هێشتاگیانی دەرنەچوەو پەلەقـاژەو باڵەفـڕەی گیان دانیەتی، دەڵێن: نیم بەسـمەل، چونکە، سەربڕ لەوەختی سەربڕین‌دا دەڵێ: بسم‌اللّه. جا یانێ سـەری بڕیوە بەڵام هێشـتا تەواو لە سـەربڕین نەبوتەوەو بسم‌اللّەکەی تەواو نەگوتوە.) **دهەڤ:** تێکەوە؛ **وەرتێم:** دەگلێم؛ **دخونێدا:** دەخوێنێدا.

**مانا بەتێکڕایی:**

گراوی داوی دڵداریم. تیری جیا بونەوەم لەیار، دڵی پێکـاوم. وەك باڵندەی تازە سـەربڕاو، پەلەقاژەمەو دەخوێنی خۆمدا دەگەوزم.

**٧ بروسکا باطنی دادل دهێتی سینەوی وەربو**
**کودێ بێتن تەبیتا دل دناڤ وێ نارو پێتێ دا**

**مانای وشە:**

**بروسك:** بروسکـە؛ **باطنی:** نادیاری؛ **پێت:** گڕوبڵێسـە؛ **سـینە:** سـینگ؛ **وی‌وەربو:** لێ‌هاڵا؛ **کو:** کوا، لەکوێ؛ **دی:** دەبێ؛ **بێتن:** ببێت؛ **تەبیت:** ئۆقرەو ئارام؛ **نار:** ئاگر.

**مانا بەتێکڕایی:**

بروسکـەیەکی نادیاری لە دڵمی‌دا، دەگەڵ بڵێسـەی ئـاگری سـینەم لێك هاڵان‌و گڕی ناو هەناوم ئەوەندی بو، ئەوە ندەی تریشی هاتە سەر. جا ئێستا دڵ چـۆن لەناو ئـەو هەمو بڵێسـەو ئـاگرەدا ئۆقرەو ئارامی بۆ دەمێنێ؟

**٨ ژئولفێ شوبهەتی زولفێ مەدام لەو بێ قەرارم ئەز**
**کوجانێ من عەزیز ئیروٚ چوو دل وێ دئولفێدا**

**مانای وشە:**

**ئولف:** هۆگری‌و مەیل؛ **شوبهەت:** وەکو؛ **زولف:** کەزی؛ **مەدام:** هەمیشـەو دایم؛ **لەو:** بۆیە؛ **بێ‌قەرار:** بێ‌ئۆقرەو ئارام؛ **ئەز:** من؛ **کو:** کە؛ **جان:** گیان؛ **عەزیز:** بەڕێزو هێژا، **ئیروٚ:** ئەمڕۆ؛ **چو:** ڕۆیشت.

**مانا بەتێکرایی:**

لەتاوو توێی دڵداریەکی کە هەمەو هەمیشەو دایم وەك کەزیەکانی یارم لە لەرازان و هاتو چوّدام و هیچ ئۆقرەو ئارامم نیە. بۆیەیە کە یارە بەنرخەکەم ئەمڕۆ رۆیشت و دڵیشم کە هوگری خوّی بوەو هەرگیز لێی دور ناکەوێتەوە، دەگەڵی رۆیشتوە.

٩ ژمەحبوب دورکرم چەرخێ فەلەك وی پڕ هەلاڤیتم
نزانم دێ لکو دەت من دەڤێ دەوران و چەرخێ دا

**مانای وشە:**

**مەحبوب:** خۆشەویست؛ **کرم:** کردم؛ **چەرخ:** گەردونە؛ **فەلەك:** زەمانە، عاسمان؛ **پڕ:** زۆر؛ **هەلاڤیتم:** هەڵی‌هاوێشتم؛ **نزانم:** نازانم؛ **دێ:** دەبێ؛ **لکودەت:** لەکوێ بدات؛ **دڤێ:** دەو؛ **دەوران:** سوڕ؛ **چەرخ:** خول.

**مانای بەتێکڕایی:**

گەردونەی گەردون، دژی من سوڕاو زۆری هەڵتەکاندم و هەڵی هاویشتم و لەیاری خۆمی جوێ کردمەوە. هێشتا نازانم دەبێ لەو چەرخ و خولەدا بەکوێمدا بدات و بەکام پەلمەوە بکاو چ پەندێکم بەسەر بێنێ؟.

١٠ حەبیبی بێ خەتا کوشتم بدەربا فیرقەتی ئاخر
ژوێ رۆژێ دزانی من کویار ئەو تیر لجەرگێدا

**مانای وشە:**

**حەبیب:** خۆشەویست؛ **بێخەتا:** بێ‌سوچ و تاوان؛ **کوشتم:** کوشتمی؛ **دەرب:** زەبر؛ **فیرقەت:** جیایی؛ **ژوێ:** لەوێ؛ **دزانی‌من:** من‌دەمزانی؛ **کویار:** کەیار؛ **ئەوتیر:** تیرەکەی؛ **جەرگ:** جگەر.

**مانای بەتێکڕایی:**

بەبێ‌ئەوە هیچ سوچ و گوناهێکم لێ روبدات، یاری خۆشەویستم، دوری خستمەوەو بەزەبری دەردی دوری منی کوشت. من هەر لەرۆژی هەوەڵێوە کەیار بەتیری دڵداری پێکامی، دەمزانی ئەم دەردەم بەسەر دێت و لە دواروژدا گەرەکە، نرخی ئەو شادی و خۆشیە بژمێرم و لەدوری دیداری یاردا بە عەزرەت و ئاواتەوە، گیانی ئامانەتی بسپێرم.

مەلا لەم چەند بەیتانەدا، ئیشارە بەو بڕوایە ئەکا کە دەڵێن: لەرۆژی بناوان‌دا (رۆژی ئەزەل)، خودای مەزن، روحی هەمو ئافەریدەکانی ساز داوەو بە دیداری خوّی شاد کردون. بەڵام بۆ

مەبەستێکی تایبەتی ـ کە ئیرادەی خوێەتی ـ هەریەك لەو گیانانەی ناردوّتە ناو قالبێکی قورّین‌و گڵینەوەو خستونیەتە سەر دنیاو بە رواڵەت تەنیا ماونەوەو روٚژێك دێت، کە دوبارە دەچنەوە شوێنی پێشویان‌و گەرەکە حیساب‌و کتابی روٚژگاری ژیانی سەرزەوی، بدەنەوە. جا هەرگیانێك لەو گیانانە، کە لەماوەی ئەم ژیانە دنیاییەدا، نەکەوتوّتە ناو تاریکایی دنیا پەرستی‌و بەرچاوی روٚنەو بیر لە رابردوی هەرە پێشوی خوّی دەکاتەوە، هەمیشە بە عەزرەت‌و ئاواتی ئەو روٚژەیەکە بگاتەوە بارەگای خوا. هەر بەو مانایە خواجە حافظی شیرازی دەڵێ:

«کاتێ کە لە مەیخانەدا، سەرخوٚش‌و کەلەلا کەوتبوم؛ دەنگێکی نادیاری لە غەیبەوە مژدەی پێدام کە: هوّی شابازی بەرزە نواری باڵا نشین! ئەم قوژبنە مەینەت ئاوایە، جێگەی توّ نیە. توّ نازانی کەوا لەسەر برجەکانی تەختی خوداوە، فیتوت بوٚڵێ دەدەن کە بە فیتی خوّت بزانی‌و بچیەوە. من نازانم توّ چیتە والەناو ئەو جێگەداوانەدا، ماتەت هەڵگرتوە.»

١١ گەلوّ دیسا ببینم ئەز چرایی وەصلەتێ هل‌بت
بصوژم شوبهی پەروانێ دبەر وێ نورو شەوقێ‌دا

**مانای وشە:**

گەلوّ: خەڵکینە، ئاخوّ؛ دیسا: جارێکی‌تر؛ ئەز: من؛ وەصلەت: پێك‌گەیشتن؛ هل‌بت: هەڵ‌بێ؛ بصوژم: بسوتێم؛ شوبهی: وەکو؛ پەروانە: پەپولە؛ نور: روناکی؛ شەوق: تیشك.

**مانا بە تێکرایی:**

توّبڵێی جارێکی تریش، ئەوهەلەم بوّ برەخسێ؛ بەدیداری یار شادو شوکور ببمەوەو چرای پێك‌گەیشتن، دوبارە هەڵ بێتەوە؟ ئەوسا وەك پەپولە، بەدەوری گڕی چرادا بێم‌و باڵ‌و پەرم هەڵپروزێ‌و بسوتێم‌و ببمە شەهیدی رێگای دڵداری؟

١٢ بدەربێ کەو کەبا صوبحێ ل مەشرق زوهرە طالع بت
زوحەل دوربت بشەش برجان‌و وندابت دغەربێدا

**مانای وشە:**

بدەربێ: وەدەر کەوێ؛ کەوکەب: ئەستێرە؛ صوبح: بەربەیان؛ مەشریق: خوّر هەڵات؛ زوهرە: ئەستێرەیەکی زوّر گەشە؛ طالع: هەڵاتو؛ برج: مەنزڵی ئەستێرە؛ زوحەل: ئەستێرەیەکی گەروکەو دەڵێن شوم‌و نەحسە؛ وندا: گوم؛ بت: بێت؛ غەرب: خوّرنشین.

«مانای ئەم بەیتەو بەیتی دواییں پێکەوەن»

**١٣ ژقوندوس زوهره پەیدابت زهەندس موشتەری بێت دەر**
**سپێدەی دەت ثورەییایێ شەفەق دەت قامەتی پیٚدا**

### مانای وشه:

**قوندوس:** تاریکایی توندو خەستی شەو؛ **هەندس:** شەوی زۆر تاریك؛ **زوهرەو موشتەری:** دو ئەستێرەی گەڕۆکن؛ **سپێدە:** سپیایی بەرەبەیان؛ **ثورەییا:** هێشوە ئەستێرەی کۆ؛ **شەفەق:** شەبەق، روناکایی ئاسۆ؛ **قامەت:** بەژن‌وباڵا.

### مانای ئەو دو بەیتە بە تێکڕایی:

شاعیر خۆی لەناو تاریکە شەوی ناهومێدیدا دەبینێتو تەنها تروسکە هومێدێکی لەسوچی دەرونی‌دا ماوە کە دنەی ئەدا ئاوات بخوازێ بە وەختێکی کە دوبارە بە دیداری یاری شادو شوکور ببێتەوە. دەڵێ: تۆبڵێی ئەو دەمە ببینمەوە کە لەو تاریکاییە خەستو خوڵەدا، لەپڕ ئەستێرەی زوهرە لەلایەکەوە بدرەوشێتەوە، ئەستێرەی موشتەری، گرشەوورشەی بێت، ئەستێرەی زوحەل- کە مایەی نەحسی‌و شومی‌یە - لەئاسۆ ئاوا بیٚو بەد بەختیم ببڕێتەوە. ئەستێرەی بەرەبەیان، شەوق‌و شەبەقان بخاتە عاسمانەوەو سپیایی بەرەبەیان هێشوی ئەستێرەی پێرو مشت‌وماڵ بکاو لەشەوێکی وا خۆش‌دا، بەژن‌و باڵای خۆشەویستم، خۆنیشان بداتو من لەو تاریکایی دوری‌و ئاوارەییە رزگار بکات؟

**١٤ ژشەوقی ئەبروان بنمێت هلال دیسا دقەوسەینان**
**ژخاوەر بێتە خورشیدی ظەلام وەربت دنوریٚدا**

### مانای وشه:

**شەوق:** مەیل؛ **ئەبرو:** برۆ؛ **بنمیت:** بنوێنێ؛ **هلال:** مانگی‌یەکشەوە؛ **قەوس:** کەوان؛ **قەوسەین:** دوکەوان؛ **خاوەر:** خۆر هەڵات؛ **خورشید:** خۆر؛ **ظەلام:** تاریکایی؛ **وەربت:** لەبەین بچیٚ؛ **نور:** رۆشنایی.

### مانا بە تێکڕایی:

بۆ ئارەزوی دیداری یار، بەشەرتێك ئەو خۆی دەرخا هەمو شتێك دەکەونە هەڵپە بۆ دیتنی. هەرچەندە من دەڵێم بەیان بەربێ، بەڵام هیچ دورنیە کە مانگی یەکشەوە لە دولاوە بۆ لاسایی برۆکانی کەوانە بداو بێتە بەر چاو. خۆر زۆر زو لە رۆژهەڵاتەوە بۆ سەیرانی بەژن‌و باڵای ئەو سەر لە ئاسۆگ بەرز کاتەوە. ئەوسا تاریکایی شەوو تاریکایی بەختی من، بە یەکجاری لەبەین دەچن‌و لە ئارادا نامێنن.

**١٥** ب وەردان زەیینین گولشەن چەمەن‌دا لالە بشکفتن
بنەفش‌و چیچەکان ڤیکرا شەفەق‌دا یەك دەرەوضێدا

**مانای وشە:**

**وەرد:** گوڵی‌گوڵاو؛ **زەیینی:** رازایەوە؛ **گولشەن:** گوڵجار، گوڵستان؛ **چەمەن:** مێرگ‌و مێرخوزار؛ **لالە:** گوڵەمێلاقە؛ **بشکفتن:** پشکوتن؛ **بنەفش:** وەنەوشە؛ **چیچەك:** گوڵی‌دەشت لە هەمو جۆرێکی؛ **ڤیکرا:** هەمو پێکەوە؛ **شەفەق:** شەوق‌و روناکی؛ **دایەك:** دایان بە یەکتر؛ **رەوضە:** باغچەی گوڵان.

**مانا بەتێکرایی:**

وادیارە عاشقی ئاوارە، لەپاش ئاوات خوازتن‌و بە خەیاڵ، خۆش کردنی دنیا بۆ دیداری یاری ـ کە هێشتا هەر ئاواتەو بۆی بەدی نەهاتوە ـ دیسانەوە دەکەوێتە گلەیی کردن لە بەختی رەشی خۆی‌و دەیەوێ دڵی یار بۆدیدارێك، نەرم بکا. ئەمجارە باسی فەصڵی بۆ دەکا، کەوا بەهارەو دنیا رازاوەتەوەو تەنیا ئەوی کەمە کەمایەی دڵخوشی بۆ دروست بێ. دەفەرموێ:

ئەوا لەم کژی بەهارەدا، کە هەرەمەی گوڵانە، گوڵی‌گوڵاو بونەتە خشڵی دەشتو دەرو گوڵزاریان رازاندوتەوە. گوڵەمێلاقە، مێرگ‌و مێرخوزاریان داپۆشیوە. هەمو جۆرە گوڵێك، کە وەنەوشەش یەکێکە لەوان، لە باخچوڵان‌دا پشکوتون‌و بەرانبەر بەیەك چەقیون‌و روناکایی دەدەن بەیەکتر.

**١٦** سەحەرگەه عەندەلیب مەستن ژبهنا وەردو بشکوژان
شوبە توتاگ‌و گۆیینان دەنالین ئەم دفرقێدا

**مانای وشە:**

**سەحەرگەه** : بەرەبەیان؛ **عەندەلیب:** بولبول؛ **مەست:** سەرخۆش؛ **بهن:** بۆن؛ **وەرد:** گوڵی‌پشکوتو؛ **بشکوژ:** خونچەگوڵ؛ **شوبە** : وەکی؛ **توتاك:** مەلێکە شەو هەتا رۆژ ناخەوی‌و هەردەڵێ «توت، توت»؛ **گۆین:** مەلێکە شەو هەتا رۆژ ناسرەوی‌و ناڵەی دی‌و جارجار حیلەیەك دەکا کەوەك دەنگی گریان دەچی؛ **دنالین:** دەناڵێنین؛ **ئەم:** ئێمە؛ **دفرقێدا:** لە جودایی‌دا.

**مانا بە تێکرایی:**

لەم بەهارە خۆشەدا، کەدەشت‌و دەر بەگوڵ‌و خونچە رازاوەتەوەو بولبولان ـ کە ئەویندار گوڵانن ـ هەمو بەیانیان، لەبەر بۆن‌و بەرامەی گوڵان مەست‌و سەرخۆش دەچریکێنن؛ چە خوا بەر دارە منی چارەرەش‌و کڵۆل، وەکو توتاك‌و گۆین، شەو هەتا رۆژ بگریم‌و بناڵێنم‌و لە دیداری یار بێبەش بمێنم.

**١٧ ل کەلبیٚ ئاستانیٚ خوٚ نەپرسی قەط حەبیب جارەك**
**گەلوٚ نائینە بیری ئەم دقیٚ نیچیرو راویٚدا**

**مانای وشە:**

**کەلب:** سەگ؛ **ئاستانە:** دەرگانە؛ **قەط:** هەرگیز؛ **حەبیب:** خوٚشەویست؛ **گەلوٚ:** خزمینە، ئاخوٚ؛ **ئەم:** ئێمە؛ **دقیٚ:** دەو؛ **نیچیر:** راو؛ **ڕاو:** شکار،

**مانا بەتێکڕایی:**

وەخت کە بەهار بیٚو هەرەمەی گوڵان بیٚ؛ دیارە میرو شازادە دەبیٚ بچنە راوشکاریٚ. باشە! شازدەکەی مەلاش دیارە لەو وەختە خوٚشەدا، چوٚتە راو. ئەدی چوٚنەکە جارێك لەجاران، هەرگیز بوٚ ئەو راوشکارانە، سەگی ئاستانەی خوٚی وەبیر نەهاتوٚتەوە، کە رەگەڵ خوٚی بخاو بەدیداری خوٚی دڵشادی بکات؟

**١٨ دزانم شەهسەواریٚ من غەزالەکوی دفتراکیٚ**
**بە جایی صەیدی ئەز بوما دویٚ فتراکو بەندێدا**

**مانای وشە؛**

**شەهسەوار:** سەر توٚپی سواران؛ **غەزال:** کەژاڵ، ئاسك؛ **وی:** وا؛ **فتراك:** بەن ساموٚرتە؛ **صەید:** نیچیر؛ **ئەز:** من؛ **بوما:** ببوایەم؛ **دویٚ:** لەناو ئەو؛ **بەند:** بەن.

**مانا بە تێکڕایی:**

شاعیر کە جارێك خوٚی بەسەگی ئاسانەی یار دادەنیٚو گلەیی لە بەختی خوٚی دەکا کە یارەکەی وەبیری نەهاتوٚتەوە، کە بیباتە راوشکاریٚ؛ جارێکیتر بیری دەڕواتە ئەو دەشتو دەرە، کە سوکەڵە سوارەکەی خوٚشەویستی ڕاوی لیٚ دەکاو ئەوسا بەبیریدا دیٚ کە بوٚ جوانێکیوا، بیٚگومان ئاسکی دەشت زوٚر منەتبارن کە ببنە نێچیری. کەوابو، ئێستا هیچنەبیٚ ئاسکێك ئەو خوٚشیەی دیوەو بوٚتە نێچیری یارو بەبەن ساموٚرتەی زینەکەیەوە، تەکەتەکی دێت، دەڵیٚ: سور دەزانم، سوکەڵە سوارە خوٚشەویستەکەم، ئێستا کەژاڵێکی بەبەن ساموٚرتەوە گیرداوە. ئەی صەد خوٚزیا من بومایە لە جێگەی ئەو ئاسکەو بەو بەن ساموٚرتەوە هەڵاوەسرابام.

**١٩ چ حەددی صەد هەزار جانێن دفتراکا حەبیبیٚ من**
**کو صەد جەمشیدو کەیخوسرەو غولامن سەر دقیٚ ریٚدا**

**مانای وشه:**

**چەحەددی:** ڕێی ناکەوێ؛ **فتراك:** بەن ساموڕتە؛ **حەبیب:** خۆشەویست؛ **جەمشیدو کەیخوسرەو:** دو پادشای بەناوبانگی ایران بون؛ **غولام:** نوکەر؛ **دقێ:** دەئەو.

**پوختەی مانا:**

**مەلا لەپڕ، هۆشی دێتەوە بەرەخۆو دەبینێ کە لەو ئاواتە خوازیانەیدا زۆر لە بەڕەی خۆی پتر پێی ڕاکێشاوە. گورجێک پەشیمان دەبێتەوەو دەڵێ:**

**نەك من، بەڵکو صەد هەزار گیانیش پێکەوەبن، هەرگیز ڕێیان ناکەوێ ئەوەندە بەرزەفڕی بکەن‌و ئاوات بخوازن، کە لەبەن ساموڕتەی ئەو شاسوارەدا بەند بکرێن. بگرە صەتانی وەك جەمشیدو کەیخوسرەو لەو ڕێگەدا خولامەتی دەکەن، هەر ئەوەندە یار بە دیدارێك بیان لاوێنێتەوە.**

**٢٠ دده هسالان ملازم مامو یاریٚ رونەدا جارێك**
**وەگەرنە یار ئەگەر رودەت هەیە جارەك دسالێدا**

**مانای وشە:**

**ملازم:** هەمیشە ئامادەی خزمەت؛ **مام:** مامەوە؛ **وەگەرنە:** ئەگینا؛ **رودەت:** روبدا؛ **هەیە:** ممکنە.

**مانا بە تێکڕایی:**

**مەلا لێرەدا دەکەوێتەوە گلەو گازندە لە بەختی ڕەشی خۆی‌و دەڵێ:**

**گریمان ڕێم ناکەوێ بمباتە ڕاوێ؛ گریمان ڕێم ناکەوێ بڵێم دەبەن ساموڕتەکەیدا بم. بەڵام من کە ماوەی دەساڵی ڕەبەق لەبەر دەرگاکەی کەوتومو هەرگیز روم لێ وەرنەگێڕاوە، نەدەبوایە جارێك لەجاران رومبداتێ‌و بملاوێنێتەوە؟ خۆ ئەگەر بڵێم ئەو لەبەر کاری زۆری نەی پەرژاوە، ڕاست ناکەم؛ چونکە ئەو خۆ لێ بواردنەی منەی ئەگەر بە ئانقەست نەبا، دەیتوانی هیچنەبێ ساڵێ جارێك ئەحواڵێکم بپرسی‌و بە روپێدانێك، بەسەرم بکاتەوە.**

**٢١ دلۆ مزگینە من شابە کو سولتانێ مەدێ بیتن**
**ژمن باوەرکە پەیغامێ سەحەر مزگین بەمن پێدا**

**مانای وشە:**

**دلۆ:** ئەی دڵ؛ **مزگینە:** مژدەیە؛**شابە:** شادبە؛ **کو:** کەوا؛ **سولتان:** خونکار؛ **دێبیتن:** لێبڕاوەبێ؛ **ژمن:** لەمن؛ **باوەر:** بڕوا؛ **پەیغام:** وەڵام؛ **سەحەر:** بەرەبەیان؛ **بەمن پێدا:** بەمنیدا.

**مانا بەتێکڕایی:**

باوەڕی صوفیان وایە، کە پیاو هەتا خۆی بەهیچ بزانێ؛ خوا ئاوڕی لێ ناداتەوە. وەختێك کە خۆی لەبیر بچێتەوە، ئەوسایە کە بەزەیی خوا بەسەری دەکاتەوە.

مەلا تا ئارەزو دەکا کەیار دیداری لێبکاو لەگەڵ خۆیا بەرێ بۆ راوو پێو چی... مانای ئەوەیە خۆی بەشتێك دەزانێو هەتا خۆشی بەشتێك بزانێ، لەلای خوا بەهیچ حیساب ناکرێ. بەڵام کە دەبینێ لەماوەی دەساڵدا، هیچ لێی نەپرسراوە؛ ئەوسا بۆی دەر دەکەوێ کە ئەم خۆ بینییە بوتە لەمپەر لەنێوان دڵدارو یاردا. لەو خۆ بە شت زانینە پەشیمان دەبێتەوەو سەری کزی، لەسەر ئەژنۆی هەژارانەی ئەنێتەوەو جگە لەیار هەمو شتێکی، تەنانەتخۆشی، لەبیر دەچێتەوەو بە سەرکزیەوە دەپارێتەوە. یار بەزەی پێدا دێتەوەو بەخۆیێنیشاندانێك دەی لاوێنێتەوە. مەلا مژدەی ئەو دیدارە بەدڵەمەینەت بارەکەی ئەداو ئەڵێ:

ئەی دڵ مژدەت پێدەدەم، شادبە. ئەوا خونکاری نازدارم بڕیاری داوە بێتە دیدارم. باوەڕم پێبکە راست دەکەم؛ چونکە لەبەرەبەیاندا؛ پەیام نێری صەبای صالحان ئەو مزگێنیەی بەمن داوەو تەواو جێگەی بڕوایەو هیچ گومانو دودڵی تێدانیە.

**٢٢ شوکور بیناهی یامن هاتو یەعقوب دیدە رەوشەنبو**
**ببویا یوسفی میصری ل کەنعانێ بەصەر پەیدا**

**مانای وشە:**

**شوکور:** سوپاس؛ **بیناهی:** روناکی چاو؛ **دیدە:** چاو؛ **بو:** بۆن؛ **کەنعان:** مەڵبەندێکە لەفەلەستین؛ **بەصەر:** هەم چاو هەم دیتن؛ لەم بەیتەدا مەلا، چیرۆکی یاقوبو یوسفمان بیر دەخاتەوە، کە یوسف لە یاقوب پێغەمبەری باوکی دور کراوەتەوە. باوك لە تاوی کوڕ، کوێربوە. لەپاش چەند ساڵان کە براکانی یوسف چونە میصر بۆ گەنمکرینو یوسف لەوێ کاربەدەستی دەوڵەتبو. گەنمی دانێو کراسەکەیخۆی بۆباوکی نارد. باوك بەبۆنی کراسی یوسف، چاوەکانی چاك بونەوە.

**مانا بەتێکڕایی:**

زۆر سوپاس یارم کە روناکایی چاوەکانمە هاتە دیدارمو چاوم بەدیداری رۆشن بۆوە. دیداری ئەویش هەروەك کراسەکەی یوسف، بەبۆن چاوی باوکی بینا کردەوە، منیش کە لەسوێی دیداری دنیا لەبەر چاوم تاریکببو بەدیتنی، تەمو تانەم لەسەر رەویو رون بومەوە.

**٢٣ نەسیمی سونبولو سێڤان سەحەردا حەبسو زیندانێ**
**ڤەبو قفلا مەبێ مفتە زرنگینی ژقفلێدا**

**ماناى وشە:**

**نەسیم:** شنەبا؛ **سونبول:** گوڵى سملّ؛ **سێڤ:** سێو؛ **سەحەر:** بەربەیان؛ **حەبس:** گرتوخانە؛ **ڤەبو:** كرایەوە؛ **مفتە:** كلیل؛ **زرنگینى:** زرنگانەوە.

**پوختەى مانا:**

**ئێمە كە لەدورى یار وەك ئەسیرى ناو حەبس‌و زیندانان وابوین؛ لە بەرەبەیاندا شنەبایەك كە بەسەر پرچەكانى وەك گوڵى سملّ بۆن‌خۆش، بەسەر كوڵمە سورەكانى سێوئاسایى‌دا هاتبو، ئێمەى گرتەوە. حەبس‌و زیندان لەلاى ئێمە نەما. دڵى قفلّ دراومان، بەبێ‌كلیل كرایەوەو بەڵكە لەخۆشى ئەو شنەبایە بۆن‌خۆشە زرینگە لەقفڵەوە هات. واتا، لەخۆشیان قفڵیش كردیە هاوار.**

**٢٤** **فیراقى شەو بئاخر چو سپێدە كەفش بو دیسا**
**مەریخا نەحس ئاڤابو خویابو رۆژ دشەرقێدا**

**ماناى وشە:**

**فیراق:** دورى؛ **سپێدە:** بەرەبەیان؛ **كەشف:** دیارى؛ **دیسا:** دیسان؛ **مەریخ:** ئەستیرەیەكە بەشوم ناوى دەركردوە؛ **نەحس:** شوم؛ **خویا:** ئاشكرا؛ **شەرق:** خۆرهەڵات.

**مانا بەتێكرایى:**

**شەوى دورى لە دیدارى‌یار، دوایى هات. بۆجارێكى‌تریش ئوخەى ئەوا بەیانى پێك‌گەیشتن پێ‌گەیشت. زۆر سوپاس، ئەستێرەى نەحسى بەختمان لەئارادا نەماو رۆژى طالعمان لەرۆژهەڵات، هەڵات‌و خۆى ئاشكرا كرد.**

**٢٥** **دچەرخێ وەك نجوم دیم‌دورّ سەما هاتن قیرّانا یەك**
**هەییڤا بەدربو ئەو سورّپەرى من‌دى درەقصێدا**

**ماناى‌وشە:**

**چەرخ:** عاسمان؛ **چەرخ:** زەمانە؛ **چەرخ:** سورّدان‌و خول خواردن؛ **نەجم:** ئەستێرە؛ **نجوم:** ئەستێرە گەل؛ **دیم:** روخسار؛ **دورّ:** مروارى درشت؛ **سەما:** عاسمان؛ **سەما:** هەڵپەركێ؛ **قیرّان:** بەرانبەرى‌و لێكنزیكى؛ **هەییڤ:** مانگى‌عاسمان؛ **بەدر:** مانگى چاردە؛ **سورّپەرى:** وەك پەرى لە دلكێشان‌دا؛ **رەقص:** هەڵپەركێ.

**مانا بەتێكرایى:**

**یارى خۆم دەگەرى هەڵپەركێ‌دا دیت كە سورّى دەدا. كۆزى هەڵپەركێكە، پرّى‌بو لەكیژى جوانى**

روخســـار وەك مرواری. دەهاتنە بەرانبەری یەكترو لێك نزیك دەبونەوە. كە روانیم یاری من كە وەك پەری دڵ رفێنە دەوكوڕی رەقصەدا هەر دەتگوت مانگـــی چـــاردەیە دەناو ئـــەســـتێراندا، لەعاسمانی جوانی‌دا چەرخ دەدا.

**٢٦ ژوادی ئەیمەنی دلبەر نزام ئەنگوشتەك ئیظهار كر**
**كو خۆش ئەنوارو بەرقن ئەو تەجەللابون دطورێدا**

**مانای وشە:**

**ژوادی:** لەشیوی؛ **ئەیمەن:** راستە؛ **ئەیمەنْ:** جێگـــەی‌هەرەپیرۆز؛ **نزام:** نازانم؛ **ئـــەنگـــوشت:** قـــامك؛ **ئیظهار:** دیار؛ **كو:** كەوا؛ **خۆش:** جوان؛ **ئەنوار:** رۆشنایی‌گەل؛ **بەرق:** بروسكە؛ **تەجەللا:** دیاردە؛ **طـور:** كێوێكە لە دەشتی سینا.

مەلا ئیشارە بە چیرۆكی موسا پیغەمبەر دەكا. كە وەختێك ژنەكەی زەیستان بوە، ویستویە بچـێ بزوتە ئاگرێكی بۆبێنی‌و ئاگری بۆبكاتەوە. گەیوەتە ناو شیوەڵەیەك لە كێوی طور. خوا بانگـی لێ‌كردوە، كە تۆ لە پیرۆزترین شیوی طوردای، كەوشـــان داكەنە. هەروەها موســـا بەخـــوای گوتوە: دەمەوێ بت‌بینم. خـــوا فەرمویە: نام‌بینی، من خۆم نیشـــانی كێوی طـــور دەدەم، ئـــەگەر خـــۆی لەبەر دیداری من راگرت، توش وادەكەم بم‌بینی. خوا خۆی نیشانی كێوی طـــور داوە، كێو ســـوتاوەو موســـا دڵی بوراوەتەوەو لەســـەررا بەربوتەوە.

**مانای بەتێكرایی:**

ئەو هەمو روناكاییە جوانانە، ئـــەو هەمو بروســكـــەدانە كە لەو بەرەبەیانە خـــۆشەدا بۆعاشـــقان بۆتەدیمەن دەبێ چبێ، چقەومابێ؟ نازانم، تۆبڵێی یاری دڵرفێن قامكێكی نیشانی كێوی طوردابێ، كەوا ئێمە وەك موسا دڵمان دەبورێتەوەو بەرودا دەكەوین؟!

**٢٧ قیرانا زوهرەیی من دی دبەر عەقدا ثورەییایێ**
**ژپەروینان دبێژم عەكسە هێژ كەفتی دجامێدا**

**مانای وشە:**

**قیران:** بەرانبەر هاتنی دو ئەستێرە؛ **زوهرە:** ئەســـتێرەیەكی‌گەشـــە؛ **دی:** دیت؛ **عەقـد:** گەردانە؛ **ثورەییا:** هێشوە ئەستێرەی كۆ؛ **پەروین:** ئەســـتێرەی ناو هێشـــوە ئـــەســـتێرەی كۆ؛ **دبێژم:** دەڵێم؛ **عەكس:** تیشك‌دانەوە؛ **هێژ:** هێشتا؛ **جام:** پیاڵەی بادە نۆشین.

**مانا بەتێكرایی:**

لەو هەڵپەركێ‌یەدا، كچەكانی ترم وەك لیزگەی گەردن‌بەندێك هاتنە بەرچـاو، كە لەجـوانیدا بەكۆ

ئەستێرە دەشبهێندران. بەرانبەر بەمانگی رووی یارم دەبون‌و تیشکیان لەو وەر دەگرت. من کەمەستی شەرابی ئەو جوانیەم، دەڕوانم پیاڵەکەم هەروا بریقەی ئەستێرانە لێیەوە دیارە. من دەڵێم تیشکدانەوەی رووی یارمە کە داویەتە ئەو ئەستێرانەو ئەوانیش تیشکیان داوەتە پیاڵەی بادەی منەوە.

**٢٨** **حبیبێ عەزمی موحبەت کر دجامان لەو شەڕاب ثانی**
**دلی من دی دو صەییادان ژبوریانا بەری وی‌ٚدا**

### مانای وشە:

**حبیب:** خۆشەویست؛ **عەزم:** لێبڕان، قەصد؛ **صوحبەت:** هاودەمی؛ **لەو:** بۆیە؛ **شەراب:** مەی؛ **ثانی:** هێنای. **دی:** دیت؛ **صەییاد:** نچیرەوان؛ **بوریان:** بریانی، گۆشتی‌برژاو؛ **بەری‌وێدا:** لێی‌ڕوانی.

### مانا بەتێکڕایی:

خۆشەویستەکەم، ویستی ببێتە هاودەم‌و هاونشینم. بۆ ئەوە بوکە شەرابی دەناو پیاڵان‌دا هێنا؛ یانێ چاوە مەستەکانی نیشاندام. دڵم دەس‌بەجێ هەستی‌کرد کە دو ڕاوکەر - واتا چاوەکانی - تێ‌یەوە دەڕوانن دەیانەوێ بۆ مەزەی مەستیەکەی خۆیان بیکەنە بریانی. «سالم» لەوبارەوە دەڵێ:
وەی‌وەی چ مەجلیسی‌بو دوێنێ! لە دیدەوو دڵ      دڵبەر شەرابی گێڕا؛ سالم، کەبابی هێنا

**٢٩** **ب تولێن ئاستانێ‌ڕا ڤەخوێندم میر ب دەرگاهێ**
**بڤێ چاڤێ حەبیب دیتم شوکور ئەڤ شەفقە مەولێ‌دا**

### مانای وشە:

**تول:** تولە، سەگی پچوك؛ **ئاستان:** بارەگا؛ **ڤەخوێندم:** خوێندمیەوە؛ **بڤی:** بەو؛**دیتم:** دیتمی؛ **شەفقە:** رحم‌و بەزەیی؛ **مەولێ:** مەولا، سەروەر.

### مانا بەتێکڕایی:

خودایە ئەی سەروەری سەروەران، زۆر سوپاس بۆتۆ، کە بەزەییت بەمن‌دا هات‌و کاریکت کرد، دڵبەرم من بە تولەی دەرگانەی خۆی حیساب بکاو بم‌خوێنێتەوە، منی‌هەژار لەدەرگای میرێکی‌و! دەسەڵات‌دار، ڕێگا بدرێم‌و یارم بەوچاوی خۆشەویستیەوە لێم‌بڕوانێ.

**٣٠** **ژشکلێ ئەبروێن ساقی هلاتن صەد هیلال ایرۆ**
**وە بەدرەك من مقابل دی ئیشارەت من ژعەکسێ‌دا.**

**مانای وشە:**

**ساقی:** مەیگێڕ؛ **هلاتن:** هەڵاتن؛ **هیلال:** مانگی یەکشەوە؛ **ئیروّ:** ئـەمڕوّ؛ **وە:** وەها، ئـاوا؛ **بەدر:** مانگـی شەوی چاردە؛ **مقابل:** بەرانبەر؛ **دی:** دیت؛ **ئیشارەت:** ئیشارە؛ **عەکس:** تیشکدانەوە.

**مانا بەتێکڕایی:**

ئەمڕۆ کە یار روخساری نیشان‌دا، صەد مانگی یەکشەوە بوّ لاساکردنەوەی بروّکانی ئـەو مەیگێڕە چاومەستە، لە ئاسوّگ سەریان دەرێنا. هەروەها، مانگی چـاردەشـم دیت، کە بەرانبەر بە روومەت‌و هەنیەی وێستابو. من ئیشارەتی روخساری یارم لە تیشك بەخشینی بەمانگی چـاردە پی‌گەیشـت‌و زانیم دەرکەوتوە تا بی‌بینم.

**٣١** بـزەهریّ خوّی شەریف خوّندم کو خدمەتکاری دێرینی
تەپڕ جەورو جەفا دینە سلوکو سەعیو جەهدێدا
لەهێندێك نوسخەدا (بە زاری خوّی شیرین) هاتوە.

**مانای وشە:**

**زەهر:** زار،دەم؛**شەریف:** ممبارەك؛ **خوّندم:** بانگـی لیّ‌کردم؛ **کو:** کە؛ **پڕ:** زوّر، زیاد؛ **جـەوروجـەفـا:** دەردوئازار؛ **سلوك:** ریّ‌ڕوّیشتن.

سلوك لە زاراوەی صوفیاندا، پلەپلە بەرەژور چـونە بەرمو خـودا؛ تا دەگەنە مزلّگـەی توانەوە لەخـوادا کە فــەنا فــی‌اللای پی‌دەڵێن. ئــەم پلانەش بریەتین‌لە: **توّبە، کوّشش، تەنهــایی، دورەپەرێزی، لەخواترسان، دنیافرّی‌دان، بێدەنگی، تکاو هی‌تریش**... **سەعی:** روێشتنی بەپەلە؛ **سـەعی:** کوّشش؛ **جەهد:** تەقەلاو هەولّ.

**پوّختەی مانا:**

یارم‌بەدەمی‌پیروّزو شیرین‌زمانی‌خوّی، منی‌دواندو فەرموی کەتوّ خـدمەتکـاری لەمێژینەی منی. توّ لەرێگەی خزمەتی منداو بوّ گەیشتن بەمن، زوّر ماندو بوی‌و زوّرت کوّشش‌و تەقەلا کردوە.

**٣٢** بچین وەردان ژگولزاران کو ئەغیاران بـدەست خارن
ژمەخصوصانی دەرگاهی دو عامن ئەو دهجریّ‌دا

**مانای وشە:**

**بچین:** بچنە؛ **وەرد:** گول؛ **گولزار:** گوڵجار؛ **ئەغیار:** بێگـانە، غەوارە؛ **خـار:** درّو، چقـل؛ **مەخصــوص:** تایەبەتی؛ **دەرگاە**. : دەرگا؛ **عام:** سالّ؛ **هجر:** دوری‌دیدار

**مانا بەتێکڕایی:**

تۆ ئەوا دوساڵە، دەردی دوری دەکێشی‌و هەر بەتەمای دیدار بوی‌و خـوت ڕاگرتوە. چـاکت‌کردوە، لەوە بەولاوە دەت‌کەم بە خوڵامی تایبەتی بەر دەرکی بارەگای خۆم. ئەوەندەش بزانە کە ئـەوانەی غەوارەن‌و لەئێمە بێگـانەن، لەدنیادا، جگــە لە دڕکو داڵ، چیان وەدەســت نەکەوتوە. ئــەوا تۆ گەیشتیە ناو باغ‌و باغچەی ئاوات. دەسا دەس‌کە بە گوڵ‌چنین لە گوڵجاڕی ئارەزودا.

**٣٣** بتەشریفا خو ئەز خوندم ژلوطفێ بەندە نیشان‌کر
خەلات‌و شەفقەوو دلدان شوکور خوازین کو باخوێدا

**مانای وشە:**

**تەشریف:** گەورەکردن؛ **تەشریف:** گەورەیی؛ **خو:** خـۆی؛ **خـوندم:** خـوێندمیەوە، لاواندمیەوە؛ **لوطف:** التفات‌و نەرمی؛ **بەندە:** کۆیلە؛ **خەلات:** بەخشش؛ **شـەفقـە:** محیبەت‌و خـۆشەویسـتی؛ **دلدان:** دڵدانەوە؛ **باخوێ:** خودا.

**مانا بەتێکڕایی:**

بەگەورەیی خۆی، گەورەی کردم. بە نەرمیو التفاتەوە، منی کۆیلەی خۆی نیشانە کرد. ئـەو هەمو بەخشش‌و التفــات‌و ڕوخــۆشیو دڵدانەوەو لاواندنەوەی کە لە یارم دیت؛ لەهونەرو کردەوەی من بەدەرەو تەنیا خودایە بەزەی پێمدا هاتوەو خوێندومیەوەو بەسەری کردومەوە، زۆر سـوپاس‌گوزارم لەخودا.

**٣٤** مە هادر سەجدەیا شوکرێ لوێ عەردێ مقەددەس بر
بموژگانێن خوە دوڕسوفتن ئەنی مالی لعەردێدا

**مانای وشە:**

**مە:** ئێمە؛ **هادر:** حازر، دەس‌بەجێ؛ **سەجدە:** سـەر وەسـەر عەرز کردن بۆ کرنوش؛ **شـوکر:** سـوپاس: کەسێك‌کە خوا خۆشی زۆری دەداتێ، سوژدە دەباو ناوی سوژدەی شـوکرە. **عەرد:** زەمین؛ **موقـەددەس:** پیرۆزو ممبارەك؛ **بر:** برد؛ **موژگان:** مژۆڵ؛ **دوڕ:** مرواری درشـت؛ **سـوفتن:** سـون، کون‌کردن؛ **ئـەنی:** توێڵ، ناوچاوان.

**پوختەی مانا:**

من لە خۆشیان کە یار بە سەری کردمەوەو بە غوڵامی خۆی حیساب کردم؛ هەر دەسـت‌بەجـێ لە حوضوردا، سوژدەی شوکرم برد. لەسەر ئەو زەمینە پیرۆزە کە وەك شیوە پیرۆزەکەی کێوی طـور

بو؛ پیاو لە هەرکویٚ بە خوا بگا، ئـەو شـوێنە پیرۆزە. بە مژۆڵان مرواری فـرمێسکانم دابێشـــتو دارشت. ناوچـاوانم لەعەرز ماڵیو عەرزەکەم بەناوچـاوانم ماڵیو گەسکـمدا، بەڵام گەسگـــەکەم تویٚڵمبو.

**٣٥ هەیا بیناهی‌یا چەهڤان بوتو عوززایو لاتی من**
**توئی پیش‌بەر سجودا من سەحەرگاهان دخەلویٚدا.**

**مانای وشە:**

**هەیا:** ئەی؛ **هەییا:** وەرە؛ **بیناهی:** سوما؛ روناکی چاو؛ **چەهڤ:** چاو، دیدە؛ **بوت:** بت؛ **عوززا:** بتیٚک‌بوە لە ماڵی کابە؛ **لات:** بتیٚک‌بوە لە ماڵی کابە. **پیٚش‌بەر:** قیبلە، روگە؛ **سجود:** سـوژدەگەل؛ **سـەحـەرگاهان:** بەرەبەیانان؛ **خەلوە:** جیٚگەی تەنیایی؛ **بینایی‌چاوان:** ناوە بوٚ خودا.

**مانا بەتیٚکڕایی:**

وەرە ئەی روناکی چاوانم، ئەی بینایی چاوان. وەرە ئـەی کەسـێکی کەمن توٚم کردوٚتە بتو دەت پەرستمو لەجیٚگەی عوززاو لات کە بت‌پەرستان دەیان پەرستن؛ من توٚ دەپەرستمو وازم لە هەمو شـتێك هێناوە، جگـە لەتوٚ. توٚ روگەو قیبلەی منی. من کە هەمو بەرەبەیانان بوٚ کڕنوشـــت سەردەنێمە سەرزەوینو سوژدە دەبەم. روم دەتوێەو لەشوێنی تەنیایی‌دا توٚم دەگەڵی.

**٣٦ ل‌بال عیلمی تە مەعلومە ژژینیٚ من تو مەقصودی**
**فیدای جانیٚ مەدیٚ جان‌بت دقەستا وەصلو دینی‌ٚدا**

**مانای وشە:**

**ل‌بال:** لەکن، لەلای؛ **عیلم:** زانست؛ **تە:** توٚ؛ **مەعلوم:** دیاریو ئاشکرا؛ **مەقصود:** مەبەست؛ **جان:** گیان؛ **فیدا:** قوربان، گوٚری؛ **قەست:** نیاز؛ **وەصل:** پیٚك گەیشتن؛ **دین:** دیتنو چاو پی‌کەوتن.

**مانا بەتیٚکڕایی:**

پیٚی ناویٚ من‌بڵیٚم. خودایە، ئەی یار. ئـەی بینایی چـاوان. هەمو شـــتێك خـــوٚت دەیزانی. لەبەر زانستی توٚدا ئاشکرایە کە لە ژیاندا، جگە لەتوٚ نیازیٚکم نیە. من دەمەویٚ لەرێگەی توٚدا ـ کە گیانی بەراستیم توٚی ـ گیانم فیداکەم. هەر ئەوەندە بەو هومیٚدەوە بم کە بەتوٚ بگەمو بت‌بینم.

**٣٧ بـحوسنا خو ئیلاهی کی بـسەهمو هەیبەتی دینیٚ**
**نجومو کەوکەبیٚ لامیع ژبالا تیٚن بە بەژنی‌ٚدا**

**مانای وشه:**

**حوسن:** جوانی؛ **ئیلاهی:** خوای‌من؛ **کی:** بکەی؛ **سەهم:** سام‌و ترس؛ **هەیبەت:** مەترسی؛ **دین:** دیتن؛ **نجوم:** ئەستێرەگەل؛ **کەوکەب:** ئەستێرە؛ **لامیع:** بریقەدار؛ **بالا:** لای‌سەرو؛ **بەژن:** باڵا.

**مانا بەتێکڕایی:**

خودایە بەو جوانیەی خۆت کەی کە بەشێکت داوە بە دڵبەرمو بەو هەیبەت‌و مەترسی‌و دڵە لەرزەیەکەی، کە لە دیتنی ئەو جوانیەتدا لەروی دڵبەرم دەیبینم‌و بەو دیدارە لەو بەژن‌و باڵا ڕێکەدا، نیشانمان دەدەی. ئەو خشڵانەی دەبریقێنەوەو لەسەررا تا خوار لە بەژنی یاردا، وەك ڕێزی ئەستێرە دەدرەوشێنەوە. کە ئەوانەش هەمو پاژێك‌و بەشێکی کەمن، لەجوانی‌تۆ، کە لەو بەشی یارمت داوە.

**٣٨** بخالێن وەردو نەسرینان ژقودرەت خەط کشاندی لێ
بتەرحا نیرگزا عێلی سەحەرگاهان نەسیم لێدا

**مانای وشە:**

**خال:** خاڵی سەرڕو؛ **وەرد:** گوڵی سوری محمدی؛ **نەسرین:** گوڵێکی سپیە؛ **قودرەت:** توانایی؛ **قودرەت:** کاری خودا؛ **خەت کشاندی لێ:** خەتت لێ کێشاوە؛ **تەرح:** چوزە، چل؛ **نیرگز:** گوڵێکی سپی بۆن خۆشە؛ **عێل:** بڵند؛ **عێل:** عاشیرەت؛ **نەسیم:** شنەبا.

**مانای تێکڕا:**

خوایە، بەجوانی بەژن‌و باڵای یار کە جوانی خۆتە داوتەتێ. بە خاڵەکانی روخساری چە ئەوانەی لەسەر کوڵمەی سوری ـ کە وەك گوڵی گوڵاون ـ چە ئەو خاڵانەی لەسەر لاجانگ‌و بەر گەردنێ ـ کە لاجانگ‌و ژێرچەنەی وەك نەسرین وان ـ کە بە قودرەتی خۆت نەخشاندوتن. خودایە سوێندت دەدەم بەو بەژن‌و باڵایە کە وەك چڵە نێرگزی شلك‌و بڵندەو لەچاو هەمو جوانانی عاشیرەتدا گوڵی سەرتۆپە. ئەو چڵە نێرگزەی کە بەشنەبای بەیانان دەلەرێتەوە. یان ئەو بەژنە شلکەی کە بە هەناسەی عاشقانەی ئێمە دەهەژێت؟.

**٣٩** کوتولی ئاستانێ دور نەکی ئێدی ژدەرگاهێ
ژبا خوێ ڤی‌رجو ناکین دبابێ لوطفو رەحمێدا

**مانای وشە:**

**کو:** کە؛ **تولێ:** تولەی؛ **نەکی:** نەکەی؛ **ئێدی:** جارێکی‌تر، تازە؛ **باخوێ:** خودا؛ **ڤی:** ئەوەی؛ **رجو:**

تەمەننا، داوا؛ **باب:** دەرگا؛ **باب:** بابەت؛ **لوطف:** التفات؛ **رەحم:** بەزەیی.

**پوختەی مانا:**

خودایە، سوێندت ئـــەدەم بەجـــوانی یارم. بە بەژنو باڵای. بەو خـــاڵانەی پێت نەخشـــاندوە، کە هەموشیان تۆزێکە لە نمونەی جوانی خۆت. دڵم مەشکێنەو جارێکیتر دورم مەخەرەوە لە دەرگای خۆتو با هەر تولەی بەر دەرگانەی تۆ بم.

خـــودایە، ئـــەو تەمەننایەم تەنیا لەوەیە کە هومێدم بە لوطفو رەحمەتی تۆ هەیە. دەنا دەزانم عەبد حەقی نیە ئاواتی خۆی لەبەر خودا دانیو بڵێ بیکە.

لێرەدا مەلا ئەو قسەی صوفیانەمان بیر دەخاتەوە کە: خـوْدا بەرانبەر بەهیچ نایدا. تەنیا ئـەگەر بەزەی بەکەسێکدا هات، دەروی خێری لیدەکاتەوە. نوێژو تاعەت نابن بەهوی بەخششی خودا.

٤٥ **تو ناری فیرقەتیْ زانی دکارم ئەز تەحەممول کم**
**دباری کوهی قەندیلم بلاقیلم دعشقێدا**

**مانای وشە:**

**نار:** ئاگر؛ **فـرقەت:** جیایی، جـودایی؛ **دکارم:** دەتوانم؛ **ئـەز:** من؛ **تەحەممولکم:** هەڵگـــرم؛ **دبار:** کێو؛ **کوهی:** کێوی؛ **قەندیل:** ناوی کێوێکەلەکوردستان؛ **بلاقیل:** بیقسەوباس؛ **عیشق:** ئەوین، دڵداری.

**مانا بەتێکڕایی:**

خودایە هەرچەندە وایدا بنێم کە من کێوی قەندیلم، هیچ گلەو متەقیشم لە دڵداریدا قەت نەبوبێ. ئایا من چیتر دەتوانم تاقەتی جودایی بێنم؟ خوایە تۆ بۆخـوت دەزانی ئـاگری جـودایی چـەند بە تەوژمو بێ ئامانە. دەشزانی خۆ لەبەر راگرتنی تەنانەت لە وزەی چیای قەندیلیشدا نیە.

مەلا ئیشارە بەو ئایەتە دەکا کە خوا فەرمویە:

ئەگەر ئەم قـورعانەمان ناردبایەتە سـەر چیا. دەت دیت بەذەلیلی لەترسی خـودا لەتلەت بوەو لەبەریەك چوە.

٤٦ **زەهی دەردی مەزن فیرقەت جگەرسوت ئاتەشیدا دڵ**
**جیهی صەبریْ نەما چەندان فەرەج من دی دصەبرێدا**

**مانای وشە:**

**زەهی:** پەك، چزۆر؛ **دەرد:** ژان؛ **مەزن:** زل؛ **فیرقەت:** جودایی؛ **سـوت:** سـوتا؛ **ئـاتەش:** ئـاگر؛ **جیە:** جێگە؛ **چەندان:** هێندە؛ **فەرەج:** فەرحانی؛ **صەبر:** حەوسەڵەو پشو درێژی.

**مانای تێکڕایی:**

ئاخ لەژانی گرانی جودایی چیپێکردم. جەرگی سوتاندم، ئـاگری دەدڵ بەردام. بەڵێ زۆرم صـەبر کردو لەصەبری زۆرەوە گەیمە فەرحانی. بەڵام ئیتر تازە کە دڵو جگەرم ئـەوسـا سـوتاوە، دڵیش جێگەی صەبرە ئاگری گرتو بو بەخوڵەمێش، ئیتر جێگـەی صـەبرکردنە کەشـم نەماوە. دەسـا خودایە دیسان توشی جوداییم مەکەوە.

٤٢ مەلا بێ قامەتا یەکتا قیامەت من بە چەهڤان دی
فیراقێ روسیا بن‌تە. ژمن جانی شیرین جیّدا

**مانای وشە:**

**قامەت:** بەژن؛ **یەکتا:** بێوێنە، (نەمامی تاقانە)؛ **فیراق:** جودایی؛ **روسیا:** روڕەش؛ **جێ:** جیا، جودا.

**مانا بەتێکڕایی:**

هۆی مەلا ـ وەك شـاعیرانیتر خـۆی دەدوێنێ ـ بێ بەژنو باڵای‌یار کە وەك نەمامی تاقـانەو بێوێنەیە، من قیامەتم بەچاوان دیت. ئەی جودایی، روت رەش‌بێ، تۆ بوی کەگیانی شـیرینمت ـ کەیارە ـ لێ جیا کردمەوە.

## قصیدەی هەشتەم

# «دوعا»

١ سەری زولفاتە بـ‌کوللابی دوعا
هاتە دەستی مە بـ‌جەللابی دوعا

**مانای وشە:**

**کوللاب:** قولاپ؛ **دوعا:** نزا؛ **جەللاب:** کێشەر؛ **جەللاب:** بەو کەوە دەڵێن کە دەناو حەشـاردا دەیشـارنەوەو کەوی پێ ڕاو دەکەن.

**پوختەی مانا:**

ئـەی‌یار، ئێمە دوعامان کردو دوعاکەمان وەك کەوی ڕاو، وەك قـولاپو داو، سـەری زوڵفـی ئاڵقەی قولاپ ئاسایی تۆ کەوتە دەستمان.

٢ صوفی‌یی خەلوەنشین بێنە سجود
هەردو برهێن تەنە میحرابی دوعا

**مانای وشە:**

**خەلوەنشین:** چلەکێش؛ **برهـ** : برۆ.

**مانا بەتێکڕایی:**

ئـەی یاری دڵرفێن، ئـەو تاقـی برۆیانەی تۆ پیرۆزترین میحـرابن کە هەر کەس بەرانبەریان ڕاوەستێو دوعابکا دەس لەجێ قبوڵ دەبێ. با صوفیە چلەکێشەکانیش بەرەو ئەو برۆیانەت سـوژدە بەرن، تا شتێکیان لە قودرەتی خودا لێ حاڵی بێ.

٣ عەرضی کی دیٚبکرم صورەتی حال
کو تویی قیبلەیی ئەربابی دوعا

**مانای وشە:**

دیٚبکرم: بکەم؛ صورەتیحال: باسی چۆنیەتی خۆم؛ کو: کە؛ قیبلە: روگە؛ ئەرباب: خاوەنان.

**پوختەی مانا:**

باس‌و خواسی چۆنیەتی خۆم، جگە لەتۆ لای کیٚ بدرکیٚنم. کە هەر خۆتی روگەی نیازو ئاواتانی.

٤ ژدوعائی قەدەحەك دەر دەستە
هەرسەحەر مەستی مەیی نابی دوعا

**مانای وشە:**

قەدەح: پیاڵە؛ دەر: دەناو؛ مەیی ناب: شەرابی بیٚخەوش.

**پوختەی مانا:**

لەسایەی پاڕانەوەم لەدەرگات، هەمو بەیانیان، مەستو سەرخۆشمو لەبادەی بیٚ غەوشی یادی تۆیە، ئەو سەرخۆشیەم.

٥ گولی ئیقبال ژگولزاری قەبول
مەچنی‌بو دشەکەرخابی دوعا

**مانای وشە:**

ئیقبال: روتیٚکردن، بەخت؛ شەکەرخاب: خەوی خۆش، شیرین خەو.

**پوختەی مانا:**

من کە هیٚندە بەکزی‌و کەنەفتی لەبەرت پاڕامەوە تاخەو بەلای‌دا بردمەوە. لەخەوما دیتم کەنزام قبوڵ بوەو گوڵی بەختم پشکوتوەو گوڵچنینم لە گوڵزاری قبوڵ کردنت بە نەسیب بوە.

٦ بەردو برهیٚن تە ب ئیخلاس‌و یەقین
مددبر سەجدە ب ئادابی دوعا

**مانای وشە:**

**برھ** : برۆ؛ **ئیخلاس:** دڵپاکی؛ **یەقین:** بێگومانی؛ **مەدبر:** ئێمە دەمان برد؛ **ئاداب:** رێوشوێن.

**پوختەی وتار:**

من وام بەخۆم هەست کرد، کە بە دڵو یەقین سوژدەم دەبردە بەر میحرابی ئەو دو برۆیانەتەو بەدامو دەستوری دوعاوە دوعام دەکرد.

**٧ ژدلەك صافی تو میحراب ببین**
**سەجدەیەك لازمە دەربابی دوعا**

**مانای وشە:**

**ژ دلەك صافی:** لە دڵێکی صافەوە؛ **لازمە:** پێویستە؛ **دەربابی:** لەبابەتی؛

**مانا بەتێکڕایی:**

ئەگەر بە دڵێکی پاكو بێخەوش، بڕوانیە ئەو برۆ میحرابیو کەوانیەیە؛ دەزانی کە بۆ پاڕانەوەو نیازگرتن، پێویستە سوژدەیەکی بۆ بەری.

**٨ مە ددل عوروەتی وثقایە بدەست**
**ژ ئەنایاتە سەر ئەلقابی دوعا**

**مانای وشە:**

**مە:** ئێمە؛ **ددل:** دەدڵدا؛ **عوروە:** دەسکەگۆزە، دەسکیهەرچی؛ **وثقا:** هەرەقایم؛ **ئەنا:** مەدحوپیهەڵگوتن؛ **ئەلقاب:** نازناوان.

**پوختەی مەبەست:**

من کە مەدحی تۆدەکەمو ناوت دەبەم؛ ناوی تۆ، سەروەری هەموناوو نازناوانە. ناوی خۆت دەکەمە تکاکار لە دوعا کردندا. دەستم بە دەسکی هەرەقایمەوە گرتوەو هەرگیز تلنادەمو لەرێگـە لا ناکەوم.

**٩ ژ ئەزەل یەك جیهەتی دایە مەلێ**
**هەرمە ئیخلاصە ژ ئەسبابی دوعا**

**ماناى وشه:**

**ئەزەل: هەرەپێشو؛ یەك جیهەتی: یەكلایەنی؛ مەلیٚ: مەلا؛ هەرمە: ئێمەهەر؛ ئەسباب: هۆ.**

**مانا تیكرا:**

هەر لە رۆژی بناوانەوە، خـوا یەكتاپەرسـتی داوە بە مەلا. هۆیەكی كە دەبێتە مایەی پاڕانەوەمان، ئەو ئیخلاص‌و دڵپاكیەمانە.

# قەسیدەی نۆهەم

## «دیدار»

١ دەستی قودرەت کو هلاڤێت ژبەژناتە نیقاب
ل‌جەمالا جەبەروتی مەنەمان پەردە، حیجاب

**مانای وشە:**

قودرەت: توانایی؛ هلاڤێت: هاویشتی، هەڵی‌ماڵی؛ نیقاب: سەرپۆش؛ جەمال: جوانی؛ جەبەروت: دەستەڵات؛ حجاب: لەمپەر.

**پوختەی مانا:**

لەوساوە کەوا دەستی بەهێزو توانای، سازدەری زەوی‌و عاسمانان، بەژنی تۆی هێناوەتە ئاراوەو پەردەی نێوانی لەناو لاداوەو خۆی بەئێمە نیشان داوە؛ ئێمە جوانی خوای گەورەمان لە روخساری تۆدا بەدی‌کردوەو بۆ دیتنی جوانی ئەو پەروەردگارە تواناو خاوەن دەسەڵاتە، هیچ پەردەو لەمپەرمان لەناودا نەماوە.

٢ ل‌گولێن تەی تەرو نازک کو سەحەر گرتی خوناڤ
دئەباریق‌و قنینان ژحەسەد صوهتی گولاب

**مانای وشە:**

گولێن: گوڵان؛ تەرونازک: شەق‌وتورت؛ خوناڤ: شەونم، ئاونگ؛ ئەباریق: جەمعی ابریق، لولێنە؛ قنینە: دەفری‌شوشە؛ حەسەد: ئێرەیی؛ صوهتی: سوتاو؛ گولاب: گوڵاو.

**مانا بەتێکڕایی:**

لەوەتا سەرگۆنای‌تۆ کەوەک پەلکە گوڵی ناسکو تورت‌و تێراو وان‌ـ لەبەرەبەیاندا شەونمیان

پەڕیوەتە سەر؛ گوڵاو کە شیرەی گیانی گوڵانەو دەزانیٚ نەگەیشتوٚتە بارتەقای، ئەو شەونمە ـ کە بەسەر کوڵمەکانتەوەیە ـ لەبەر ئێرەیی‌و چاونەزێری لەداخ‌و حەسرەتان، لەناو تونگەی لونەدارو لەناو شوشان‌دا، سوتاوە.

٣ عەینی کافوری‌یە مەشرەب مە ژحوسنا تەیی صاف
لەو ژعیشقاتە ددل‌دامە قەبو عیلمی عوباب

**مانای وشە:**

**عەین:** کانی؛ **عەین:** هەروەك؛ **کافور:** شیرەی دارێکە زوٚرتر لەچین‌و ژاپوٚن دەڕوێ. ئەویش وەك دارەبەنی وڵاتی خوٚمان، لەلەدەکریٚ‌و شیرە دائەداو دوایە وشك دبێتەوە. ڕەنگی زوٚرسپی‌یە، بوٚنی خوٚشە، بوٚ داودەرمان بەکاردەبریٚ. بە لاشەی مردویەوە دەکەن تا زوٚر زو بوٚن نەگریٚ. خوا لە قورعاندا دەفەرمویٚ: «لەو دنیا کارچاکان، لە پیاڵەیەك دەخۆنەوە کە ناوەروٚکی پیاڵەکە، کافوریشی تێکەڵاوەو لە کانیەك تێراودەبن کە هەرگا بیانەویٚ هەڵدەقوڵیٚ»؛ **حوسن:** جوانی؛ **صاف:** بیٚخەوش؛ **لەو:** بوٚیە؛ **عیشق:** ئەوین؛ **قەبو:** کرایەوە؛ **عیلم:** زانست؛ **عوباب:** دەریای بەشەپوٚل‌و شەپوٚلی دەریا؛ **عوباب:** ناوە بوٚ کتێبێکی فەرهەنگی عارەبی کە «صغانی» بیست‌بەرگی نوسیوە بوٚی تەواو نەکراوە. (صغانی، ناوی ابوالفضایل حسن کوڕی محمد بو. لە نێوان ساڵانی ـ ١١٨١ و ١٢٥٢ ی ـ میلادی‌دا ژیاوە. لە شاری لاهوری هندوستان هاتوٚتە دنیا. لەشاری غەزنە خوێندویەو لە بەغدا مردوە. دو فەرهەنگی عارەبی نوسیوە؛ یەکێکیان ناوی: «التِکْلَمة والذّیل والصلَة» واتا: تەواوکەرو پەڕاوێزو پێك‌گەیاندن بوە. ئەویتریان، «اَلعُبابُ الزاخر واللُّبابُ الفاخِر:» دەریای پڕو سەرڕێژ یان، شەپوٚلی سەرڕێژکەری دەریاو کاکڵە خوٚشەکان. ئەو فەرهەنگەی تاپیتی‌میم هێناوەو بوٚی تەواو نەکراوەو مردوە. فەیروز آبادی، قاموسەکەی خوی، لەسەر داروپەردوی ئەم دوکتێبەوە هەڵناوە.

**مانا بەتێکڕایی:**

لەوساوە ئێمە ڕێگامان دراوە کە لەجوانی بیٚ‌گەردو بیٚخەوشی توٚ بڕوانین؛ خوٚمان لە بەهەشتا دەبینین‌و لەڕێزی پیاوچاکان داین‌و لەو سەرچاوە بەهەشتی‌یە، تێراو دەبین کە کافوری لەگەڵا تێکەڵاوە. هەر بوٚیەشە کە دەرگای دەریای زانست بەڕوی دڵمان‌دا کراوەتەوەو دڵمان لەزانایی خواناسین‌دا دەریایەکە شەپوٚل‌ئەدات‌و سەرڕێژ دەکات. یان، لەسایەی دیداری توٚوە، ئێمە زانستێك ڕوی تیٚ‌کردوین کە زوٚر لەناوەروٚکی کتێبی العبابی صغانی زیاترە.

٤ مەژسەر چەشمەیی حەیوان قەدەحەك صافی قەخوار
ناگەهی لەذذەت‌و ذەوقامە بـصەد جلدی کیتاب

**مانای وشە:**

**سەرچەشمە:** سەرچاوە؛ **حەیوان:** ژیان؛ **قەدەح:** پیاڵە؛ **صاف:** ڕون‌و دور لە لێڵایی؛ **قەخوار:** خواردەوە؛

**ناگەهی:** ناگاتە؛ **لەذذەت:** خۆشی؛ **ذەوق:** چێژە؛ **جلد:** بەرگ؛ **کتاب:** کتێب.

**مانا بەتێکڕایی:**

**ئێمە لەسەرچاوەی ئاوی حەیاتیٚ پڕی پیاڵەیەکی رون‌و رەوانمان خواردۆتەوە؛ خۆشی‌و چێژەیەکی کە ئێمە هەستمان پیٚ‌کردوە، بە صەد بەرگ کتێب باسی‌بکەین هێشتا دوایی نایە.**

**٥ لەو دچەنگیٚ مە دخونیٚ کو دعشقا تە بساز**
**مە ببەژناتە دخونن نەی‌و قانون‌و روباب**

**مانای وشە:**

**لەو:** بۆیە؛ **کو:** کە؛ **دخونیٚ:** بانگ‌دەکا؛ **نەی:** بلوێر؛ **چەنگ، ساز، قانون، روباب:** هەریەکە آمرازێکی موسیقان؛ **بساز:** بساچینە، ئاشنابە.

**مانا بەتێکڕایی:**

**ئەوینی تۆو دیتنی دیداری تۆ، وەك ئاوی‌ژیانە، کە مردن لەناو دەباو تام‌و چێژەی لە باس‌کردن نایە. واتازە تێدەگەم، کە بۆچی گویٚ لە هەر ئاوازو ئامرازێکی موسیقی دەگرم تێکڕا هەر دنەم ئەدەن‌و ئامۆژگاریم دەکەن: کە تۆ دەگەڵ ئەوین ئاشنابەو دەست لە دڵداری بەرمەدە.**

**٦ قەهوە یا تەلخ دگەل زەهری هەلاهیل ب دەری**
**مەژدەستی تەمبارەك شەکەر ئامیزە خوشاب**

**مانای وشە:**

**قەهوە:** مەی؛ **قەهوە:** قاوە؛ **تەلخ:** تاڵ؛ **زەهر:** ژەهر؛ **هەلاهیل:** گیایەکە شیرەکەی ژەهرێکی زۆر حەستەمە؛ **بدەری:** بدەیەی؛ **مە:** بۆمە؛ **مبارەك:** پیرۆز؛ **شەکەرئامیز:** شەکراوی؛ **خوشاب:** خۆشاو.

**مانا بەتێکڕایی:**

**ئەگەر تۆ ژەهری هەلاهیل بکەیەناو قاوە ـ یان شەرابی زۆر تاڵەوە ـو بڵێی بیخۆرەوە؛ چونکە دەستی پیرۆزی تۆی وی‌کەوتوە، بەلامەوە لە خۆشاوی شەکراوی شیرین‌ترو خۆشترە.**

**٧ قولزومی عیشقیٚ ژبایی خۆ موخالیف دەمەکی**
**دهەماماتی عەجاجی مەل سەر دەستی غوراب**

**مانای وشە:**

**قولزوم:** دەریا؛ **عیشق:** ئەوین؛ **بایموخالیف:** بایپێچەوانە؛ **دەم:** تاو؛ **هەمام:** راتلەکاندنیبا؛ **عەجاج:** گێژەڵوکەو گەردەلول؛ **غوراب:** جورێك گەمیەی بەبادەوەی پێشوبوە.

**مانا بەتێکڕایی:**

ئێمە سەردەمێك لەدەمان، لەناو دەریای پڕلە توّفاندا، وەبەر گێژو گەردەلولیّ کەوتوینو بەدەم بای موخالیفەوە رەتمان دەبردو دەستەڵاتمان بەسەر گەمیەکەمادان نەما. گەمیەکەمان ئێمەی بەسەر دەستی خوّیەوە گرتبو. بای پێچەوانە دەیرەتاندو سەرمان لیّشێوابو.

**٨** سەحەری خضری عینایەت کو برین چەشمەیی دل
بجیهانیّ مە نەظەردا کو جیهان عەینی سەراب

**مانای وشە:**

**خضر:** سەوز؛ **خضر:** خدری زیندە. خدری زیندە یانیّ، کەسکی نەمر. گوّیا یەکێك لە خوّشەوێستانی خودا، گەیشتوّتە سەرچاوەی ئەو ئاوەی کە هەرکەس بیخواتەوە، هەرگیز نامریّ. واتا وەك سەوزەگیایەك وایە کە هەرگیز وشكو سیس نابیّو هەمیشە کەسکە؛ **عینایەت:** بەسەرکردنەوەو ئاگاداری؛ **برین:** بردینیە؛ **چەشمە:** سەرچاوە؛ **جیهان:** دنیا؛ **نەظەر:** روانین؛ **عەین:** بەتەواوەتی؛ **عەین:** کانی؛ **سەراب:** تراویلکە، لە بیابانـدا، پیاو لەدورەوە شتێك دەبینیّ بەئاوی دەزانیّ؛ بەڵام ئاوێك لە ئارادا نیەو چاوی فریو دەخوا بەوە دەڵێن سەرابو بەکوردی پێی دەڵێن **تراویلکە**.

**مانا بەتێکڕایی:**

ئەم تاکەشیعرە، تەواو کەروکلکەی شیعری پێشوە کە فەرموی: لە دەریادا، بەر گێژەڵوکە کەوتینو گەمیەکەمان با دەیرەتاندو بەسەرگەدانی مابوینەوە. دەڵیّ: شەوێکی زوّر حەستەممان دەرباز کرد، تا لە بەرەبەیاندا، روحمو بەزەی خوا، لێمان بوبە خدری زیندەو لە توّفان رزگاری کردینو دەستی کێشاین تا بردینیە سەرچاوەی دلّ؛ کە هەر چاوەی دڵیشە ئاوی ژیانی تێدایەو ئێمە پێی نازانین.

ئەوسا کە تماشای دنیامان کرد، بەو هەمو دەریاو وشکانیەوە کە هەیەتی، هەمومان تەواو بەسەرابو تراویلکە هاتە بەرچاوو زانیمان چاومان فریوی خواردوە.

**٩** بحوبابیّ مەبە مەغرور وەهە سەر گەشتە «مەلا»
باقبەر کەفتییە وی بیهودە سەرگەشتە حوباب

**ماناى وشه:**

**حوباب:** بڵقى سەرئاو؛ **مەغرور:** لەخۆبايى؛ **وەهە:** ئـاوا؛ **سـەرگەشـتە:** سـەرگەردان؛ **ڤبەر:** وەبەر؛ **كەفتى:** كەوتو؛ **بىٚ‌هودە:** لەهيچىٚ، بەخۆرايى.

**مانا بەتێكڕايى:**

ئەى مەلا! ژيانى ئەم جيهانە، وەك بڵقى سەرئاوە. بڵقى سـەرئـاو، بايەكى چـۆتە ناو، كەوا هەڵى مساندوە. ژيانى جيهانيش هەر وەك بڵقى سەرئـاو، بادى هەوايەو هەروەك بڵق، بە باڵىٚ‌دەركەوتن دەپوچێتەوە. ژيانيش كە نەفەسێكىداو نەهاتەوە لەناو ئەچىٚ. جا ئاگات لە خۆت بىٚ، بڵقى سەرئاو هەڵت نەخەڵەتێنىٚ‌و بەژيانى دنيايى، بايى نەبى.

١٠ وەيە هودهود ژسەبا بێتو بزانين چيە حال
كو لحالىٚ مە غەريبان نەسوئالو نەجەواب

**ماناى وشه:**

**وەيە:** رەنگ‌هەيە؛ **هودهود:** پەپوسـلێمانە؛ **سـەبا:** شـوێنێك‌بوە لە يەمەن كە بەڵكيس بەرلەوە بێتە ژنى سلێمان پێغـەمبەر، لەوىٚ ژياوە. (باسـى سـلێمان‌و بەڵكيس‌و دەلالَيە كەى پەپومان لەپێشـدا كردوە.)؛ **غەريب:** ئاوارەى نيشتمان؛ **سوئال:** پرسيار؛ **جەواب:** وڵام.

**مانا بەتێكڕايى:**

ئێمە لەنيشتمانى راستەقينە، دورخراوينەوەو لەم جيهانە ئامانەتيەدا بەئاوارەيى ماوينەوە، نە كەس لێمان دەپرسـىٚ چـۆنى‌و نە وڵامێكمان بۆ دەنێرن كە دڵمان خـۆش‌كا. هومێدمان هەيەو رەنگـە پەپوى پێوقەدەم پيرۆز، مژدەيەكمان لەسەباوە بۆبهێنىٚ‌و دەخـۆمان بگـەين كە چـۆنين‌و چـۆن دەبين.

١١ هەردو برهێن تەنە ميحرابى چە ئيمان‌و چە كوفر
بودو نابود كويەكن ئەڤ چەواب‌و چە عيقاب

**ماناى وشه:**

**برە:** برۆ؛ **تەنە:** تۆن؛ **ئيمان:** باوەڕى؛ **كوفر:** بىٚ ئـەمەگى؛ **بودونابود:** بون‌و نەبون؛ **ثەواب:** پاداشـت؛ **عيقاب:** تۆڵەوسزا.

**ماناى بەتێكڕا:**

رێبوارانى رێگەى خواناسين، بەقۆناغێكدا تىٚ‌پەڕ دەبن. كەقۆناغى لەخـوا داون‌بونى پىٚ‌دەڵێن. لەم

پلەیەدا، بەردو دارو گیاندارو بیٚگیان، بەلایانەوە هەموی هەر خوا دەپەرستیٚ. ئەوانەی کە بەروالٚەت، کافرن‌و سەجدە دەبەنە بەر بت؛ لەلای ئەوان سەجدەکەیان بوٚ خودایە. چونکە باوەڕی‌و ناباوەڕیش هەر لەلایەن خوداوە بەبەندە دراوەو هەر فەرمانی خوٚیەتی، بەجیٚ هیٚندراوە. لایان‌وایە پاداشتی چاکەو سزای خراپەش، هەر شتیٚکی ظاهری‌و روالٚەتی‌یەو کەسیٚکی فەرمانی ئەوی پیٚك‌هیٚنابیٚ ـ فەرمانەکە هەرچیەك بیٚت ـ ناشیٚ دەردو ئازاری لەسەر ببینیٚ و هەروەك لەمەو بەریش باسمان‌کرد، صوٚفیانی پایە بەرز، دەلٚیٚن: یار هەموی هەر رەحمەت‌و خوٚشی‌یەو رەحمەت لە هەرکویٚ هەبیٚ ئازاری لیٚ‌نیەو خوداش لە هەمو جیٚگەیەك هەیە. کەوابو عەزاب نابیٚ هەبیٚ. زوٚرجار لەگفتەی صوٚفیان‌دا توش دەبین کە دەلٚیٚن: ئەوەی شیخ لەخانەقادا بوٚی دەگەڕا ئیٚمە لە گوٚشەی مەیخانە توشی بوین... و...

مەلا لەم بەیتەدا، ئەم بڕوایە دەخاتە بەرو دەلٚیٚ:

هەر ئەو دو بروٚیەی راست‌و چەپی توٚیە کە بونەتە سوژدەگای باوەڕدارو بیٚباوەڕانی روالٚەتی. ئیتر کوفرو ئیمان دەبڕیٚتەوەو تیٚکەلٚ دەبن. بون‌و نەبون ئەگەر هەیەو ئەگەر نیە، هەر لە خوٚتەوەیە؛ پاداشتی باش‌دانەوەو سزادان، چوٚن لیٚك جوٚی دەکریٚتەوە؟!

**١٢** وەرە نیشانی «نیشانی» دەخوە بیٚپەردە سەحەر
لیٚ ژخونیٚ بکە پەرهیز کو شەهیدان چەحیساب

### مانای وشە:

نیشانی: نیشانەی تیران؛ نیشانی: تَخَلُّصی مەلا لە شیعردا؛ بیٚ پەردە: ئاشکرا؛ لیٚ: بەلٚام؛ خون: خویٚن؛ پەرهیز: پاریٚز؛ شەهید: کوشتەی ریٚگەی هەقانیەت؛ حیساب: ژمارە؛ حیساب: لیٚ پرسینەوە.

### مانا بە تیٚکڕایی:

ئەی یار وەرە، دە بەرەبەیانان‌دا، خوٚت نیشانی ئەم نیشانەی تیرانەی خوٚت بدە. بەلٚام هەر من نیم کە شەهیدی تیری ئەوینی توٚم؛ کوژراوانی ئەو ریٚگەیە، لەژمارە بەدەرن‌و هەموش لەریٚی هەق‌دا کوژراون‌و خویٚنیان لە بەردەڕوا. ئەگەر هاتیە سەردانمان، توٚزیٚك بەپاریٚزەوە وەرە، نەوەك خویٚنی ئیٚمە پەلٚاویت بکاو دەشزانی کە شەهید لیٚ پرسینەوەیان بوٚنیە.

## قصیدەی دەیەم

# «پیاڵەی لێواولێو»

١ للەالحمد ژیاریٚ مەددەست جامە لەباڵەب
ژلەبی نوشی پەیاپەی ددل ایلهامە لەباڵەب

**مانای وشە:**

**للەالحمد:** شوکور بۆخوا؛ **ژیاری:** لەیارەوە؛ **مە:** ئێمە؛ **جام:** پیاڵە؛ **لەباڵەب:** لیپاولیپ؛ **لەب:** لێو؛ **نوش:** رەواقی هەنگوین؛ **پەیاپەی:** لەسەریەك و بێپسانەوە؛ **ایلهام:** لەغەیبەوە خەبەر بەدڵ گەیشتن.

**مانا بە تێکڕایی:**

سوپاس بۆخوا، کەیار ئێمەی خوێندۆتەوەو بەلێوە شیرینەکانی - کەهاوتای رەواقـی هەنگـوینن - ئێمەی لاواندۆتەوەو لەوساوە جامو پیاڵەی لیپاولیپمان لەئـەوین هاتۆتە دەسـتو دڵمان پڕبوە لە موژدەو خەبەری غەیبی.

٢ د ری‌یا وان خەت‌و خالان کو نەحەرفێن قەلەمینە
مە ژفەیضا تەیە مەستانە رەوان چامە لەباڵەب

**مانای وشە:**

**ری:** رێگە؛ **وان:** ئەوانە؛ **خەت‌وخال:** خاڵ‌ومیل؛ **حەرف:** پیت؛ **قەلەم:** بنوس؛ **فەیض:** بەرەکەت، سەرریژ؛ **رەوان:** بێ‌گری‌و قوڕت؛ **چامە:** شیعرو هەڵبەست؛ **لەباڵەب:** لێواولێو.

**مانا بە تێکڕایی:**

ئەوخاڵ‌و خەتەی لەروخساری تۆ دێتە بەرچاو، کاری قەڵەمی نوسەرو نەقاشان نیە. خـوای گەورە

بەدانستە رژتونی. من کە دڵم داوەتە ئـەوینی ئـەوانە، بەپلەو پایەیەك گەیشـتوم کەلە بەرەکەتی ئەوانەوە کە ڕێژەوی کردوە سەر خۆشمو شـیعرەکانم ئـاوا رەوانو بیٚگریٚو قـوڕتنو بەسـەر لێوانەوە دەگەڕێن.

**٣ مەستی شەهکاسیٚ مە یا جاذبەیی روح دذات (یان ـ ددات)**
**روح دزانت کوژبەر لە ذذەتی عیشق مامە لەبالەب**

**مانای وشە:**
**شەهکاسە:** شاکاشی؛ **جـاذبە:** کێشـەر؛ **روح:** گیان؛ **ذات:** خـۆیی؛ **کو:** کەوا؛ **لەذذەت:** خـۆشی؛ **مامە:** ماوم.

**مانا بە تێکڕایی:**
لەو بادەیە ـ کە روح و گیان بەرەو خۆی دەکێشیٚ ـ من بە شاکاشی فرٚم کردوە. نەك تەنها لەشو ئەندامم تەزیوەو بڵێم وەك خەڵکی رەمەکی سـەر خـۆشم؛ بگـرە گیانیشـــم بەو لەزەتەی زانیوەو دەزانیٚ کە من لەو خۆشی دوبارەیەی ئەویناویدا بە لیپاو لیپی ماومەوە.

**٤ نیرگزا مەست ژبالا چەمەنا سونبولو گول تیٚ**
**قەدەحی تازە بـدەستی خوە تنیٚ دا مە لەبالەب**

**مانای وشە:**
**بالا:** بەژن؛ **بالا:** سەرو، ژورو؛ **چەمەن:** چیمەن؛ **سونبول:** سـمڵ؛ **تیٚ:** دیٚ؛ **تیٚ:** تێدا؛ **تازە:** هەرەباش؛ **تنی:** تەنیا؛ **دامە:** دایبە ئێمە؛ **لەبالەب:** لێواولێو.

**پوختەی مانا:**
**بەژنو باڵای یارم، وەکو مێرگو مێرخوزارێکە کە هەمو جۆرە گوڵێکی جوانو بۆن خۆشی تێدایەو لەواندا گوڵی رومەتیو سونبولی کەزیەکانیو لە ســەروی هەموا نیشــەوە، نێرگســی چــاوە مەستەکانی، بەجوانی خۆ دەنوێنن. دیتنی چاوەکانی، بۆمن وەك ئـەوە وابو کە پیاڵەیەك شـەرابی هەرە باشی دابێتە دەستمو پڕ بە پڕ مەستو سەرخۆشی کردوم.**

**٥ وەحدەتی صرفەمە مەشرەب تە چەایکسیری وجود**
**ئەم لەبالەب چە لەبالەب بـخوە هەم جامە لەبالەب**

### مانای وشە:

**وەحدەت:** یەکالّایی؛ **صیرف:** بیّخەوش؛ **مەشرەب:** ئاوخوّرە؛ **مەشرەب:** مەبەستو مەرام؛ **تە:** توّ؛ **اکسیر:** ئەو دەرمانەی کەمس دەکا بەزیّر؛ **وجود:** بون؛ **جام:** پیالّە؛ **جامە:** لیباس، کراس.

### مانا بە تیّکرایی:

ئیّمە بە هەمو باراندا، لەگەلّ یارا تیّکەلّین‌و بوینە یەکیّك و لەسەر چاوەی خالیص‌و بیّگەردو رون تیّراو دەبین. تازەکارمان لەوە دەرچوە کەماموّستاو پیری دەستگیر، اکسیری خوّیانمان لیّ خەرج‌کەن‌و مسی وجودمان، بکەنە زیّر. ئیّمە زیّری خالیصین، ئیّمەوەها پرّبوین لە ئەوینی یەکیەتی لەگەلّ خوادا، سەرباری خوّمان بگرە کراسە کەشمان لە ئەوین سەر ریّژ دەکاو لیپاو لیپە.

**٦ شەمعو پەروانە بـذاتیّ خوە ژحالی مە ددورن**
**ئاتە شەك صِرفە ژعیشقاتە ڤەڤەستامە لەبالەب**

### مانای وشە؛

**شەمع:** موّم؛ **پەروانە:** پەپولە؛ **بـذاتیّ‌خو:** لەخودی خوّدا؛ **ددورن:** پەرتن؛ **ئاتەش:** ئاگر؛ **صیرف:** تەواو بیّخەوش؛ **ڤەوەستان:** گیران؛ **ڤەوەستان:** هەستانەوە؛ **ڤەوەستان:** داوەستان.

### مانای بە تیّکرایی:

چیروّك‌و بەسەرهاتی مەلە ئەوین‌دا، بەهیچ جوّر نابیّ دەگەلّ ئەویینداری پەروانەو موّم، باسی بکریّو بلّیّن‌ویّك دەچن. گرّی شەم جوانە بەلّام هەر دەمیّکە، یان بەفوویّك دەکوژیّتەوەیان بە توانەوەی موّم، دەبرّیّتەوە. پەپولە دلّداریّکی گیانبازە بەلّام، بەبالّ سوتانیّك لەئەوین دەتە کیّتەوە. گرّی روخساری یاری‌من، لەگرّی شەم، تیشك هاویّژترەو هەرگیز بەهیچ باو توانەوە یەك، لەناوناچیّ. من جیّگەیەکم نیە بلّیّم بەگرّی ئەوین دەسوتیّ؛ چونکە هەر خوّم ئاگری روتم‌و لەوئاگرە نەمرانەم کە هەرگیز، کوژانەوی بوّنیەو لەعیشق پرّوداوەستاوو راوەستاوم.

**٧ قەدەحەك تازە ژعیشقیّ د ئەزەل دامەحەکیمی**
**ژیّ دنوشین هەی‌و هەی هیّ بـخوە جامامە لەبالەب**

### مانای وشە:

**قەدەح:** پیالّە؛ **تازە:** زوّرباش‌و عالی؛ **ئەزەل:** هەرەپیّشو؛ **دامە:** دای‌بەئیّمە؛ **حەکیم:** زوّرزانا؛ **حەکیم:** دەسەلّاتدار؛ **حەکیم:** بژیشك‌و لقمان؛ **ژیّ:** لیّ؛ **دنوشین:** دەخویّنەوە؛ **هەی‌وهەی:** دایم‌و دەرهەم؛

**٥ قەیسەری رومێ لسەر حەددی فەرەنگ**
**توق‌و زنجیر ڨەبەستن چەپ‌و راست**

**مانای وشە:**

**قەیسەر:** لەقەبی أمپراتوری روم. روم سەرزەمینی تورکیای ئێستا؛ **سەرحەد:** سنور؛ **فەرەنگ:** فەرانسە یان ئوروپا بەگشتی؛ **توق:** ئاڵقەی ئاسنین؛ **ڨەبەستن:** بەستنیەوە.

**مانا بە تێکڕایی:**

بسك‌و كەزی یارم کە بە زنجیرە چین بەچین‌و ئاڵقە ئاڵقە دەوری روخساری سپی‌و ناسکیان داوە؛ بەوە دەشبهێندرێ کە قەیسەری رۆمێ دەوری وڵاتی فەرەنگانی بەزنجیرو ئاڵقەی لەشکر دەورە دابێ.

**٦ هەردو دەستێن خۆ حەمایل شەڨەکێ**
**مە ژبو یارێ دخۆستن چەپ‌و راست**

**مانای وشە:**

**دەستین:** دەستان، دودەست؛ **حەمایل:** بەندی شمشیرو بەندی نوشتە کەدەمل دەکرێ‌و بە تەنیشت دا دێتەخوار؛ **شەڨەکێ:** شەوێك.

**مانا بە تێکڕایی:**

ئێمە هەمو، ئاوات‌و نیازمان هەر ئەوەبوە کە تەنیا شەوێك لە ژیانماندا هەردوك دەست‌و باسکمان، لە گەردنی یار وەك حەمایەلێ هاڵاباو لەراست‌و چەپەوە بەخۆمانەوە کوشیبا.

**٧ ڨە«مەلێ» سورێ پەری‌یا حوری سرشت**
**صەد مەلەك دەست بدەستن چەپ‌و راست**

**مانای وشە:**

**ڨە:** ئەوە؛ **ڨەه :** عەجەبا؛ **مەلێ:** مەلا؛ **سورێ:** دڵکێشی‌و رۆحسوکی؛ **پەری:** جنۆکەی جوان؛ **حوری:** کیژی بەهەشتی چاوڕەش؛ **سرشت:** رسکان.

**مانا بە تێکڕایی:**

ئەوە (یان، سەیرە) مەلا تۆ ئاواتی دەستەملان بونی بخوازی. ئەو پەریە دڵکێشەی کە وەك حۆری بەهەشتێ خوڵقاوە. هەمیشە صەد خزمەتکاری کچی پاکی وەك فریشتەی خودا دەستیان

بەدەستیەوە یەتی لەراستو چەپەوە پاسەوانی لیّدەکەنو چاوی لیّخافلّ ناکەن تا وەگیر توّ کەویّو دەستە ملانیبیی.

# قصيدەی پازدەهەم

## گوڵباران

١ گەر ژویٚ حوری سرشتیٚ عیشویەك ئیظهار بت
دي ببت ناری خەلیلواللەو دوژەھ ساربت

**مانای وشە:**

**گەر:** ئەگەر؛ **ژویٚ:** لەومێوینە؛ **حوری سرشت:** وەك حـوٚری رسكـاو؛ **عیشـوە:** نازو غەمزە؛ **ئیظهــار:** دیاری‌دان؛ **دیٚ:** بیٚشك؛ **ببت:** دەبێت؛ **نار:** ئاگر؛ **خەلیل:** دوٚسـت؛ **خـەلیلواللە:** دوٚسـتی خـودا. نیاز لە خەلیل‌اللە برایم پێغەمبەرە؛ **دوژەھ :** جەهەننەم؛ **سار:** سارد؛ **بت:** بیٚ.

**مانای تێكڕایی:**

ئەگەر ژیانمان جەهەننەم بیٚ،یان وەك برایم پێغـەمبەر دەناو ئـاگر هاوێژرابین، بەو مەرجـە ئـەو حوٚریە جوان‌چاكە، بە نازەوە گوٚشـەیەكی چـاومان بوٚ دەرخـاو لێمان بڕوانیٚ؛ ئـاگر بە دەردی ئاگرەكەی برایم دەچیٚو تەنانەت جەهەننەمیش‌بیٚ، بیٚشك ساردوسڕ هەڵدەگەڕیٚ.

مەلا لەو شیعرەدا باسـی برایم پێغـەمبەرمان بیردەخـاتەوە كە نەمرود بە تاوانی بت‌شكـاندن خستیە ناو ئاگرەوەو خودا فەرمانی بەئاگردا كە ساردو سەلامەت بەو ئازاری مەدە. دەڵیٚ: منی‌دڵدار، خوٚمو دڵەكەم كەوتوینە ناو ئاگری ئەوینێكـەوە كە هیچ لە ئـاگری نەمرودو بگـرە لەئـاگری جەهەننەمیش كەمتر نیە. جا ئەگەر خـوای كردبا ئـەو نازداری باوانە بەو چـاوانەی بەنازێكـەوە لیٚی‌ڕوانیبام لێمرونە ئـاگرو گڕپەی دڵی منیش، بە دەردی ئـاگرەكەی برایم سـارد دەبوٚوە، بەڵكـە ئەگەر جەهەننەمیشم لە دڵدا بوایە تینی دادەمركا.

٢ وەر ژبەر پەردیٚ یەدی بەیضا بە موعجیز بێتە دەر
شەمس‌و كەوكەب دیٚ هلین عالەم تژی ئەنوار بت

**مانای وشه:**

**وەر:** وە ئەگەر؛ **ژبەر:** لەپشت، لەبن؛ **پەردێ:** پەردەیرا؛ **یەدی بیضا:** دەستی سپی؛ **موعجیز:** ئەوی کەسی تر نیەتی؛ **شەمس:** خۆر؛ **کەوکەب:** ئەستێرە؛ **دێهلین:** هەڵدێن؛ **عالەم:** هەمودنیاجگە لەخوا؛ **تژی:** پڕ؛ **ئەنوار:** ڕۆشنایی گەل.

**مانا بە تێکڕایی:**

مەلا دەیەوێ، دەستی حەزرەتی موسامان وەبیر بێنێتەوە کە موجزات بوەو هەرگا ناویەتە باخەڵیو دەری هێناوەتەوە لەسپیایەتیا شۆقی داوەتەوە.

گوتمان ئەگەر لێیڕوانییام ئاگری دڵم دادەمرد، خۆ ئەگەریش دەستە سپیو ناسکەکەی کە چەپێکی دەبەر دەستە موجزاتە کەیموسا دانیە، لەودیو پەردەوە دەرێنیو پیشانی دنیای بدا، وەك هەمو ئەستێرەو خۆر، وێکڕا هەڵاتبنو روناکایی بدا ئاوا هەمو دنیا پڕدەبێ لە روناکیو شۆق دانەوە.

**٣** **وەر ژعەکسی خەمرییان قەوسو قەزەح دەت یاسەمین**
**دێ گولو رەیحان بیارن، تێکو تێك گولزار بت**

**مانای وشە:**

**عەکس:** تیشکدانەوە؛ **خەمری:** پارچە قوماشێکی سورە کە ژنان پرچیسەر توێڵیانی پێ گرێ دەدەن؛ **خەمری:** ئەو پەرچوکانەیە کە بەسەر توێڵدا دێنو لە ناوەراستی هەنیەدا هەڵدەپاچڕێن؛ **قەوسو قەزەح:** کوڵکە زێڕینە؛ **دەت:** بدات؛ **یاسەمین:** گوڵی یاسەمەنە کە زۆر سپیو زۆربۆن خۆشو زۆر ناسکە؛ **دێ:** بێشك؛ **تێكو تێك:** سەر لەبەر، گشتلە گشت؛ **گولزار:** گوڵجاڕ؛ **بت:** ببیت.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر روخساری یارم ـ کە وەك سەرپەڕی گوڵی یاسەمەنە، سپیو ناسکەو لەبۆن خۆشیدا لەو زیاترە ـ تیشك بداتە دەسرۆکەی سوری لە هەنیە گرێدراوی. یانتیشك بداتە ئەو پرچوکانەی کە بەسەر توێڵیدا هاتونو لە رەشییان دەبریقێنەوە. ئەوسا تیشك بداتەوەو تیشکەبگەڕێتەوە بۆسەر گۆنایار کەوەك پەڕی سورە گوڵە. ئەوەندە ڕۆشنایی رەنگاورەنگ پەیدا دەبن کە کوڵکە زێڕینەی لێ دروست دەبێ. کوڵکە زێڕینەش، نیشانەی پاشبارانەو بارانەش هۆی شینبونی گیاو گوڵو ریحانە. کەوابو هەر کەیار روی نیشانبداو خەمریو پرچوکان روناكبکاتو ئەوانیش تیشکی بگەڕێننەوە، هەمو دنیا سەرلەبەری دەبێتە گوڵجاڕو لە هەمو شوێنان گوڵو ڕێحانە بەبارەو خۆشیو گەشی دادەبارێ.

٤ شەمع دیٚ جان‌دەت ژشەوقیٚ بیٚتەبەر صوبحیٚ نەفەس
نارت ئاخر گەر بـەمویەك بەحسی زولفا یاربت

**مانای وشە:**

**شەمع**: مۆم؛ **دیٚ**: بی‌شـك؛ **جـان**: گیان؛ **دەت**: بدات؛ **بیٚتەبەر**: بچتەوە بەر؛ **صـوبحیٚ**: سـبەینیٚ؛ **نەفەس**: هەناسە؛ **نارت**: ناگاتە؛ **ئاخر**: دوایی؛ **گەر**: ئەگەر؛ **بەحس**: لیٚدوان؛ **زولف**: کەزی.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر هەر لە هەوەڵی شەویٚرا، دەس‌بکریٚ بەباسی تاقە مویەك لە زولفی‌یار شەو خـەلاس دەبی، بەرەبەیان هەناسە دەداتو رۆژدەبیٚتەوە مۆم دەتویٚتەوەو دەکوژیٚتەوە. بەڵام تاریفی جـوانیو دریٚژی ئـەو تەنیاموە، هەر دریٚژەی پی‌دەدریٚو بەکەس نابریٚتەوە. هەر لەم مانایەدا، شـاعیریٚکی فـارس گوتویە: رۆژی قیامەت کەدەڵیٚن دریٚژیەکەی هەزارساڵە، چـی دەگەڵ دڵی پڕلە گازندەی ئیٚمە پیٚ دەکریٚ؟! ئەوا سەری زولفی تۆ، بەداستانی دڵداری ئیٚمە کورت بوٚتەوە.
«نالی خۆشمان، چەند خۆشی فەرموە کە دەڵیٚ:

هەر پەرچەمو پیشانی‌یە فکری شەوو رۆژم      هەر گەردنو زولفە ئەمەلی دورو دریٚژم

٥ سیلسیلا بەحسیٚ ژخونا دل بەران زولفا بەچین
دیٚ خەتا بت نافێ میسك ئەر نافەیێ تاتار بت

**مانای وشە:**

**سیلسیلە**: زنجیرو زنجیرە؛ **ژخونا**: لەخوێنیٚ؛ **بەران**: لەسـەرئـەو؛ **بەچین**: چیندار؛ **خـەتا**: غەڵەت؛ **ناف**: ناو، اسم؛ **میسك**: میشك؛ **ئەر**: ئەگەر؛ **نافە**: ناوکی ئاسکی میشـك؛ **خـەتا**: ناوەبۆ مەڵبەندەکانی باکۆری چین. کە ئیٚستا بریەتیە لە مەنچۆریو مغولستانو تورکسـتانی رۆژهەڵاتی؛ **تاتار**: ناوی عەشـایریٚکی‌تورکە کە بە وڵاتەکەشیان تاتار یادەڵیٚن؛ **میسك**: نەوعیٚك ئـاسك هەیە، کە لە هەڵاتنو ماندوبونی زۆرەوە، خـویٚن دەناوکیەوە دەتزیٚو خـویٚنەکە رەش هەڵدەگەریٚو وشـك دەبیٚتەوەو وەك دەناو کیسـەیەك دابیٚ، بەناوکیەوە تەکەتەکی دیٚو لەدواییدا، لە غاردانەدا لیٚی دەکەویٚت. ئەو خویٚنە وشك هەڵاتوە، عەطریٚکی زۆر بوٚن‌خۆشەو ناوی لی‌نراوە؛ **میسك**: یان، **میشك** یان، **موشك**. جـا وا زانراوە کە ئـاسکی دەشـتەکانی چینو خـەتاو تاتارستان میسکی هەرەچاکیان لی‌بەرهەم دیٚت.
مەلا لەو بەیتەدا، گاڵەی کردوە. زۆر لە وشەکانی، دوجار دەبیٚ مانا بکریٚن؛ **خەتا**: هەم وڵاتی خەتا، هەم غەڵەت؛ **چین**: هەم وڵاتی‌چین، هەم چین‌چین‌بونو بەسەریەکدا شکانی موی کەزی.

**پوختەی مانا:**

خویٚنی دڵی دڵداران، کە لەتاوی کەزیە رەشە پڕچینە چین لەسەرچینەکەی ئەو نازدارە، هەڵقوڵاوەو

رژاوەو بەو تاڵە زولفانەوە بەندە؛ ئەوەندە لەسایەی زولفی تۆوە بۆنی خۆش‌بوە کە هەرکەسێك باسی میشکی ناو ناوکی ئاسکی چین‌و خەتاو تاتار بکاو بڵێ‌ئەو خوێنی دڵەو ئەو میشکی ئاسکە وەك یەکن، غەڵەت دەکاو بە هەڵەدا چوە. بۆنی خوێنی دڵمان بەهەوای زولفت هەزارقات لەبۆنی خوێنی وشك هەڵاتوی ناوکی ئاسکی میشك خۆشترە.

٦ طەوقی گەردەن حەلقەیی زوننارێ زولفا یاری من
دی‌کلیتا کەلبی عشقێ حەلقەیا زوننار بت

**مانای وشە:**

**طەوق:** قەڵادەی مل؛ **حەلقە:** ئاڵقە؛ **زوننار:** کەمەر بەندی ئاوریشمی خاچپەرستان؛ **کلیت:** کلیل، هاچەر؛ **کەلب:** سەگ.

لەم بەیتەدا مەلا، داستانی شیخی سەنعان‌مان بیردەخاتەوە، کە بۆکچێکی خاچپەرست، دەستی لەدین هەڵگرت. قورعانی سوتاند. شەرابی خواردەوە. زوونناری بەست. بوبە بەرازەوانیماڵی دڵبەری. مەلا دەگەڵ ئەوەشدا کە وەفاو ئەمەگی شیخی سەنعانی بەرانبەر بەگرەی ئەوین بەلاوە پەسندە؛ خۆی لە ئەوینداریدا ئەمەگدارتر نیشان دەداو دەڵێ‌من خۆم بەسەگی ئاستانەی دڵبەر دەزانمو ئاواتم ئەوەیە قەڵادەی ملمو قفڵو ئاغزونەکەی لە ئاڵقەیەکی زوونناری بەژنی یار بێ. جا چونکە پرچو کەزی یاری من لەناو قەدی هاڵاوەو احتیاج بە کەمەربەندی ئاوریشم‌نیەو هەر زولفە پرچینەکەی جێگەی زوونناری بۆ پڕ کردوتەوە من‌ئاڵقەی زولفیم بەنصیب دەبێ. ئەگەر راستیشت دەوێ قفڵ‌وکلیلی قەڵادەی سەگی ئاستانەی عیشقێ هەر دەبێ ئاڵقەی زولف بێ. زۆر لە صوفیان دوعایان کردوە کە خودایە، واپکەی وەك سەگ وەفادار بم.

**پوختەی ماناکە:**

با تۆقی‌گەردنم ئاڵقەی زوونناری زولفی یارم‌بێ. ئاخر هەر دەبێ قفڵی قەڵادەی سەی عیشقێ ئاڵقەی ئەو زوننارە بێ، کە زولفیەتی. «مەحوی» دەڵێ:

دەگەڵ دەستی مەلا رێك ناکەوێ زوونناری زولفی یار
وەکو شیخ ئیختیاری مەزهەبی تەرسا نەکەم چبکەم؟!

مەولەوی تاوەگەوزیش فەرمویە:

بێ‌تەناب زولف مەحبوب نەگەردەن    حەیفەن وەقابض گیان تەسلیم کەردەن

٧ عەقدی ئیحرامێ دعیشقیدا کوپیری عیشق بەست
دی چفەم گەر خەرقە رەهنی خانەیی خەممار بت

**مانای وشە:**

**عەقد:** نیەت هێنان؛ **ئیحرام:** رۆژانی جەنگەی حەج کە حەجاج جلکی خۆیان فڕێ دەدەن‌و بەشتەمانو

فۆتە دەبەر دەکەن؛ **پیری عیشق:** مامۆستاو ڕێبەری عاشقان، (یان، ئەوی لە عیشقیدا پیربوە)؛ **بەست:** دابەست؛ **دی:** ئیدی، ئیتر؛ **چغەم:** قەیدی چیە، چدەبێ؛ **خەرقە:** باڵاپۆشی پڕپینەی دەروێشان؛ **رەهن:** بارمتە؛ **خانە:** ماڵو دوکان؛ **خەممار:** بادە فرۆش.

**مەلا دەیەوێ تەریقەتی خۆی، لە تەریقەتی وشکە سوفیە ڕواڵەتبینەکان، جیا کاتەوە. دەڵێ: ئەوان دەچنە حەج. نیەتی ئیحرام دادەبەستن. بۆ ئەوە دەوری ماڵی کابە بدەن جلکەکانیان دادەکەنن و تورێ هەڵدەدەن.** ئێمەش بەشوێن پیری تەریقەتی عیشقدا حەجی خۆمان هەیە. کابەی ئێمە ماڵی یار نیە، بەڵکو خودی یارەو یارەکەش لەهەمو جێگا هەیەو لە هەمو ئاقارانەوە دیارە... لە حەجی خۆماندا، ئەگەر پیری تەریقەت نیەتی ئیحرام دادەبەستێو ئێمەش پەیڕەوی لێدەکەین. هەموشتێکمان تەنانەت دنیاو قیامەتو ئاواتی بەهەشتو ترسی جەهەننەمیشمان تورهەڵدەدەینو تەنیاو تەنیا یارمان لەبیرەو یار دەپەرستینو هیچیتر. جا لەوەختی وادا کە خەرقەو مەرقە، فڕێ دەدرێو تازە نامان گەرەکە، چی ئەبێ ئەگەر ئەو خەرقەیە لە دوکانی شەراب فرۆشدا، لە گرێوی شەراب داندرابێ؟! بگرە لەوەچاترە کە بەخۆرایی فڕێی بدەین. ناشبێ لۆمەی شێخیسەنعان یامن، یاهەر ئەویندارێکی ڕاستی دیکە بکرێ کەچۆن جبە بەزونار دەگۆڕینەوە. بەلای ئێمەوە یار، لە هەمو شوێنێکەو هەموشت نوێنەری یارە. حافظ شیرازی کە یەکێك بوە لە دەستەی ئەو دڵدارانە دەڵێ: لە مەیخانەی زەردەشتیاندا نوری خودا دەبینم.

**٨ گەزمەیەك قەوسێ شەڤین عاشق بەنیڤا دل کەڤت**
**دێ ژجان دەستان بشوت خاسما کەڤان نوباربت**

**مانای وشە:**

**گەزمە:** سەرەتیری چەقۆیی؛ **قەوس:** کەوان؛ **شەڤێن:** دەشەوێدا؛ **شەڤین:** چەماو؛ **نیڤ:** ناوەڕاست؛ **کەڤت:** بکەوێ؛ **دێ:** بێشك؛ **ژجان:** لەگیان؛ **دەستان بشوت:** دەستان دەشوا؛ **خاسما:** خوبە تایبەتی، مخصوصا؛ **کەڤان:** کەوان؛ **نوبار:** هەوەڵجار؛ **نوبار:** کچێکی تازە مەمکی خڕکردوە.

**پوختەی مانا:**

ئەوینی ڕاستەقانی (عیشقی حەقیقی) کارێك بەسەر ئەویندار دێنێ کە ئەوە هیچ هۆشو دینی لێدەستێنێ، بگرە هەر خودی خۆشی لەبیر نامێنێو دەبێتە زیندوێکی مردو یان مردوێکی زیندو. ئەوانەی بەئاگری ئەم ئەوینەوە نەتلاونەوە، نازانن خەبەر چیە... ئەگەر سەرە تیرێکی عشقێ لە برۆیەکی کەوانی چەماوەدا، لە نیوەشەوێکا ناوەندی دڵی دڵدارێك بپێکێ. ئەو دڵە دەس بەجێ دەست لەگیانی خۆی دەشوا. خۆ نەخوازەو بەتایبەتی کە ئەو تیرە لە کەوانی برۆێ کیژۆڵێکی تازە مەمك خڕکردو دەرچێو ئەوە هەوە ڵجاریش بێ کە دڵەکەی کردوتە نیشانە. چونکە هەوەڵ نیگای

پێك گەیشتنی دڵدارو دڵبەر هەرگیز شوێنەواری کوێر نابێتەوە. ئەو هەوەڵ تیری نیگـایە، لە هەمو برینگەرێك کاریگەرترەو لای عاشق پیرۆزترین شتە. مەولەوی تاوەگەوزی دەفەرموێ:

بیٚزام خەدەنگ مژەی مەهروان     نەنگەن وەسارای قیامەت لوان

واتا پیاو برینی تیری مژۆڵی مانگ روخسـارانی پێوە نەبێ، زۆر شـەرمو شـورەییە بڕوا بۆ دەشـتی قیامەت

**٩ وەر ژقەوسەینان بەمیزان بێتەدەر جوتەك خەدەنگ**
**دێ جگەربت پارەپارە، سینە تارو مار بت**

**مانای وشە:**

**وەر:** وەئەگەر؛ **ژقەوسەینان:** لە دو کەوانان؛ **بەمیزان:** بەرێكوپێکی؛ **جوتەك:** جوتێك؛ **خەدەنگ:** تیر؛ **جگەر:** جەرگ؛ **بت:** دەبێت؛ **پارەپارە:** لەتلەت؛ **تارومار:** تەرتوتونا.

**پوختەی مانا:**

گوتمان ئـەگەر سـەرەتیرێك لە کەوانی بڕۆوە وەناوەندی دڵ کەوێ، دڵ دەسـت لەگیان دەشـوا تیرێك لە کەوانەوە واتا ئەگەر گۆشەی تاکە چـاوێکمان بداتێ. ئـەدی ئـەگەر یار چـاومان پێ هەڵێنێو بە هەردوك چاوە مەستەکانی لێمان بڕوانێ، ئەوسا دوتیر بەرەو هەناومان دێنونیشانەش ئەپێکن. چونکە میزان کراونو سێرە پێگیراون. ئەو کاتە جگە لەوە دڵ دەسـت لەگیان دەشـوا، هەم جەرگیش لەتلەت دەبێو هەم سینگو هەرچی لەبن سـەرپۆشـی سـنگدایە، دادەفـەتێو تەرتو تونا دەبێ.

**١٠ خون ژمیلاکێ بدەربا خەنجەرێ گەربیتە دەر**
**بو شەهیدی عیشق ئیدی دێ ژکو هشیار بت**

**مانای وشە:**

**خون:** خوێن؛ **میلاك:** جەرگو هەناو؛ **دەرب:** لێدان؛ **شەهید:** کوژراوی رێگەی راسـت، (یان، کوژراوی خۆشەویست)؛ **ئیدی:** ئیتر؛ **ژکو:** لەکوێ؛ **هشیار:** لەسەر هۆش.

**پوختەی مانا:**

ئەوانەی بەدەردی ئەوین دوچار نەبونو ئاگایان لە حاڵی من نیە، لۆمەم دەکەن کە بۆچی هۆشـت لەسەر خۆتنیە؟ بۆوڕاوەدەکەی؟ بۆباسی زوننارو شەرابو مەراب دەکەی؟ کورە ئـاخر کەسـێکی بەخەنجەری تازەسـاوی گۆشـەی برۆومژۆڵی دڵبەرێکـیوا نازدار جـەرگو هەناوی کەوتبێتە

دەشتەوەو بوبێتە شەهیدی ڕێگای ئـەوین؛ چـۆن دەتانەوێ هۆشـی دنیای دەسـەردا بمێنیٚو وەك ئێوەی بیٚ خەبەر پێتان خۆشە، بتان دوێنیٚ؟؟!

١١ دیٚژوان لەعلان شفایی دل بقانون تەلبە کت
دا ئیشارەت خۆش بکن هەرچی کەسی بیمار بت

**مانای وشە:**

**دیٚ:** لازمە، واباشە؛ **ژوان:** لەوان؛ **لەعل:** گەوهەرێکی رەنگ ئاڵە شاعیران لێوی ئاڵی گەشی یاریان، پیٚ شبهاندوە؛ **شفا:** لە نەخۆشی چاك بونەوە؛ **قانون:** رێوشوێن؛ **تەلبە:** داوا؛ **کت:** بکـات؛ **ئیشـارەت:** دوان بەدەست یا بەچاو؛ **خۆش:** ساغ؛ **بکن:** بکەنەوە؛ **بیمار:** نەخۆش‌و لەش‌بەبار.

نابیٚ ئەوەشمان لەبیربچیٚ، کە «ئـەبوعەلی‌سـینا» یان «ابن‌سـینا»، بۆ حـەکیمی زانین لە هەمو کەس بەناوبانگتر بوەو بە نمونەی حـەکیمی هەرە گەورە، ناوی هاتوە. ئـەبوعەلی سـینا، سـیٚ کتێبی بەناوی: «ئیشارات»، «قانون»، «شفا» نوسیوە. مەلا ناوی ئەو کتێبانەشـی بردوەو هەریەك لەوناوانە دوجـار دەبیٚ مانایان لێدرێتەوە.

**پوختەی مەبەست:**

ئێمە کە تائێستا هەر باسـی تیر وەدڵ کەوتن‌و جـەرگ لەتبون‌و هەناو بەخـەنجـەر دەر هاتنمان کرد؛ نابیٚ لامان وابیٚ کە دڵبەر هەر وازی لە جزیادان‌و کوشتن‌و برینەو دڵخـۆشی بە دیمەنی زام‌و برینە. نەخێر یار هەروەك دەردمان بۆ دەنیریٚ دەرمانیشـی لەلایە. ئـەو بریندارو لەش بەبارەی کە باری گرانی دڵداری لەسـەرشـانەو باری هەژاری لەسـەر لێوانەو هێندە دەردی گرانە، کە بەکتێبەکانی ئەبوعەلی سینا، ئیشارات‌و شفاو قانون چاری نایە. چـاریان والای جـوتە لێوی ئـاڵی بەرەنگـی لاڵن. بزەیەکی ئـەولێوانە، دەرمانی هەمو دەردانە. هەرکەسـیٚ دەردەدارە، بالەبەر ئـەو لێوانە بپارێتەوە تا لەش‌ساغی بەسەر بگرێتەوەو لە هەمو کەس چاکتر بێتەوە.

١٢ بولبولی مەجروحی عیشقیٚ تاقەتا خاران نهن
دیٚ کولاڤا رێشی‌سینە بشکوەك بیٚ خار بت

**مانای وشە:**

**مەجـروح:** زامدار؛ **کولاڤ:** چنگـورکی باڵندەی راوکەر؛ **ریش:** زام؛ **بشکـۆ:** خـونچەگوڵ (یان، گلوکی داری بەری)؛ **خار:** درك؛ **تاقەت:** تابشت؛ **نهن:** نیە.

**پوختەی مەبەست:**

دەست لە لۆمەم هەڵگـرن. بولبولێکـی کە دڵی زامداری تیری ئـەوینە، هێندە دڵناسـك بوە، کە

تاقەتی تێراچونی دڕوی سەرکۆنەو لۆمەی ئەغیاری پێوە نەماوە. بەڵکو ئەگەر خونچە گوڵێکی بێ‌دڕکیشی، وەسینگی کەوێ، وەك بەچنگورکی باڵدارێکی گۆشتخۆر لیی‌درابێ، دەروشێ. واتا، گوڵیشی‌وێ کەوێ بریندار دەبێ. لێرەدا چیرۆکی مەنصوری هەلاجمان بیر دەخاتەوە. کە خەڵك بەردو تیریان تیٚ‌دەگرت. جونەیدی بەغدادی کە هەواڵو هاودەردی‌بو، خونچە گوڵێکی پێدادا. هاواری کرد. گوتیان: بۆتیر ناناڵی، چۆن لەگوڵ دەناڵی. گوتی گوڵێك دوست پیٚتدا بدا، لە هەزار تیرو شیری بێ خەبەران بەژانترە.

١٣ هەر دلێ بازی صیفەت دێ صەیدێ تەیهو نك وەبێ
فەررو پەروازی هومای‌و پەنجەیی شنقار بت

**مانای وشە:**

**بازی:** بازی راوی؛ **صیفەت:** رەوشتو ئاکار؛ **دێ:** بێشك؛ **صەید:** نچیر؛ **تەیهو:** سوێسکە؛ **نك:** کن؛ **وە:** ئێوە؛ **فەرر:** شکۆو گەورەیی؛ **پەرواز:** فڕین؛ **هوما:** پیرۆزە، باڵداری بەختەوەری؛ **شنقار:** شمقار، کە وەك باز دەچێو لەباز گەورەترو بەهێزو گوڕترەو لەراو چابکترە.

**پوختەی مەبەست:**

هەردڵێکی کە ئاکاری لەناو خەڵکا، وەك ئاکاری بازەدەناو مەلانداو چاوی لە بەرەژور چونەو بەرزە فڕو بەدەمارەو ڕێگەی خوی باش شارەزایە؛ حەزو منە دەکا کە تەنانەت بۆسوێسکەیەکی ئاستانەی تۆش بیێتەنێچیر، هەر ئەوەندە لە تۆنزیك بێو جارێك چاوی پیٚت بکەوێ. چونکە دەزانێ نێچیری بەردەستی تۆ حەتتا ئەگەر سوێسکەیەکیش بێ، شکۆو پایە بەرزی پیرۆزەی پیرۆزو هێزو گوڕو چابکی شمقاری وەگیر دەکەوێ.

١٤ یار دێ حاکم بتن قەولی رەقیبان گۆهنەکت
شاهی مولکی دلبەری دێ فاعیلەك موختار بت

**مانای وشە:**

**بتن:** بیێ؛ **دێ:** دەبێ؛ **قەول:** گفت؛ **رەقیب:** چاو نەزێرو شوفار؛ **گۆهـ** : گوێچکە؛ **نەکت:** نەکات؛ **فاعیلی موختار:** خاوەن دەسەڵاتی بێ‌پرس‌وڕا. هەرچی بیەوێ بیکاو کەس نەتوانێ چۆن‌و بۆچی پێ‌بڵێ.

**پوختەی مانا:**

شکایەتم لەوانە نیە کە لای یار خراپەم دەڵێن. بۆرە گلەییم لە یارە، کە بۆچی ڕێگا دەدا لای ئەو خراپی من بڵێن. ئەویارە کە هەر خۆی حاکمە و دەبێ حاکمی مولکی دڵبەری کاران بە کەیفی

خوێ بکاو گوێ نەداتە بوڵەو شەیتانی کردنی کەس.

**١٥ دل بخولمێ ناسوژێ غەنجو خەتو خالن ددل**
**خەیرخواهی دەولەتێ میری ژوان گوهدار بت**

**مانای وشە:**

**ناسوژێ:** ناسوتێ؛ **غەنج:** ناز؛ **خەتو خال:** خاڵومیل؛ **خەیر خواە:** چاکە خواز؛ **گوهدار:** گوێدێر.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر گازندەم هەیەو خۆم ناوناوە دڵسوتاوی ئەوینێ، مانای ئەوە نیە زوڵمو ناهەقیەکم لێکرابێ. نەخێر، دڵیمن کە پڕە لە نازو خەیاڵی خەتو خاڵیدڵبەر و ئەوانەش هەموی خێرو خۆشین؛ ئاگرو سوتان ناتوانێ روبکاتە دڵمەوە لەبەر ئەوان. بەڵام خۆ دیارە نازو جوانی ئەو کە خەیاڵیان لە دڵمایە، پایەداری ئەو جوانیە دەخوازنو بۆ خونکاری موڵکی عیشق، خێر خوازن، باگوێ لەوان بگرێو ئەو دڵەی کە هێلانەی نازو خۆشەویستی خەتو خاڵی ئەوە توزێك بلاوێنێتەوە.

**١٦ تەیریدل بێ توعمەیەك (یان، بێتەمعەیەك) نایێتە دەست شەهزادەیان**
**قوشچیێ شاهین ددەستێ دێ دبێ ئازار بت**

**مانای وشە:**

**تەیر:** باڵدار، مەل؛ **توعمە:** چێژە؛ **تەمعە:** تەماح؛ **قوش:** باشوکە: **قوشچی:** بازەوان؛ **دێ:** لازمە، پێویستە؛ **دبێئازاربت:** بێئازاربێ.

**پوختەی مانا:**

شازادەو نەجیمزادەکان، لە راوکردنی مەلاندا، رێو شوێنیان وایە کە تەماح وەبەر مەلان دەنێنو چێشکەیان دەدەنێ تا بکەونە داویانەوەو راویان بکەن. بازەوانی شازادان، کە بازیان شاهێنی لە سەر دەستە، دەبێ مەلی راوکراو ئازار نەداتو بە نەژاکاوی بیداتە دەست ئاغاکەی خۆی.

جا کە منو دڵم بە خۆشی خۆمان بوینە نچیری خەتو خاڵو ئاڵوواڵایتۆ، پێویستە تۆش لە رێوشوێن کەنار نەگری. تەماحێکمان وەبەر بنێی. تامی دەمی دڵمان بەگفتێکی شیرن خۆش بکەی. کارێك بکەی کە ئازار نەبینینو بەدەستی نەزانانەوە نەژاکێین.

**١٧ بەندەیی باخوێ بڤێت دێ مەیلی سیمو زەر نەکەت**
**داعەتایا پادشاهان بێحەدو ئەژمار بت**

**ماناى وشه:**
**بەندە:** كۆیلە؛ **باخوى:** خودا، خـودان؛ **دىٰ:** پێویـستە؛ **سـیمو زەرٚ:** زێوو زێڕ؛ **عەتا:** بەخشش؛ **پادشـاه:** خونكار؛ **حەد:** سنور؛ **ئەژمار:** ژمارە.

**پوختەى مانا:**
وادیارە مەلا لەوەندە داوایەشى لەیار پەشیمان بوٚتەوە. دەڵێ من كۆیلەم. كۆیلەش ئەگەر خودایان خودانیخوٚى بوىٚ، نابىٚ زێڕو زێوو دنیاو خوٚشى خوٚىلىٚداواكا. چونكە ئەو دەمە بوٚ خوٚشەویستیە خالیسەكەى شـەریك پەیدا دەكا. ئـەگەر كۆیلە هیچـى داوانەكردو هەر بوٚ رەزاى خـاوەنى كارى كردو چیترى نەگرتە بەرچاو، لەلاى خـونكارى خـاوەنى زوٚر بەرێز دەبىٚو بەخششـى لەسـنورو هەژمار بەدەرى بەسەردا دەبارێنىٚو لەخەمو پەژارەى دەردێنىٚ.

۱۸ **سار دبت دل ما بـصەد جەورو جەفایان ذەررەیەك**
**عیشق طەبعەت نارە هنگىدىٚ بچت دژواریت**

**ماناى وشه:**
**سار:** سارد؛ **دبت:** دەبىٚ؛ **ما:** مەگەر؛ **ذەررە:** توٚزقاڵ؛ **طـەبعـەت:** مزاجو تەبیات؛ **نار:** ئـاگر؛ **هنگـى:** هەرچەندە؛ **دىٰبچت:** خەریكبىٚ، بەردەوام بىٚو پێوەبچىٚ؛ **دژوار:** چەتونو سەخت.

**پوختەى مانا:**
جا ئەوە گوتیشم ئازار دەبینم. جا ئەوە پاڕاشمەوە كە گوىٚ بوٚ شـوفارو چاونەزێران مەگرە. بەڵام ئایا ئەگەر صەد ئـەوەندەش ئـازارو دەردبچێژم، مەگەر دڵم لەئـەوین سـارد دەبێتەوە؟ نەخێر توٚزقاڵێكیش چیە، سارد نابێتەوە. چونكە مزاجى ئەوین ئـاگرینەو بڵێسـەى ئـاگر هەتا بچـىٚو بەردەوامبىٚ، بەرزترو بەتینترو دامركانى دژوارترو سەختتر دەبىٚ.

۱۹ **لەشكرى عالەم مەگەر یەكسەر تەدوژمن بن «مەلا»**
**غەم بەمویەك ناكشینى گەر تەدلبەر یاربت**

**ماناى وشه:**
**مەگەر:** گریمان، فەرزەن؛ **یەكسەر:** سەرلەبەر، بەگشتى؛ **تە:** لەتوٚ؛ **غەم:** كەسەر؛ **ناكشـینى:** ناكێشـى؛ **تە:** توٚ.

**پوختەى مانا:**
مەلا گلەیى كردن لە لوٚمەكەرانو لە جـەورو ئـازاركێشان، شـتێكى زیادە. توٚ كە دڵت داوە بەو

دڵبەرە، گریمان تەواوی هۆردوی دنیا بێتە دوژمنت. تۆ لەخـۆشی ئـەویندارییەکەت قـەت بەقــەد تۆزقاڵێکیش خەم ناخـۆیو کەســەر هەڵناگری. پیاو یاری وای هەبێ چـۆن گوێ بە دەردو ئـازار دەدات؟

«مەحوی» دەفەرموێ:

لەسەرتۆم دوژمنە دنیا قەضیّە مانیعول جەمعە

کە تەرکی تۆنەکەم تەرکی هەمو دنیا نەکەم چبکەم

## قصیدەی شازدەهەم

# ئیکسیری ئەوین

١ قەلبیّمە شوبهی زیّر ژفەیضاتە جەلا گرت
ما روسیەهو صیفرصیفەت رەنگی صەفا گرت (یان، رەنگی صەدا گرت)

**مانای وشە:**

**قەلب:** دلّ؛ **قەلب:** قەلّبو بەدەلّ؛ **شوبە:** وەك؛ **فـەیض:** بەرەکەت؛ **جـەلا:** مشـتـومالّ؛ **صـیفر:** مس؛ **صەفا:** صافیو رۆشنی؛ **صەدا:** ژەنگ؛ **ما:** ئایا؛ **ما:** مایەوە.

**مانا بە تیّکڕایی:**

دلّی ئیّمەی قەلّبو دەغەزدار، کە وەکو مسی ژەنگـاوی لەژیّر باری گوناهان دا رەش هەلّگـەڕابو، ئیّمەی توشی رورەشی کردبو. لەئـاوڕویّدانی پڕ بەرەکەتی تۆرا، وەکو زیّڕی مشـتـو مالّ کراوی لیّ بەسەر هات. (یان، ئاخۆ قەت رویداوە شتیّکی مس‌ئاسایی رەش هەلّگەڕاو ببیّتە زیّڕی صاف؟ بەلّیّ دلّی من ئەو مس ئاساییەبو کە لە بەرەکەتی تۆوە کراوە بە زیّڕی بیّ خەوش.

٢ تەشبیە بـجەدوەل مە دنیڤ ئاتەشی عیشقیّ
دل قەلبیّ حەقیقەت بتـو ئیکسیریّ هەما گرت

**مانای وشە:**

**تەشبیە:** ویّچون؛ **جەدوەل:** جۆگەلەی‌بچوك؛ **نیڤ:** ناوەند؛ **ئاتەش:** ئـاگر؛ **عیشـق:** ئـەوین؛ **قـەلب:** وەرگەڕان؛ **حەقیقەت:** راستینە؛ **هەما:** بەهاسانی، هەروەها.

**مانا بەتێکڕایی:**

ئێمە دەناو ئاگری ئەویندا توابنەوەو وەك ئاوی ناو جۆگە رەوان بوین‌و دڵمان کەوەك مسی ژەنگاوی‌و رەش وابو، وەرگەڕا بە تواوەیەکی بێ‌خەوش‌و ئەوسا بەهاسانی ئیکسیری ئاوردانەوەو بەزەیی توی وەرگرت‌و کرا بە زێڕی صاف‌و دورلە قەڵبی‌و دەغەڵی.

٣ سالیك کی‌یە؟ هاتی ژمەجازی ب حەقیقەت
صورەت نەشوناسی‌یو بەمەعنی نەفەنا گرت

**مانای وشە:**

**سالیك:** رێڕەو، رێبوار؛ **هاتی:** هاتو؛ **مەجازی:** رواڵەتی؛ **صورەت:** شکڵ؛ **مەعنا:** ناوەرۆك؛ **فەنا:** لەناوچون، تێداچون.

**مانا بەتێکڕایی:**

رێڕەوانی رێگەی خوداناسین کێن؟ ئەوانەن کە بەئەوینی دنیاییەوە گیرۆدەبون‌و لە جوانیەکی کە خوا بە دڵبەرانی داوە، کەوتونەتە سەر ئەوینی ئەو جوانی دەرەو بونە دڵداری خوداو ئەوسا بە تەواوی لەناو ئەوینی خواییدا، تواونەوەو هەروەك نەبوبن، وایان بەسەرهاتوە کە پێیان دەڵێن «فەنا فی‌اللا» بون. بەڵام ئەو کەسانەی کە هەر بەدەم دەڵێن خواناسین، بەڵام نەخودایان لەشکڵی جوانان دا دیوەو نە بەباطن گەیشتونە تاوانەوە لەئەوینی خواییدا بەرێرەو حیساب ناکرێن.

٤ تەنها نەلمن لامیعی حوسناتە شەفەق‌دا
عالەم بخوەوێحوسنو جەمالێ دخوەدا گرت

**مانای وشە:**

**لامیع:** بریقەدەر؛ **حوسن:** جوانی؛ **شەفەق:** روناکی کەنارەی عاسمان؛ **شەفەق:** بەزەیی؛ **عالەم:** جگە لەخوا هەموشتێك.

**مانا بە تێکڕایی:**

من وتم لە بەرەکەتی تۆ، مسی رەش‌و ژەنگاوی بوم، بومەزێڕی صاف. گوتم صوفی بەراستی کەسێکە تۆلەروی دڵبەراندا بەدی دەکاو دەبێتە عاشقی خۆت‌و لەتۆدا، دەتوێتەوە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێ، کە هەرمن هەستم بەجوانی تو کردبێ‌و بەس. هەرچی هەیەو ئافەریدەی تۆیە وەکو من، بریقەی جوانی تۆی دیوەو جوانی‌و دڵرفێنی تۆ، هەمو دنیای داگرتوەو تۆی کە بەزەت بە

کەسێكدا بێت، لە ئەوینی رواڵەتەوە دەیخەیە سەر ئەوینی راستینی خواپەرستیو دەیتاوێنیەوە.

٥ تەیغون ددەستیتە زەهی دەولەتو ئیقبال
هەرچی تەبری دام دتۆرا خوەهوما گرت

**مانای وشە:**

**تەیغون:** وادیارە مەلێکی دەشتی بێت کە راو دەکرێ. بەڵام من لە فەرهەنگاندا، نەم دیتەوە. وا بیردەبەم، تەیهو بێ کە تەیهو بە سوێسکە دەڵێن...؛ **زەهی:** های لەو، ئای چەند؛ **دەولەت:** بەخت؛ **اقبال:** رووداو، بەخت؛ **دام:** داو؛ **تۆڕ:** داوی بەگەوی هەراو؛ **هوما:** پیرۆزە. کەمەلێکی ئەفسانەیەو گوایە سێبەر لە هەرکەس بکا، دەبێتە فەرمانڕەوا.

**مانا بە تێکڕایی:**

سوێسکە بکەوێتە ناو دەستی تۆ دەبێ بە بەختو سەرکەوتنی خۆی بنازێ. هەرچی بە داوی تۆ بگیرێو بکەوێتە تۆڕی تووە، خۆی بە هوما دەزانێ. دەیسا چلەوە خۆشترە، پیاو گیرۆدەی داوی تۆ بێ.

٦ جانێ خوە مەکر دانەیی داڤا کوڤەدایی
ئاهو صیفەت ئەو پێ حەسیا راهی خەطاگرت

٧ عەنقا نەشکارا کەسە داڤان تو بچین ڤەر
داڤا کو لەعەنقا توڤەدی بادی هەوا گرت

**مانای وشە:**

**جان:** گیان؛ **دانە:** دەنك؛ **ڤەدایی:** نراوەوە؛ **ئاهو:** ئاسك، مامز؛ **حەسیا:** هەستی کرد؛ **خەطا:** هەڵە؛ **خەطا:** مەڵبەندێکە؛ **عەنقا:** سیمرغ؛ **شکار:** راو؛ **بچین ڤەر:** هەڵ بچنەوە، کۆکەرەوە؛ **بادی هەوا:** خۆڕاییو هیچ.

**مانا بە تێکڕایی:**

ئێمە بەتاسەوە ویستمان گیانمان بەو دانەو داوەوە بکەین کەنراوەتەوەو ببینە نێچیری تۆو بەبەختی خۆمان بنازین. بەڵام بەداخەوە گیانمان وەك ئاسکی سڵ، بەبێ ئەوە بزانێ ئەو دەداو کەوتنە، چەند مایەی بەختەوەریو شانازیە؛ هەر هەستی بەداوکرد رەویەوەو خۆی گەیاندە مەڵبەندی خەطاو رێگەی هەڵەی گرتەبەرو لەقەی لەبەختی خۆیدا، ئێمە بەهەڵە چوبوین، کە بە خەیاڵی خۆمان، دەتوانین ببینە نێچیری بەردەستی تۆ. واتا ئێمە داومان دەنایەوە کە ئەو

بەختەوەریەمان دەسکەوێ. بەڵام زۆر بەهەڵە چوبوین. هاتنە ناو تۆڕی‌تۆ، وەك ئەوە وایە، کە ئێمە سیمرغ بەداو بگرین. دەیسا داوو بەهانە کۆ کەرەوە سیمرغ بۆتۆ ناگیرێ‌و هەرکەس داو بۆ سیمرغ بنێتەوە هەربا بەدەستو دەم لەپوش دەبێ... خودا ئەگەر بۆخۆی ئیرادە نەکا، بەندەی لەخۆی نزیك بکاتەوە، هەمو فێڵ‌و ئاواتی بەندە بەخۆڕایی دەچێ.

**٨ هەرکەس سەحەرێ طالبی تشتەك ب چەمەن هات**
**هن سوسن‌و هن سونبول‌و هن زولفی دوتا گرت**

**مانای وشە:**

**هەرکەس:** هەمو کەس؛ **سەحەر:** بەرەبەیان؛ **طالب:** داخواز؛ **تشت:** شت، چت؛ **چەمەن:** مێرگ، چیمەن؛ **سوسن‌و سونبول:** سوێسنەو سملێ دو گوڵن؛ **زولف:** کەزی؛ **دوتا:** دولایەنە.

**مانا بە تێکڕایی:**

بەختەوەری‌و بەش‌و بەهرە، لە خواوەیە. هەمو کەس لەسەرەتادا، لە بەرەبەیانی هەبون‌و ژیاندا، بەئاواتی شتێکەوە کە تاسەی گیانی بشکێنێ رویان کردە مێرگ‌و چیمەنی دنیاوە. هێندیکیان سوێسنەو هێندێك سملێان چنی‌و هێندێك دەستیان لەدولاوە بەکەزی یارەوە گیرساوە.

«نالی» شاعیری گەورەمان لەم بارەوە دەڵێ:

سەهم‌و نەصیب ئەصڵی‌یە، باسی گیاووگڵ‌نیە   توتنە خەرجی سوتنە مۆدنە ماچی لەب دەکا

**٩ دەستێ مە سەحەر گرت‌و برین سەیرێ حەبیبێ**
**فی‌الحال رەقیبی ژحەسەد لەرزەووتا گرت**

**مانای وشە:**

**سەیر:** گەڕان‌و تەماشا؛ **حەبیب:** خۆشەویست؛ **فی‌الحال:** دەستەو لەجێ؛ **رەقیب:** چاونەزێر؛ **حەسەد:** ئێرەیی؛ **لەرزەووتا:** نۆبەتێ.

**مانا بە تێکڕایی:**

یاری خۆشەویست، لەو بەرەبەیانەدا بەزەی بەمنا هاتەوە، لاواندمیەوە، دەستی گرتم‌و بردمیە گەڕان‌و تەماشای گوڵان. دوژمنی چاو نەزێر هەر کە ئەمەی دیت، لە داخان‌و لە بەغیلی‌و ئێرەیی نۆبەتێی هاتێ‌و دەلەرزی. لیرەدا مەلا، چیرۆکی ئادەم‌و حەوامان دەخاتەوە بیر کە خودا بەهەشتی پێدان‌و شەیتان فریوی‌دان‌و توشی نەگبەتی ژیانی سەردنیای کردن. کە ئەم مەبەستە، لە شیعرەکانی دوایی‌دا پتر رۆشن دەبێتەوە.

١٠ لەو کەبکی خەرامان کو دکوژیٚ لقەبو هات
شاهیٚنی قەضاییٚ بتەغافول ژخوە راگرت

**ماناى وشە؛**
**کەبك:** کەو؛ **خەرامان:** بەلەنجەولار؛ **کوژ:** حەشارگە؛ **قەبو:** قاسپە؛ **قەضا:** حوکمی خودا؛ **تەغافول:** خۆگێل کردن.

**مانا بە تێکڕایی:**
ئەو کەوەکە لەخۆشی نزیكبونەوەی لە خۆشەویست، کەوتبوە لەنجەو لارکردن‌و دەحەشارگەدا، دەی‌قاسپاندو تەواو خۆی لەبیر کردبو. پەنجەی قەضا ـ وەك شاهێن کە دەکەو رۆ دەبێ ـ رۆی بۆیەو گرتی‌و بردی.

١١ زینهار کەسی دەست ببت ئەرقەمی سەرویٚ
بیٚ عیشوەیی لەعلان نە بتەسلیم ژها گرت

**ماناى وشە:**
**زینهار:** دەغیلە؛ **ئەرقەم:** ماری جنجیر؛ **سەرو:** داری سەولٚ؛ **عیشوە:** ئیشارەتی بەنازەوە؛ **تەسلیم:** خۆ بەدەستەوە دان؛ **ژها:** هەژدیها.

**مانا بە تێکڕایی:**
دەغیلە هۆشتان لە خۆتان بێ. هەرکەسێك بە هەرپایە یەك بگات، ناشێ لە خۆی بایی بێت‌و جگە لە خۆتەسلیم کردن بەیارو چاوەنۆڕی کردنی فەرمان لە لێوە لەعلەکانی، هیچ کارێك ئەنجام بدات. ئەو کەسەی دەستی دەگاتە زلفی یار کە وەك ماری جنجیر لەو بەژن‌و باڵای وەك سەوڵەی هاڵاوە ـ ئەگەر بەبێ ئاگاداری‌و ئیشارەتی لێوی یار بێ، وەك ئەوە وایە کە خۆی گیرۆدەی هەژدیها کردبێ. لێرەدا شاعیر یادێك لە مارەکەی بەهەشت دەکا، کە شەیتان کردیە جاشی خۆی‌و بابە دەمی پێ فریودا.

١٢ صەبریٚ بەری شیرینە وەئوستادی خەبەردا
لەو دل مەبە تەحلی‌یو غەمان خوررەم‌و شاگرت

**ماناى وشە:**
**صەبر:** پشو لەسەر خۆیی؛ **لەو:** بۆیە؛ **تەحلی:** تاڵی؛ **خوررەم:** خۆش؛ **شا:** شاد.

**مانا بە تێکڕایی:**

ئێمەی کە دەستمان گەیشتبوە زولفی یارو لە باخچەدا دەستی گرتبوین‌و سەیرانی پێ دەکردین‌و قەدری ئەو نیمەتەمان نەزانی‌و لەخۆمان بایی‌بوین‌و ملمان لە نافەرمانی ناو بێ ئەوە گوێ بدەینە رێو شوێنێك کە یار بۆی دیاری کردبوین، بزوتینەوە. لەجیاتی زولف ـ کە وەك مار لە بەژنی یار هاڵابو ـ بێتە بەردەستمان، بوینە گیرۆدەی هەژدیهای دەردو بەڵایان. بەڵام بە فەرمودەی مامۆستا صەبرو، پشو لەسەر خوێی با تاڵیش‌بێ، بەری شیرین ئەدات. وابۆیە ئێمەش دڵی خۆمان بەتاڵی‌و خەمانەوە خۆش کردوەو چاوەنۆری ئەو بەرە شیرینەین کە داری صەبر بیدات.

**١٣** هەر نەشتەرو شوکێن کو حەبیبی‌مە لدلدا
من یەك بـیەکو تێك لدەردێ خوە شیفا گرت

**مانای وشە:**

**نەشتەر:** تیخی برین دڕین؛ **شوك:** درك‌و چقڵ؛ **تێك:** هەموی بە تێکڕایی.

**مانا بە تێکڕایی:**

بە هومێدی ئەو دەمەی کە داری پشو لەسەرخۆیی، بەری شیرینم بۆ بدات؛ وامن هەر نەشتەرو دڕکێك کە لەلایەن یاری خۆشەویستەوە چەقاوەتە دڵمەوە، بە مایەی خۆش بونەوەو چاك بونی دوارۆژی دەزانم.

**١٤** عاشق ژغەمێ سایەی وێ جامێ طەلەب کر
پر عەقلێ ددێرت مە ژقسمی حوکەما گرت

**مانای وشە:**

**عاشق:** ئەویندار؛ **سایە:** پەنا، پەسیو؛ **وێ جامێ:** ئەو پیاڵەیەی؛ **پر:** زۆر؛ **ددیرت:** وەدی دێنێ؛ **حوکەما:** هۆزانان.

**مانای تێکڕا:**

ئەو عاشقە، پەنای لەو پیاڵەی غەم هێنە داوا کردو هانای پێ‌برد. لێت رون بێ زۆر عاقل‌و زانایەو ئێمە ئەو دەرسەمان لە شارەزایان‌و هۆزانان وەرگرتوە. غەم خواردن لەرێگەی عیشقدا، دڵ پڕدەکا لە عەقل‌و زانایی.

١٥ صەفصەف نەتنێ گەزمە دبارن ژکەڤانان
دل کاکولو زولفان دکەمەندێ بتەبا گرت

**مانای وشە:**

**تنێ:** بەتەنیا؛ **گەزمە:** تیر؛ **کەڤان:** کەوانی تیر هاویشتن؛ **تەبا:** پێکەوە.

**پوختەی مانا:**

ئەو خەمەی کە ئێمە بەدڵ ویستومانەو خۆمان داوەتە ژێر پەنایەوە، لەچەند لاوە دەوری داوین. تیری مژۆڵ لەلای کەوانی برویانەوە بۆمان دادەبارن. جا نەك هەر ئەوەندە، بگرە کاکۆڵو کەزیش بە جوتە دڵمیان لەناو کەمەندا شەتەك داوە.

١٦ دێوانە هەرێ تێتە دڤێ سسلەو بەندێ
کو موستەحەقە خوسرەوی خوبان بجەزا گرت

**مانای وشە:**

**دێوانە:** شێت؛ **هەرێ:** بێگومان، چاری ناچار؛ **تێتە:** دێتە؛ **دڤێ:** دەنێو ئەو؛ **سسلە:** زنجیر، سسڵە؛ **بەند:** بەستن؛ **موستەحەقە:** رەوایەتی؛ **خوسرەو:** پاتشا؛ **خوب:** جوان چاك؛ **جەزا:** سزا، جزیا.

**مانا بە تێکڕایی:**

ئەوکەسەی شێتی دەستی ئەوینە، بێگومان دەبێ لەشی گیانو دڵی بخرێتە ناو ئەو زنجیرەی زولفانەوەو شەتەك درێ. سەرداری جوانچاکان، سزای ئەوانەی لە ئەوینی ئەودا شێت بون، لە زنجیر شەتەکدانی دا ناوە.

١٧ پەیوەستە دوفێرس ژمەرا دابەرزین دل
زولفان بەچەپو راست لئۆغلمە جەما گرت

**مانای وشە:**

**پەیوەستە:** پێکەوە نوساو؛ **پەیوەستە:** هەمیشە؛ **فێرس:** ئازا لە شەڕو کوشتاردا؛ **دابەڕزین:** هەڵکوتانە سەر، راسان؛ **ئۆغلمە:** تێکەڵ بەیەکبونی شەڕ کەران؛ **جەم:** تەنیشت، کن؛ **جەما:** کۆ، تۆپەڵ.

**مانا بە تێکڕایی:**

دو برۆی پەیوەستو پێکەوە نوساو، یاخۆ بەبێ وچان دو برۆکانی ـ کە لە دڵدار کوشتن زۆر ئازاو بەکارن ـ هەڵیان کردە منی دیوانەی دڵداری، کەبمگرنو بەسزای خۆم بگەیەننو لەناو زنجیری

کەزی‌و بسکاندا، بمبەستنەوە. کەزیەکانیش لەراستەو چەپەوە هاتنە نزیك بسکانەوەو لە گرتنی مندا یاریدەیان دەدان‌و لەو ناوەدا پەلەقاژەو خوڕاپسکانی من‌و هێرشی ئەوان مەیدانی جەنگی مەغلوبەی پێك هێنابو.

**١٨ قەوسی دو هیلالان کو لسەر بورجی ئەسەد بت**
**بوشوهرە دعامی عەمەل ئەنگوشت نوما گرت**

**مانای وشە:**

**قەوس:** کەوان؛ **هیلال:** مانگی یەکشەوە؛ **ئەسەد:** شێر؛ **بورجی ئەسەد:** چەند ئەستێرەیەکن، کە لە دورەوە وەك شکڵی شێر دیارن‌و پێنجەمین قوناغی مانگانەی خوڕە؛ **شوهرە:** ناوکردو؛ **عامی:** مەردمی رەمەکی؛ **عەمەل:** کار؛ **ئەنگوشت:** قامك؛ **ئەنگوشت نوما:** بە ئیشارەی قامك نیشان‌دان.

**مانا بە تێکڕایی:**

ئەم بگرەو بەردەو هێرش‌و راسانی برۆیان‌و پەلاماردانی زولفان، بۆ شەتەك‌دانی دڵی منی‌دڵدار لە زنجیردا ـ کە وەك مەیدانی جەنگی مەغلوبەوابو ـ کارێکی ئەوەندە سەرسوڕێن‌و سەیربو کە مەردمی رەمەکیشی هێنابوە سەیرانێ. بەڵام عەجایبە کە لە گرتنی مندا نەبو؛ لەوەدابو کە دەیان دیت کەوانەی دومانگی یەکشەوە پێکەوە لە بورجی ئەسەددا خۆیان نیشانداوە. چونکە بورجی ئەسەد مەنزڵگای رۆژە نەمانگ. دو مانگی یەکشەوەش هەرگیز بەیەکەوە لە ئاسۆ نەبینراون. ئەم روداوە هەمو مەردمی سەرسام کردبو، بە قامك ئیشارەتیان بۆ دەکرد. مەبەستی شاعیر لە بورجی ئەسەد، ناو چاوانە. «اسد» بە حیسابی ئەبجەد شێست‌و پێنجە. «جبین» کە بە عارەبی بە توێڵ دەڵێن بەو حیسابە شێست‌و پێنجە. هەروەها «هنی»: هەنی کە بە کوردی بەتوێڵ دەڵێن، شیست‌و پێنجە. کەوابو پوختەی ماناکە ئەمەیە: دو برۆی کەوانی کەوەك مانگی یەکشەوە لەسەر توێڵی یاری نازەنین دیاری دەدا، خەڵك هەمو حیکایەتی لەتبونی مانگیان وەبیر هاتەوە کە بە موعجیزەی پێغەمبەر لە ئیشارەتی قامکیەوە، لەتبو. بۆیە ئەم دیدارە، ناوبانگی بەناو خەڵکا بڵاو بوتەوە.

**١٩ شیعراتە «مەلا» سیحری شەکەرریزە بە موعجیز**
**زانم ژلەبێ لەعل تەئەڤ لەفظو ئەدا گرت**

**مانای وشە:**

**سیحر:** جادو؛ **شەکەر ریز:** شەکر هەڵرێژ؛ **موعجیز:** موجزات؛ **زانم:** دەزانم؛ **لەفظ:** ئەو قسەی لەدەم دەردەچێ؛ **ئەدا:** دەربڕینی وشە.

**مانا بە تێکڕایی:**

ئەی مەلا، شیعری تۆ موجزات دەکاو سیحرێکە شەکری لێ دەبارێ. دەزانم شیعری‌وا، لە وزەی خۆتی تەنهادا نیە. لە خۆشی‌و یادی لێوی ئاڵی وەك لاڵ ئەو قسانەت بۆ هاتوە. دیارە ئیشارەتێکیشی بۆ ئەو ئایەتە تێدایە کە فەرمویە: وادەبێ دەربڕینی‌وتە کاری سیحراوی دەکا.

شاعیری خوا لێ خۆشبو «سالم» دەڵێ:

هەمو ئەشعاری دوشینم بەیادی لێوی نوشین بو

دەچەسپا لێو بەسەر یەکدا حیکایەت بەس کە شیرین بو

# قصیدەی حەقدەهەم

## «یار ئاگادارە»

١ مەحبوب ددلدا مەبە ئەڤراز چحاجەت؟
عەنقا ب خوە بێتن فرو پەرواز چحاجەت؟

**مانای وشە:**

**مەحبوب:** خۆشەویست؛ **ئەڤراز:** هەوراز؛ **ئەڤـراز:** هاوراز؛ **حـاجەت:** نیاز؛ **عەنقـا:** سـیمرغ؛ **پەرواز:** هەڵفرین؛ **پەرواز:** باڵ لێك کردنەوە.

**مانا بە تێکڕایی:**

یاری خـۆشەویسـت، لەناو دڵدا جێگیر بوە. پێی ناوی بۆی بڕوانمە بەرزایی عاسـمان، (یان، بەهەورازو ڕێگەی دژواردا بۆی بگەڕێم). سیمرغێك کە ئـاواتی منبو بیبینم، خـۆی هاتۆتە لام. ئیتر کارم بەوە نیە هەڵوەدای دیتنیبمو باڵ بگرم.

٢ ئەی دورە حبیبێ مە چفەریادو فغان کین
وێ گوە ل ضەمیرا دلە ئاواز چحاجەت؟

**مانای وشە:**

**فەریاد:** هاوار؛ **فغان:** هەراو داد؛ **کین:** بکـەین؛ **گوە:** گوێ؛ **ضـەمیر:** دڵ، وەشـارتوی دەرون؛ **ئـاواز:** بانگ.

**مانای تێکڕایی:**

یاریمە لە ئێمەوە دور نیە. ئیتر هەراو دادو هاواری بۆ لێ بکەین. ئـەو وەشـارتوی ناو دەرونمانی

گویٚ لیٚیه. بوٚچی بەقەو بانگی کەین.

٣ گوٚ سوختە مورادا خوه ژمن طەلبەکە ئیروٚ
من گوٚ ژکەریم طەلبەو داخواز چجاجەت؟

**مانای وشە:**

**گوٚ:** گوتی؛ **سوختە:** تازە فەقێلە؛ **موراد:** نیازی دڵ؛ **طەلبە:** داوا، طەڵەب؛ **ئیروٚ:** ئـەمڕوٚ؛ **کەریم:** دڵاوا، بەخشندە؛ **داخواز:** مەبەستو نیاز.

**مانا بە تێکڕایی:**

گوتی: ئەی تازە شاگرد، چیت، گەرەکە داوای بکە، تابوٚت پێك‌بێنم:

گوتم: لە دڵاوایان داوا کردنی شت پێویست‌نیە. بەخشـندە بەبیٚ داوا لێکـردن نیازی هەزاران پێك دێنن. نزیك بەم‌شیعرە، «مەولەوی» چەند شیرینی فەرموە:

یاخەلیل دەخیل کیٚ‌عادەت کەردەن      توٚشەوە دەرماڵ کەریمان بەردەن

مەلا دەیەویٚ بڵیٚ: خوایە هەرچەند فـەرموتە لێم بپاڕێنەوەو چیتان دەویٚ بخـوازن؛ بەڵام توٚ کە لە وەشارتوی دڵمان ئاگاداری پێویست‌ناکا ئێمە بڵێین. توٚ خوٚت زاناش‌و بەخشندەشی.

٤ من نالە ڕەفیقن غەم‌و تەحلینە موصاحیب
فەریاد ئەنیسی‌منە دەمساز چجاجەت؟

**مانای وشە:**

**تەحلی:** تاڵی؛ **موصاحیب:** هاوڕیٚ؛ **ئەنیس:** خەم ڕەوێن؛ **دەمساز:** هاودەم.

**مانا بە تێکڕایی:**

ڕەنگە هێندێك لوٚمەم بکەن، کە بوٚچی بەتەنیا دەژیم‌و گوٚشـە گیرم‌و هەواڵ‌و هاوڕێم‌نین... ئـەی نازانن من ناڵە هاواڵمەو پەژارەو تاڵی هاوڕێمەو هاوار هاودەنگیمە. ئیتر کارم بەپیاوی هاودەم چیە؟

٥ دلدان‌و نەوازش چنە دوشنام بەسن من
پر دەردو جەفا حورمەت‌و ئیعزاز چجاجەت؟

**مانای وشە:**

**نەوازش:** لاواندنەوە؛ **چنە:** چین؛ **دوشنام:** جوێن؛ **پرٚ:** زوٚر؛ **جەفا:** ئازار؛ **ئیعزاز:** بەگەورە گرتن.

**مانا بەتێکڕایی:**

من هیچ چـاوم لەوەنیە، کەس بمڵاوێنێتەوەو دڵم بداتەوە. چـونکە خـۆم بە کەمتر لەوە دەزانم کە کەس بمڵاوێنێتەوە.. بە جنێو پێدانیش بەســەر کرێمەوە هەر زۆرە. کەسـێکی کە وەك من، لە دەردو ئـازار دارماڵ بێ، کوا کاری بە حـورمەتگرتن و قــەدر لێنان دەمێنێ. هەمو تەمەنم بە هەژاری و خاکەساری رابراوەو هەرگیز وەبەرچاوان نەهاتوم. وەهاش فێری ئـەم ژیانە بەژانە بوم کە هەرگیز ئارەزو ناکەم بەژیانێکی تری بگۆڕمەوە.

٦ **صوحبەت بەمەی و چەنگ حبیبێ مە بـقێتن**
**فەریادو فغانی مە نەبەس ساز چحاجەت؟**

**مانای وشە:**

**صوحبەت:** هەواڵەتی، هاودەمی؛ **بـقێتن:** بیەوێ؛ **مەنەبەس:** ئێمەی بەســە؛ **ســازو چــەنگ:** دو ئامرازی موسیقان.

**مانا بە تێکڕایی:**

ئـەگەر یار لە کۆڕی بەزمدا ـ کە مەی و موزیکــی بۆ ئــامادەیە ـ رێگــەی من بدات بچمە لای؛ گریان و هاواری من، جێگەی سازو چـەنگــی بۆ پڕدەکاتەوەو لەبەر ســوزی دەرونی من، دەنگــی موزیك دەر ناچێ.

٧ **رازێن مە چحاجەت وەکو غەمماز بزانن**
**نەشـکێن مە بەسن دیدەیی غەمماز چحاجەت؟**

**مانای وشە:**

**راز:** نهێنیدڵ؛ **غەمماز:** چاوداگر. ئەوانەی بۆ ئاشکرا کردنی سوری خەڵك چاو لەیەکتر دادەگرن؛ **ئەشك:** فرمێسك؛ **دیدە:** چاو.

**مانا بەتێکڕایی:**

ئەوانەی لە ئاژاوە دەگەڕێن و دەیانەوێ بەچاوداگرتن رازی من دەخەڵك بگـەیەنن؛ با هیچ خـۆیان ماندو نەکەن. فـرمێسکی چــاوی من شــایەتیم لێ دەدەن، کە من ئــەویندارم. هیچ احتیاج بە اشارەی چاوی چاوداگران نیە.

٨ **هەر لەحظە چحاجەت کو بـنازان بـکوژی من**
**جانا ژخوە قوربانێ تەمە ناز چحاجەت؟**

**ماناى وشه:**

**لەحظە:** چاوتروكانێك؛ **لەحظ:** تماشا؛ **جانا:** گيانە؛ **ژخوە:** خۆ بەخۆ، لە خۆمەوە؛ **تە:** تۆ.

**مانا بە تێكڕايى:**

چيێويستە هەمو سـاتو كاتان بەروانينى پڕلەنازەوە من بكـوژى؟ گيانە ئـــەوە ئــاشكرايە كەمن بومەتە قـوربانىتۆ بەبێ ناز كردنيش. ئيتر نازى بۆچيە؟ واتا: مردو مردوە، تازە كارى بەچـەك نيە كە بكوژرێت.

**٩** تاچەند بەهيجرا خۆ تومن تەجرەبە ئينى
زێڕێ ژخوە خاليص محەكو گاز چحاجەت؟

**ماناى وشه:**

**هيجر:** دورى؛ **ئينى:** دێنى؛ **خاليص:** بێ خەوش؛ **محەك:** بەردى ئەزمونى زێڕ.

**پوختەى مانا:**

تاكەى و تاچەند تۆ من بە دورخستنەوە لە ديدارى خۆت، دە ئەزموى؟ تابزانى لە دڵداريدا چـەند بە ئەمەكمو چـــەند لە بەر دەردى دورى خــۆڕاگرم. كە لێشـــت رونە من وەك زێڕى بێخـــەوش - لەدڵداريدا - بێ عەيبم. زێڕى صاف احتياجى بە لە محەكدانو بەگاز لێ هەڵكراندن نيە.

**١٠** حاجەت نيە جانا يەدى بەيضا بەدەر ئانين
ئينكار ددينda نەبت ئيعجاز چحاجەت؟

**ماناى وشه:**

**يەد:** دەست؛ **بەيضاء:** سپى؛ **بەدەر ئانين:** دەرهێنان؛ **ئيعجاز:** موجزات.

**پوختەى مانا:**

گيانەكەم پێويست نيە تۆش وەك موسـا بە موعجيزە، دەسـتى بەسپيەتى لە گيرفـانى دەرهێنا، تا فيرعەونى پێ لە ئينكار كردن بگيرێتەوە؛ موعجيزە بۆمن بكەىو دەستى سپيت دەرخەى. چـونكە من بڕواى تەواوم هێناوەو هيچ گومانم لە دڵدا نەماوەو هيچ كارم بەموجزە نواندن نيە تا ببمە خاوەن باوەڕ.

١١ ئەسراری ئەزەل دێ دئەبەد بێنە ظهورێ
ئەنجامی سەرئەنجام ژئاغاز چحاجەت؟

**مانای وشە:**

ئەسرار: نهێنی‌یەکان؛ ئەزەل: هەرە پێشو؛ ئەبەد: هەرە پاشین؛ ظهـور: دیاری دان، ئاشکرا بون؛ ئەنجام: پێك هێنان؛ سەرئەنجام: ئاخری کار؛ ئاغاز: دەس پێکردن، سەرەتا؛ دێ: حەتماً دەبێ.

**مانا بەتێکڕایی:**

نهێنیەکانی هەوەڵ کە خوا بڕیاری داون؛ بێ‌گومان لە دوا ڕۆژدا، هەر دێنە دی. پیاو ناشێ هەر لە سەرەتاوە لای‌وابێ دەبێ بەسەرهاتی خۆی لە دوارۆژدا یان لە پاش مەرگ بزانێت. نیازی شـاعیر ئـەوەیە کە خـودا بۆ بەندەو ژیانی دنیاو قیامەتی بڕیاری خـۆی داوە. ماندوبونی بەندە بۆ زانینی چارەنوسی خۆی بەرلە هاتنی بێ‌سودو بەهرەیە.

١٢ گەر لوءلوئی مەنثور ژنەظمێ تە دخوازی
وەر شیعری «مەلێ» بین‌تە بەشیراز چحاجەت

**مانای وشە:**

لوءلوء: مرواری؛ مەنثور: پەرژو بڵاو، نەسمراو؛ مەنثور: پەخشان، بەرانبەر بەشیعر؛ نەظم: هۆندنەوە؛ نەظم: شیعر؛ مەلێ: مەلا؛ شیراز: شارێکە لە ئێران زێدی سەعدی‌و حافظو گەلێك لە شاعیرانی ترە.

**پوختەی مانا:**

ئـەگەر تۆ دەتەوێ مرواری هێشـتا نەسـمراوت لەهۆندراوەدا دەس کەوێ؛ وەرە بڕوانە شـیعری مەلا. ئیتر کارت بەسەر شیرازو بوێژانیەوە چیە؟

# قصیدەی هەژدەهەم

## «هونەر مەرجە»

١ کەس بەدادا مە نەپرست گلەو داد چکەت؟
تە نەبت دادرەسەك بێهودە فەریاد چکەت؟

**مانای وشە:**

**گلە:** شکایەت؛ **داد:** هاوار؛ **داد:** عەدالەت.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر هیچ‌کەسێك بەدادمان نەگاو لێمان نەپرسێتەوە، شکایەت‌و هاوارَ چی دەکا؟ تۆ ئەگەر فریا رەسێکت نەبێ، هاواری بێ‌فایدە چیت بۆ دەکا؟

٢ بەشرینێ نەگەهت دەست ئەگەر رۆستەم بت
دێ بەبازوو ملان شوبهەتی فەرهاد چکەت؟

**مانای وشە:**

**شرین:** شیرنی بەرانبەری تاڵ؛ **شیرین:** ناوی دڵبەری فەرهاد؛ **نەگەهت:** نەگات؛ **رۆستەم:** پاڵەوانی چیرۆکی ئێرانی؛ **بازو:** باسك؛ **مل:** شان؛ **شوبهەت:** وەکو؛ **فەرهاد:** دڵدارە بەردبڕەکەی شیرین؛ **شیرین:** کیژە ئەرمەنیەك‌بو ببوە ژنی خوسرەوی پەروێزی، پاشای ئێران؛ **فەرهاد:** کوردێکی کەڵهوڕی بەردتاشی ملهوڕبو، دڵی چوبوە سەر شیرین.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر خوا بڕیار بدا کار پێك بێت، بە باری نەرمی‌و بەبێ تاڵی چێژتنیش بە ئاواتت دەگەیەنێ.

بەڵام ئەگەر بڕیاری خوای لەسەر نەبێ، کار بە زۆرەملی پێكنایە. نەك هەر فەرهاد بە زۆری شان‌و باهوو باسکی بەهێزی؛ بگرە ئەگەر رۆستەمیش بوایە ـ کە لەو پاڵەوانتر بوە ـ هێشتان دەستی نەدەگەیشتە یارە شیرینەکەی کە شیرین بوە.

**٣ فاعیلەك لازمە دا فیعل‌و ئەثەر پەیدا بت**
**گەرتو حەدداد نەبت کورەیی حەدداد چکەت؟**

**مانای وشە:**

**فاعیل:** کرگار؛ **لازم:** پێویست؛ **فیعل:** کر؛ **ئەثەر:** شوێنەوار؛ **پەیدا:** ئاشکرا؛ **حەدداد:** ئاسنگەر؛ **تو:** هیچ.

**پوختەی مانا:**

شاعیر دەیەوێ تێمان بگەیەنێ کە ئەگەر دەڵێ تا خوا نەیدا، زۆری بازو بەکار نایە. مانای وانیە تۆ هیچ نەکەی خوا دەیدات... نەخێر ئەشێ تۆ زۆر تەقەلا بدەی‌و هەمو هێزی خۆت بۆ بەدیهێنانی ئاواتت بخەیە کار. ئەوسا چاوەنۆڕی بەزەی خوا بی کە بە ئاواتت بگەیەنێت.

دەڵێ: دەبێ کارکەرێك هەبێ تا کارو کردەوەکەی بێتە بەر چاو. ئەگەر هیچ ئاسنگەرێك نەبێت کە ئاسن بوکتێ‌و بیکاتە ئامراز، تەنیا کورەی ئاسنگەر چی پێ دەکرێ؟ دەبێ یەکێك نێڵێبداو ئاسنی تێدا سورکاتەوە.

**٤ مومکینەك دێ هەبتن داکو طەلەب حاصل بت**
**صەیدو نێچیر کو نەبت تولەیی صەییاد چکەت؟**

**مانای وشە:**

**مومکین:** شیاوی وەدی هاتن، رەوا؛ **دێ:** دەبێ؛ **هەبتن: هەبێت؛ دا:** تا؛ **طەلەب:** نیاز؛ **حاصل:** پەیدا؛ **صەید:** نێچیر؛ **نێچیر:** راو؛ **تولە:** سەگی چکۆڵەی راوێ؛ **صەییاد:** نێچیروان.

**پوختەی مانا:**

ئەم قەسیدەیە، رێوشوێنێك بۆ بیرو بڕوای مرۆ، بەرانبەر بە کارو بارو نەوی بون‌و بەرزبونی لەدنیاو قیامەتا، دادەنێ‌و پێمان دەڵێ:

پیاو دەبێ خوابناسێ‌و هاواری بەرێتە بەرێ‌و بەتەمای ئەوبێ. ئەگەر خوا فریارەس نەبێ. هیچ کارێك ناچێتە سەر. خوا کەیفی لێبێ، بە بێ زەحمەتی زۆریش بە ئاواتت دەگەیەنێ. نابێ ئەوی دەتداتێ، هەر لە زۆری بازوی خۆتی بزانی. ناشبێ لات وابێ تا کارنەکەی دەت داتێ. خوا

فەرمویە: (هەرچی پیاو بۆی نەکۆشێ، پێی‌ناگا). ئـەمجـار دەبێ بۆ کارێك هەم کۆشش بکـەی‌و هەم پەنا بەخـوا بەری کە بۆت پێك بێنێت کە لەوانەبێ پێك‌بێت. نەك شـتی محـالْ داواکەی‌و شوێنی کەوی. ئەگەر راوکەر نەبێ‌و نێچیر نەبێ، تولە قەندی دەبێ بەتەمای گرتنی چی‌بێت؟

**۵ هەر گلو سەنگ دبتن زێڕ ب تەدبیری حەکیم**
**قابیلییەت کونەبت حیکمەتی ئوستاد چکەت؟**

**مانای وشە:**

**حەکیم:** زۆر زاناو حیکمەت زان؛ **قابیلییەت:** شیاوی؛ **ئوستاد:** مامۆستا.

**پوختەی مانا:**

دەبێ بۆ پێك‌هاتی ئاوات، خـوا پشـتیوان بێ. خـۆشت زۆر ماندوکەی، ئـارەزوی وات هەبێ کە محالْ نەبێ؛ دەبێ خۆشت ئەوەندە لێهاتو بی کە شـیاوی پێك هاتنی ئـەو ئـاواتە بی. ئـەوا وەك بیستومانە، زانای وا هەن لە گلْو بەرد، زێڕ دەر دەخەن. بەڵام ئـەگەر گڵەکەیان بەردەکە لەوتەرزە نەبن کە زێڕیان لێ‌پەیدا دەبێ، زانایی مامۆستای زانا، بە هیچێ دەچـێ. دەبێ شـیاوی فێربونیش بیت.

**٦ کان ب‌گەوهەر چبکەت گەوهەر ئەگەر پاك نەبت**
**تو بەصیرەت تەنەبت سیرەتی ئەجداد چکەت؟**

**مانای وشە:**

**کان:** کانگا؛ **گەوهەر:** گەواهێڕات؛ **گەوهەر:** جەوهەرو هونەر؛ **تو:** هیچ؛ **بەصیرەت:** بینایی؛ **سـیرەت:** رەوشت؛ **سیرەت:** ژینامە؛ **ئەجداد:** باپیران.

**مانا بە تێکڕایی:**

سەرەڕای هومێد بە خواو کۆششی خۆت‌و شیاوی‌و قابلیەتت بۆ گەیشتن بە مراز، ئەشـێ پاك‌و بێ خڵەتش بیت. نەك بەتەمابی کە لەسـایەی جـێ بەرزی بابو باپیرانەوە دەتوانی بە دەرەجـەیەك بگەی.

ئەگەر گەوهەر بۆخۆی صاف‌و بێ غەوش نەبێت؛ کانگاکەی چۆنی صاف دەکا؟ ئـەگەر خـۆت هێزی بینایی دڵت نەبێ؛ رەوشت‌و ژیانی باپیران چت بۆ ناکا.

**٧ زێرو زیوەر دکرن جەلبی قلوبان حاشا**
**حوسن‌و سوزْ ذاتی نەبت قامەتی مەییاد چکەت؟**

**مانای وشە:**

**زیوەر:** خشلْ؛ **جەلب:** هێنان؛ **قلوب:** دڵان؛ **حاشا:** نەخێر هەرگیز؛ **حوسن:** جوانی؛ **سور:** دڵکێشی؛ **ذاتی:** خۆیی؛ **قامەت:** بەژن؛ **مەییاد:** بەلارو لەنجە.

**پوختەی مانا:**

هومێد بەخوا، قابِلیَّتْ، دلْ صافی، پێویستن لە تەریقەتدا، نەجیبایەتی کارناکا. هەروەهاش بە رواڵەت خۆنیشاندان‌و بەریش‌و پرچو جبەو تەزبێحیش هیچ ناکریْ. کیژێك کە بۆخۆی جوان نەبێت بە زێرو خشلْ وەخۆ خستن، ناتوانیْ دڵان بەرەو خۆی راکێشیْ.

**٨ عاشقی مەست بەعیشقیْ نیە حاجەت بەمەییْ**
**واردی واردی ئەحوال بئەوراد چکەت؟**

**مانای وشە:**

**عاشق:** ئەویندار؛ **مەی:** بادە؛ **وارد:** شارەزا؛ **وارد:** بەئاو گەیشتو؛ **وارد:** ئازاو نەترس؛ **ئەوراد:** کومەڵی ویرد؛ **ویرد:** دوعای بن لێوان.

**پوختەی مانا:**

ئەوانەی گەیشتونەتە سەرچاوەی ئاوی مرادو شارەزای حاڵ‌و باڵی تەریقەتن، کاریان بە ویردو دوعا خوێندنی بن‌لێوان نیە. ئەوکەسەی بەبادەی ئەوین سەرخۆشە، کاری بە شەرابخواردنەوە نیە. مەبەست ئەوەیە، ویرد خوێندن‌و لەبن لێوانەوە بوڵەبوڵْ کردن، وەك مەی خواردنەوە بۆ مەست بونە. جا پیاو کە ئاوا مەستی ئەوین بو، نیازی بە شەراب چیە؟!

**٩ تەغەرەض ڤیك کەتنا یەك وَلی‌یەك مورشید بت**
**سالیك‌و طالبی ئیرشاد بە بەغداد چکەت؟**

**مانای وشە:**

**غەرەض:** مەبەست؛ **ڤیك کەتن:** توش بون؛ **وەلی:** پیاوی خوا؛ **مورشید:** ریْ شاندەر، شارەزای کار؛ **سالیك:** رێبوار؛ **ارشاد:** ریْشاندان.

**مانا بە تێکڕایی:**
تۆ ئەگەر مەبەستت گەیشتن بە پیرێکی دەستگیرو ڕێشاندەر هەبێ؛ دەبێ بۆی هەڵوەدابیو داوای بکەی. ئیتر کارت بەشوێنو جێ هەواری مشایخانی بەناوبانگ نەبێ. بۆ نمونە لات وانەبێ، بەغدا ـ کە جێگەی گەیلانی‌یە ـ دەردت دەرمان دەکا.

**١٠ جەهدەئو سەعیو طەلەب بێ ئەثەرەك صافی نەهن**
**تونەبێ پەردەنشین چاکرو قەوواد چکەت؟**

**مانای وشە:**
**جەهدە:** کۆشش؛ **سەعی:** دواکەوتنو تەقەلا؛ **طەڵەب:** خواستن؛ **ئەثەر:** نیشانە؛ **نەهن:** نین؛ **تو:** هیچ؛ **پەردە نشین:** مەبەست لە پیاوی گەورەیە کە پەردەدارو دەرکەوانو لەشکریان هەبێ؛ **چاکر:** نۆکەر؛ **قەوواد:** قائدان؛ **قائد:** سەرکردەی لەشکر.

**پوختەی مانا:**
لە کۆششو تەقالادا، بۆ دۆزینەوەی پیر؛ تا نیشانی تەواوت دەس نەکەوێ، ناشێ خۆت دەگرێوی کەس بنێی... هەروا سەربەخۆ هەرکەس وتی پیری تەریقەتم، باوەڕ مەکە. نیشانی هەیە. جا هەروەك پەردەدارو سەکردەی لەشکر، نیشانەی بونی فەرمانرەوایەکن کە لەپشت پەردەوەیە؛ ئاکارو رەوشتی پیریش نیشانەی راستیو ناراستیەتی. ئەگەر میر نەبێ، **نۆکەرو سەرکردەبۆهەن؟** چدەکەن؟

**١١ چئەثەر دێ لبەری خارە بکەت قەطرەیی ئاب**
**قەلەمی مە بدوسێ قەطرەیی زوهها د چکەت؟**

**مانای وشە:**
**بەر:** بەرد؛ **خارە:** زۆر سەخت؛ **قەطرە:** تنۆك؛ **ئاب:** ئاو؛ **زوهها:** وشك؛ **د:** دێ، دەبێ.

**١٢ دێ ژحەق جاذیبەیەك دل بگرت وەرنە «مەلا»**
**ژ ئەزەل گەرتو هیدایەت نەبت ئیرشاد چکەت؟**

**پوختەی مانای ئەو دو بەیتە:**
مەلای جزیری دوای ئەوە کە رێوشوێن بۆ هەڵوەدای رێگەی خواناسینو صوفیایەتی دیاری دەکاو چەند مەنزڵێکی لەبەر دادەنێ؛ کە دەبێ: بە تەمای خوا دەس پێ بکا، شیاوی ئەو کارەبێ،

دڵ‌صاف‌و بێ‌خەوش بێ، بە باب‌و باپیران نەنازێ، لای وانەبێ بەرگی دەروێشی بەهرەی بۆ دەدا، بەدنیادا بگەڕێ تا دەگاتە پیری دەستگیر، نیشانەی خواناسی لەپیر ببینێ. ئـەوسـا هومێدی هەبێ کە لەپلەی صوفیاندا، جێگەی دەکرێتەوە. دوبارە بادەداتەوە سـەر بێ ئیختیاریەکەی بەندەو دەڵێ: ئەگەر خودا هەر لەرۆژی بناوا نەوە بڕیاری نەدابێ کە تۆ لە ڕیزی خوا ناسان دەبی؛ من پێت بڵێم‌و نەڵێم، تۆ زۆریش خۆت ماندوکەی، هەر ناگەیە مراز. بەبێ بەزەیی‌و ئیرادەی خـوا، ئـەو پەندانەو ڕێوشوێنانە، وەك تنۆکە ئاوێکە کە وەبەردی ڕەق بکەوێ. قـەڵەمی من بە دوسـێ تنۆکەی وشـك کوا دەتوانێ هیچ کارێك بکات؟ پێویستە کێشەرێك لەلایەن خواوە دڵت رابکێشـێ. ئـەوسـا ئـەم ڕێگەیە بگریە بەرو بێ‌بەیتە سەر.

# قصیدەی نوزدەهەم

## «بەشی ئێمە»

١ ئەووەل کویاریْ دامە یەك ذەررەیەك عینایەت
قیسمەت مە خەمرو جامە ددەفتەرا هیدایەت

**مانای وشە:**
**کو:** کە؛ **دامە:** دای بەئێمە؛ **یەك ذەررەیەك:** تاقە تۆزکاڵێك؛ **عینایەت:** بەسەرکرنەوە؛ **قیسمەت:** بەش؛ **خەمر:** شەراب؛ **جام:** پیاڵە.

**پوختەی مانا:**
هەر لە سەرەتاوە کەیار تۆزێك ئێمەی بەسـەر کردەوەو ئێمەی خـوێندەوە؛ لەناو سـیایی‌و پەراوی شارەزایانی رێگەدا، بەشی ئێمەی شەراب‌و پیاڵەی بەزەیی خۆی دیاری کرد. واتا ئێمەی مەسـتی بادەی ئەوینی خۆی کردو لە رۆژی ئەزەلەوە بەمەستی خوڵقاین.

٢ حوسن‌و جەمالی جانان نادێرتن توپایان
هەرچی نەبت بیدایەت ئەصلا نەهن نیهایەت

**مانای وشە:**
**حوسن:** جوانی هەندام؛ **جەمال:** جوانی لە بیچـمو لە ئـاکاریشدا؛ **جـانان:** یار، دڵبەر؛ **جـانان:** گیانان؛ **نادێرتن:** نیەتی؛ **تو پایان:** هیچ بڕانەوەیەك؛ **بیدایەت:** سـەرەتا، دەس‌پێك؛ **ئـەصـلا:** بەهیچ جـۆرێك؛ **نیهایەت:** دوایی هاتن.

**پوختەی مانا:**

ئەوینی ئێمە هەمیشە لە گەرمو گوڕیدایە. چونکە ئێمە کە دەڵێین عاشقی فڵانە کیژین، عاشقی روحین. واتا عاشقی ئەو کەسەین کە روحی ئەوی داوەو خوای تێدا بەدی دەکەین. جا کەوابو چونکە خوای ئەزەلی لەبەرچاوەو هەرچی دەس پێکراتی نەبێ، دوایی‌هاتن‌و بڕانەوەشی نیە؛ عیشقی مە، هەرگیز دوایی نایەو کاری تەنیا بە جوانی روخسار نیەو یار هەمیشە لەبەرچاومان هەر ئەو جوانەیە کە هەوەڵ رۆژ دیتومانە.

٣ فەیضا عولومی حیکمەت جاما صەدەف کوگێرا
مە ژدەستی موغبەچان دیت بمەصحەفو ب‌ئایەت

**مانای وشە:**

**فەیض:** سەر ریژکردن؛ **عولوم:** زانستان؛ **حیکمەت:** زانستی راستو بێگری، فەلسەفە؛ **موغبەچە:** بەچکە مەلای زەردەشتی، بریەتیە لە شاگرد مەیخانەچی؛ **مەصحەف:** قورعان.

**پوختەی مانا:**

ئێمەی کە لە هەمو جوانیەکدا، هەر خودا بەدی دەکەین‌و هیچ شتێکی ترمان وەبەرچاو نایە؛ لە مەیخانەدا، کە شاگرد مەیخانەچیە جوانەکان، پیاڵەی لەصەدەفی پڕشەرابیان دەگێڕا، لە شەرابەکەیاندا دەمان‌دی کە فەلسەفەو حیکمەتی خواناسینی لێ هەڵدەرژیو ئەو زانستانەمان پێدەڵێ کە لە قورعان‌و ئایەتدا، هەیە. یان، سوێند بە قورعان‌و ئایەت لە شەرابی مەیخانەدا، تیشکی خودا دەبینین.

حافظی نەمریش لەوبارەوە دەڵێ:

لە مەیخانەی موغان‌دا رۆشنی خوا دێتە بەرچاوم
چلۆن تیشکێ لەچۆن شوێنێك دەبینم؟ سەیرە، سوڕماوم

٤ عارف حەتا نەنۆشێ ژدەستی مەی فرۆشێ
غائیب نەبو ژهۆشێ پەیدا نەکر ویلایەت

**مانای وشە:**

**عارف:** خواناسی بەراست؛ **حەتا:** هەتا؛ **ویلایەت:** شێخایەتی.

**مانا بە تێکڕایی:**

کەس ناتوانێ سەر بەخۆ، بەبێ ئەوە لەلای پیری تەریقەت فێری رێو شوێنی راستین بێ،

پیٚبگات. بۆ ئەو کەسەی کە ڕێبواری ڕێگەی خوداناسینی بەراستیە، پێویستە شەرابی ئەوینی خودا، لە دەستی پیری تەریقەت بخواتەوەو بەتەواوی خۆی لەبیر بچێتەوەو خۆپەرستی بتوێتەوە، ئەوسا هومێدی هەبێ کە بکەوێتە پلەی دۆستانی خوداوە.

**٥ گوناهی زوهدو طامات هلناگرت خەرابات**
**کەسێ بڤێ دەرێ رەت دڤێ بکت ریعایەت**

**مانای وشە:**

**زوهد:** تەرکە دنیایی؛ **طامات:** ورێنەو قسەی هەلەق مەلەق کردن؛ **خەرابات:** مەیخانە؛ **ڤێدەرێ:** بەولایەدا؛ **رەت:** بڕوات؛ **ریعایەت:** هۆش پێوەبون، موراعات.

**مانا بە تێکڕایی:**

لەو مەیخانەی ئەوینی خودایەدا، نەرێگە بۆ قسەی دور لەمانای حالٚ لێ هاتوان هەیە، نە سەر کزکردنو خۆ لە خۆشی دورکردن باویەتی. لەوێدا هەرچی هەیە سەرخۆشیو دلٚخۆشییە. خۆ بەکزو کەنەفت نیشاندانو قسەی لابەلاکردن، گوناهن لەوێدا. هەرکەس دەیەوێ ڕێگەی تێ بکەوێ دەبێ ئاگای لەدامو دەستوربێو موراعاتی ئەدەب بکا.

**٦ عیشقێ ژهەردو چەشمان ئەووەل ددل ئەثەر کرد**
**لێ ذەررە ذەررە ئاخر صوٚتن کرو سیرایەت**

**مانای وشە:**

**چەشم:** چاو؛ **لێ:** بەلٚام؛ **ذەررە:** کەموسکە، قورسایی مێرولەی وردی زەرد؛ **صوٚتن:** سوتان؛ **سیرایەت:** گیروٚیی، تەنینەوە.

**مانا بە تێکڕایی:**

ئەوین لەسەرەتا، لەرێگەی هەردوك چاوانەوە کەوتە دلٚو شوێنی تێدا کردەوە. بەلٚام هەروا هێدی هێدیو توٚزە توٚزە، گڕی دەدلٚ بەرداو سوتاندیو سوتانەکەش تەنیەوە بۆ دەرونو هەناوان.

**٧ شاکی‌السلاح هەردەم بە کوشتنا «مەلێ» هات**
**گازندەیان ژکی‌کم ژکی بکم شکایەت؟!**

**مانای وشە:**

**شاکی‌السلاح:** پرچەك؛ **هەردەم:** هەمودەمان؛ **گازندە:** گلەیی؛ **ژکی:** لەکێ.

**مانا بە تێکڕایی:**

یاری من، کە تەنیا هەر ئەو دەناسمو هەمو هاوارو هانام هەر دەبەمە بەر ئەو؛ هەمو دەمان بەبێ وچان، بە پرچەکی ـ واتا: بەمژۆڵان، بەچاوان، بەبرۆیان، بەروخسار، بەقەدو باڵاو زولفو خاڵان، کە چەکی هەرە بەکارن ـ دێتە کوشتنی مەلا، کە خۆم بم. دەیسا ئەگەر فەرمانڕەواو پەنادەر بۆخۆی ئازارمبدا، مَن لەلای کێ گلەبکەم؟ شیکایەتم بەرمە بەر کێ؟ هەر خۆی دەبێ دادیمن لەخۆی بستێنێ.

**٨** **جاما ددەستی شاهید ژەنگێ ژدل دشۆتن**
**پیری موغان ژرەندان وەهومدکر ریوایەت**

**مانای وشە:**

**شاهید:** یار، گراوی؛ **دشۆتن:** دەشوا؛ **رەند:** لەزاراوەی عارفاندا، بە کەسێك دەڵێن کە تێکەڵ بەخوا بوەو جگە لەخوا گوێ بەهیچ شت لەدنیاو قیامەت نادا؛ **ریوایەت:** گێڕانەوەی قسە.

**پوختەی مانا:**

لە پیری موغان ـ کە نیاز پیری تەریقەتە ـ بیستومە. ئەویش لەوانەوە کە تەواو تێکەڵ بە خوا بونو هیچیان جگە لەخوا لەبیر نیە، وای گێڕاوەتەوە: کە ژەنگیدڵ، تەنیا بەو پیاڵە مەیە دەشۆرێتەوە کە لە دەستی یار وەردەگیرێ.

**٩** **ئەطواری عیشقو مەستی، ئەسراری بوتپەرستی**
**تەقریری صەد ریوایەت ناکەت لبۆ کیفایەت**

**مانای وشە:**

**ئەطوار:** طەوران؛ **طەور:** حاڵەت؛ **تەقریر:** گێڕانەوەو باس کردن؛ **کیفایەت:** بەس؛ **بوت:** بت، نیاز دڵبەرە.

**پوختەی مانا:**

حاڵاتی ئەویندارىو سەرخۆشیمان بەو ئەوینەو نهێنیەکانی یارپەرستن، بەگێڕانەوەی صەد داستانیش تەواو نابێو بۆ تێگەیاندنی بێ ئاگایان، بەش ناکا.

**١٠** **لیطمَئِنَّ قلبی عَینَ الیَقینَ دبەخشت**
**عینَ العیان دڤێتن کافیىنەن درایەت**

**مانای وشه:**

**لِيَطْمَئِــنَّ:** تا خــاترجەم بێ؛ **قَلْبي:** دڵم؛ **عَيْنُ اليَقين:** بێ‌گومانیو بڕوای تەواو؛ **عَيْنُ العَيان:** دیداری بێ‌پەردەو بەئاشکرا؛ **کافیٖ:** بەس؛ **نهن:** نین؛ **درایەت:** زانست.

**پوختەی مانا:**

لەقورعانا دەفەرموێ: براپم پێغەمبەر گوتی: خـودایا نیشـانمدە چلۆن مردو زیندو دەکەیتەوە. خـوا فـەرموی: بۆچـی باوەڕت نەکردوە کە پێم دەکرێ؟ گوتی: بەڵێ باوەڕم کردوەو دەزانم مردوت پێ زیندو دەکرێتەوە. بەڵام دەمەوێ نیشانمدەی تا دڵم ئاو بخـواتەوەو خـاترجەم بم. خـوا فـەرموی: چوار مەلان، لە بەریەك هەڵوەشـێنەو لەسـەر هەر کێوێك پاژێکیان لێ‌دانیو ئـەوسـا بانگیان‌کە بەغار بەرەو خۆت دێنەوە.

شاعیر دەگەڵ وەبیرهێنانەوەی ئەم مەبەسـتە، پێمان دەڵێ: نهێنیەکانی دڵداریو یارپەرسـتن، هەر بەوەندە پێك‌نایە کە بڵێی دەزانم. یان وا ریوایەت کراوەو باوەڕم کردوە. نەخێر خــودا بە ئاشکرا دیتنو دەگەڵ خودا تێکەڵ بونە کە دڵ خـاترجەم دەکاو ئـەم حـاڵەتەش هەر بۆ خـواناسە بەراستەکان دەست ئەدا.

**١١** میریو پادشاهی مویەك لنك «مەلایێ»
نادم بەمولکی عالەم یەك‌ذەررە یەك عینایەت

**مانای وشە:**

**مویەك:** تاڵێك‌مو؛ لنك: لەکن؛ **عالەم:** هەموشت جگە لەخوا.

**پوختەی مانا:**

هەمو دنیاو هەرچی خوا دروستی کردوە، لەلای من تۆزکاڵێك لە بەسەر کردنەوەو لاواندنەوەی یار ناهێنێ. میریو خونکاری دنیایی لەکن منی مەلا نرخی تاڵێك‌موی نیەو بە هیچی ناکرم.

## قصیدەی بیستەم

# «گران ناز»

١ عەرعەر خەراما بقەددو قامەت
یەك بوسە دامە بصەد قیامەت

**مانای وشە:**

**خەرام:** لارو لەنجە؛ **قەدو قامەت:** بەژن‌و باڵا؛ **بوسە:** ماچ؛ **قیامەت:** ڕۆژی زیندو بونەوە.

**پوختەی مانا:**

ئەو یارە جوانە ـ کە بەژن‌و باڵای وەك داری عەرعەر، ڕاستو بی‌گرێیەو لارو لەنجە دەکا ـ تا ماچێکی دامیٚ، ئەوەندەی جزیاو ئازاریی چێشتم کە بارتەقای دەردو ئازاری صەد ڕۆژی قیامەت‌و ترس‌و لەرزەکەیەتی.

٢ یەك بوسە بەخشی ئەووەل بئیحسان
ئاخیر لمن کر جورم‌و غەرامەت

**مانای وشە:**

**ئیحسان:** چاکە کردن؛ **جورم:** گوناە؛ **غەرامەت:** تاوان.

**مانا بە تیٚکڕایی:**

ماچی دامیٚو سەر لە هەوەڵەوەلام وابو هەر چاکەم دەگەڵ دەکاو هیچی‌تر. بەڵام دەرکەوت کە زۆرم تاوان بژاردەوەو کەوتمە بەر سزای گوناهکارانەوەو لە ڕیٚگەی ئەویندا، بەدوی ئەوماچەدا هەزاران تاڵی‌و زەبونیم کیٚشا.

٣ ژ ژەنگو زەرقیّ تادل بشوّتن
جاما صەدەف بین رەندو کەرامەت

**مانای وشە:**

**زەرق:** ریاو مەرایی؛ **بشوّتن:** بشوات؛ **بین:** بهیّنە؛ **رەند:** زوّرباش؛ **کەرامەت: قەدرو ریّز.**

**پوختەی مانا:**

مەیگێڕ ئەو پیاڵە صەدەفیە پڕلەو مەیەی کە هەم جوان‌و باشەو هەم پیاوی دەباتە پلەی قەدرو حورمەتەوە؛ بیّنەو بمان‌دەریّ. تا ژەنگی دڵ‌و نەنگی دوروویی‌و منافقی، لە دڵمان بشواتەوە.

٤ ژهەردو چەشمیّن تەی مەستو خونریز
نورادو چەشمان کیّ‌دی سەلامەت؟

**مانای وشە:**

**چەشم:** چاو؛ **تە:** توّ؛ **خونریز:** خویّن‌ریّژ؛ **نور:** روّشنایی؛ **سەلامەت:** دورلە نەخوّشی.

**مانا بە تیّکڕایی:**

ئەی یار! ئەی روناکایی دو چاوەکانم! کیّ هەیە لە دنیادا، لە دەست ئەو دو چاوە مەستو عاشق کوژەی توّ بە سەلامەتی دەرچیّ؟

٥ لدەردو ئیّشان پەیکان‌و نیّشان
مە ژهەردو چەشمان کفشن عەلامەت

**مانای وشە:**

**دەرد:** نەخوّشی؛ **ئیّش:** ژان؛ **پەیکان:** سەرەتیر؛ **نیّش:** پیّوەدان؛ **کفش:** دیاری، کەشف؛ **عەلامەت:** نیشانە.

**پوختەی مانا:**

ئەو بەپەیکان پیّکانەو ئەو پیّوەدانەی کە دوچاوە مەستەکانت توشی منیان کردوە، ئەوەندە کاری‌گەربون، کە لە هەمو گیانی مندا، شویّنیان کردوەو برین‌و جیّ پیّوەدان نیشانەی کاری چاوی توّمان بوّ دیاری دەکا.

٦ ریسوایی عیشقیٚ تەنها نە ئەز بوم
کەس دی زەمانان حوب بیٚ مەلامەت؟

**مانای وشە:**

**ریسوا:** ناو زڕاو؛ **ئەز:** من؛ **حوب:** خۆشەویستی، دڵداری؛ **مەلامەت:** سەرکۆنە.

**مانای تیٚکڕایی:**

هەر تەنیا من نەبوم کە لەســەر دڵداری ناوم بزڕیٚو لۆمەم بکــریٚ؛ هیچ‌کەس لەهیچ دەورو زەمانیٚکدا، دڵداری بیٚ سەرکۆنەو لۆمەی نەدیتوە.

٧ دوسەجدە فەرزن فی‌الحال ب‌بین‌بەر
دەما خویابن ئەو قەددو قامەت

**مانای وشە:**

**سوجدە:** سوژدە، بۆ کڕنوش سەر نانەزەوی؛ **فەرز:** هەرە پیٚویست؛ **فـی‌الحــال:** دەس‌بەجــیٚ؛ **خــویا:** ئاشکرا.

**پوختەی مانا:**

هەرگا ئەو بەژن‌و باڵایەی یارمان بۆ دەرکەویٚو خۆمان لیٚ ئـاشکرا بکـا؛ لەسـەرمان فــەرزە دو سەجدەی بۆ بەرین. سەجدەیەك بۆ پەرستنی ئەو کە شیاوی پەرستنە. سەجدەیەك لە شـوکرانەی دیتنی بەژن‌و باڵاکەی.

٨ دا عەیبی رەندان نەکی بەبادی
(نُفُوسُ قَوْمٍ بِهٰا تَسامَتْ)

**مانای وشە:**

**دا:** وشەیەکە بۆ شیار کردنەوە، دەغیلە؛ **رەندان:** ئەو سـەرخـۆشانەی گویٚ بەدام‌و دەسـتور نادەن؛ **نەکی:** نەکەی؛ **بەبادی:** بەبادەییٚ، بەشـەراب خـواردن، (یان، بەبادا بدەی)؛ **نفـوس:** گیانان؛ **قــەوم:** کۆمەڵ؛ **بِها:** بەوی؛ **تَسامَتْ:** بەرزەوە بو.

**پوختەی مانا:**

دەغیلە نەکەی عەیب لە رەندان بگری کە شەرابی دڵدارانەیان خواردوٚتەوەو سەرخۆشی ئـەوین‌و

بە لۆمەو لەقەمەوە عەیبو عاریان بەبادا بدەیو بەگوێی خەڵکی رابگەیەنی. چـونکە ئـەو بادەیەی ئەوان خواردویانەتەوە، گیانی زۆر لە کۆمەڵو پیاو چاکانی پێ بەرز بۆتەوە.

٩ «مەلا» لعمری بی فەیدە بوری
کیشا بزور ئان قەهرو نەدامەت

**مانای وشە:**

**بوری:** رابرا؛ **زور:** زیاد؛ **زور:** زۆری؛ **قەهر:** خەمو خەفەت؛ **نەدامەت:** پەشیمانی.

**پوختەی مانا:**

مەلا! داخـی گرانی هەر ئـەوەیە کە تەمەنی بێبەهرە رابراو دنیا بەزۆری توشـی ئـەو هەمو خەمخواردنو پەشیمانی لە کردەوەی رابراوی کردوە.

# قصیدەی بیست‌ویەکەم

## «ڕەنجی بێوەر»

١ عومرێ ضایع‌بو مەبێ دلبەر عەبەث
وەی تەڤێ عومرێ مەبوری بەرعەبەث

**مانای وشە:**

**عومر:** تەمەن؛ **ضایع:** خەسار؛ **مە:** ئێمە؛ **عەبەث:** فیرۆ؛ **وەی:** هەی مغابن؛ **تەڤێ:** لەو؛ **بوری:** رابرد؛ **بەر:** سەر.

**پوختەی مانا:**

تەمەنمان بەبێ‌یار، بە خەسار چوە. داخم بۆئەو ژیانەمان‌کە بەفیرۆمان‌دا.

«خەییام» ئەم مەبەستەی لە چوارخشتەکیەکدا هێناوەو دەڵێ:

حەیفم لەدڵێ دێ کە بەبێ سوتمانە — دڵـداری تیـا نەکردوە هێلانە
هەر ڕۆژێ کەبێ دڵبەرو بێ دڵداری — بێ نرخـە، پڕو پـوچە، زیانی ژیانە

٢ دل ئەمانەتدا بەنائەهلان نەدی
لێ بنائەهلان مەدا گەوهەر عەبەث

**مانای وشە:**

**دا:** ها، وشەی خەبەردار کردنە؛ **نائەهل:** نابابەت؛ **لێ:** بەڵام.

**پوختەی مانا:**

هەرگیز نەکەی دڵی‌خۆت، بدەیە سـەر پێ‌نەزان‌و نەگونجـاوان. جـا کە پەندی تۆئـەدەم، لە

عیبرەتێکەوە یە کە خۆم گرتومە. من گەوهەری عومرم دابەوانەی کە شیاوی نەبون.

٣ دا دسەیرا عیشق بیٚدلبەر نەچی
لیٚ دبت سەیرا تەبی دلبەر عەبەث

**مانای وشە:**

سەیر: رۆیشتن؛ عیشق: ئەوین؛ لیٚدبت: لیٚدەبیٚتە.

**پوختەی مانا:**

دەخیلە بەبیٚ دڵبەر بەرێگای عیشقیٚدا مە بەرێبوار. چونکە رێبواری بیٚ دڵبەر، رۆیشتنەکەی بەفیرۆ دەڕوات. واتا کەسێك کە بەبیٚ پیری شارەزا، لای وابیٚ بە خودا دەگا، هەرچی دەیکا بەهرەی بۆ نادات‌و بەئاوات ناگات.

٤ پور دپەی وەصلیٚ مە سەعی‌و جەهدەدا
جەهدە ئو سەعیا مەهاتن دەر عەبەث

**مانای وشە:**

پور: زۆر؛ دپەی: لەشوێن؛ وەصل: پێك گەیشتن؛ سەعی: کۆشش؛ جەهدە: تەقالا؛ هاتن‌دەر: دەرچون.

**پوختەی مانا:**

ئێمە بۆ گەیشتن بەیار، زۆرمان کۆشش کرد. هەموی بە فیرۆ چو، هیچمان بۆنەکرا.

٥ ئاە وی‌کوشتم بدەربا خەنجەریٚ
ما دمیلاکیٚ درەت خەنجەر عەبەث؟

**مانای وشە:**

وی‌کوشتم: ئەو کوشتمی؛ دەرب: زەبر؛ ما: چۆن؟، کەی؟؛ میلاك: جەرگ‌و هەناو؛ درەت: دەروا.

**پوختەی مانا:**

من کە وتم کۆششم بەفیرۆ چو، راست نیە. ئاخو داخمە لە ئێشی ئەو زەبری خەنجەرەی، کە یار دەجەرگ‌و هەناوانیٚ گیٚراوم. مەگەر ئەو خەنجەر لیٚدانە، کەم کارێکە کە من لە دەستی یار پێم گەیشتوە؟ دیارە کارەکەم بیٚبەهرە نەبوە.

٦ دل ژدەربا کاشوان بو پارەپار
گوی دمەیدانیٚ دبت صەد کەر عەبەث؟

**مانای وشە:**

**کاشوٚ:** شەق، گوٚچانی گەمەی گوٚیێن؛ **پارەپار:** لەت بەلەت؛ **کەر:** کەرت، لەت.

**پوختەی مانا:**

دڵم وەگ گوٚ، لە مەیداندا بە زەبری شەق‌و گوٚچانی دڵبەر، لەت‌و پەت بوە. جا چوٚن دڵ بە خوٚڕایی دەبێتە صەد پارچە؟ دیارە یار بەزەی بە دڵما هاتوە. بوٚیە بەرکاشوٚی داوەو لەت‌و کوتی کردوەو ئەو صەد پارچە بونەی دڵم، بە خوٚڕایی نەبوە.

٧ مەهدەرا ویٚ سوختەئیٚ ئیروٚ بکن
ئەز دبێژم نابت ئەڤ مەهدەر عەبەث

**مانای وشە:**

**مەهدەر:** تکا؛ **سوختە:** تازە فەقێلە، (یان، سوتاو)؛ **ئیروٚ:** ئەمڕوٚ؛ **ئەز:** من؛ **نابت:** نابێت؛ **ئەڤ:** ئەو.

**پوختەی مانا:**

وەرن ئەی خێرەومەندان، ئـەمڕوٚکوٚ بینەوە بوٚتکـاکردن دەربارەی منی سـوتاوی ئـەوین‌و تازە شاگردی ڕێگەی یارناسین. من دەڵێم تکای ئێوە بە فیڕوٚ ناچێ‌و یار بەزەی پێمدا دێت.

٨ کفشە مەعنا کی ل لەوحی سیم دی
نوقطەیی میسك‌و خەتی عەمبەر عەبەث

**مانای وشە:**

**کفش:** دیار، کەشف؛ **مەعنا:** واتە؛ **لەوح:** تەتەڵە؛ **سـیم:** زیٚو؛ **نوقـطە:** خـاڵ؛ **میسـك‌و عەمبەر:** دو بون‌خوٚشی ڕەنگ ڕەشن.

**پوختەی مانا:**

مەڵێن تکا بیٚ بەهرەیە بوٚتوٚ، کە بەخـت ڕەشـیت‌و یار وەك زیٚوی بیٚ خـەوشـە. کیٚ دەتوانیٚ بڵیٚ لەسەر تەتەڵەی زیٚوین خاڵ‌و خەتی ڕەش، خـەسـار بوە. بەڵکـو جـوانتری دەکا. یار کە پاك‌و بیٚ‌خەوشە، ئەگەر منێکی بەخت‌ڕەش، وەك ڕەشایی خـەت‌و خـاڵی عەنبەرین‌و میسـك ئـاسایی،

لەلای خۆی جێبکاتەوە چیتیایە؟...

یاخۆ: ئەگەر خاڵی وەك میسك بچێتە سەر خەتی عەمبەر، دەبێتە غەمبەرو ئەوسا غەمم لادەچێ.

٩ دا «مەلا» هشیار بی لێ پور کەسان
سینە پور لێدانە سەنگو بەر عەبەث

**مانای وشە:**

**دا:** ها، دەغیلە؛ **لێ:** بەڵام، (یان، لەو)؛ **پورکەسان:** زۆر کەس؛ **سینە:** سینگو بەر؛ **سەنگ:** بەرد؛ **بەر:** بەرد.

**پوختەی مانا:**

هۆی مەلا! دەغیلە وشیاری خۆت بە، لات وانەبێ کۆششت بەفیرۆ ناچێ. زۆر کەس زۆریان لەورێگەدا، بەرد لەسنگی خۆیان داوەو هیچیان بۆ بەهیچ نەکراوە. پیاو دەبێ تەنیا چاوی لە بەزەی خوابێو نابێ لای وابێ بەسەرمایەی کۆشش پێدەگا.

# قصیدەی بیست‌ودوهەم

## «یاربینە»

١ نامی عەنبەر شکەنی بێت ژعەنبەر مەکە بەحث
بل ژوی سلسلە ئو زولفی موعەنبەر مەکە بەحث

**مانای وشە:**

نام: ناو؛ شکەن: شکێن؛ بەحث: دوان؛ بل: بەغەیرەز، بێجگە؛ سلسلە: زنجیر؛ موعەنبەر: عەنبەراوی.

**پوختەی مانا:**

تاکەزی‌و پرچی بەزنجیرەی عەنبەراوی یار، لە خەیاڵ دایە. یان، لەبەرچاوە. بەراستی بازاری عەنبەری لەبرەو خستوە. جگە لەو نابێ باس بکرێ، عەنبەر دەبێ خۆی ون‌کا لە شەرمان.

٢ ڤەکە لێڤێ‌و ژنیڤێ بـوەرین قەندو نەبات
ژلەبی لەعلی شەکەر بێژو ژشەککەر مەکە بەحث

**مانای وشە:**

ڤەکە: بکەرەوە؛ نیڤ: نێوان؛ بـوەرین: داوەرێنە؛ شەکەربێژ: شەکردابێژ، (یان، وتەشەکر).

**پوختەی مانا:**

بزەیەکت بێتە سەر لێوان‌و لێوت لێك بکـەوەو قـەندو نەبات، لەلێوی شـەکر دابێژ، (یان، شـەکر بێژت) داوەرێنە ئەم‌ناوەوەو، هەرگیز باسی شەکری دەسکردی بنیادەم مەکە. چونکە ئـەو بەرانبەر بە شەکری لێوی تۆ‌ـکە بەرەنگی لەعلی ئاڵە ـ نەك هەر بێ‌تامە تاڵیشە.

**٣ ب سەر ئەنگوشتی عەقیقی بدە فینجانا رەحیق**
**ئابی حەیوانی تەچین ناڤێ ژکەوثەر مەکە بەحث**

**مانای وشە:**
**ئەنگوشت:** قامك، تلی؛ **عەقیق:** گەوهەرێکی رەنگ ئاڵە؛ **رەحیق:** مەی؛ **ئابی حەیوان:** ئاوی حـەیاتیێ؛ **چین:** وڵاتێکە؛ **کەوثەر:** سەرچاوەیەکە لە بەهەشت.

**پوختەی مانا:**
یارە جوانەکەم! تۆ بەو قامکە یاقیقـیەت، فینجـانی مەی ببەخشـــی بە هەرکەس؛ ئیتر ئـاوی حەیاتت داوەتیێو پێویستناکا وەك ئـەسکـەندەر بەشـــوێنیدا هەتا وڵاتی چین برۆاو دەســتیشی نەکەوێ. نەك هەر ئەوەندە بگرە نابێ لە بەرانبەر ئەو فینجانە مەیەی تۆدا باسی ئـاوی کەوثەری بەهەشتیش بکرێت.

**٤ زەریئێن شەهلەو دورۆدانەبین شاهیدی بەزم**
**ژگەنم رەنگو سیەچەردەو ئەسمەر مەکە بەحث**

**مانای وشە:**
**زەری:** سەوزە رەنگ، سپی پێستی ئامالێ زەرد؛ **شەهلا:** چاوکالێ؛ **شاهید:** دڵبەر؛ **شاهید:** حازر.

**پوختەی مانا:**
من کە دەڵێم تازولفەو لێوو پەنجەی فینجـان لەسەری تۆهەبێ، نابێ باسی عەنبەرو قـەندو ئـاوی حەیاتو کەوسەر بکرێ. وەك ئەوەیە کە لە کۆڕێکی بەزمو ئاهەنگدا، جـوانچـاکی وەك دەنکـە دورۆ چاوکالێ بەزم گێڕبنو کچانی رەش پێستو گەنم رەنگو رەش تاڵەش، خـۆ بنوێنن کە هیچ نمودیان نابێو ناشێ باسیان بکرێ.

**٥ دێ بیشارەت بئیشارەت ژنەیێ بێتە سیماع**
**تو ژنایێ دسەمایێ بکە باوەر مەکە بەحث**

**مانای وشە:**
**بیشارەت:** مزگین؛ **نەی:** بلوێر؛ **سیماع:** شنەفتن؛ **سەما:** هەڵپەڕکێ.

**پوختەی مانا:**
مژدەی گەیشتن بەمراد، گەرەکە لەگەروی بلوێرەوە بەرگوێ بکەوێ. تۆ لەکۆڕی سـەماو بەزمدا،

بە لۆرینەوەی بلوێر باوەڕبکە کە دل دەزرینگێنێتە وەو، لەباس‌و خواس وازبێنە.

هەروەك مەولەوی لە سەرەتای مەثنەویدا فەرمویە:

گوێ لەبلوێر بگرە بیری لیّ‌کەوە      شیوەنی دەردی جودایی لای ئەوە

٦ وی نیهالی بدەر ئاغوش‌و بدی جانی شیرین
شاخی عومری بخوە بەرژێ‌و ژقەیسەر مەکە بەحث

**مانای وشە:**

**نیهال:** نەمام؛ **ئاغوش:** هامێز؛ **شاخ:** لك؛ **ژێ:** لەو.

**پوختەی مانا:**

ئەو نەمامە دەباوەش بگری‌و گیانی شیرینی لە ڕێگـەدا بدەی‌و لە هەمو درێژایی تەمەن‌دا، لکێك لەو نەمامە بوخۆت تەرخان کەی؛ ئیتر ناشێ لەبەرانبەرتا ناوی قەیسەر بگوترێ. چونکە توّی کە بەو بەهرەیە بگەی لە هەمو قەیسەران بەختەوەرتری.

٧ ئایەتێ حوسنێ موفەصصەل کە ژکەششافی جەمال
علمی عیشقێ بکە تەفسیرو ژدەفتەر مەکە بەحث

**مانای وشە:**

**ئایەت:** پاژێك لە سورەتی قورعان؛ **ئایەت:** نیشانە؛ **حوسن:** جـوانی؛ **موفـەصصـەل:** شـی‌کراوە؛ **کەششاف:** دۆزەرەوە؛ **کەششاف:** تەفسیرێکی قورعانە؛ **تەفسیر:** راوە؛ **دەفتەر:** کتێب، پەڕاو.

**پوختەی مانا:**

کاکی ئەویندارى خودا! توّ بوّ روشن کردنەوەی جوانی خودا کارێکت بە دەفتەرو کتێب‌و تەفسیران نیە. توّ کە جوانی خودات دیت، خوّت دەتوانی زانستی ئـەوین شـی کەیەوەو لە هەمو تەفسـیران باشتری بەخەڵك تێ بگەیەنی.

٨ رازی دەهرێ ژسوپیهرێ تو نزانی بجەدەل
حیکمەتی داوەرە تو ژحیکمەتی داوەر مەکە بەحث

**مانای شە:**

**راز:** نهێنی؛ **دەهر:** زەمانە؛ **سوپیهر:** عاسمان؛ **جەدەل:** دەمەقـاڵە؛ **حیکمەت:** زانسـتی‌هێزا؛ **داوەر:** ناوی‌خـوایە.

**پوختەی مانا:**

بە دەمەقـاڵەو کتێب خـوێندنەوەو روانینە عاسـمان، نهێنییە گرینگـەکانی زەمانە، رون نابنەوە. حیکمەتی خودا ئەوەنیە کە مەمانان پەی پێ بەرین. تۆ لەباسی حیکمەتی خودا گەڕێ.

٩ ئابی حەیوان تە دڤێتن توبیە هەمرەهی خوضر
جامی جەم بین‌و ژداراو سکەندەر مەکە بەحث

**مانای وشە:**

ئابی حەیوان: ئاوی حەیاتێ؛ دڤێتن: دەوێ؛ هەمرەهـ : هاوڕێ؛ خوضر: سەوز؛ خوضر: ناوی یەکێك لە پیاوانی خودایە کە دەڵێن ئـاوی حـەیاتی خـواردۆتەوەو هەرگیز نامرێ‌و هەر بە سـەوزی واتا، بە لاوەتی دەمێنێتەوە؛ جامی جەم: ناوی ئاوێنەیەکە لە ئەفسانەدا، کە جەمشید تێی راونیوەو هەمو شتێکی تێدا دیوە؛ دارا: خونکاری ئێران بوەو لە ساڵی (٣٣٣ بەر لەمیلاد) لە بەر ئەسکەندەری خونکاری یۆنان بەزیوە.

**پوختەی مانا:**

تۆ دەتەوێ ئاوی ژیانی هەمیشەییت دەس‌کەوێ کە گەیشتن بەخودایە. دەبێ پیرێکی دەستگیری خدر ئاسایی بکەیە هاوڕێ‌و ڕێ‌نیشاندەر. ئەوسا جامی جەمت دێتەبەر چـاو؛ هەموشـتێك دەبینی. ئەگینا باس لە ئەسکەندەرو داراو چیرۆکی کۆن، هیچ بەهرەت بۆنادات.

١٠ ژئەزەل عاقیبەتی کار کو مەعلوم نەبت
جامی مەی نوش‌و ژتەقدیری موقەددەر مەکە بەحث

**مانای وشە:**

ئەزەل: هەرمزو؛ عاقیبەت: بنەتا، دوایی؛ تەقدیر: لێکدانەوە؛ موقەددەر: ویستی‌خودا.

**پوختەی مانا:**

هەر لەرۆژی بناوانەوە، کە تێ نەگەیەنراوین دواییمان بەچی دەگاو چارەنوسـمان چیە؛ چـاکوایە پیاڵەی بادەی ئەوین بخوێنەوەو سـەرخـۆشی ئـەوین بین‌و لەوە نەکۆڵینەوە کەیار چـی بڕیار داوە بۆمان. هەرچی خۆی‌دایناوە دەبێ پێی شادو شوکور بین.

١١ دلێ یارێ‌مە نەبو نەرم بـصەد ئابی گری
ژدلی دلبەری ماوو بەری مەڕمەڕ مەکە بەحث

**مانای وشه:**

**گری:** گریان؛ **بەر:** بەرد.

**پوختەی مانا:**

دڵی یارەکەمان، بە فرمێسکی زۆری صەدجار گریان نەرم نەبو. تۆ ناشێ دڵی ڕەقی یاری ئێمە، دەگەڵ ڕەقایی بەردی مەڕمەڕدا - کە زۆر سەختە - بەراوردبکەیو لێی بدوێی.

**١٢ تیر صەد تێنە جگەر سینە لبەر مایە چەپەر**
**ژدڵو جەرگی‌کولو سینەیی کەرکەر مەکە بەحث**

**مانای وشە:**

**تێنە:** دێن؛ **جگەر:** جەرگ؛ **سینە:** سینگ؛ **چەپەر:** سەنگەر؛ **کول:** بریندار؛ **کەرکەر:** لەت‌لەت.

**پوختەی مانا:**

لەسەر کۆنەو لەمژۆڵەکانی یارەوە بەصەد صەد تیر، بەرەو جەرگم دێن. تەنیا سەنگەرو مەتاڵم سنگی بێ‌تینو تاومە. دەسا ئیتر خۆت دەزانی برینی جەرگو دڵی‌بریندارو سینگی لەت‌لەت کراوم هەرباسی ناکرێ کە چۆنن.

**١٣ شیری ئەلماسی کشینت تو ژلامیع دەخەبەر**
**ڤەکرت حوققەیی یاقوت ژگەوهەر مەکە بەحث**

**مانای وشە:**

**لامیع:** بروسکە دەر؛ **لامیع:** تروسکەی هەور؛ **ڤەکرت:** بکرێتەوە.

**پوختەی مانا:**

لەکاتێکا کەیار قامکی سپیو تروسکەداری بۆ سەرکۆنەی ئەویندار، رادەدێرێ، تۆ لات‌وایە، بروسکەی هەور دیاری داوە. ئەگەر لێو بیزێوێو ددانی بەرچاو کەوێ - کەدەمی وەك قوتوی لەیاقوتە - ناشێ تۆ باسی گەوهەر بکەی. چونکە گەوهەر لەبەرانبەر دەمو ددانی یاردا، هیچ برەوێکی‌نیە.

**١٤ ژشەفەق زوهرە خویابت توبنێ پەروینان**
**جەبهەتی ئەو بنومێت تو ژمەهو خاوەر مەکە بەحث**

**مانای وشە:**

**شەفەق:** کەنارەی سوری عاسمان لەئێوارەدا؛ **خویا:** ئاشکرا؛ **بنیٚ:** بڕوانە؛ **پەروین:** ئەستێرەی پیٚرو؛ **جەبهەت:** تویٚڵ؛ **ب‌نومیٚت:** بنویٚنیٚ؛ **مەه:** مانگ؛ **خاوەر:** رۆژهەڵات.

**پوختەی مانا:**

لەلاجانگی یار ـ کە سپیەو نزیك شەوی پرچەو تیشکی سوری رومەتی داوەتەوەو ئەو لاجانگە ـ لە زوهرە جوانترە ـ دیاری بدات، تۆ چۆن دەبیٚ بڕوانیە جوانی ئەستێرەی پیرۆ؟ هەنیەی یار خۆی بنویٚنیٚ، کیٚ‌رای دەکەویٚ باسی خۆرو خۆر هەڵات‌و مانگ بکات؟

**١٥** **لروی یاریٚ دو مەهنەو مەقران‌دینە دمەست**
**تو ژسەیرا قەمەری طالع‌و ئەختەر مەکە بەحث**

**مانای وشە:**

**نەو:** نویٚ؛ **قران:** نزیکی؛ **قەمەر:** مانگ؛ **طالع:** هەڵاتو؛ **ئەختەر:** ئەستێرە، شیاوی باسە ابراهیم پیٚغەمبەر، ئەستێرەو مانگ‌و رۆژی دیوە. لای وابوە خودای ئەون. کە دیتونی ئاوادەبن؛ گوتویە ئاوا بوم خۆش ناویٚ‌و داهیٚنەریان خودای منە.

**پوختەی مانا:**

تۆ چیتە باس لە هەڵاتنی مانگ‌و ئەستێران دەکەی‌و بە بەڵگەیان دادەنیٚی؟ وەرە سەیری من‌کە. من دومانگی تازەهەڵاتوی یەکشەوە مەست‌و سیوەنگیم لەنزیك یەکەوە لەروی یاردا دیوە کەئاوا بونیان بۆنیەو گومانم نەماوە کە یار شیاوی پەرستنەو کارم بەباسی مانگ‌و ئەستێرە نەداوە.

ئەستێرەناسان دەڵیٚن: ئەگەر دوئەستێرەی بەودملیٚك نزیك بن، دنیا بەختەوەر دەبیٚ. مەلا دەڵیٚ نەك دوئەستێرە، من دومانگم لە نزیك یەکەوە دیوە کە مایەی ئەو پەڕی بەختیاریمە.

**١٦** **پور ژدیم‌و خەت‌و خالان تەخەبەر دایە «مەلا»**
**نەظەری وەر بدە بەژنیٚ ژموفەسسەر مەکە بەحث**

**مانای وشە:**

**دیم:** روخسار؛ **وەر:** وەرە؛ **بەژن:** قەدو باڵا؛ **موفەسسەر:** راوەکراو.

**پوختەی مانا:**

هۆ مەلا! تۆ زۆر بەتەواوی دەربارەی پەسنی روخسارو خەت‌و خاڵی‌یار دواوی. دەوەرە چاویٚکیش

لەو بەژن‌و باڵاشەنگ‌و چەلەنگە بکەو ئیتر ئـەوپەڕی شـیرینکاری خـودات بۆ دەردەکەوێ‌و نیازت بەوە نامێنێ کە دەربارەی داهێنانی بێ‌وێنەی خودا مانای کتێبانت بۆ لێکدەنەوە.

## قصیدەی بیست‌وسێهەم

# بازاری جیهان

۱ تو سەحەرگە بەتەماشا وەرە بازاری حُدوث
لیٚ‌تە بیٚ‌فائیدە ئازار نەدەت خاری حُدوث

۲ دا ژدل غونچە لەبەك نازكو تەردانە بژیری
ب تەبەسسوم بتەرا بێتە ژگولزاری حُدوث

**مانای وشە:**

**حُدوث**: پەیدابون، فەیلەسوفان بەدنیا دەڵێن حُدوث، چونکە خۆی نەبوەو خوا سازی‌داوە؛ **حُـدوث**: روداو؛ **حدوث**: کارەسات؛ **لیٚ**: بەڵام؛ **خار**: درِك؛ **دانە**: تاقانە، بیٚ‌وێنە؛ **ب‌تەرا**: دەگەڵ‌تو؛ **تەبەسسوم**: بزە.

**پوختەی مانای ئەودو بەیتە:**

لە دەمی بەربەیانێکدا، وەرە بازاری دنیا بۆ تماشـایە. بەڵام هۆشـت هەبیٚ، بیٚ‌بەهرە ئـازارت نەدا درِکی. هەتا بتوانی بەدڵی خۆت یەکێکی جـوانی بیٚ‌وێنەی تەڕو ناسـك ـ کە لێوی خـونچە ئـاسا تەنگ‌و رەنگ ئاڵە ـ لەگەڵتا بیٚ‌ولە گوڵزارا بەرەو رویِ‌تۆ بزەی بێتیٚ.

۳ صەد گریهمن ددلن لەو کو چەپ‌و راست دکر
شاهی حوسنی قیدەمیٚ زولفی گریهداری حدوث

**مانای وشە:**

**لەو**: لەبەرئەوە؛ **حوسن**: جوانی؛ **قیدەم**: هەرهەبو، بەرانبەری پەیداکراو.

**پوختەی مانا:**

لەوساوە کە پادشای جوانی خودایی ـ کە ئـەو جـوانیە هەر هەبووەو پێشـینەی نیە ـ زولفـی یارمی بەلای راستو چـەپدا خسـتوەو هەریەك لەو کەزیانە، هەزار چینو گرێی تیٚکەوتوە؛ منی هەژار بەصەد جیٚ دلٚپڕلە گرێمو هاوارمە لەدەست زەمانەو بەو حاڵەش هەر شادو رازیم.

٤ **بل ژسولتانی قیدەم من بتو ئیقرار نەهن**
**گەر لکا بامە نهەن متقەبو بزماری حدوث**

**مانای وشە:**

**بل:** بەجگە؛ **سـولٚتان:** دەسـتەڵات دار؛ **تو:** هیچ؛ **کاب:** **گوێزنگ؛** **نەهن:** نین؛ **نهـەن:** دانێن؛ **متقـەب:** مەتکەو، ئامرازی کون کردن.

**پوختەی مانا:**

من کە دڵم داوە بەو جوانیەی یارو صەتان گرێم کەوتوٚتە دلٚ لە دیتنی زولفـی چینچینو پڕگرێی؛ هەربوٚیەیە کە بەجـوانی خـوای دەزانمو لام وایە بەرلە پەیدابونی دنیا، هەر بووەو گوٚرانی بەسـەردا نایە. ئەینا هەرگیز جگە لەخـوا، دڵم نادەم بەهیچ شـتێك کە رودەداو پەیدا دەبیٚ. تەنانەت ئـەگەر گوێزنگم بەمەتکەو کون کون بکەنو بزماریشـی لیٚ داکوتن؛ دڵداری خـوامو هیچـیتر. جـوانی خودا لەروی سەلمادا دەبینم.

٥ **دل ددەریایی قیدەم قافە بثابت قەدەمی**
**گەرچی دایم لسەریٚ فەرقەمە مینشاری حُدوث**

**مانای وشە:**

**قیدەم:** هەربو؛ **قـەدەم:** پا؛ **قـاف:** دەیانگـوت چیایەکە دەوری دنیای داوە وبنی لەدەریادایە؛ **فـەرق:** تەپڵەسەر؛ **مینشار:** هەرّە، مشار.

**پوختەی مانا:**

دڵم لەدەریای ئەوینی ئەو جوانیە خودا نوێنەدا، وەك کێوی قاف خوٚی داکوتاوەو پیٚ داگرە. ئەگەر بێتو بەمشاری کارەساتو روداوەکانی سەر دنیا ـ کە لام هیچە ـ تەپڵە سەریشم شـەق بکـەن؛ نە دەلەرزم، نە لە ئەوین دەس هەڵدەگرم.

٦ **بەڵکو دیوار بگوٚهین بخودیٚ کی بخودیٚ**
**ب تورەنگی نەکری ئەشکەرە ئەسراری حُدوث**

**مانای وشه:**

**بەڵکو:** بەشکەم؛ **خودێ:** خودا؛ **ئەشکەرە:** ئاشکرا.

**پوختەی مانا:**

مەلا! زۆرت پێ لێ هەڵێناوە. نەکەی بۆخاتری خودا، بۆ خاتری خودا؛ بەهیچ باراندا نهێنیەکانی رویداوەو نهێنیەکانی دنیایە، ئاشکرا کەی. تەقائەوە دیوار خاوەن گوێ بیو لێنەزانان قسەی دڵت لێببیسن.

**٧ لەمعەیەك گەر ژکەناری قیدەمێ پورتەوی دەت**
**دێ ژبەر وێ سەعەتی مەحوبن ئەنواری حُدوث**

**مانای وشە:**

**لەمعە:** تروسکە؛ **پورتەو:** تیشك؛ **سەعەت:** دەم، کەمترین وەخت، سەعات؛ **مەحو بون:** لەبەین چون؛ **ئەنوار:** رۆشناکیان.

**پوختەی مانا:**

ئەو دڵدارەی گەیشتوتە بارەگای یار؛ نابێ بەهیچ جۆر ئەوی لە یاری دەزانێ، نەك لای خەڵك، بگرە لای خۆشی بیدرکێنێ. چونکە تەنانەتی ئەگەر هەر تەنیا تروسکەیەکیش لە خەرمانەی تیشکی جوانی یاری ئەزەلی ـ کە خوایە ـ بداتە سەر ئەم دنیایە، هەرچەند تیشكو رۆشناکی لەدنیایە. لەتاوی ئەو، دەستەو لەجێ لەناو دەچن.

**٨ وی بصەد پەنجەرەیان دایە شوعاعا قیدەمێ**
**گونبەدی عیشقێ لەسەر کورسی‌یی دەوواری حُدوث**

**مانای وشە:**

**وی:** ئەو؛ **شوعاع:** تیشك؛ **دەووار:** خولخولە، زۆر بەسوڕانەوە.

**پوختەی مانا:**

ئەو نهێنیەی کە من دەڵێم نابێ وناشێ بیدرکێنمو خەڵکی لێ ئاگادار بکەم؛ نهێنی لە نێوان خوداو دڵدارەکانی خودایە کە بریەتین لە: ئەولیا واتا بەفەرمودەی سەعدی:

بولبول دەوەرە فێری ئەوین‌بە لە پەپولان نوزمت نەیە باش هەڵبکروزیتو بسوزیت

نەك لام وابێ کە تیشکی هەمیشە بویی (ئەزەلیەت) خودا، بەرپیوارو نادیارە، نەخێر، ئەو

ڕۆشناکیە لە صەتان ڕۆچنەو دەلاقەوە لەم گونبەزە خول‌خولەو سەر لیٚ سورماوەی دنیای نەهەتا سەری داوەو بە هەزار جۆر دێتە بەرچاو. بڕوانیە گیاندار یان بیٚ‌گیان، هەرچی ئافەریدە هەیە، نیشاندەری ئەو تیشکەیە... تەنانەت جوانی دڵبەران، زۆر بە ئاشکرا، ئەو جوانی خودایی‌یە پیشان ئەدات.

٩ تو حُدوثیٚ وەمەبین قەنج نەظەرکی جارەك
ل ئەساسی قیدەمیٚ دانی‌یە دیواری حُدوث

**مانای وشە:**

**وە:** ئاوا؛ **قەنج:** باش؛ **نەظەر:** ڕوانین، تماشا؛ **ئەساس:** هیم؛ **دانی‌یە:** داندراوە، دایناوە.

١٠ هەرە ئەصلیٚ خوەو تەرتیبی قیاسی ژیٚ‌کە
گەر نزانی چیە یەك‌جار بەری داری حُدوث

**مانای وشە:**

**هەرە:** بچۆ؛ **تەرتیبی قیاسی:** بە بەراورد کردن هەرشتە لەشوێن خۆ دانان.

**پوختەی مانای هەردوك بەیت:**

**تۆ ناشیٚ هەروا بەسەرچڵی بڕوانی‌و بیر نەکەیتەوە. ئەگەر باش هەر لەم دنیایەو چی‌تێدایە بە زیتی‌و وردی بڕوانی، باشت بۆ ڕون دەبێتەوە، کە هیمی دنیاو ڕوداوەکانی کە ڕودەدا لەسەر خواستی خودای، هەربوەو هەر دەبیٚ، دامەزراوەو خۆبەخۆ پەیدا نەبوگە. جا ئەگەر هەتا سەرچاوە پێدا بچی‌و بەراوەردێکی ورد بکەیت‌و بەباشی هەر شتەی هەیە بەریەوە سەر بنچینەکەی ئەوسا بۆت ڕون دەبێتەوە بەری داری دنیای فانی لەچی‌و لە کوێوە هاتوەو سەرەتای بە چیەوە بەندە.**

١١ ئاتەشیٚ عیشقیٚ شبیٚ زێڕ وجودیٚ حەل کەت
هەیە مومکین نەفرت زەیبەقی فەرراری حُدوث

**مانای وشە:**

**ئاتەش:** ئاگر؛ **حەل:** توانەوە؛ **شبیٚ:** وەك؛ **زەیبەق:** جیوە؛ **فەررار:** زۆر بزۆزو دانەسەکناو.

**پوختەی مانا:**

**هەروەك چۆن زێڕ لە بۆتەدا، لەسەر ئاگر دەتوێتەوە؛ ئێمەش بەتینی ئەوینی یاری خۆمان**

تواوینەوەو خشتو خاڵی خۆشەویستی دنیایی‌مان ـ کە وەك جیوە بۆ هیچ کەسێ ئـۆقرە ناگریۆ لەناو دەستاندا رادەکا ـ لەکۆڵ کەوت. دیارە تینی ئـاگرێکی زێڕی پێ بتاوێتەوە، جیوە هەر خـۆی لەبەر ناگرێ.

«نالی دەربارەی دەس لەدنیا بەردان، بۆ دڵبەرەکەی فەرمویە:

بۆتۆ کە بیکرو تازەو وەکو حۆری جەننەتی    قەیدی چی‌یە عەجوزەیی دنیا بدەم تەڵاق؟

١٢ الله الله کو دعومرێ خۆە توجارەك نەبهی
چصەدا تێتە ژوی گونبەدێ دەوواری حُدوث

١٣ تو ژبەر پەردەیی وەهمێ وەرە دەر تا ببهی
چنەوا تێتە بـصەد نەغمە ژ ئەو تاری حُدوث

**مانای وشە:**

**تو جارێك:** هیچ جاران؛ **نەبهی:** نەبیسی، نەت‌بیست؛ **وەهم:** خـەیاڵی پوچ؛ **نەوا:** ئـاواز؛ **نەغمە:** هەوای موزیك؛ **وەتەر:** ژێ تارو کەمانو کەمانچە؛ **الله الله:** وشەی سەیر مانە واتا؛ زۆر سەیرە.

**پوختەی مانای هەردوك بەیت:**

کابرای بێ‌خەبەر لە دەردی دڵی ئەویندارانی جـوانی خـودایی! زۆر پێم سـەیرە، کە لەبەر سـوڕ خـواردنت، لەناو ئـەم گونبەزە سـوڕدەرەدا ـ کە دنیایەو هیچ مانو بەقـای بۆنیە، وا کەوتویە ناو گێژی خەیاڵاتەوە، گوێچکەی دڵت کپو کەڕەو هیچی بەکەڵك نابیسـی. وەرەدەر لەناو خـەیاڵات، ببیسە چەند هەواو دەنگی هەمە جۆر. کە حیکایەت لە گەورەیی‌و جوانی بێ‌وێنەی یار دەکا، لە ژێ کەمانچـەی دنیایە دێتە بەر گوێ. من دەبیبیسـم تۆ نایبیسـی. بەراسـتی زۆرم بەزەیی بەتۆدا دێو سەیرماوم.

١٤ حالو موستەقبەلو ماضی دخوەدا تێك یەکن
صوبح مەوجودە بعەینی خوە دئیڤاری حُدوث

**مانای وشە:**

**حال:** ئێستە؛ **موستەقبەل:** ئـایندە؛ **ماضـی:** رابردو؛ **تێك:** تێکـڕا؛ **عەینی خـوە:** بێ زیادو کەم، تەواو پڕبەپڕ.

**پوختەی مانا:**

لەو شـوێنەدا کە ئێمەی دڵدار گەیوینێ، ئـایندەو رابردەو ئێسـتای تیا نەماوە. بەرەبەیانو ئێوارەو

درەنگو زو، لە بەرچاوی لەدڵداری بێ ئـاگایان هەیە. لای ئێمە بەیانو ئێوار، هەر یەکێکـەو لەبارەگای یار، حیسابی کاتو ساتو بەیانو ئێوارێك نیە. پێغەمبەری خوا فەرمویە: «لەکن خودا، بەیانیو ئێوارە نیە» وادیارە مەلا ئیشارەی بەو فەرمودەیە کردوە.

**١٥ راستو چەپ گاڤو سەعەت هەر لمە ئەوداتینت**
**ذوالفقاری قیدەمێ حەیدەری کەرراری حُدوث**

**مانای وشە:**
**گاڤ:** کات؛ **سەعەت:** دەم؛ **ذوالفقار:** شیرە دو دوخـەکەی بەناوبانگـی ئیمام عەلی؛ **حـەیدەر:** شـێر؛ **کەررار:** ئەوی زۆر بادەداتەوە سەر دوژمن. چەرخی؛ **حەیدەری کەررار:** نازناوی ئیمام عەلی بوە.

**پوختەی مانا:**
ئەوانەی تانەی نەزانی لەچاوی دڵیان پەڕیوەو بەرەو خـودا سـەر دەکەون؛ قسـەکانیان دوتوێمەنو یەکترناگرن. بە دەردی سەعدی گوتەنی: گا یەکجار باڵا نشینم. گاپشتی پای خـۆم نابینم. دەمێك لە گەشەی سەرخـۆشی بەبەختی خـۆیان دەنازن. کاریان بەدنیاو قیامەتو بەهەشـتو دۆزەقیش نیە. لە هەموشـت باڵاترن. دەمێك دێنەرێکـی هەردیو دەردی دڵیان لەزەمانە دەس پێدەکا؛ هەژارانە دەیکەن بەنوزەو کروزەو خۆ بە گوناهبار دەزاننو دەترسن نازیان بشێوێ.
جا کە مەلا لە شیعرەکانی پێشوی‌دا، دەگەڵ سەرچاوە تێکـەڵەو لە نهێنی تایبەتی شـارەزا بوەو زێڕی قاڵەو جیوەی دنیای لەلابایە. لەم بەیتانەی ئایندەدا جـۆرێتر خـۆ نیشـان دەداو بەئـاخەوە پێمان دەڵێ:
هەروەك چۆن ئیمامی عەلی بەشـیرەکەی دەکەوتە جـەسـتەی دوژمنان؛ دنیاش لەراسـتو چوپەوە ئاوا دڵو گیانی منی وەبەر شیری بەڵا داوە.

**١٦ راستو ئەڤرازو نشوڤێ مەبوارن یەكو یەك**
**لێتنێ وێ لمەبو دائرە بەرواری حُدوث**

**مانای وشە:**
**راست:** دەشتایی؛ **ئەڤـرازو نشـوڤ:** هەورازو نشـێو؛ **بوارن:** بورین؛ **یەکو یەك:** یەکی یەکی؛ **دائـرة:** جەغز؛ **بەروار:** گەوە، رێگە لەقەدی چیا.

**پوختەی مانا:**
هیچ هەورازو نشێوم هەڵنەبواردوە، کە پێیان‌دا رانەبورم. تەنیا گەوەی دنیا ماوە کە وەك جـەغز،

دەناوی‌دا هەڵدەخولێم‌و قەتیس ماوم.

**١٧** **دێ لقەلبێ مە چ‌دەت لامیعە یا ئیسلامی**
**کو لجانێ خوە مەخەف بەستی‌یە زوننارێ حُدوث**

**مانای وشە:**

**لامیعە:** تروسکەدەر؛ **خەف:** بەنهێنی؛ **زوننار:** پشتێندی گاورانە.

**پوختەی مانا:**

دەسا ئێمەی کە بە رواڵەت ئیسلامین‌و لەبنەوە زیننارێ دنیاپەرستی‌مان لەپشتایە، چۆن بەئاوات‌و تەمابین کە وەبەر تیشکی بێ‌گرێی ئیسلامەتی راست بکەوین؟

**١٨** **رەنگ‌و ژەنگێ حەدەثێ نەقشی حُدوثێ مە ددل**
**بدە بەر رەندشی عیشقێ ئەوە قەصصاری حُدوث**

**مانای وشە:**

**حەدەث:** روداو؛ **رەندش:** رەندە، چڵکبەر؛ **قەصصار:** گازر.

**پوختەی مانا:**

لە روداوە کارەسا تەکانی دنیا، دڵمان ژەنگی هەڵێناوەو رەنگی زۆر خراپ گۆڕاوە. چار هەر ئەوە بە دەس ئەوینی بسپێرین کەبۆمان خاوێن کاتەوە. ئەوین بۆ دڵ وەك گازرە بۆ پارچەی چڵکن‌و گەمار.

**١٩** **جان لسەر دەستێ نهایی درّیا جانان‌دا**
**روح صەف‌صەف کو قەوەستانە دبازارێ حُدوث**

**مانای وشە:**

**نهایی:** داندراوە؛ **جانان:** یارو دڵبەر؛ **قەوەستان:** راوەستان.

**پوختەی مانا:**

لەکاتێکا کە هەمو گیانێك دەیەوێ لەبازاری جیهان‌دا بمێنێتەوەو ریزبەریز لێی راوێستاون؛ من گیانم والەسەر دەستم کە لە رێگەی یاردا بیدەم‌و خۆم لەدنیا رزگار بکەم.

**٢٠ دیْ ژغەفلەت برەتن سایە زەوالیْ ئەی دل**
**رونەنیْ داتو ئەمانەت لسیهاداری حُدوث**

**مانای وشە:**

**دیْ:** ویْدەچیْ، رەنگە؛ **غەفلەت:** نەکاو؛ **برتن:** بروات؛ **زەوال:** لادانی رۆژ لە ناوەندی عاسمان؛ **رونەنیْ:** دامەنیشە؛ **ئەمانەت:** خاترجەمی، دەغیلە؛ **سیها:** سێبەری.

**پوختەی مانا:**

دڵی سەرچڵو سەرەرۆ لەوانەیە لەنەخافڵ سێبەری جەنگەی نیوەرۆی ژیانی دنیاییت برەویْو بکەویە ئاسۆی رۆژپەری بەرەو نەمان. دەغیلە هەرگیز خاترجەم لەبن سێبەری دنیادا رۆمەنیشە.

**٢١ تو ژفەصلیْ وەرە ئەصلیْ کو دڤیْ دەیری خەراب**
**دا نەبی مەرکەبی جەهلیْ تو دبن باری حُدوث**

**مانای وشە:**

**فەصل:** جیایی؛ **ئەصل:** رەگەز؛ **دەیر:** نوێژگەی رەبەنانی خاچپەرست؛ **خەراب:** وێران؛ **مەرکەب:** ئەوی سواری دەدا، بارەبەر.

**پوختەی مانا:**

تا لەم دنیا وێرانو بەقورێ گێراوە، بیْدەرەتانو گیرۆدەی؛ وەك بارەبەر لە ژێر باری نەزانی دای. بادەرەوە سەر رەگەزو سەرچاوەتو واز لەم جیابونەوەیەت بەهۆی دنیاوە بهێنە تا لەبنبار قوتار بیی.

**٢٢ دا نیگاری خوە بـصەد رەنگی ببینی ئیرۆ**
**وەرە جارەك بکە سەیریْ تو دئەطواری حُدوث**

**مانای وشە:**

**نیگار:** جوانی دڵبەر؛ **سەیر:** تماشا؛ **سەیر:** گەشتو گەڕان؛ **طەور:** بار، حاڵەت؛ **طور:** کێویکە لە سارای سینا.

**پوختەی مانا:**

ئەم دنیایە هەرچەندە زۆر خراپیشەو بەخەرابە دێتە حیساب؛ بەڵام باری زۆر لە باریشی تیْدایەو چیای توریش ـ کە موسا لەویْ دەگەڵ خوا دەئاخاوت ـ لەم جیهانەس. توْ گەرەکتە یاری خوت

ئەمڕۆ بەصەت ڕەنگ بێتە بەرچاو، خۆت ئامادەی گەشتێکی موسا ئاسا کەو بگەرە توری سینایە.

٢٣ تو بحالیٚ مە دزانی چیـیە هەر لەحظە «مەلا»
مە ددل تێتو دەرت خەنجەری غەدداری حُدوث

**مانای وشە:**

**لەحظە:** چاوتروکانێك؛ **غەددار:** بیٚ ئەمەگو بەڵێن شکێن.

**پوختەی مانا:**

مەلا! گەرەکمە پێت بڵێم من چۆنمو دەردم چەندە. لەهەر چـاوتروکانێکدا، خـەنجـەری دنیای بیٚ بەڵێن دەناو دڵما دێتو دەچێت، تێی دەچەقێتو دەردەچیٚ.

# قصیدەی بیست‌وچوارەم

## سەوڵی ناز

١ شمشادی خەرام‌و سەروی غەنناج
جانان دبرت بـعیشوە تاراج

**مانای وشە:**

**شمشاد:** داری‌شمشاڵ؛ **سەرو:** داری سەوڵ؛ **خەرام:** لەنجەو لار؛ **غەنناج:** زۆر بەناز؛ **عیشوە:** قـەمزەو ناز؛ **تاراج:** تاڵان.

**پوختەی مانا:**

ئەو بەژنە بەلارو لەنجەو زۆر بەنازە، کە لە سـەوڵ‌و شـمشاڵ دەکا؛ بە سـیلەی چـاو داگرتن‌و ناز فرۆشتن گەلە گیان بەتاڵان دەبات.

٢ من دی سەحەریٚ دخوابی مەستی
بیٚ دەنگ تەزەرو، لال دورراج

**مانای وشە:**

**خواب:** خەو؛ **تەزەرو:** باڵدارێکی پنۆك پنۆکی کللکدرێژە؛ **دورراج:** پۆر.

**پوختەی مانا:**

من لە بەرەبەیانێکدا، کە هێشتان پۆرو تەزەرویش، لاڵ‌و پاڵ‌بون‌و بۆخـوێندن وەخـۆ نەکەوتبون؛ یارم دیت کە هێشتان خەواڵویی شەو، بەری نەدابو.

٣ بشكفت ژغونچە نیرگزا مەست
بو فەرق ژسەر قەدیفە دیباج

٤ جەبهەت کەشفی ژصوبحی صادق
نوریٚ کو قەدا لسەر شەبی داج

**ماناى وشە:**
فەرق: جیایی؛ فەرق: تەپڵەسەر؛ قەدیفە: پارچەی مەخمەر؛ قەدیفە: گوڵێکە؛ دیبا: پارچەی ئاوریشم؛ جەبهەت: توێڵ؛ صوبحی صادق: بەیانی رون؛ نور: رۆشنایی؛ نور: گوڵ؛ داج: تاریك.

**پوختەی مانا:**
یار کە مەستی خەواڵو بو، چاوەکانی ـ کە وەك دو نێرگزی مەستن ـ بەروی گوڵزاردا هەڵێنا. پارچەی ئاوریشمی سەرپۆشی لەسەر ناوچاوانی لادا. لەخۆشی ئەو دیمەنەی ئەو، نێرگز چاوی داپچڕاندو لە خونچەییەوە بوبە گوڵ. گوڵی قەدیفەی رەنگ ئاڵیش بۆ لاسایی ئەو روخسارەو بۆ دیداری، خۆی لە سەرپۆشی گەڵای شین، رزگار کردو هەمولا دەبەژنی ڕامابن. روناکیو صافی هەنیەی یار کە دەرکەوت، تاریکایی شەوە زەنگی لەبەررەویو بەیانی رونی وەدەر خست.

٥ ئەلماسی نومانە شوبهی میصری
دانین جەگەریٚ مە دل کر ئاماج

٦ نەسرینو بنەفشە تەووزاندن
ماوەرد درەشاند شوشەیی عاج

٧ جوهتی حەبەشان بطُرفَةِالعَین
ئانی قەدەرەك ژئەسپەهان باج

**ماناى وشەی ئەو سیٚ بەیتە**
نومانە: نواندیان؛ میصری: شیری میصری کە بە تیژو جەوهەر دار بەناو بانگە؛ دانین: دایان گرت، هاتنیٚ؛ ئاماج: نیشانە؛ نەسرین: گوڵێکی زۆر سپییە؛ تەووزاندن: رازاندنەوەو رێكو پێك کردن؛ ماوەرد: گوڵاو؛ رەشاندن: پرژاندن؛ شوشە: گوڵاودان؛ عاج: ئێسکیدانی فیل؛ جوهت: جوت؛ حەبەش: خەڵکی حەبەشە؛ طُرفَةُالعَین: چاو تروکانێك؛ طرفە: جوانو لەبەر دڵان؛ عەین: چاو؛ ئانی: هێنای.

**پوختەی مەبەست:**
دیمەنێکم دێتە بەرچاو:

مەلا دوای نوێژی بەیانی - کە دنیا زۆر ماتو کشە - لە مزگەوت دەرکەوتوە، گەشتێك دەکا... بەگیانو دلْ، چاوی دلْو گیانی چاوی، بەرەو شانشینی کۆشکی سەلمای گراوی، دەڕوانن. لەپڕ پەنجەرەی هەیوانی روبە باخچە، دەکرێتەوە، یار خویەتی، چاوی هێشتان مەستی خەوە، بەژنو باڵای بەرزو تەرزی، تلدەدا دەلەرێتەوە. چاوێك بە گوڵاندا دەگێڕیو بزەیەك دێتە سەر لێوی. کارەکەرێك ئاوێنەو شانەو گوڵاودانو کلو کلتوری بۆ دێنیو لەسەر کورسی روبەروی دای دەمەزرێنیْ، کە خانم خۆی وەرازێنیو لە داهێنانی پەلکەی شۆڕ، دڵی دنیا بشۆرێنیو بشێوێنیْ.

کەزی دادێن، لەلادانیان، لاجانگی سپی دەنوێنیْ. بە کلچۆك چاوان دەرێژیْ. دەستێك بە برۆیاندا دێنیْ. کڵاو زێڕێکی پڕ پەرەنگ لەسەر دەنیْ. بەسینگو بەرۆكو کەمەر، چەند لیزگە لە زێڕو گەوهەر، سەربەرزو بەختەوەر دەکا. لە وێنەدانی ئاوێنە، خۆیشی عاشقی خۆی دەبیْ. جا واوەیلا لە مەلای دلْ برینداری ئەویندای دورە هومێدو هەژاری پاكو بیْگەرد! لەم کاتەدا، چی بەسەر دێت؟ سەرچاوەی شیعر دەجۆشیْ، فیچقە دەکا. مەرەکەفو قاقەزو قەڵەمی ناویْ. ئەشکی سورو بژانگو پەرەی‌دلْ، هەیە. دەبابزانین لەم سیْ بەیتەو بەیتەکانی ئایندەی ئەم قصیدەدا، ئەو دەڵیْ چی؟

برۆ - کە وەك شیری میصری بەکەوانەنَ - بەمشتو ماڵی سەرپەنجەی وەك ئەڵماسی تیژیان لیْهات. دڵمی کردە نیشانەیان، جەرگیشمیان پارەپارەکرد. لاجانگی سپی زێوینو کەزیە رەشو بۆنخۆشەکەی، خونچەی نەسرینو وەنەوشەی پیْ گەشاوەو پشکوتنو بۆ دیداری دەستێکیان بەخۆدا هێناو رازانەوە. گوڵاودانی عاج، لە تاوی لاجانگو مەچەکی سپیو بۆنی خۆشی بسکی خاوی، لیکاوی لەدەم دەپڕژا. کل فرۆشانی ئیصفەهان - کە بەکلچاکی ناودارن - لەوە ترسان، چاوی رەشی بیْ سورمەی یار - کە بازاری کلە سوبحانیش دەشکێنیْ - برەوی سەودایان بەریْ. ملیان بۆ خوڵامی چەماندو بونە باجدەری چاوانیو لە چاو تروکاندنێکا سەرانەیان گەیاندە لای ئەو دو حەبەشیە مەستانە. ئەگینا نەکەزیەکانی کاریان بەعەطرو گوڵاوەو نە چاوە مەستە کانیشی کلیان دەویْ. بۆنی خۆشی خودادادەی، بسکی خاویو رەنگی لە ئەزەل دارژاوی جوتە چاوی، هیچ کارێکیان بە دەسکردی بەندەی خوداوە بەند نیە.

٨ سیما کو نوما نەما لهش سیم
سیماب ژخەجلە مایە رەجراج

٩ میرئاتی سکەندەری لپێشە
(بحرُو لهاالعُکوسُ امواج)

١٠ دۆرا قەمەریْ ژبەر شەفەقدا
کو سپێدە لفەرقیْ سەر نها تاج

**مانای وشه:**

**سیما:** کەسم؛ **هش:** هۆش؛ **سیم:** زێو؛ **سیماب:** جیوە؛ **خەجلە:** شەرمەزاری؛ **رەجراج:** بەلەرزە؛ **میرئات:** ئاوێنە؛ **سکەندەر:** دنیا گرێکی بەناوە، دەڵێن ئاوێنەیەکی هەبوە، هەمو دنیای نیشان داوە؛ **عکوس:** وێنە دانەوە؛ **ئەمواج:** شەپۆل گەل؛ **دۆر:** دەورە؛ **شەفەق:** رۆشنایی ئاسۆ لە ئێوارەدا؛ **سپێدە:** بەربەیان؛ **نها:** داینا.

**پوختەی مانای ئەو سێ بەیتە:**

کەسمو بیچمە رەزاسوکو رازاوەکەی، کە دیاری دا؛ زێو لەتاوان، لە هۆش چو، سپی هەڵگەڕا. جیوە لەشەرمی لەرینی بەژنو باڵای، لە رەوتو لارو لەنجەدا، لەرزی لێهات. ئاوێنە کە وێنەی جوانی بێوێنەی هەمو دنیای ئەدایەوە؛ دڵی کەوتە شەپۆلدانو شەپۆلی جوانی دەوێدا، ببوە تۆفانو فەرتەنە. سپیایەتی بەرەبەیان، بە دیمەنی ئەوناسکە سپیە لە خۆشیان، بە سوپاسەوە قەدەمی وەك تانج نایە سەر. تەنانەت روناکی ئاسۆی ئێوارانیش، لە عەییەتان، رۆژو شەوی لێ گۆڕابو. چوبو دەوری مانگی دابو، کە هیچ نەبێ، کەموسکەیەك وەك روخساری یار دەنوێنێ. مەبەستی مەلا ئەوەیە؛ بریقەی کڵاوزێڕەکە لە دەورەی سەرو سیمای یار، وەکو روناکی ئاسوبێ لە دەوری مانگی چاردەدا دێتە بەرچاو.

١١ چەرخە، فەلەکو مەلەك دبازن
(شمسٌ وکواکبٌ وابراج)

١٢ زوهرە بقیرانی قابەقەو سەین
(والنّجم اذا هَویٰ بِمدراج)

١٣ دەنگێ مەلەکان زمیهنە زەمزەم
ئەرواح ژعیشقێ تێنە میعراج

**مانای وشە:**

**چەرخ:** عاسمان؛ **چەرخ:** کۆزی هەڵپەرکێ؛ **فەلەك:** عاسمان؛ **فەلەك:** زەمانە؛ **مەلەك:** فرشتە؛ **بازین:** سەماکردن، لەیزتن؛ **شەمس:** خۆر؛ **کەواکب:** ئەستێرەگەل؛ **ئەبراج:** رێبازەکانی ئەستێران؛ **قیران:** نزیك بونەوە؛ **قاب:** ئەندازە؛ **قابەقەوسەین:** ئەندازەی ژێ‌کەوانێك؛ (یان، ئەندازەی دودەست لە پەنجە تا هانیشك)؛ **نەجم:** ئەستێرەکۆی پیرو؛ **هەوێ:** داکەوت؛ **مِدراج:** پلەپلە؛ **زمیهتن:** گاڵەگاڵ کردن؛ **زەمزەم:** ویرە ویر، زەمزەمە؛ **زەمزەم:** بوێسە؛ **زمەزم:** گورەو هەرا؛ **تێنە:** دێنە؛ **معراج:** بەرەو سەر کەوتن.

**پوختەی مانا:**

مەلای ئێمە کە لە بوتەی ئەوینی خوداناسیندا، قاڵ کراوەو پاڵێوراوە؛ لەپڕ دڵی دادە خوربێو

هۆشی گیانی لەسەیری جوانی سەلمایە ـ کە پاژێکی زۆر وردیلە لە دەریای جوانی خودایە ـ رادەپەڕێو خوڕەی سەرچاوەی دێتەگوێ. حاڵی لێ دێ. هەمو نهێنی پشتپەردەی خاكو ئاوی ئەم زەمینەی دێتە بەرچاو. چیبینێ؟ نەك هەر ئەو لەجوانی خودای جوانیدەر بە سەلماکەی ئەو، سەر خۆشەو دڵی دەجۆشێ؛ بگرە هەردو عاسمانو هەرچی لە ناویاندا هەیە، کەوتونە خۆشیو زەمزەمەو هەڵپەرکێو بەزمو دیلانە. فەرمویەتی:

کۆزی هەڵپەرکێو سوردانە، عاسمانو فرشتەکانو ڕۆژو ئەستێرەو بورجەکان، سەما دەکەن، زوهرە، بەدەم هەڵپەرکێوە نزیك بوتەوە لە پیرۆ. ئەستێرەی کۆش، بەسەماوە پلەپلە بەرەو ئەو بەیانە جوانە، دادەکەوێ. پۆلپۆل فرشتە لێك کۆنو هەرایانە، گاڵەیانە، ناڵەیانە، هەڵدەپەڕن، دادەپەڕن، بە ویرەویر، بە دەنگی قەو پەسندی ئەو جوانیە دەدەن. هەمو گیانێکی بەختەوەر، بەرەو تیشکی جوانی خودا، بۆسەر کەوتن ملە دەکەن. گەرەکیانە زوی بگەنێو سەیری بکەن. «سەعدی»ش لەمبارەدا دەڵێ:

گەڵای شینی داران لەکن پیاوی وشیار لەپەسنی خودا هەر پەلەی دەفتەرێکە

شیاوی باسە، مەلا لەم چەند بەیتانەدا، میعراجی پێغەمبەریشمان، بۆ باس دەکا. کە چۆن لە گەڕانەوەیداو گێڕانەوەی ئەو سەفەرەی کافر باوەڕیان نەدەکردو عوتبەی کوڕی ئەبولەهەبی زاواشی، زۆر بێعەدەبانە دواندیو گوتی: بڕوات بە ئەستێرەو خوای ئەستێرانیش نەماوە... خودا سورەی «نەجم»ی ناردو لەسەر راستی روداوەکەی ئەو سەفەرە، هەر بە ئەستێرە سوێندی خواردو فەرموی:

«سوێند بە پیرۆ لەوکاتەدا دادەکەوێو بەرەبەیان ئاوا دەبێ. ئەو هەواڵەو نە گومبوە، نەگومرایە. لەخۆیەوە قسە ناکا. هەرچی دەیڵێ لەخواوەیەو فرشتەی زۆر تواناو بەهێز فێری دەکا... ئەو فرشتە وەحی بەرە. لە ئاسۆگ خۆی نیشاندا‌وەو لەپاشانیش بە ئەندازەی ژێکەوانێو نزیکتریش، خۆی لێ نزیك کردۆتەوەو فەرمانی ئێمەی پێداوە.»

مەلای خواناس کە لە حاڵاتی جەزمەدا، زۆر نهێنی گرینگی ئاشکرا کردون. سور دەزانێ لەوانەیە وشکەسۆفی کە سەریان لەهیچ دەرناچێ؛ بڕوانەکەن. بە بزەی پڕ بەزەییەوە فەرمویەتی:

١٤ دل بەحرە ئو صەدهەزار مەوجن
زاهید چخەبەر ژبەحری مەوواج؟

**مانای وشە:**

زاهید: تەرکەدنیا، لێرەدا مەبەست وشکە صوفیە؛ مەوواج: زۆر بە شەپۆل.

**پوختەی مانا:**

دڵی منی پێگەیشتوی تێگەیشتو، وەك دەریایەو لە صەد هەزار لایەنەوە، شەپۆل دەدات.

وشکەسۆفی ـ کە لەسەر خۆڵ مەلە دەکا ـ خەبەری لە دەریا چی‌یە؟! «نالی» دەڵێ:

بڕوانە وشکە صۆفی یو ڕەقصی بە هەروەلە      دیسان لەبەحری وشکی هەوا کەوتە پێ مەلە

**١٥** بوری‌و بەغەنجەکی «مەلا» کوشت

ئەو غونچە لەبا دەلال‌و غەنناج

**مانای وشە:**

**بوری:** رابرد؛ **غەنج:** ناز؛ **دەلال:** بە عەرەبی نازەو بە کوردی جوان چاکە؛ **غەنناج:** زۆر بەناز.

**پوختەی مانا:**

دیارە مەلا بەئەمەگە. چاکەی سەلما، لەبیر ناکا کە بەو دیدارەی بەیانەی لانەی دڵی، شێواندوەو گەیاندویەتە ئەو حاڵەی کە زۆر نهێنی گرینگی بۆ دەرکەوێ، دەڵێ: ئەویارە دەم بیچکەڵانەی لێوئاڵەی لەبەردڵانە، لەو تولحی بەرەبەیانە، بەنازەوە هات رابردو مەلای هەژاری لەگیان کرد.

## قصیدەی بیست‌و پێنجەم

# «سەروەری جوانان»

١ دل ژعیلاجیٚ کو بدەرکەت میزاج
دیٚ ژلەبی نوش عەطابت عیلاج

**مانای وشە:**

**عیلاج:** دەرمان؛ **عیلاج:** چارە؛ **نوش:** رەواقی هەنگوین؛ **عەطا:** بەخشین.

**پوختەی مانا:**

دڵێك کە نەخۆشی بگاتە دەرەجەیەك کە بە هیچ کەس دەرمان نەکرێت. لە لیکی رەواق ئاسایی لێوی تەنکی‌یار چارەی دێت.

٢ ئایینەیی جامی جیهان‌بینی جەم
بادەیی لەعلینە دجاما زوجاج

**مانای وشە:**

**جام:** پیاڵە؛ **جام:** شوشە: جام: ئاوێنە؛ **جیهان‌بین:** دنیابین؛ **جەم:** ناز ناوی پاشایەکی کۆنی ئێرانە کە گوایە پیاڵەیەکی هەبوە هەمو دنیای تێدا دیوە؛ **بادە:** مەی؛ **زوجاج:** شوشە.

**پوختەی مانا:**

بادەی ئاڵ بە رەنگی لاڵ، کە دەناو پیاڵەی شوشە بکریٚ؛ دەبێتە پیاڵەکەی جەم کە خۆرەوەی هەمو شتی دنیای فراوانی دێتە بەرچاو.

٣ ژاڤی حەیاتیٚ بمەدا شەربەتەك
زیندە کرین ما ژعەدورا نەشاج

**ماناى وشە:**

**ژاوی:** لەئاوی؛ **عەدو:** دوژمن؛ **نەشاج:** گریان‌و شیوەن.

**پوختەی مانا:**

مردبوم، یارم لە ئاوی ژیان ـ کە مەیەك بو، لیکی وەك رەواقـی خـۆی تیٚدابو ـ کە شـەربەتیٚکـی دەرخوارد دام، زیندو بومەوەو گریان‌و شین‌و قورپیٚوان هەربۆ دوژمنان مایەوە.

٤ بەندکرم گەرچی شبی فیل بوم
سیم بەری ساعیدو بازو ژعاج

**ماناى وشە:**

**ساعید:** قۆڵ؛ **بازو:** باسك.

**پوختەی مانا:**

منیٚك کە بەلای خـۆمەوە، لە هیٚزو پیٚزو توانا دا، خـۆم بە هاوتای فیل دەزانی؛ کەچـی ئـەندام زیٚوینیٚکی قۆڵ‌و باسـك سپیواشـی بەرەنگـی ددانی فیل، گرفتاری خـۆی کردم‌و بەندو پیٚوەندی کردم. «نالی» دەڵیٚ:

ئەلا ئەی ئاسکی ناسك بەباسك　　شکاندت گەردنی صەد شیٚری شەرزە

٥ ئەختەری ئیقبال‌و مەهی بورجی بەخت
میهری سپهریٚ کەمەرو تەختو تاج

٦ کوس‌کو هەنگافت بشاهی لتەخت
پادشەهان نەقدی رەوان دان خەراج

٧ خوسرەوی شیرینی لدەر بەندی حوسن
سیم بەران لازمە لیٚ موهرو باج

**ماناى وشە:**

**ئەختەر:** ئەستیٚرە؛ **ئیقبال:** بەخت؛ **میهر:** خۆر؛ **میهر:** خۆشەویستی؛ **سپیهـر:** عاسـمان؛ **کوس:** تەپڵ؛

**هەنگافتن**: لێدان؛ **رەوان**: رەواج؛ **رەوان**: گیان؛ **خوسرەو**: پاشا؛ **شیرین**: جوان‌و لەبەردڵان؛ **شیرین**: ژنی خوسرەوی پەروێز، کە فەرهاد لەسوێی‌مردو لە دەربەندێك کۆشکی هەبو کە جێگەی ئێستا شارێکە لە کوردستان، بەناو قەسری شیرینەوە؛ **موهر**: مۆر.

**پوختەی مانا:**

یارە جوانکیلانەکەی من، بەراستی دەکرێ بەپادشای هەمو جوانانی سەر زەمین دابندرێ. ئەستێرەی بەودم وپیت‌و مانگی بورجی بەختەوەری، بونە کەمەری زێڕینی‌و تەختی لەسەر رۆنیشتنی. خۆر لەعاسمان بەئاواتە، وەك تانج لە سەر سەری ئەوبێ. یاری‌من کە گەیشتە سەر تەختی پادشایەتی جوانان‌و لەخۆشیان تەپڵیان بۆکوتا. پادشایانی دنیا، تێکڕا ئامادەیی خۆیان شاندا کە نەغدینەی گیانی خۆیانی بە شاباش‌و باج بۆ بەرن. ئەو جوان‌و لەبەر دڵانە کە لە دەربەندی جوانی‌دا، هەر بۆ خۆیەتی‌و هیچ کەس‌نا. پێویستە ناسك ئەندامان بەدەستی گەل نامەی خوڵامی‌و بەندەیی بۆ مۆرکەن‌و سەرانەو پیتاکی پی بدەن.

**٨** سککەیی شیعرامە بەناڤێ تەهات
لەو ب‌عەیاری دجهان‌دا رەواج

**مانا:**

شیعری ئێمە ـ کە سکەکەی بەناوی تۆوە لێدراوە ـ بۆیە بەعەیارتەواوی لە هەمو دنیا ناسراوەو پەرەو برەوی وا زۆرە.

**٩** ئابی رەوان من دیە شیعرا «مەلا»
(یُنْکَرُ لِلماء لِسوءِالْمِزاج)

**مانای وشە:**

**من‌دیە**: من‌دیتومە؛ **یُنْکَرُ**: ئینکار دەکرێ؛ **للماء**: بۆئاو؛ **لِسوءِالمزاج**: لەبەر بەد میزاجی.

**پوختەی مانا:**

من دەبینم شیعری مەلا بەرەوانی، وەك ئاوی کانی رەوانەو هەتا بڵێی‌خۆش‌و جوانە. کێ دڵی لەئاو ببێزێ دیارە بۆخۆی لەپاڵە خۆی‌دا نەخۆشەو هیچ تاوانێکی ئاو نیە.

# قصیدەی بیست‌و شەشەم

# مەی چارەیە

١ دیسا ژنو بی‌حالە دل ساقی وەرین جاما زوجاج
موشتاقی خەمرا ئالە دل لێ خۆشی ئانی بت میزاج

**مانای وشە:**
**ژنو**: سەرلەنوێ؛ **وەرین**: بهێنە؛ **زوجاج**: شوشە؛ **موشتاق**: بەتاسە؛ **خەمر**: بادە؛ **خۆش**: ساغ؛ **ئانی**: دەس‌بەجێ؛ **میزاج**: تەبیات.

**پوختەی مانا:**
مەیگێڕ! بەو پیاڵە بلورینەی خۆت سا بادەیەکم بۆبێنە، وا سەرلەنوێ، دڵ بی‌حاڵەو ئارەزوی بادەی ئاڵ دەکا. هەر بمگاتێ، دەس‌بەجێ دڵ‌و تەبیاتم ئازاو ساغ‌و خۆش دەبنەوە.

٢ ساقی کو دیم مەهوەش بتن کاکول ژشیڤا رەش بتن
قەرقەف بلا ئاتەش بتن ئەم دێ بوی دل کین عیلاج

**مانای وشە:**
**دیم**: روخسار؛ **مەهوەش**: مانگ ئاسایی؛ **شیڤارەش**: شەوی تاریکی ئەنگوستە چاو؛ **قەرقەف**: بادە.

**پوختەی مانا:**
ئەگەر مەیگێڕ وەك مانگ جوان‌بی‌و کاکوڵی وەکو شەوەزەنگ رەشی توخ بێ؛ بائەو مەیەی دەماندا‌تێ، وەك ئاگر جەرگ سوتێن بێ. گوێ نادەینێ و دەردی دڵمان دەرمان دەکا.

**٣ دا ئەم بوی دل حەی بکین  پیّ سینە داغو کەی بکین**
**صەد مەنزلان پیّ طەی بکین  ئەودیّ دسەیریّ کەت رەواج**

**مانای وشە:**

**حەی:** زیندو؛ **کەی:** داغ؛ **طەی:** پێچانەوە؛ **سەیر:** رۆیشتن؛ **کەت:** دەکا؛ **رەواج:** برەو.

**پوختەی مانا:**

مەیگێڕ! بادەی ئاگرینمان پیّ ببەخشە، تا دڵمان زیندو کاتەوە. سینەو هەناومان، داغ بکا. مەی دەستی تۆ، بۆ ڕێڕەوان دنەدەرەو بیخۆینەوە دەتوانین صەد مەنزڵ ببڕین‌و نەوەستین.

**٤ بیّ نورو ناری موحبەتیّ  بیّ نەقش‌و صونعی قودرەتیّ**
**ناچین مەقامی وەصلەتیّ  (نورٌ لَنا وَالّلَیْلُ داج)**

**مانای وشە:**

**نار:** ئاگر؛ **موحبەت:** خۆشەویستی؛ **مەقام:** جێگە؛ **وەصلەت:** پێك گەیشتن؛ **لَنا:** بۆئێمە؛ **لەیل:** شەو؛ **داج:** تاریك.

**پوختەی مانا:**

شەو تاریکە. سەر دەرناکەین. نازانین بەرەو کویّ دەچین. ئەگەر روناکایی‌و گڕی ئەوین‌و نەخشی دەسکردی توانایی خوای مەزن ڕێگەمان بۆ رۆشن نەکات؛ هەرگیز ناگەینە ئەو پایە کە بە بارەگای یار بگەین.

**٥ ئەڤ نار سیقالادلە  دائیم لوی قالا دلە**
**نەوروزو سەرسالاد لە  وەقتیّ هلیتن ئەوسیراج**

**مانای وشە:**

**سیقال:** مشت‌و ماڵ؛ **قال:** گاڵەو هەرا؛ **هلیتن:** هەڵێت؛ **سیراج:** چرا؛ **سیراج:** بریەتیە لە خۆر.

**پوختەی مانا:**

ئاگری ئەوین‌و خۆشەویستی، کە دڵی من هەمیشە بۆی دەگاڵیّ‌و لەتاسەی ئەوا دەناڵیّ؛ تەواو دڵ مشت‌و ماڵ دەکاو هەرگا خۆری ئەوینی یار، تیشك بخاتە دڵەوە؛ لێی دەبێتە جێژنی نەوروزو ئازادی:

٦ حەتتا بنورا بادەییٚ ڕەنگین نەکی سەججادەییٚ
دوری ژوی شەهزادەییٚ دوردانەیا گەردن ژعاج

**مانای وشە:**

سەججادە: بەرماڵی نوێژ، دوگرد؛ دوردانە: گەوهەری تاقانە.

**پوختەی مانا:**

ئەی ڕێڕەوی ڕێگـەی ئـەوین! باش‌بزانە، تا دوگردت لەناو شـەرابدا ڕەنگ نەکەی؛ ناگەیتە لای ئەو شازادەی کە گەوهەری تاقانەیەو گەردنی‌سپیە وەکو عاج.

«مەحوی» لەو بارەوە دەڵێ:

بەنوری بادە کەشفی ظولمەتی تەقوا نەکەم چبکەم؟
بە نورێکی وەها چارەی شەوێکی‌وا نەکەم چبکەم؟

«حافظ» دەڵێ:

ئەگەر پیرت گوتی دوگردده مەی هەڵکێشە بی‌کێشە
بە فەرمانی بکە خۆی شارەزایەو ڕێگە ناگۆڕێ

٧ دوردانەیا گەردەن بلور ڕەیحان لسەر وەردێن دجور
هەی‌هەی بەمەستی تێنەدور خاڵا لنك فەرقێ بتاج

**مانای وشە:**

وەرد: گوڵ؛ جور: گوڵی گوڵاوێ؛ لنك: لەکن.

**پوختەی مانا:**

ئەو گەوهەرە تاقانەی گەردن بلورینە ـ کە ڕێحانەی بسکـەکانی کەوتونە سـەر گوڵی گوڵاو ـ ئـەو بسکە ڕێحانیانەشی، مەستی جوانی خاوەنیانن. هەر لەپەستا، دێنە دەورەی ئەو خاڵی سـەر هەنیە جوانەی کە بەرانبەر بە نێوانی سەر دیارٚ ئەداو نەخشێکە لەبن تاجەکەی.

مەبەستی مەلا ئەوەیە: یار بسکەکانی لاجـانگی لەسـەر گوناوە لادەخـاو بەرەو سـەر هەڵیان دەوێژنێ و لەنزیك خاڵی سەر توێلی بە کڵاوەکەی بەندیان دەکات.

٨ میهراتە پورٚ ئەبتەر کرین خالان ژبەر بسکان دەرین
زولفا موسەلسەل عەنبەرین چین‌چین ژچینێ تێتە باج

**مانای وشه:**

**میهر:** ئەوین؛ **ئەبتەر:** بێبێت؛ **موسەلسەل:** بەزنجیرە کراو.

**پوختەی مانا:**

لە ڕێی خـۆشەویسـتی تۆدا، دەردێکمان بەسـەر هاتوە، بەهرەو پیتمان لەدەس داوە. دەسـا بەزەییەکت هەبێ، خاڵەکانت - کە ژێر بسکەکانت کەوتون - دەر بهێنەو بیان نوێنە. ئەو کەزیانەت - کە بە زنجیرەت هۆنیون‌و بە بەرامە بازاری عەنبەر دەشکێنن بادەرکەون. خـەڵکـی چینیّ پێی بزانن. ئەگەر چی میشکی خوتایەش لای خۆیانە. دەستەدەستە دێنەلات‌و باج بۆ ئـەو کەزیانەت دێنن.

**٩** **تەنها نەکوردستان ددن شیرازو (ینگ)و وان ددن**
**هەریەك لسەر چەهڤان ددن ژ ئەسپەهان تیتن خەراج**

**ماناکەی:**

جگە لە خەڵکی کوردستان - کە شانازی بە جوانی کچی کورد دەکەن - خەڵکـی تریش لەشیرازو ینگ (؟) و وان‌و ئیصفەهان‌و شوێنی تریش، باج بۆ ئـەو جـوانیەت دەنێرن‌و چـی بفـەرموی لەسەرچاوان پێکی دێنن.

**١٠** **چەهڤێن بەلەك قەوسێن هەلەك چەرخو فەلەك، غالب مەلەك**
**(فی حُبِها عُمری ذَلك) (والحب یجری فی عجاج)**

**مانای وشە:**

**چەهڤ:** چاو؛ **هەلەك:** هیلاك‌و خەتەر؛ **هەلەك:** خوارەوەبو؛ **چـەرخو فـەلەك:** هەڵپەرکێ بەکۆز؛ **غالب:** بەشی هەرە زۆر؛ **مەلەك:** پەری‌و فرشتە؛ **فی حُبِها:** لە ئەوینیدا؛ **عُمری:** تەمەنم؛ **ذَلك:** لەسەر ئـاوا بونە؛ **والحب:** ئەوینیش؛ **تجری:** دەڕوا؛ **فی‌عجاج:** لە گێژەڵوکەدا.

**پوختەی مانا:**

لەو کۆزی هەڵپەرکێیەدا - کە بەشی زۆر لە سەماکەر وسوردەران وەك فـریشتەو پەری دەچـن - چاوی بەڵەك‌و برۆی کەوانیّ پیاوکوژی ئەو نازدارە، دەردی داومیّ. لە ئەوینی ئەو چاوانە، تەمەنم لە ئاوابونەو هێشـتان گەمیەی ئـاواتانم دەبەر گێژەڵوکە دایەو زۆر چـەتونە گەردەلول تێکـی نەشکێنیّ.

١١ شاهید هەزار ڕەنگ خەمملین ڕەقص‌و سەما بێ کەمملین
ئیرۆ «مەلا» ئەم صەد دلین ساقی وەرین جاما زوجاج

**مانای وشە:**

**شاهید:** دڵبەر؛ **خەمملین:** خۆیان ڕازاندەوە؛ **کەمملین:** بێ کەمایەسی بون.

**پوختەی مانا:**

لەم بەزم‌و ئاهەنگ‌و کۆڕی سەمایەدا، دڵبەران بەهەزار تەرز خۆیان جوان ڕازاندبوو‌و کۆڕەکە هیچ کەمایەسی تێدا نەبو. مەلا! ئێمە ئەمڕۆ دڵمان لەصەد جێوە لەت‌لەت بوە. مەیگێڕ وەرەو پیاڵەی بلورینت بێنە، تاوەخوێن‌و برینی دڵمان دەرمان کەین.

«نالی» دەڵێ:

بۆچی نەگریم صەد کەرەتم دڵ دەشکێنی مەی چۆن نەڕژێ شوشە لەصەد لاوە شکاوە

# قصیدەی بیستو حەوتەم

## «رازداری»

١ پورْ مەکە اِسراف دقەتلیٚ مُباح
(سَفكُ دَمِ الْعاشِقِ مالا یُباح)

**ماناى وشە:**

**اسراف:** لەرادە دەرکردن؛ **مُباح:** نهێنیێ درکێنراو؛ **مُباح:** رەواو حـەڵاڵ؛ **سَـفْك:** رژاندن؛ **دَم:** خـوێن؛ **ما:** شتێکە؛ **لایُباح:** دروست نیەو رەوا نابێ.

٢ سینە بـدەستیٚ خوە مُبارەك ڤەکە
(تَعْرِفُ کَمْ فی کَبَدی مِن جِراح)

**ماناى وشە:**

**تَعْرِف:** دەزانی؛ **کَمْ:** چەند؛ **فی:** لە؛ **کَبَدی:** جەرگم؛ **جِراح:** برینان.

**پوختەی مانای ئەو دو بەیتە:**

کوشـتنی دڵدارەکانت لە ئـەندازە دەرکردوە. کە دەشـــتەوێ هەر بیان‌کوژی. وا بەکۆمەڵ مەیان‌کوژەو وامەکە، بە زۆریکاریو هەژار کوشتن، ناوت دەرچێ. چـونکە هێندێك دڵداری وایان لەناودا، وا لە ئەویندا سوتاوە، هەربینا گیانی دەر دەچـێو خـوێنەکەشـــی ناخـــەنە گەردنی تووە. بۆنمونە من خۆم دەڵێم: بە دەستی ممبارەکی خۆت، سینەم شـەق‌کەو لە هەناوانم بڕوانە، تابزانی کە چـەند برینی کاریگـەر، لە جـەرگمداو مزگێنی مەرگم پێ دەدەن. من هەر لەســوێی تۆ، گیان دەدەمو کەسیش ناڵێ خوێنی بەناهەق رژاوەو کەس گوناح ناخاتە سەرتۆ.

«سەعدی» لەو کوشتو کوشتارە توڵەی دەوێ. بە عەرەبی گوتویە:

دەڵێن راموسانی کچی جوان خەتایە      ئەدی رشتنی خوێنی عاشق رەوایە؟!
واتا: ئەم حەقیچە بەم حەقیچە.

**٣ دل ژهەوایاتە دفکرێن دهور**
**(فی لُجج ِ بَین َ هُبوبِ الرّیاح)**

**٤ عیشق کوگەها کیّ وەلعەقلی خوەما؟ (یان، عیشق گەهاکیّو لعەقلی خوەما؟)**
**(یَفتِكُ بالعاشِقِ حُسن ُالمِلاح)**

**مانای وشە:**
**هەوا:** ئەوین؛ **هور:** ورد؛ **لُجج:** لوججەگەل؛ **لوججە:** نێرینەو پڕایی ئاوی بەربەرین؛ **هبوب:** هەڵکردنی با؛ **ریاح:** باگەل؛ **گەها:** گەیشت؛ **یَفتِك:** دەکوژیّ بیّئەمان؛ **حوسن:** جوانی، باشی؛ **مِلاح:** بای گەمیە ئاژوّ؛ **ملاح:** جوان چاکان.

**پوختەی مانا:**
منێك کەخوّم بە خاوەن ئاوەز دەزانی ودەمگـوت دڵم‌کانگـای بیری ژیرانەیە؛ لەوەتا بومە دڵدارت، خــوّمو دڵم، وەکو گەمیەی بادەوانی ـ کە لەناوەندی دەریادا، قــەتیس مابیّو لە هەمو لا، بای گەردەلول دەوری دابیّو رای‌تەکێنیّو بیرەتێنیّو نزیك‌بیّ تێکی بشکێنیّ ـ هومێدم لەمان بڕاوە.
هەرکەسیّ تریش کە وەك من، لە ئەویندارێدا بگاو کاڵی‌و تاڵی بەجـیّ بێڵێت؛ وەك ئـەو گەمیە لیّقـەوماوەیّ لیّ دێت. تەنانەت ئـەگەر باش باش‌و بەئــارەزوی گەمیەوان بێت؛ لە گێژاوی دڵداری‌دا، بیّگومان لەبەریەك دەچیّ. ئاخ لەدەس ئەوینی جوانان!! دڵدارکوژی بیّ ئامانن.

**٥ دیّ دو سیەهسورمەیی چەهڤێن خوەکەت**
**خاکی رەهی یاریّ صەبا هەر صەباح**

**٦ توزو غوباری سەحەری بەرچەمەن**
**(قَد نَشَرَالطّیبَ و بِالمِسكِ فاح)**

**مانای وشە:**
**صەبا:** شنەی بای روّژهەڵات؛ **صەباح:** شەوەکی؛ **چەمەن:** مێرگو چیمەن؛ **قد:** لێرەدا مانای تەواو؛ **نَشَرَ:** بڵاوی کردەوە؛ **فاح:** بوّنی‌دا.

**پوختەی مانا:**
ســروەو شــنەی بەیانان ـ کە لەروّژهەڵات هەڵدەکا ـ هەمو روّژیّ بەخــاکی بەرپیّی یارەکەم،

چاوەکانی خوێی دەڕێژێ. تۆزی پاڵای یارە باڵا بەرزەکەی من، بۆنی خۆشی دا بە مێرگو باغی گوڵانو بۆنی میسکیش نیسکێك لەو تۆزەی تێدایە کە هێندە بەرامە خۆشە.

**٧ فێرسو رمباز گەهان یەك بتیر**
**(أحْمَدُ فیالبینِ قَتیلُالرماح) یان، (قَتیلَالرماح)**

**مانای وشە:**

**فێرس:** ئازای سوارچاك؛ **بەین:** نێوان؛ **بەین:** دور کەوتنەوە، هجران؛ **قتیل:** کوژراو؛ **رماح:** رمبگەل؛ **أحْمَدُ:** سوپاسو تاریف دەکەم.

**پوختەی مانا:**

بە نازەوە، چاوەمەستەکانی لێك ناپیلوەکانی لە دولاوە، بەتیرورمبی بژۆڵان، هاتنە سەریەكو تێكگیران. لەو ناوەدا، ئەحمەدی بێ سوچو تاوان، بەنوکی ئەو بژانگانەی لەرمب درێژترو تیژتر، شەهید کرا!

ئەگەر قتیلَ بێ؛ واتا: سوپاسو ئافەرین دەکەم لەو کەسەی کە هەر دوربەدور کوشتەی ئەو مژۆڵانەیە.

**٨ (بوسە زنان هرکە بران آستان   مَکَّنَ مِنْ جَبْهَتِهِ لابَراح)**

**مانای وشە:**

**بوسە:** ماچ؛ **بوسە زنان:** بەماچ کردن؛ **بَرْ:** لەسەر؛ **آستان:** پێش دەرگا؛ **مَکَّنَ:** بوێ‌لوا؛ **مِنْ:** لە؛ **جَبْهَـە:** سەردارو سەروەر؛ **جَبْهَە:** سەردەرانە؛ **لا:** نا؛ **بەراح:** لاکەوتن، جێ‌هێشتن.

**پوختەی مانا:**

هەرکێ هەرجارێك بوێ بلوێ، سەر لە دەرگانەی یار بسوێو سەرداری ماڵ رێگەی بدا، سەردەرانەکە راموسێ؛ تازە هەرگیز لاناکەوێو هەتاهەتایە، لەژیانی بەختەوریدا رادەبوێرێ.

**٩ (حَلَّ لَهُ القتلُ بِشَرْعِ الْهَوىٰ  مَنْ کَشَفَالسِرَّ وَبالسِر باح)**

**مانای وشە:**

**حَلَّ:** رەوایە؛ **قَتل:** کوشتن؛ **شەرع:** دەستور؛ **هَوىٰ:** ئەوین؛ **من:** کەسێ؛ **کَشَـفَ:** پەیدای کرد؛ **سِـر:** نهێنی؛ **باح:** درکاندی.

**پوختەی مانا:**

مەلا! تۆ بۆچ ئەم نهێنیەت ئاشکرا کرد، کە ماچێك لە دەرگانەی یار، هۆی هەرمان‌و سەرچاوەی هەمو خۆشیانە؟ بە شەریعەتی دڵداران، هەرکێ بەسرێك بزانی‌و ئاشکرای کا؛ کوفرەو کوشتنی ڕەوایە.

«حافظ» دەڵێ:

وتی ئەویارە کە سەرداری قەنارەی شادکرد
سوچی گەورەم ئەوەبو رازی دڵی خۆم درکاند

١٠ حوسنی ئەدایاتە «مەلا» هەرکێ دی
(صحَّ لَهُ إنكَّ عَيْنُ الفِصاح)

**مانای وشە:**

حوسن: باشی‌و جوانی؛ ئەدا: پێك هێنان؛ صَحَّ: بەراست گەڕا؛ لَهُ: بۆئەو؛ إنَّكَ: تۆ؛ عَين: سەروەر، سەردار؛ فِصاح: قسەرەوان گەل.

**پوختەی مانا:**

مەلا! هەرکەسێ کردەو هونەرتی چاو پێ بکەوێ‌و بزانێ چەند جوان‌و ڕەوان شیعر دەڵێی؛ بێ‌گومان بۆی دەردەکەوێ، کە تۆ سەرومرو سەرداری زمان‌تەڕو پاراوانی.

«نالی» دەڵێ:

نالی عەجەب بەقودرەت‌و حیکمەت ئەدای دەکا
مەعنایی زۆرو گەورە بە لەفظی کەم‌و بچوك

## قصیدەی بیست‌و هەشتەم

# حوسنا موقەددەس

**١** حەیف دقەیدا خاك‌و گیل بت عارفی چالاك روح
دیٚ موجەررەد بت کو پورتەو دەت ژنورا پاك روح

**مانای وشە:**

**حەیف:** مخابن؛ **قەید:** بەند، زنجیر؛ **گیل:** حەڕی، قور؛ **چالاك:** چوست؛ **موجەررەد:** روتەوەبو؛ **پورتەو:** تیشك.

**پوختەی مانا:**

زۆر حەیفە گیانی چاکی بزۆزو چالاکی خودا ناس، لەناو بەندی قورو خاکی لەشی سەرزەوی بمێنیٚ. پیٚویستە ئەو بەندو کۆتەی فریٚبدا تا سەرلەنویٚ گیانی پاکی وەبەر تیشکی جوانی خوای تاك کەویٚ.

**٢** قەیدی خاك‌و گیل نەبت دابیٚ حیجاب‌و پەردە بیٚ
میثلی بەدریٚ جارنان تیٚخت خوسوفیٚ خاك روح

**مانای وشە:**

**حیجاب:** پەردە، لەمپەر؛ **جارنان:** هیٚندیٚ جاران؛ **تیٚخت:** بخاتە؛ **خسوف:** گیرانی مانگ.

**پوختەی مانا:**

وا باشە گیان ئازادبیٚو هیچ لەمپەڕو بەندی خاك‌و قوڕی لەبەرو لەسەر نەمیٚنن. چونکە تا دیل‌و یەخسیری ناو ئەو کەلاکە خاکەیە؛ چاری ناچار با وەك مانگی چاردەش وابیٚ، توشی گیرانیٚ هەر

دەبیٚ‌و خاك دەیگریٚ.

شیاوی باسە، گیرانی مانگی عاسمانیش، هەر لە سوٚنگەی زەمینی خـاك‌و ئـاوی‌یە، کە دەبیٚتە لەمپەر لە نیٚوان مانگ‌و روٚژ.

**٣ شەمعی سەرنور نادرت گەر ئەو نەکەت پەرهیز دل**
**ذەوقی جاما عیشقیٚ ناکەت گەر نەکەت ئیمساك روح**

**مانای وشە:**

**شەمع:** موٚم، شەم؛ **پەرهیز:** پاریٚز؛ **ذەوق:** چیٚژە؛ **ئیمساك:** خوٚراگرتن لە خواردن‌و...

**پوختەی مانا:**

موٚم ئـەگەر لە ناوەروٚکدا، پیس‌و خـوٚلاوی بیٚت؛ هەلٚ نابیٚ‌و روناکی نادات. ریٚرەوی ریٚگــەی عیرفانیش، هەروەهایە. ئەگەر بەدلٚ پاریٚز لە خلٚتو خاشی دنیایی نەکا؛ هەرگیز روناکایی جـوانی خودا، لەسـەری خـوٚی دا نابینیٚ. هەتا عارف خـوٚی لەهەمو لەزەت‌و خـوٚشیان دور نەگریٚ‌و لەم دنیایە واز نەهیٚنیٚ، لەبادەی ئەوینی خودا، چیٚژە ناکات.

**٤ دل بـطایەك نیٚرگزان‌دە نازکەك تەروەندە دە**
**گول دکن تەشبیهی خاران هەرخەس‌و خاشاك روح**

**مانای وشە:**

**طا:** چلٚ، قل؛ **تەروەندە:** نوٚبەرە، تازە پشکوتو؛ **خار:** چقلٚ؛ **خەس‌و خاشاك:** زبلٚ‌و زالٚ، پڕوٚپوش.

**پوختەی مانا:**

ریٚبواری سەر ریٚگەی عیرفان، لەدوای ئەوە کە لەخوٚشی‌و شادی دنیا دەست بەر ئەداو دلٚ‌و گیانی بەپاریٚزو خوٚراگرتن، تەمیزو بیٚخلٚتە دەکا؛ ئەوسـاش دەبیٚ لە هەلٚبژاردنی یاری دەسـتگیردا، پەلە نەکاو فریوی روالٚەت نەخوا. کەسیٚك کە دەستی بگاتە باغی گولاٚن‌و ریٚگەی بدەن گولیٚك بوٚخـوٚی هەلٚبژیٚریٚ، باتیٚ‌گەریٚ‌و چلیٚك نەرگزی ناسکی تازە پشکوتوٚی نوٚبەرەی بیٚ‌هاوتا، بکـاتە هی خـوٚ. ئیتر وەك ئەوانە نەبیٚ کە روحیان لە زبل‌و زالٚداو چقلاٚنیش بەگولٚ دەزانن.

**٥ جامی عیشقی پاکی روحانی طەهورا باطینە**
**ئی‌نەنوشی هەروەها حەتتا ئەبەد ناپاك روح**

**مانای وشە:**

**طەهور:** خاوێن‌و خاوێن کەرەوە؛ **باطین:** دەرون؛ **نوشین:** وەخواردن.

**پوختەی مانا:**

بادەی ئـەوینی پاکی خـوداناسی ـ کە تایبەتی گیانپاکانە ـ دڵ‌و دەرون لە پیسـیەتی دەشـواتەوە. هەرکەس لەو بادە نەنۆشـێ، هەزار سـاڵیش تێبکـۆشێ گیانی بۆ هەتا هەتایە گەمارو چڵکـن دەمێنێ.

٦ **هەیئەتا کەیف‌و کەمی بی‌کەیفە کەیفا عارفە**
**دێ بمێنت گەر نەبت ناچار بێ‌تریاك روح**

**مانای وشە:**

**هەیئـەت:** تەرز، رواڵەتی؛ **کەیف:** چـۆنیەتی؛ **کەمی:** چـەندی؛ **کەیف:** ئـارەزو؛ **دێ‌بمێنت:** هەردەمێنێ؛ **تریاك:** دەرمانی دژی ژەهر.

**پوختەی مانا:**

چۆنی خوداو تەرزو بیچم‌و چەندایەتی رەوشـتو ئـاکارەکانی (صیفاتی)، هەرچـی باس دەکرێ‌و دەگوترێ، لەراستی‌دا هیچـی دەگەڵ راسـتەقـانی تەواو یەکتر ناگرنەوە. هەرکەسـێ هەرلە ئەندازەی ئاوەزو بیرکردنەوەی خۆی بۆی چوە. دڵ‌و گیانی رێرەوانی رێگەی عیرفان، بەو چـەندو چۆن لێکدانەوەی ئاکارو تەرزو دیمەنی خودای مەزن، ژان لەگیان‌و دڵ پەشێوو سـەرسـورماون. هەرگا یار یاری کردن‌و چاوی دڵیان لەدینی دیداری گەش‌بو؛ لەو دڵەتەپی‌و دودڵیەی توشیان بوەو ـ چون مارانگەزتە، پێچ دەخۆن ـ رزگار دەبن. کێ بە خوا بگا، تێدەگا، کە بۆ ئـەو یارە تاقـانە، نە چۆنی هەیەو نە چەندی. خۆی‌و صیفەت‌و ئیرادەی هەر یەکەو خـۆی سـەرچـاوەیەو لێك جیانین. واتا بەدەردی کورد دەڵێ: خودا یەکەو نابێ بەدو.

٧ **دێ بەگولزارا جەمالا سەبزە پوشان وی چکەت؟**
**ئی دمیهرێ‌دا نەبت دل پارەپارە، چاك روح**

**مانای وشە:**

**جەمال:** جوانی؛ **سەبزەپوش:** لێرەدا بریەتیە لەو کەسانەی دەگەڵ خودا تێکـەڵاون‌و هەرگیز سیس‌و پیر نابن‌و لەناو ناچن. (ناوی حەزرەتی «خضر» کە کورد دەڵێن: «خدر» واتا هەمیشە سەوزو دور لەسیس‌بون‌و وشك بون)؛ **میهر:** ئەوین؛ **چاك:** دادڕاو.

**پوختەی مانا:**

کەسێکی لە دڵداری پاکدا، دڵی لەتلەت نەبوبێتو پارچەی گیانی دانەدڕابێ، قەت ڕێی‌نابێ بچێتەناو باغی گوڵانی ئەو جوانانەی کە تا هەتا بە ئەوینی یار، زیندون‌و سیسی‌و کزی‌وهەڵوەرینیان نایەتە ڕێ.

**٨ بەر ژجان دەررا کەیەك ڕەوشەن‌ترو والا دڤێت**
**صورەتی حوسنا موقەددەس دابکەت ئیدراك روح**

**مانای وشە:**

**بەر:** پێشتر؛ **دەرراکە:** زۆر زو لەشت گەیشتو، زۆر لەسەر هەست؛ **والا:** بەرز، هێژا؛ **صورەت:** شکڵ؛ **موقەددەس:** پیرۆز؛ **ئیدراك:** پێزانین.

**پوختەی مانا:**

هەر ئەویندارێکی خودا، کە بەنیاز بێ بە دیداری یار شادبێ، پێویستە سەرەڕای گیانی خاوێن هۆش‌و بیرو تێ‌گەینەکی زۆر لە پلەی بەرزا هەبێت؛ تا توشی هەڵەموت نەبێ‌و هەڵنەدێری. ئەوسا دەکرێ بەدیداری ئەو جوانیە هەرە پیرۆزە، گیانی شادبێ‌و لە بەندی خەمان ئازادبێ.

**٩ گەر خەبەرداری ژسیررا (کُنتُ کنزاً) گۆهبدێر**
**دا بەصەد تەورێ بەیانکەت مەعنی‌یێ (لولاك) روح**

**مانای وشە:**

**کُنتُ:** بوم؛ **کەنز:** گەنجینە؛ **گۆهـ :** گوێ؛ **تەور:** جۆر؛ **لولاك:** تۆ نەبای.

«دوفەرمودەی پیرۆز (حدیث قدسی) هەیە، پێغەمبەر لەزوان خوداوە فەرمویەتی: من گەنجینەی نهێنی بوم، ئەم جیهانەم هەر بۆیە کردوە بناسرێم. جارێکی تریش فەرمویە: گەر تۆ نەبای، ئەم عاسمانانەو جیهانەم ساز نەدەدا.

ئەگەر ئێمە بە ڕواڵەت بینی‌و سەرچڵی لەو دو فەرمودە بڕوانین؛ وا ئەزانین پێچەوانەو دژ بەیەکن. ئەم سازدانە بۆکامیانە؟ بۆ ناساندنی خودایە؟ یان بۆ ڕێزنان لە پێغەمبەر؟

بەڵام ئەگەر سەرنج بدەین، زو تێ‌دەگەین هەردوك لا لکی دارێکن‌و ناو ئاخنی تابارێکن. با بزانین چۆن؟! خوا ویستویە خەڵك دروس‌کا بیناسن. پێغەمبەری هەڵبژاردون‌و ناردونی مرۆ ئاموژگاری بکەن کە بیناسن. محمدیش (ص) بەرانبەر بە فەرمودەی خۆی «من بیومە پێغەمبەرو هێشتان بابەدەم لیتەبو» پێشینەی پێغەمبەرانەو لەدوای هەموانیش هاتوە. خودا گیانی محمدی بەر لە هەرشت وەدی هێنا. واتا ماك‌و هەوێنی سازدانی دنیا محمدە. بونی پێغەمبەرو جیهان وەك دو شەنگلە بەرەکەتەن کە لێك جیا ناکرێنەوە. «شێخی‌خانی» لە پێشەکی «مەمو زین» دا لەو بارەوە بە کرمانجی فەرمویەتی. کە سورانیەکەی

ئەمەیە:

گەنجینەیی گەوهەری وەشێراو
چی جوان‌و بەنرخی ئەم جیهانەن
دای جوانی نەمر بروسکەیەك لەم
ئەو تیشکی خودایە بۆ هەمیشە
گیانان لەگیانی ئەو پەیا بون
سەرپاکی لەتیشکی رونی ئەوبون
هێشتا نەزەوی، نە عاسمان بو
عاسمان‌و زەوی لەبەر ئەوی بون
پێغەمبەرێ بو لەلای خودا ئەم
ئەو پەنجەرەیەو خودا دەوێرا

پاش پەردەیی کردە دێتە بەرچاو
لەجوانی خودای نەمر نیشانەن
پێغەمبەری ئێمە هاتە بەرهەم
بۆ هەرشتێ بۆتە پنچو ریشە
چەند تیرەو و هۆز لەیەك جیابون
گش هاتن‌و بون لەبونی ئەوبون
ئەو سەروەری هێزی سەروەران بو
بۆوی بو فریشتە سەرنەوی بون
بێ خوێ یەکی قوربو باوە ئادەم
تیشکی لە دڵی رەشی مە گێرا

**پوختەی مانای بەیتەکە:**

ئەگەر لە مانای نهێنی «گەنجینە بوم» ئـاگاداری، دەگوێ بگـرە؛ بزانە گیان چـۆن بەصـەد تەرزو جۆر مانای «گەر تۆ نەبای»ت پێ دەڵێ...

١٠ لامیعی سیررا تەجەللی سەر لطوری دل ددەت
ضەبط ناکەت وێ مەجالێ صەد هەزار ئەفلاك روح

**مانای وشە:**

**لامیع:** تروسکەدەر؛ **تەجەللی:** خۆشاندان؛ **ضەبط:** راگرتن‌و گرتن؛ **مەجـال:** وەخـت، دەم؛ **ئـەفـلاك:** عاسمانان.

**پوختەی مانا:**

هەروەك موسا لە کێوی تور، لە خوا پاڕاوە بیبینێ، خـودا فـەرموی: تۆ نامبینی، بەڵام بڕوانە ئـەو کێوە. ئەگەر خۆی لەجێی خۆی داگرت، سا ئەوسا کە تۆش دەمبینی. وەختێ خودا خۆی نیشـانی چیاکە دا، لەبەریەك چو. موسا بە بێهۆشی کەوت.

ئەگەر تیشکی جوانی خودا خۆی بۆ دڵ ئاشکرا بکـا؛ گیان خـۆی ناگرێ. ئـەگەر صـەدهەزار عاسمانیش لە هەمو لاوە بیگرن، وەك کێوی توری بەسەر دێ.

١١ هەردو ئیلانێن تەدی‌من طەوقی گەردەن‌کر مودام
دامە هەربێتن تەبەسسوم وەك‌گولا ضەحاك روح

**مانای وشه:**

**ئیلان:** مار؛ **طەوق:** بەندی بەئاڵقە؛ **مودام:** هەمیشە؛ **ضەححاك:** زۆر بەپێکەنین؛ **ضەحجاك:** گوڵی جوان پشکوتو.

**پوختەی مانا:**

مەلا لەپاش ئەوهەمو ئامۆژگاریانەی خواناسانەو دەنگو باسانەی، چۆنیەتی بەخوا گەیشتن‌و تێ‌گەیشتن لەمانای ئایەتو حەدیث؛ بۆ وچانێك بادەداتەوە سەر دنیاو دیسان رودەکاتە سەلمای دڵ رفێنی‌و فەرمویەتی:

چەند خۆشە پیاو دیلی تۆبیٚ‌و خەڵکیش بەوکارە بزانن، کە تۆ یەخسیرو دیلی خۆت رست کردوە. جا بۆئەمە من کە هەردو پرچی وەك ماری رەشتم دیت، کردمنە تۆقی گەردنم، تا لای هەموکەس شانازی بەو بەختەوەریەم بکەم‌و هەمیشە وەك گوڵ گەش‌ببم‌و لەخۆشیانا هەربخەنم‌و بزەم لەسەر لێو لانەچێ.

**١٢** جەوهەری حوسنی ئەدا تەنها دبت مەقبولی طەبع؟
گەر نەصەیقەل دەت بنوریٚ عیشق وەك حەككاك روح

**مانای وشە:**

**جەوهەر:** گەوهەر، عەصل، لێرەدا بەمانا هونەرە؛ **صەیقەل:** مشتومالٚ؛ **حەکاك:** ئەوی شتدەرٚنیٚ تا ژەنگی لیٚ بکاتەوە.

**پوختەی مانا:**

شیعرو گفتی من، بۆیە لە چاو قسەی خەڵکیتر زۆر لە بەردڵانەو خەڵك پیٚیان خۆشە، چونکە گیانم کە بەتیشکی ئەوین قاڵە، زمان‌و دڵ‌و مێشکمی بە خاوێنی راهێناوەو وەکو ژەنگرن ژەنگاوی مشتومالٚ دەکا. ئەویش مشتو ماڵی داون، بۆیە وا خۆش‌و لەبارن.

**١٣** دی بویٚ ئەندازو تەرزی کی دبێت سیحری حەلال
گەر نەبالا طەبع بت وەك پەهلەوان چالاك روخ

**مانای وشە:**

**دی:** لێرەدا بەمانا دەنا؛ **سیحری حەڵال:** بریەتیە لە شیعرو وتاری زۆرباش.

**پوختەی مانا:**

دەنا کیٚ دەتوانیٚ بەم تەرزو بەو ئەندازە زۆرە، سیحری حەڵالی بەدەمدا بیٚ. ئەوە کاری کەسێکە

که گیانی وەك پاڵەوانی زۆرچوستو بەکار مرخیشیعری بەپایەو پلەی بەرزە تی گەیاندبێ.
«نالی» دەڵێ:

فارس و تورکو عەرەب هەرسێم بەدفتەر گرتوە
نالی ئەمرۆ خاوەنی سێ مۆلکە دیوانی هەیە

١٤ دل بەڕم ئاڤیهتو وی لێ بارکر قەوسی شەڤین (یان، چەڤین)
دێ بدەت بەر گەزمەیان بێسوچ ئەو سەففاك روح

**مانای وشە:**

ڕم: رمب؛ ئاڤیهت: هاویشت؛ بارکر: ئامادەی کرد؛ شەڤین: بەرەنگی شەو؛ گەزمە: تیر؛ چەڤین: چەماو.

**پوختەی مانا:**

ئەویارە عاشق کوژو خوێن ڕێژە، بە ڕمبی مژۆڵان جەرگی هەنگاوتومو ئێستا بەوە نەوەستاوە؛ دو برۆ کەوانیەکانی ـ کەچەماون‌و ڕەشن وەك شەوی زۆر تاریك ـ ئاراستەی گیانم کراوەو دەیەوێ ئەو بێگوناهەش هەر بێتاوان بەرتیران دات.

١٥ شەهسەوار ئیرۆ کەمەند ئاڤیهتنە قەلبێ «مەلێ»
بەند ناکەت غەیری فیتراکاتە صەد فیتراك روح

**مانای وشە:**

فیتراك: بەن سامورتە.

**پوختەی مانا:**

ئەمرۆ زۆر لەوانەی کە لە مەیدانی جوانی‌و دڵبەری‌دا بە سوار چاك دەژمێردرێن؛ ویستیان دڵی‌من بخەنە ناو کەمەندی خۆیانەوەو لە تۆم بستێنن. بەڵام خەیاڵیان خاوە، من بەوانە ناگیرێم‌و گیانی من تەنیا بەبەن سامۆرتەی پشت زینی ئەسپی تۆنەبێ؛ لە هیچ بەندێکی دیکەدا، ئۆقرە ناگرێت‌و ناگیرێ.

«سەعدی» دەڵێ:

ئەگەر تۆ ڕاو بکەی وەحشی بە خۆشی دەبنە نێچیرت
هەمو گیانێك گرفتاربونی تۆی بۆ بەختەوەر بونە

## قصیدەی بیست‌و نوهەم

# «کلیلی دڵ»

١ عیشقیّ کوبدەن بەیەکدو ئەرواح
پەیوەستە دقیّ بەهەفبن ئەشباح

**مانای وشە:**

**بەیەکدو**: بەیەکتری؛ **پەیوەستە**: پێکەوەلکاو؛ **پەیوەستە**: هەمیشـە؛ **بەهەڤ**: پێکـەوە؛ **ئـەشـباح**: شەبەح‌گەل؛ **شەبەح**: تارمایی، ئەو تەرزو شکڵەی کە گیان لەپاش دەرچون لەلەش بەخـۆیەوە دەگریّ کە لەشیش نیەو هەروەك لەشە دنیاییەکە دەچیّ؛ **شەبەح**: ئەو زنجیرەی لاقی دیلی پیّ دەبەستن.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر گیانان لەبەر بارەگای خودادا ئەوین پێکتر بگـۆڕنەوەو بەتەمابن هەر ئـەوینداری یەکتربن؛ زۆرپێویستە تارمایی گیان هەڵگـریشیان هۆگر بەیەکتر بگـرن‌و بۆ هەمیشــە خــۆیان بەزنجیری ئەوین بەیەکەوە ببەسـتنەوەو هەرگیز لێك جیانە نەبنەوەو تەواو هەروەك تێکـەڵاوی لەش‌و گیانی دەورانی ژیانی سەردنیا لێکدرابن.

٢ جان‌و جەسەدان کو ئیتتیحادن
(والْماءُ لَهُالمِزاج بالراح)

**مانای وشە:**

جەسەد: لەش؛ **ماء**: ئاو؛ **لَهُ**: بۆئەو؛ **مِزاج**: تێکەڵاوی؛ **راح**: بادە، مەی.

**پوختەی مانا:**

تێکەڵاوی لەش‌و گیانی ئـەویندارانی بەراسـتی‌و دەرون خـاوێن‌و داوێن پاك، تا لەروی خـاك‌بون

چۆن بوە. دوای دەرچونی گیان لە ڕکەی لەشی خاکیش، هەروا دەبن. تێکەڵی گیان‌و تارمایی گیان هەڵگری ئەویندارانن، وەك لێكدانی مەی‌و ئاوە کە تازە بەهیچ ئاوایەك لەبەریەك هەڵناوێردرێن.

٣ **وەصلاتە لجان‌و دل حەیاتە**
**(مَنْ ذاقَ مَرارَةَالنّوىٰ طاح)**

**مانای وشە:**

**مَنْ**: کەسیٚ؛ **ذاقَ**: چەشتی؛ **مَرارە**: تاڵی؛ **نَوىٰ**: دوری، هجر؛ **طاحَ**: بەهیلاكچو؛

**پوختەی مانا:**

نزیکی‌و گەیشتن بەتوٚ، مایەی ژیانی گیان‌و دڵە. کەسێك تاڵایی دوری توٚی تام‌کردبیٚ، گومانت نەبیٚ مردوە.

٤ **تەنها نە دسینە من خەدەنگن**
**(مِنْ لَحظِكَ فیالقلوبِ أرماح)**

**مانای وشە:**

**خەدەنگ**: تیر؛ **لحظ**: چاو، تماشا؛ **قلوب**: دڵان؛ **ارماح**: ڕمگەل.

**پوختەی مانا:**

نەك هەرمن گرفتاری توٚم‌و سینگم پڕە لە تیری نیگای لاتیلی چاوەکانت. ڕمی تیژی مژوٚڵانت ـ کە لە تەماشا کردنا دڵ دەپێکن ـ زوٚر دڵی وەك دڵی منیان هەنجنیوە.

٥ **پەروین ژشەفەق سەحەر خویابون**
**(لابِدعَ وَفیهِ مِنْكَ مِصْباح)**

**مانای وشە:**

**پەروین**: کوٚ ئەستێرەی پیٚرو؛ **شەفەق**: لێرەدا بەمانا کوردی‌یەکەیە کە بە شەبەقی روناکایی بەیان دەڵێن؛ **خویا**: ئاشکرا؛ **لابدعَ**: تازەیەك‌نیە، واتا شتێکەئاسایی؛ **فیهِ**: لەودایە؛ **مِنكَ**: لەتو؛ **مصباح**: چرا.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر ئەستێرەی کوٚ، بەرەو روناکی بەربەیان هاتن‌و خوٚیان ئاشکراکرد؛ هیچ نائاسایەتی نیە.

چونکه روخساری تۆ، به شەوارەی خستبون‌و بە تیشکی چراوه هاتن.

٦ (لَومِستَ مِنالهویٰ کَبانٍ     لابِدعَ وَقَدْ تَمیدُ ارواح)

**مانای وشه:**

**لەو:** ئەگەر؛ **مِسْتَ:** راژای، لەریتەوه؛ **مِنَ‌الهَویٰ:** لەبەر شنەبا؛ **کَبانٍ:** وەك نۆنەمامی داری بان که دارێکی زۆر شەنگ‌و شۆخە؛ **قەد:** لێرەدا خۆدیاریشه؛ **تَمیُد:** دەلەرێ‌و دەهەژێ.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر دەبینم که لەبەر شنەبایەك، بەژن‌و باڵات، بەنازەوە بەم‌لاو ئەولادا رادەژێ؛ بە نائاسایی نابینم، چونکه تۆ وەك ئێمە لەش‌نی. لە نازکی‌دا گیانێکی‌و گیانیش دیاره بە هاسانی شنەبا یەك دەیلەرێنێ.

٧ سەییاح مەدین دخەلوە ئیرۆ
الله کو چخەلوە ئو چسەیاح!؟

**مانای وشه:**

**سەییاح:** سائح‌گەل؛ **سائح:** پێنج مانا دەدا، رەبەنێك بۆ خواپەرستی روبکاتە چیاو چۆڵان، ئاوی رەوان، وتار نەخشین، گەڕیدە بە وڵاتان‌دا، رۆژوەوان؛ **مەدین:** ئێمە دیمان؛ **خەلوە:** کونجی تەنیایی.

**پوختەی مانا:**

ئەمڕۆ لە کونجی تەنیایی بەچاوی‌دڵ سەیرم دەکرد، رەبەنانی خواپەرست‌و دەم‌بەرۆژوی مرۆی نوێژو رۆژی پاك‌و دنیاگەڕی زمان شیرین‌و دەم‌پاراو، که گشتیان وەك‌من دڵداری دیداری یاری نازدار بون؛ دەسته دەسته وەك ئاوی رەوانی ناو جۆ. بە بزەی هومێدواریەوە، هەر دەهاتن‌و تێ دەپەرین. ئای خودایە. لەو کونجە خامۆشه چیم دیت!!

٨ (اِفتحْ بِلِقاكَ قُفْلَ قَلْبی     فالْقَلْبُ لَهُ لِقاكَ مِفْتاح)

**مانای وشه:**

**افتح:** وەکە؛ **لِقا:** توش‌هاتن؛ **قُفل:** قفڵ؛ **قَلْبی:** دڵم؛ **لَهُ:** بۆئەو؛ **لِقاكَ:** توش هاتنت؛ **مِفتاح:** کلیل.

**پوختەی مانا:**

دڵم بە جارێك داخراوەو تەنیا بەتۆگەیشتن‌و دیداری‌تۆ، دەتوانێ بۆم بکاتەوه.

٩ بەرقیٚ کو قەدا ژبەر نیقابیٚ (فاللّامعُ مِنْ سَناهُ قَدْلاح)

١٠ قەوس‌و قەزەحان نومان ژبالا (والْعَنْبَرُ مِنْ شَذاهُ قَدْفاح)

١١ ڕِاپینە دلیٚ «مەلا» جەلادا (مِنْ طَلْعَتِهِ فَقَد صَفا الرّاح)

**ماناى وشەى ئەو سێ بەیتە:**

**بەرق:** بروسکە؛ **قەدا:** داى، دایەوە؛ **نیقاب:** روپۆش؛ **لامع:** تروسکەدەر؛ **سَنا:** رۆشناکى؛ **لاحَ:** دیارى‌دا؛ **قەوس‌و قەزەح:** پەلکە رەنگینە؛ **شەذا:** بۆن‌و بەرامە؛ **فاح:** بڵاوەوەبو؛ **جەلا:** مشت‌و ماڵ؛ **طلعـة:** دیتن، هاتنەدەر؛ **صَفا:** پاڵاوتەبو؛ **راح:** بادە.

**پوختەى ماناى ئەوسێ بەیتە:**

دیارە پاڕانەوەى مەلا قبوڵ بوە. بۆیە دەڵێ:

بروسکێکى تروسکە زۆر. لەو دیو پەردەى پیوارەوە چەخماغەى‌دا، ڕێژنەى بەزەیی لە دوهات‌و داى‌باراند کەى‌کەم ئیســـتەى‌کەم. دڵى ســـیس‌و تینوى ژارى هەزاران کزونزارى دورە هومێدو بێچارەى ئێمە گەلى ئەوینداران پاراوبون‌و گەشانەوە. لەو هەمو ئاڵ‌و واڵایەى ئـەو باڵایە، پەلکـە رەنگینە وەدى هات. عەنبەر کە بۆن‌و بەرامەى ئـەو بەژن‌و باڵا نەمامەى بەرکەوتبو، بۆن خـــۆشى بڵاو کردەوە. دڵى مەلا کە تا ئەوسا وەك ئاوێنەى ژەنگاوى رەش هەڵگەڕابو، بە نمنمى پریشکەى هەورى بەزەیی خاوێن بۆوە. گیانى کە لەخشت‌و خـاڵى دنیا وەك بادەى پرتڵتەو خڵتە شـلوێ ببو. بەو دیمەنە دڵرفێنە واپاڵێوراوە، هێند رونە یادەى نمونەش نایگاتێ.

# قصیدەی سیهەم

# «نالەی دڵ»

١ ئاهیٚ ژدەردی دل دکت هەرچی کودی ئازاری چەرخ
دەربیٚ لنیڤا دل ددەت لامیع صیفەت نوباری چەرخ

**مانای وشە:**

**ئازار**: ژان؛ **چـەرخ**: زەمانە؛ **دەرب**: زەبر؛ **لامیع صیفەت**: وەك بروسكـە؛ **نوٚبار**: جـوٚرە كەوانێك بوەكە چەند سەرە تیری وێكرا دەركردوە.

**پوختەی مانا:**

هەركەس وەك من، ژانی دەستی زەمانەی پەستی چێشـتبیٚ؛ ناچـارە دەردی دڵ بكـاو ئـاخ هەڵكێشیٚ. كەوانی دەسـتی زەمانە، تیران داوێتە دڵی من بە زەبرێكـی هێند دەسـتو برد، دەڵێی بریسكە لێم دەدا.

٢ تێن سینەیان پەیكان نهین ئامانجی وان تیران ئەمین
داما بەلاییٚ دەر كەمین هەر گوشە دوٚر ماداری چەرخ

**مانای وشە:**

**پەیكـان**: سـەرەتیر؛ **نهین**: بەنهێنی؛ **ئـەمین**: ئێمەین؛ **دام**: داو؛ **دەركەمین**: لەبوٚسـەدا؛ **دوٚرمادار**: دەوراندەور.

**پوختەی مانا:**

زەمانە لەهەر گوٚشـەو كەناران، بوٚسـەی بەڵای بوٚ داناوین‌و دەوری داوین. سـەرەتیران بەرەو سینگمان دەهاوێژیٚ‌و ئێمەی نیشانەی تیرانین.

٣ بیرا خوتینن غەنجەیان   عاشق دنیڤ ئەشکەنجەیان
ئاڤیتە دل بەرپەنجەیان  هەردەم ژنو شونقاری چەرخ

**مانای وشە:**

**غەنجە:** ناز؛ **ئەشکەنجە:** ئازاردان؛ **ئاڤیتە:** دەهاوێتە؛ **شونقار:** جۆرێك بازی زۆر چنگاڵ تیژو بەهێزە.

**پوختەی مانا:**

لەجەنگەی ئازاردانێکدا، کە لە زەمانەی دەبینین؛ سەبوریمان هەر بەوە دێت، کە نازی یارمان دێتە بیرو ئازارمان لەسەر سوك دەبێ. بەڵام زەمان لێ ناگەرێ ئاسودە بین. هەر دەمێك سەرلەنوێ، دڵمان دەخاتە بەر پەنجەی دەردو ئازاران. کە وەك شمقار نچیر دەگرێ، هەڵیدەدڕێ.

٤ کوڤان لەطیفان گول عیذار   شونا گولان روستینە خار
لەو تێن ژبولبول ئاهوزار  نیڤا جیهێ گولزاری چەرخ

**مانای وشە:**

**کو:** لەکوێ؟؛ **لەطیف:** نەرمو ناسك؛ **عیذار:** لاجانگ؛ **روستینە:** رواون.

**پوختەی مانا:**

کوان؟ بۆنەمان لاجانگ وەکو پەڕەی گوڵان؟ بەداخەوە لەشوێن گوڵان دڕك رواون. بۆیە بولبول، لەشوێنی چۆڵی گوڵاندا، لە چنگ دنیا گریانو ئاخو ئۆخیانە.

٥ صەد بازییان ئەڤ حیلەباز  تینت بحیلە کارساز
گەهگە هکو نازەو گەهنیاز  سەححارو پڕ مەککاری چەرخ

**مانای وشە:**

**بازی:** عوین؛ **گەهـ** : جار، گا؛ **سەححار:** زۆر جادوگەر؛ **مەککار:** زۆر بەگزی.

**پوختەی مانا:**

ئەم زەمانە، هەتا بڵێی جادوگەرێکی بەفێڵە. بەنازو قەمزەو عیشوەبێ، بەنیازو نوزەو کزی بێ، کاری خۆی بەپیاو پێك دێنێو صەتان فێڵی لەبن سەردا.

٦ هەرچی بخونت صوحبەتێ  ئاخر دجاما شەربەتێ
زەهرا هەلاهیل دێ دەتێ  دادل نەدن ئازاری چەرخ

**ماناى وشه:**

**بخونت:** بانگ بکا؛ **صوحبەت:** هاودەمى؛ **هەلاهیل:** گیایەکە کە شیرەکەى ژەهرێکى زۆر کوشندەیە.

**پوختەى مانا:**

هەرکێ بەدەنگیەوە بچێو دلێ بەزەمانە خۆش‌بکا، زیان دەکا. لە جەنگەى دۆستایەتی دا، کە شەربەتی ئەداتە دەست؛ ژەهرى هەلایلی تێدایەو دەیەوێ دەرمان خواردوى کا. دەغیل نەکەن باوەر بە زەمانە کەن‌و دلی خۆتانی بدەنێ.

«مُحیالدین عەرەبى» دەلێ:

کەیارم دیتی مەستم، دەستی بەستم، دامیە بەر شیران
بەلێ هاوپیالەیی حەزیا سزاى جزیاى بەدودا دێت

**٧** ئەڤ ئەررەیا ژەهرى ددان  من ژێ ددل دانن سینان
مالبەهرى فەرقێ دوژمنان  بیێتو برەت مینشارى چەرخ

**ماناى وشه:**

**ئەررە:** هەرە، مشار؛ **منژێ:** لەوى؛ **سینان:** نوکەرمب؛ **مینشار:** مشار.

**پوختەى مانا:**

زەمانە وەك مشارێکە، ددانەکانی بەژەهر ئاو دراین. من زۆر نوکەرمبم لەدەست دنیا لەدلێ دایە. با ئەو مشارە ژەهراویە، هەر بەشی دوژمنانمان بێتو لەسەر تەپلە سەرى ئەوان بێتو بچێت.

**٨** دوژمن ژجان تالان بتن  ئەو خوە هەروێ نالان بتن
میلاكو دل کالان بتن  لێ بێت ورەت غەدارى چەرخ

**ماناى وشه:**

**تالان:** پوڕ؛ **هەروێ:** هەموروژێك؛ **نالان:** بەنالە؛ **میلاك:** سیو جەرگو دلێ؛ **غەدار:** قەدارە، قولە شیرێکی دم ساتوریە؛ **کالان:** بەرگی شیرو خەنجەر.

**پوختەى مانا:**

دەبا سەرەراى مشارى ژەهراوى، قەدارەى زەمانەى غەددار، دلێو هەناوى دوژمنان کالانی‌بێ. یا خوا گیانیان بەتالان چێو هەمو دەمان بنالێنن.

٩ داڤ کوهنه خانی میثلی دەیر  چەندین کەواکیب تێنه سەیر
پەیکان بداڤێ شوبهی طەیر  هەرژێ دبارن ناری چەرخ

**مانای وشه:**

**داڤ:** دەئەو؛ **کوهنه:** کۆن؛ **خان:** کاروانسەرا؛ **دەیر:** شوێنی رەبەنان؛ **سەیر:** تماشا؛ **سەیر:** رۆیشتن؛ **شوبه:** وەکو؛ **نار:** ئاگر.

**پوختەی مانا:**

دەو کۆنه خانەدا ـ کە وەك دەیری رەبەنانە ـ چەندو چەندجار، ئەستێرە دێن‌و دەڕوانن‌و بەجێی دێڵن. ئەو هەر لەسەر رەوشتی پیسی خۆیەتی. پەیکان دەگرێتە ئەستێرانیش کە وەك چۆلەکە راویان‌کا. لەم زەمانە هەمیشە ئاگر بارانەو دنیا دۆزەقی یارانه.

١٠ شەمسێ بشەمسی جام بجام حەتتاد کن دۆرێ تمام
ئاتەش درێژە هەر مودام  ئەڤ گونبەدی دەواری چەرخ

**مانای وشه:**

**شوموس:** بادە؛ **شەمس:** بریەتیە لە مەی؛ **شەمس:** دوژمنی زۆر سەخت؛ **شەمس:** هەلتۆزاندن‌و بار نەبردن، چەموشی؛ **مودام:** مەی.

**پوختەی مانا:**

زەمانە وەك مەیگێڕێکی دڵپیسە. بەنیازی دوژمنایەتی پێك لەسەر پێك، بادە بۆ خەڵك تێ دەکا. بە هەموانی دەچەشێنێ‌و بەو مەیە دەیان مرێنێ. بادەکەی ئەو ئاگرێکە بۆگیانی وەخۆرەوەکان. لەو گونبەزە خول‌خولەیە ئاور دەرژێت.

١١ ئاگر دئابو گیل دکەت  قەلبان ژقەلبان هل دکەت
میتقەب دجان‌و دل دکەت  دائم ئەڤستن کاری چەرخ

**مانای وشه:**

**هل دکەت:** هەڵ دەکا؛ **هل‌دکەت:** هەڵ دپچرێ؛ **میتقەب:** مەثکەو؛ **ئەڤستن:** ئەوەن.

**پوختەی مانا:**

ئاگر دەخاتە ناو لەشی مرۆ، کە لە ئاو وگڵە. دڵان توشی یەك دەکاو پێکیان دا دەگیرسێنێ‌و

لێکیان هەڵدەپچڕێ. گیان‌و دڵان کون‌کون دەکا. هەمیشە کاری زەمانە ئەو کارە نالەبارانەن.

١٢ چەندی کو خوبان بێن ڕەزم  من‌ژێ ددلدانن گەزم
ئامانجێ وان ڕەمزان ئەزم  سەرعەسکەری سەییاری چەرخ

**مانای وشە:**

**خوب:** جوان چاك؛ **ڕەزم:** جەنگ؛ **من ژێ:** من لەو؛ **گەزم:** تیر؛ **ڕەمز:** نیشانی نهێنی؛ **ئـەز:** من؛ **سـەر عەسکەر:** فەرماندە؛ **سەییار:** گەڕۆك.

**پوختەی مانا:**

هەرچەندی جوان چاکان، دڵیان لەدەردی زەمانە دەرەنجێ‌و دەیانەوێ بەگژی داچن؛ منی کڵۆڵ بەر دەکەوم. لە وتاری بەتێکوڵیان تێ‌گەیشتوم کەمن کراوم بە ئامانج‌و منیان بەسەرکردەی بەڵای زەمانە داناوە. هەربۆیە منی بێچارە، دایم دڵم بەتیرو تانەی چاو جوانان بریندارە.

١٣ من پورشەڤان حەتتا سەحەر  دانینە ڕێ سەمع‌و بەصەر
ئەو ماهرو مابێتە دەر  تا ببمە نەوبەت داری چەرخ

**مانای وشە:**

**سەمع:** گوێ؛ **بەصەر:** چاو؛ **نەوبەت‌دار:** جەزایەرچی، کێشك‌گر.

**پوختەی وتار:**

گەلێك شەوان تا بەیانی، لە دەورەی یانەی ئەویارە، گوێ لەسەر هەست‌و چەمەرام کە بەشکو بەختم بیهێنێ، ئەو ڕومانگە سەر لە پەنجەرە دەرێنێ‌و دوا بە ڕۆژ ڕەشی من بێنێ. ئەگەر زەمانەش ـ خوا نەکا ـ نیازی وابێ بەردوزیپکی ساردو گەرمی لەرێ دانێ، خۆم بکەمە بەڵا گەردانی باڵاکەی.

«کوردی» دەڵێ:

چاوەکەم زانیوتە بۆچی خەولە چاوم ناکەوێ
چونکە من پێش خزمەتم پێش‌خزمەتان نانون شەوێ

١٤ کەس دی لـ‌لەوحی سینەدا  نەقشەك وەهاتی بێ غەلەط
هەر دەم ژنو یەك تازە خەط  تاڤێتە دەر پەرگاری چەرخ

**ماناى وشه:**

**لەوح:** تەتەڵە؛ **وەهاتى:** ئاواهاتو؛ **ئاڤێته:** دەهاوێته؛ **پەرگار:** جەغز كێش، جەغزینگ.

**پوختەى مانا:**

هەرچى دەردو ئازارى بەشى دڵدارانه، بە پەرگارى دەستى زەمانه، لە تەتەڵەى سینەى من نەخش كراوەو هەمو دەمو كاتێك خەتێكى تازە دێتە سەر خەتان‌و هەرگیز نوسەرى بەڵایان، بۆ جارێكیش هەڵە ناكا، هەڵم بوێرێ.

«ئەنوەرى» دەڵێ:

هەر بەڵایێ كە لەعاسمانەوە دێ بەر لە هەرشت دەڵێ كوا ماڵى فڵان

**١٥** ما ژحەسرەتا شیرین لەبان خەوتێتە چەهڤان قەط شەبان
فەریاد دەربەر كەوكەبان پرسێ بكە ژبێدارى چەرخ

**ماناى وشه:**

**ما:** بۆچى، مەگەر؛ **فەریاد:** هاوار؛ **دەربەر:** لەپێش؛ **بێدار:** نەخەوتو.

**پوختەى مانا:**

من كەوتم شەوان هەتارۆژ ناخەوم‌و دڵو چاوم بریوەتە ئەو سەرسەرایەى، یارتێدا. ماناى وانیە دەتوانم بنوم‌و نانوم. بۆچى مەگەر لە عەزرەت‌و ئاواتى دینى لێوانى شیرینى وەكو هەنگوینى، خەو تخون چاوان دەكەوێ؟ هەیهات، منى دڵدار شەو هەتا رۆژ، هەر هاوارمەو ناڵەم گەیوەتە عاسمان‌و ئەستێرەشم لە خەو كردون. ئەگەر برۆا بەمن ناكەى، باسم لە زەمان بپرسە، كە شەوو رۆژ لە خولدایەو خەوى نایەو ئارام ناگرێ. تا بزانى كە هەرگیز منى نەدیوە لە خەودابم.

«سەعدى» دەڵێ:

درێژى شەو لە برژانگم بپرسە كە هیچ تاوان بەسەر یەكدا نەهاتون

**١٦** ڤان رەهرەوێن هیممەت بولەند بەردانە مەیدانێ سەمەند
سەر گەشتەبن حەتتا بەچەند ئەو رەكبى مەشعەلدارى چەرخ

**ماناى وشه:**

**رەهرەو:** رێڤنگ؛ **سەمەند:** ئەسپ یان ماینى شێ؛ **سەرگەشته:** سەرگەردان؛ **رەكب:** دەستەى سواران؛ **مەشعەلدار:** گڕهەڵگر.

**پوختەی مانا:**

ئەو ڕێبوارە بەجێو پایەبڵندانە کە ئەستێرەن لەو عاسمانە. بە ئەسپی شێ لە مەیدان هاتو چۆیانە. وەك دەستە سوارانێك دەچن کە لەشەو دابەرەو بەزمو ئاهەنگ دەچنو چۆڵە چرایان لە سەرشانە. بەڵام لەچونو هاتن‌دا، سەرگەردانن. نازانن بەرەوکوێ دەڕۆن، بۆ هەڵدێن؟ بۆئاوا دەبن؟ کەی دوایی بەم ئاهەنگە دێ کە ناومان ناوە زەمانە.

«خەییام» دەڵێ:

لەم جەغزە کەشوێنی هاتو چۆی هەموانە بێ ژێرو سەرەو دور لە نەمانو پوانە

کێ زانی لەکوێوە هاتوەو کێوە دەچێ هۆزانو نەزان وەك یەکە، سەرگەردانە

**١٧** **گاڤەك ژدەنگێ زەنگلان ئەیمەن چرونین مەنزیلان**
**هەی‌هەی دبینن مەحمیلان فەریادە هەر قەنتاری چەرخ**

**مانای وشە:**

**گاڤ:** تاوێکی‌کەم؛ **زەنگل:** زەنگوڵە؛ **ئەیمەن:** هێمن؛ **رونین:** دانیشپن؛ **مەحمیل:** کەژاوە؛ **قەنتار:** قەتار، گەلە بارەبەر پێکەوە لە کاروان‌دا.

**پوختەی مانا:**

لە بەر دەنگی زەنگی کاروانی بارکردن بەرەو ئەودنیا، کە زەمانە سازی داوەو کەژاوە لە دوی کەژاوە دێتەبەرچاوو هەروا هەیدیی بارکردنە؛ کوا دەتوانین ـ با بۆ کەمە تاوێکیش بێ ـ بە ئارامیو خاترجەمی لەم دنیایە پاڵ دەینەوەو دانیشینو قاچ ڕاکێشین.

«حافظ» دەڵێ:

چلۆن پێم‌وابێ ئاسودە دەژیم تاسەر دەگەڵ یاران

دەبیسم زەنگی کاروان بانگ‌دەکا زو لێ‌بنێن باران

«خەییام» دەڵێ:

هەربێنە بەرەو هەڵخولو هاتو چۆیە گوێ هەڵخە هەمو دەنگی بژیو ڕۆڕۆیە

خەرمانی ژیانە سورە، گەردون سەرکار ڕۆکردنو پێوانی مەیە لەوکۆیە

**١٨** **بورمن ژڤێ چەرخێ «مەلا» کیشا نەئافاتو بەلا**
**ئەبلەهدبینم وی هەلا هەرچی ژدل بت یاری چەرخ**

**مانای وشە:**

**ئافات:** زیان گەل؛ **ئەبلەه** : کەم‌ئاوەز؛ **هەلا:** هۆی؛ **هەل:** وەخت.

**پوختەی مانا:**

مەلا! هەر من خۆم دەیزانم ئەم دنیایە، چەند بێفەڕو ئازار دەرو بێبەقایە، زۆرم زیان لەدەس دیوەو فرەم جەزرەبەی چەشیوە. با پێت بڵێم، لە کاتو ساتی ژیاندا، هەرکەس بەدڵ بییتەدۆستی زەمانە، زۆر بێئاوەزو نەزانە.

## قصیدەی سی‌و یەکەم

# «شەپالاشەنگ»

١ دلبەریٚ ئیروٚ سەحەر ئاڤیتە جەرگیٚ من دو دوٚخ
یەك لسینە، یەك ددلدا لەو ژمن تێن ئاخو ئوٚخ

**مانای وشە:**
**دوٚخ:** راستایی تیر؛ **دوٚخ:** کوتەکی سەر بەبزمار، دوٚق؛ **ئوٚخ:** هاواری ئێشان؛ **ئوٚخەی:** چخوٚشە.

**پوختەی مانا:**
یاری نازدار ئـەمرۆ لە بەرەبەیاندا، کە چـاوی هاتنە بەرچـاوم؛ لە دولاوە بەرتیری مژۆڵی داوم. لە لایەك سینەی پێکاوم، لایەك دڵی وەبەرداوم. جـا بوٚیە هەر ئـاخو ئـوٚخمە. بوٚ هی بەرســینەم کەوتوە، دەڵێم ئاخ دڵمی نەپێکا. بوٚ ئەوەیش دڵمی گرتوە، دەڵێم ئوٚخەی بە ئاواتی خوٚم گەیشتم.

٢ ئاخو ئوٚخێن من ژدل تێن لی ژبەر تیرا قزل تێن؟
یان ژکوڤانێن دکول تێن ژیٚ دزیت هەر خون‌و زوٚخ

**مانای وشە:**
**لیٚ:** بەڵام؛ **قزل:** سور؛ **کوٚڤان:** کوان‌و برین؛ **کول:** بەژان؛ **دزێت:** دەدەڵێنیٚ؛ **خون:** خوێن؛ **زوٚخ:** زوخاو.

**پوختەی مانا:**
بەڵیٚ دڵم هەر بەدلیٚ، ئاخو ئوٚخیەتی. ئاخوٚ لەبەر سەرەتیرە کە بە خوێنی منی بیٚ بایەخ، سور بون؟ یان لە برینی زوٚر بەژانە، کە بە دایم خوێن‌و زوخاو دەدەڵێنیٚ‌و ترسی هەیە تیری تیژی بژانگی‌یار، شەڵاڵ‌و ژەنگاوی بکا؟

۳ خون ژدل جوٚجوٚ رەوان تیٚ  وەك عەقیقو ئەرغەوان تیٚ
لیٚ ژدەست سەلوا جەوان تیٚ  ئەو شەپالا شەنگو شوٚخ (یان، سەلوارەوان)

**مانای وشە:**

**رەوان:** جاری، دانەوەستاو؛ **عەقیق:** یاقیق؛ **ئەرغەوان:** گوڵێکــی ئــاڵی دارە؛ **ســەلو:** ســەرو؛ **سەلوارەوان:** بریەتیەلە بەژنو باڵای شوٚخ؛ **جەوان:** تەڕو تازە پیٚگەیشتو؛ **شــەپال:** خــونچیلانەی خــویٚن شیرین.

**پوختەی مانا:**

جوٚگەجوٚگە خویٚنم لەبەردڵی دەڕوا. خویٚنی من نەدەبو جوان با. بەڵام چونکە بەدەستی سەلما ڕژاوە ـ کە بەژنی وەك داری سەوڵی تازەنەمام، ریٚکەو تاخوا حــەزکا خــونچیلانەو ڕەزا ســوكو خــویٚن شیرینە ـ خویٚنەکەشمی جــوان کردوە. هەر تنوٚکەی بەرەنگــی دەنکــە یاقیقــەیان وەك گوڵی ئەرخەوانە.

٤ ئەو شەپالا شوٚخو شەنگە  کافرە، رومو فەرەنگە
دامە بەر جوٚتەك خەدەنگە  ظالمیٚ کُشتم بدوٚخ

**مانای وشە:**

**کافر:** بریەتیە لە بیٚبەزەیی‌و دڵڕەق؛ **روٚمو فــەرەنگ:** لە زاراوەی شــاعیراندا بە سپی پیٚســتی زوٚر جــوان دەڵیٚن؛ **خەدەنگ:** تیر؛ **دوٚخ:** ذَلیلی‌و زەبونی.

**پوختەی مانا:**

ئەونازدارەی لەبەردڵەی شوٚخو شەنگە، چەند بەدیمەن سپی‌و نەرمە، هیٚندەش دڵی ڕەقو سەختەو بەزەیی پیٚمدا نەهاتو لەدولاوە دامیەبەر شیری بژانگو زوٚر بە زەلیلی کوشتمی.

«نالی» دەڵیٚ:

دەخیلت بم، نەخیلی با روطابی  وەها شیرینو سینەنەرمو دڵڕەق

۵ ظالمی کوشتم شەپالیٚ  نازکی غەنجیٚ دەلالیٚ
بون حیجابا زولفو خالیٚ  ئیدەكو عالاو توٚخ

**مانای وشە:**

**قەنج:** پەسندو بیٚخەوش؛ **دەلال:** دڵگــرو جــوان؛ **حیجــاب:** پەردە؛ **ئیدەك:** ســوخمە؛ **عالا:** بریەتیە لە پارچــەی ڕەنگینی تویٚڵ‌پیچ؛ **توٚخ:** جــوقەقە، لیٚك هاڵانو پیٚچــانو بەرەو ژوروو قیت هەڵگــەرانەوەی مو لە

ناوەراستی ناو چاوان، کە وەك جوقەقەی پادشایانی لیٚدیٚت؛ توٚخ: بەو جوقەقەیان دەگوت کە لە موی ئەسپ پیٚکدەهیٚنراو لەجیاتی میدالْ دەدرا بە پیاوانی ئازای هەڵبژاردە، لە سەریانی دەن.

٦ نەترکو تایێن بەریشی ئی دزیٚرن پیٚقە ویشی
من دوفیرس دین دبیٚشی مروەتو ئینصاف یوٚخ

**مانای وشە:**

نەترەك: مانگوڵەی بەر لەرزانە؛ تا: هەودا؛ ریشی: ریشو؛ ویشی: هیٚشو؛ فیرس: سوارچاك، سوکەڵەسوار؛ مروەت: پیاوەتی؛ یوٚخ: نیە.

**پوختەی مانای ئەو دوبەیتە:**

ئەو خونچیلە خویٚنشیرینەی دنیا پەسندەی جوانچاکە، زوٚر بەزوٚردارانە کوشتمی. چونکە هەر نەمتوانی بەدڵ، سەیری خەتو خاڵی بکەم. دەسماڵو هەنیەپیٚچەکەی، موی پیٚشەسەری پیٚچراوی بەرەو ژور هەڵگەراوەکەی، لاگیرەی پیٚچە سەرەکەی، هەودای بەریشوی دەسماڵی کە هیٚشوی زیٚریان پیٚوە بون؛ بونە پەردە لە نیٚوان چاوی بەتاسەمو دینی کەزیو خاڵەکانی وەك دەمەویست، پیٚشاوپیٚش هەر چاوەکانیم دیت کە بە مەستی وەك دوسوارچاك، هیٚرشبەرن بوٚ سەر دوژمن، بە سیلەو گوٚشە روانیمیانو بیٚ بەزەییو لیٚ راوەستان گیانو دڵیان شەقار کردم. دادو هاوار لەدەس ئەو چاوە مەستانە؛ نە پیاوەتیان دەگەڵ کردم نەهیچ ئینصافیشیان هەبو. ئەگەر ئینصافیان هەبوایە، یەکجارەکی دەیان کوشتم.

٧ لەو هەرفتم ئەز ژمەیلیٚ شوبهەتی سیهلیٚ و سەیلی
موحبەتو عیشقا دلەیلیٚ ئەز کرم یەکسەر پلوٚخ

**مانای وشە:**

هەرفتم: تیٚك روخام، تیٚك تەپیم؛ مەیل: ئارەزو؛ سیهل: گڵو خوٚڵیٚك کە وەك رەملْ سیٚلاو دەیبا؛ لەیلیٚ: گراویەکەی قەیسی عامیری؛ ئەزکرم: منیکردە؛ یەکسەر: بەتەواوی؛ پلوٚخ: پوٚلوە ئاگری زوٚر گەش؛ پلوٚخ: داپەلوٚخاو، تەواو رزیو.

**پوختەی مانا:**

هەر لەترسی زوٚرداریو دورەئینصافی چاوانیەتی کە قەڵای ئارەزوی دینیم تیٚك تەپیوە. بومە ئەو خوٚڵە نەرمیلەی کە لافاو وەبەرخوی دەداو بە دارو بەردی دا دەدا. ئەگەر قەیس لە ئەوینی لەیلایەدا پیٚ داگر بو، ناگاتە من. من لە ئەوینی لەیلای خوٚم لەسەر هەتا پیٚ ئاگرمو بەسوتانەوە

گرشەمەو هەربینا هەر داپلۆخام.

٨ دەست نەهێلم ئەز ژدینێ  شوبهی فەرهادی شیرینێ
وەر ژبەر عیشق‌و ئەڤینێ  من دریێ چت ئەف کلۆخ

**مانای وشە:**

**نەهێلم:** هەڵناگرم، بەرنادەم؛ **دین:** دیتن‌و تماشا؛ **فەرهاد:** ئەویندارە بەناو بانگەکەی شیرین کە چیای بێستونی تاشی؛ **وەر:** تەنانەت ئەگەر؛ **کلۆخ:** کەللەسەر.

**پوختەی مانا:**

بەڵام نابێ کەس لای وابێ، من بەم سوتان‌و کوژران‌و ئاوبردنە، وازم لە دیداری یار هێناوە. تا هێزم هەبێ‌و بۆم بلوێ، دەچمە سەرسوێ‌و بۆ دیداری یار دەڕوانم. من لە ئەوینی شیرینی ئەو شیرینە. کە لە گیانم شیرینترە ـ ئەو فەرهادەم کە دڵ لە ئەوین بەرنادەم. تەنانەت ئەگەر سەریشم لەو ڕێگەدا بدۆڕێنم‌و وەکو فەرهاد، بەدەستی خۆم دوایی بە ژیانی خۆم بێنم.

٩ صوحبەتا چەرخ‌و سەما تێ  وەك «مەلا» صەد موبتەلا تێ
زەمزەمەو ئاڤا حەیاتێ  موشتەری صەد شیخ‌و شۆخ

**مانای وشە:**

**صوحبەت:** کۆڕی دۆستانە؛ **صوحبەت:** باس؛ **چەرخ:** سوڕدان؛ **سەما:** هەڵپەڕکێ؛ **موبتەلا:** گیرۆدە؛ **حەیا:** شەرم؛ **حەیات:** ژیان؛ **زەمزەم:** ئاوێکە لە مەککەو پیرۆزە؛ **زەمزەم:** ویرەویر؛ **موشتەری:** کڕیار.

**پوختەی مانا:**

لە کۆڕێکدا کە نازداران دێنە سەماو گەڕی دیلان دەبێتە کۆزو بادەی وەکو ئاوی ژیانی تاهەتایی‌و پیرۆز وەك ئاوی زەمزەمەو چۆڕەچۆڕی زەمزەمەی دێ‌و تنۆکەی شەرم لە سەرروی شەرمین‌و نەرمینان دیارە؛ بە صەتان لە پیرو لاوان، وەك مەلا گیرۆدە دەبن‌و بەدڵ لە خودا دەخوازن لەو کۆرەدا، ڕێگە بدرێن.

# قصیدەی سی‌و دوهەم

# «چداوەتە»

١ هەی هەیا رەقص‌و سەمایا تە چخوەش بەستی‌یە چەرخ
کو دبورجیٚ بسەما تیٚتە لسەر دەستیٚ خوە بەرخ

**مانای وشە:**
**سەما:** هەڵپەرکیٚ؛ **سەما:** عاسمان؛ **چەرخ:** کۆڕ؛ **چەرخ:** خولدان بەگەرمی، چەرخ بەستن.

**پوختەی مانا:**
کۆڕو کۆزی بەزم‌و سەمای کە تۆی تیٚدای‌و ئەو هەراو هوریاو بەهـ بەهـ و ماشاللە، لەو جوانیە گوتنەی ئەو کەسانەی لە سەمادا تۆ دەبینن؛ وای کۆڕ گەرم داهیٚناوە، دەنگی گاڵەو تینی ئەوینی دڵداران، لە عاسمان دەنگی دایەوە، بورجی بەرخ (خاکە لیٚوە) ـ کە خوٚر لەودا لە هەمو دەمان گەشترە ـ بە رۆژەوە لە خۆشیان هەر هەڵدەبەزی‌و بە چوار پەلان سەما دەکا.

٢ صوفی‌ییٚن هەر دطەوافیٚ حەجەرالاسودە قەصد
گول‌و سونبول بسەماتیٚن حەمی‌یان زەمزەمو چەرخ

**مانای وشە:**
**طەواف:** لەدەورەگەران؛ **حەجەر:** بەرد؛ **ئەسوەد:** رەش؛ **حەجەرالاسود:** بەردی رەشی حاجیان کە دە دیواری کابە گیراوەو ماچی دەکەن تا حەجەکەیان بەرکەویٚ؛ **حەمی:** هەمو.

**پوختەی مانا:**
هەروا پۆل‌پۆل، شیخ‌و صۆفی، بۆ زیارەت‌و راموسانی خاڵی رەشت، لە کابەی روت لە دەورەی

سەرت، دەگەڕێن. لە کاتێکا کەزیەو بسکت، لەبەر شنەی هەناسەی ساردی دڵداران، وەك لقی گوڵو سونبوڵان کە سروەی بەیان لێی دەدا، دەلەرێنو دێنو دەچن. حەجیان هەر لەبیر نامێنیو تێکڕا دەیکەن بە زمزەمەو چەرخو خولدان.

٣ نەقشی ئەلماسی لئەلماسی بنێ گرتی‌یە حەرف
خەطی یاقوتی لیاقوتی شکێناندیە نەرخ

**ماناى وشە:**
**ئەلماس:** گەوهەرێکی سپیو رونی هەرە بەنرخە؛ **بنێ:** بڕوانە؛ **حەرف:** رەخنەو ئیراد؛ **یاقوت:** گەوهەرێکی رەنگ ئاڵە؛ **نەرخ:** بایی، نرخ.

**پوختەی مانا:**
پێستی سپیو تیشکدەری روخساری‌یار ـ کە بۆجوانی بەئەڵماس دەشبهێندرێ ـ بڕوانە تانە دەئەڵماس دەگرێو کردویەتە گەپجاری خۆی. چونکە ئەو نەوەك ئەڵماسە هەر ساکار بێت، دەستی خودا، بە چەندین رەنگ رەنگاندویە. ئەو سوراییەی کە خوا لە لێوو کوڵمی ئەو خەتی داوەو لەچاو خەتان وەك خەتی یاقوتی وایە؛ نرخی یاقوتو ئەڵماسی شکاندوە.

٤ کەرخین ئەم دقیامێ مە ژدل پەردە دراند
عارفی وەقتمو مەعروف بلابێتە ژکەرخ

**ماناى وشە:**
**کەرخین:** تەزین؛ **کەرخین:** وەرەزبوین؛ **قیام:** راوێستان، هەستان؛ **عارف:** پیری تەریقەت، خواناس؛ **مەعروف:** بەناوبانگ؛ **کەرخ:** گەڕەکێکە لە بەغدا، شیخ مەعروفی کەرخی ـ کە لە ئەولیای بەناوبانگ بوە ـ لەوێ ژیاوەو هەر لەو کەرخەشدا نێژراوە.

**پوختەی مانا:**
ئێمە زۆر راوێستاوینو راستی پلەو پایەی خۆمان لە خواناسین دەرنەبڕیوە. پەردەیەکم گرتبۆوە کە کەس لە تێکەڵاوبونی گیانو دڵم دەگەڵ یار خەبەردار نەبێت. نەك نائاگادارو بەدکاران ئینکار بکەن؛ بەڵام کەلەم وێستانەدا، ئێستا هەستم بە تەزینو لەبەر سەرکۆنە نەبەزین کروەو ئەوێن پێم‌دەڵێ: خۆم دەرخەم. ئەدرکێنم کە من ئەمڕۆ ئەو عارفو خودا ناسەم لە دنیادا تاکم نیەو لەناو جەرگەی گیان پاکاندا، بەناوبانگم. ئەگەر یەکی وکو مەعروفی کەرخی بەناوبانگ ئەمڕۆ زیندو بایەتەوەو بهاتایەتە سەر دنیا، ئۆباڵی بۆ لەمل دەدام کە هەرچی دەیڵێم تەواوە.

**٥** **دابناسی خەتەری ڕێ تونەبێ غافڵبی**
**دیجلەیە لێ دیڕن بڕبڕی پیلو بەرو مەرخ (یان، بەربڕی پیڵ)**

**مانای وشە:**

**دیجلە:** زێ گەورە بەناوبانگەکە؛ **لێ:** لەوێدا، تێیدا؛ **بەر:** سەنگ؛ **بڕ:** برستوتوانا؛ **پیڵ:** شەپۆل؛ **پیل:** فیل؛ **بەر:** بەرد؛ **مەرخ:** بودڕو کەندەڵان، ئاودڕ.

**پوختەی مانا:**

کاورای ڕێبوار لە ڕێگەی خوداناسیندا ـ کە ئەتەوێ بگەیە کاروانی ئێمەی دڵخۆش بە ئەویندارییمان لات وانەبێ هیچ دژواریت نایەتە ڕێو گەیشتن بە دیداری یار، زۆر هاسانە. ئەمکارە وەك لە دەجلەدانە، لە هەرەتی تەوژمو سەرریژ کردندا، بەر شەپۆلی وا دەکەوی، تواناو برست لە فیل دەبڕێ. گاشەی لوسو زەلامت زۆر دێنە بەرێ کە نەدیتە تێ هەڵدەنگوی، لەپڕ سەرەنگری دەبی. پڕیە لە کەندالو ئاودڕ، تێ دەکەوی‌و نوقم ئەوی‌و گێژت ئەداو ئەمت خنکێنێ. دەغیلت بم، تا نەزانی کە مەلەوانی لە زەبری‌و دەتوانی لەو خەتەرانە خۆ دەربازکەی، مل لێمەنی‌و خۆی لێ مەدە.

**٦** **پیری شەعارە دشیعری‌و «مەلێ» شال فروش**
**تونیشان منمەدە فەرخی کولنکمن بویە فەرخ**

**مانای وشە:**

**شەغار:** کوێنچن؛ **شەعار:** هەرزە وێژی کوڵان گەڕ؛ **شال:** پارچەی پەشمینە؛ **فەرخی:** فەرروخی شاعیری دەرباری غەزنەوییان؛ **فەرخ:** جوجەڵە.

**پوختەی مانا:**

مەلا ئەمڕۆ لەبازاری هونەری شیعرو شاعیری، کاڵای پەشمینە دەفرۆشێ، تۆ ناشێ لە بەرانبەریا ناوی فەرروخی بهێنی. ئەو لەچاو من، کوێن فرۆش‌و هەرزە وێژێکی هەرجایی حیساب دەکرێ. فەرروخی بەرانبەر بەمن، جوجەڵێکە زەرنەقوتەو هێشتا توکی لێ نەڕواوە.

# قصیدەی سی‌و سێهەم

## «دەریایەکە»

۱ سیرری وەحدەت ژئەزەل گرتیە حەتتا بەئەبەد
واحیدو فەردە بذاتێ خوە وی‌نینن چوعەدەد

**مانای وشە:**

**وەحدەت:** تاکی‌و بێشەریکی خـودا؛ **ئـەزەل:** هەربو؛ **ئـەبەد:** تاهەتا؛ **واحید:** یەك؛ **فـەرد:** تاك؛ **نینن:** نین؛ **چو:** هیچ؛ **عەدەد:** هەژمار.

**پوختەی مانا:**

بەڵگەی پەی‌بردن بە یەکایەتی‌و بێشەریکی خوداو هەربویی‌و هەرمانی، بە پانایی‌و ڕۆشنایی هەر بوییەکەی‌و هەرمانی لە بەرچاوە. خۆبەخۆ یەك‌و تەنهایەو ژمارە کردن هەڵناگرێ.

۲ دقیدەمدا ئەزەل‌و عەینی ئەبەد هەردو یەکن
سەرمەدیت وە دخوازت نە ئەزەل بت نە ئەبەد

**مانای وشە:**

**قیدەم:** هەرە پێشینەیی؛ **عەین:** تەواوخۆی؛ **عەین:** سەرچاوە؛ **سەرمەدیَت:** هەرمانی بێ‌کەم‌و مەرج.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر وتمان خودا هەرە پێشونەیەو خۆی زەمان‌و جیهانی بەرهەم هێناوە؛ ئیتر پێشـینەو دواییـنە ـ ئەگەر هەبێ ـ بۆ عەقڵی کورتی ئێمەیەو لە بازاری یەکایەتی‌و هەمەکارەیی خودادا، ناکرێ باسـی

رابردوگ‌و ئێستاو ئایندەو پاشەڕۆژ، هەر بکریە.

**٣ فەرقە واحید ژئەحەد لێ دمەقامی صەمەدی**
**ب‌حەقیقەت کویەکن هەردو چواحید چئەحەد**

**مانای وشە:**

**واحید:** تاك؛ **ئەحەد:** یەك؛ **مەقام:** جێگە؛ **صەمەد:** بێ‌نیاز لە هەمو شت‌و جێ نیازی هەمو شت.

**پوختەی مانا:**

واحد بۆ کەسێك دەبێژن، کە هیچ کەسێ لە ئاکاردا، تایئەو ناکاولە صیفات دا تاقانەیە. ئەحەد بۆ کەسێك ئەگوترێ کە لە چۆنایەتی خۆی‌دا، (لە ذاتی‌دا) بێ هەوال‌و بێ شەریکە. جا ئەگەر گوتمان واحیدە یاخۆ ئەحەد، هەر یەکێکەو جیاوازی لەناودا نیە.

**٤ یەکە دەریا توبزان قەنج چمەوج‌و چحوباب**
**دئەصل‌دا کو حەمی ئاڤە چئاڤ‌و چجەمەد**

**مانای وشە:**

**قەنج:** باش، راست؛ **حوباب:** بڵقی‌سەراو؛ **حەمی:** هەمو؛ **جەمەد:** سەهۆڵ.

**پوختەی مانا:**

زۆرباش سەرنج دەو تێبگە. ئەگەر ناوی دەریامان برد، شەپۆل‌و بڵقی سەراویش، هەر دەریاکە دەگرێتەوە. سەهۆڵ‌و ئاویش هەروەتر یەك رەگەزن.

**٥ ئافتابی ئەحەدی‌یەت دخوەدا گرتی‌یە کەون**
**نەکو عەورەك هەیە لێ‌گرتی‌یە چەهڤێن مەرەمەد**

**مانای وشە:**

**ئافتاب:** تیشکی هەتاو؛ **کەون:** هەرچی ئافەریدەو داهێنراوی نێوان عەرزو عاسمانە؛ **عەور:** هەور؛ **رەمەد:** چاوێشە.

**پوختەی مانا:**

بەڵگەی تاقانەیی خودا، وەك خۆر تیشکی هەمو دنیای داگرتوەو لە رۆژیش ئاشکراترە. بەڵام ئێمەی چاوێشەدار، چاو پروشین‌و لە بەرچاومان هەورێك هاتۆتە بەر تیشك‌و ناتوانین هەتاو ببینین.

٦ **حوسنی ذاتی بتو لاتان ژجەمالا صەمەدە**
**ژمیثالی صەنەمێ وەهکو تەجەلّایە صەمەد**

**مانای وشە:**

**حوسن:** جوانی؛ **لات:** ناوی‌بتە؛ **صەنەم:** بت؛ **تەجەلّا:** ئاشکەرابون.

**پوختەی مانا:**

ئەو جوانیە دڵڕاکێشەرەی، بتپەرستان لە بتانی‌دا دەبینن‌و بویتە هۆی بتپەرستنیان؛ هەر تیشکی جوانی خودایە داویەتەوەو داویەتەوان. ئای چەند سەیرو سەمەرەیە! لە هەیکەلی بتانیش‌دا، خودا چەند ئاشکرا دیارە.

٧ **غەیری دەریا نیە صەحرا بەحەقیقەت ئەمما**
**ژروی کەیفە کوئەڤ ئاڤە بوی شوبهی زەبەد**

**مانای وشە:**

**کەیف:** چۆنیەتی؛ **شوبهی:** وەکی؛ **زەبەد:** کەف.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر راستت دەوێ، ساراش هەر دەریایە. بەڵام تەرزێك گۆرانی بەسەر هاتوە، ئاوبەئاوی ماوەتەوەو رەمڵی سارا، کەفێکە دەریا چنیویە.

شیاوی باسە، خودا بەرلە وشکانی‌و بەژ، دەریای هێناوەتە بەرهەم. وردەوردە تێکوڵی لیێ‌پەیدا بوەو ئاوەکەی بەجێی هێشتوەو بەژ وەکو کەف کردن وایە کە لە دەریاوە دەرچوبێ‌و توێی بەستبێ‌و کەژو کۆی لێ پەیدا بوبێ.

٨ **کُلَّ یَوْمٍ هُوَ فیْ شَانْ» نەبی غافل ژیێ**
**هەر پەیاپەی ژشئونان دکرت فەیض‌و مەدەد**

**مانای وشە:**

**کُلَّ یَوْمٍ:** هەمو رۆژێ؛ **هُوَ:** ئەو؛ **فیْ‌شَأن:** لەحاڵێکدا؛ **ژیێ:** لێی؛ **پەیاپەی:** بێ پسانەوە، بەدوای یەکا؛ **شئونان:** حاڵاتان؛ **دکرت:** دەکا؛ **فەیض:** بەهرەگەیاندن؛ **مەدەد:** یاریدەو کۆمەگ.

**پوختەی مانا:**

خوا لە قورعانا فەرمویە: هەرچی لە عەرزو عاسماندان، نیازیان لە خودا دەخوازن. خوا هەر رۆژێ

حاڵەتێك بەخـۆوە دەگرێ. بۆ ئـەم حـاڵەت گوێزانەوە، زۆر مانا لێدراوەتەوە. دەڵێن دەر بارەی کوشـتن‌و لە نەبو زیندو کردن‌و ڕۆژی پێدان‌و لێ‌خـۆشبون‌و تاوانبار تەنبێ کردن‌و توبە بەخشـین‌و چاو پۆشین‌و لێك جیاکرنەوەی یاران‌و پێك‌گەیشتنی دورانە. واتا خودا هەمو کارێکی لەدەس دێ‌و پیاو نابێ ناهومێد بێ‌و ناشێ لەنیاز بۆ بارەگای، سستی بکا.

مەلا بە مریدی رێ دەڵێ: چاوت لە بەزەیی خوابێ. دڵیشت لەسەر ئـاگابێ. بەهرەو باریکـاری خودا، بێ پسانەوە بەرمو دنیاو خەڵکی دنیا بە رێوەیە. لێی بخوازەو مەیژە ناگا.

٩ گەر دئادەم بدیا سیرری عیلم ئیبلیسێ
(حِیَنما أبْصَرَهْ کَبَّر حیناً وَسَجَدْ)

**مانای وشە:**

**ئیبلیس:** شەیتان؛ **حینما:** هەرکە؛ **أبْصَرَه:** چاوی پێ کەوت؛ **کَبَّرَ:** اللهاکبری گوت؛ **حیناً:** دەمێك؛ **سَجَدَ:** سوژدەی برد.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر شەیتان نهێنیەکانی زانستی بزانییا، کە ئادەم چی دەپاڵدایەو خودا فێری چی کردوەو بنیادەم چەند لەلای خودا، دەسـتی قـەدری لێ نراوە؛ هەر کە تازە لەشـی بابە دەمی دەدیت‌کە لە قـورێ دروسکراوە، بێ خۆگرتن، لە دوای بەخودا هەڵگوتن سـوژدەی دەبردە بەر ئـادەم. بەڵام نەیزانی‌و تێداچو.

١٠ چزەمان‌و چمەکان‌و چجهات‌و چحدود
چمەقادیرو تەفاصیل‌و حیسابن چعەدەد

١١ چمنافات‌و لزومن چقیاس‌و چمیثال
ئەف چتەولیدو چتەرکیبە چروحن چجەسەد

١٢ سەر بـعیجزێ ددرت قووەتی دەرراکەیی ما
(رَجعَ‌العَقْلُ کَلیلاً وَمَتیٰ قامَ قَعَدْ)

**مانای وشەی ئەو سێ بەیتە:**

**زەمان:** دەم؛ **مەکان:** جێ؛ **جهات:** لاکەل؛ **حدود:** کەوشەنان؛ **مەقـادیر:** ئـەندازەگەل؛ **تەفـاصیل:** زۆر درێژەدان؛ **حیسـاب:** هەژمار؛ **عەدەد:** ژمارە؛ **منافـات:** پێچـەوانان؛ **لزوم:** پێویسـت؛ **قیاس:** بەراورد؛ **میثال:** نمونە؛ **تەولید:** بەرهەم دان؛ **تەرکیب:** لێکدان وتێکەڵ کردن؛ **جەسەد:** لەش؛ **ددرت:** دە دات؛ **دەرراکە:** زۆر لەسەر هەسـت‌و شـتزان؛ **ما:** ئێمە؛ **رَجَـعْ:** گەڕایەوە؛ **کەلیل:** کول‌و برسـت براو؛ **مَتیٰ**

کەنگیٚ؛ **قامَ**: هەستا؛ **قَعَدَ**: دانیشت.

**پوختەی مانا:**

توٚژینەوەو لیٚکـدانەوەو پیٚوانەی کاتو شـوێنو جـیٚو هەژماردنو پیٚکگرتنو شـت لەبەریەك راگرتنو دوان لەمەربەرهەم هیٚنانو پاژ لەیەکتر گاوکردنو باسیبونو چـوٚنیەتی گیانو لەشـانو ژماردنو بژاردنو هەرنابیٚو ئەشـیٚ کردنمان، لە بەرانبەر زانسـتی خـودای مەزندا، کەڵکـی نیەو بەهرە نادا. ئاوەزو هوٚشی بنیادەم، تا بیری لیٚدەکاتەوە، سەری لە بەردی رەق دەداو هوٚشی تیژی زوٚر بەکولیو کەلەلایی، بەرەو خـوٚی دەگەریٚتەوەو هەرگا ویسـتی هەڵبویٚسـتیٚ؛ گورجـیٚ روٚدەنیٚشیٚتەوە.

**١٣ حیرەتو عیجزە سەرەنجام دبابیٚ نەظەری**
**(کَیْ بِخالق نَظَرِ قاصِرِ مَخْلُوقْ رَسَدْ؟)**

**مانای وشە:**

**حیرەت**: سەرسوڕمان؛ **عیجز**: زەبونی؛ **سەرەنجام**: ئاخری؛ **باب**: درگا، پاژیٚك لە کتیٚب؛ **نەظەر**: تماشا؛ **خالق**: داهیٚنەر؛ **مخلوق**: داهیٚنراو، دروس کراو؛ **قاصیر**: کورت؛ **رَسَد**: دەگا.

**پوختەی مانا:**

هەرچەندی لیٚکی دەیەوەو گەو بەگەو تیٚکـی کەیەوەو بیدەیە بەر بیری تیژو، بتەویٚ لە نهیٚنیەکانی زانستی خـودا بزانی؛ بیٚبەهرەیە. ئـەو کارە بە چـاوی رواڵەت، زوٚر دژوارە بزاندریٚ. ئـاخر بیرو روانینی کورتو نەبەگەی دروس کراو، کەی دە وەستاکەی خوٚی دەگات؟

**١٤ گفتوگوٚی مەعریفەتیٚ چەندی «مەلا» پەیداکی؟**
**گەوهەرا مەعریفەتیٚ ناگیهیٚتیٚ کەس بـخیرەد**

**مانای وشە:**

**مەعریفەت**: ناسین؛ **خیرەد**: عەقلو ئاوەز.

**پوختەی مانا:**

مەلا! هەرچەندی بخـوێنیو لە وتوویٚژ دەربارەی ناسـینی خـواوە، کارامەو زمان پاراوبی؛ دیسـان هیچ دادت بوٚنادا. کەس بەعەقـڵ گەوهەری خـودا ناسـینی دەس ناکەویٚ. مەگین خـوا کوٚمەگی بکا.

## قصیدەی سیو چوارەم

# جێژنە پیرۆزە

١ عیدەوو هەرکەس ژدیداراتە لێ پیرۆزە عید
ئەز تنێ مەحرومی دیدارم بصەد مەنزل بەعید

**مانای وشە:**

**عید:** جێژن؛ **مەحروم:** بێبەش؛ **بەعید:** دور.

**پوختەی مانا:**

رۆژی جێژنەو هەرکەسێکی تۆببینێ، جێژنی لێ پیروز دەبێ.

هەرمنم تەنیا بەخت رەشمو لە دینت بێبەشم. من لەدوری تۆ دەگەڵ خۆشی، بە صەد قۆناغ جودام.

٢ هەرسەحەر دهنێرم ئەز جانا بئاهانرا ژدل
(بارَكَ‌الباری بِاسعادٍ عَلَیها یَومَ عید)

**مانای وشە:**

**بارَكَ‌الباری:** خوا مبارەکی‌کا؛ **بِاسعاد:** بە بەختەوەری؛ **عَلَیها:** لەسەر ئەو مێوینە؛ **یوم:** رۆژ.

**پوختەی مانا:**

گیانە من لە ناخ دڵمەوە، هەمو رۆژێك سەرلەبەیان، بە هەناسە ساردەکەمدا وڵام دەدەم: خوایە هەمو رۆژی یارم بە ختەوەریو جێژنو شادیو دڵخۆشی بێ.

٣ دەرگەهێ لوطفاتە خانم مال مەحرومان قەبێ
(انَّ کلباً باسِطاً دَهْراً ذِراعاً بالْوَصید)

**مانای وشە:**

خانم: ئەی گەورەی من؛ خانم: ژنی بەرێز؛ ما: توبڵێی؛ انَّ: لێرەدا بەمانا ئەوا؛ کلب: سەگ؛ باسِط: راخەر؛ دەهر: زەمان؛ ذراع: دەست لە پەنجەوە تا هەنیشك؛ وَصید: ژێر دەرانە، پێش دەرگانە.
خوا لەباسی ئەصحابی کەهفا فەرمویە: «سەگەکەشیان لەبەر دەرگای ئەشکەوتەکەدا کەوتوەو هەردو چەموڵەی داداوە.»

**پوختەی مانا:**

گەورەم (یان، خانمە جوانەکە)! منیش وەکو گەماڵەکەی پیاوچاکانی ناو ئەشکەوت، دێر زەمانە لە دیاری بەر دەرگانەکەت، چاوەنوڕی لاواندنەوەم. توبڵێی جارێك ئەو دەروە لەمنی ناهومێدو دورە بەخت بکرێتەوە؟!

٤ پیرەمەردم عاشقم ئیروْ مورادا من ببەخش
(یا حبیبی یامُرادی یامُنیٰ قَلْبِ الْمُرید)

**مانای وشە:**

مُراد: جێ‌نیاز؛ مُرید: بەنیاز؛ مُنیٰ: ئاوات؛ حبیب: خۆشەویست.

**پوختەی مانا:**

پیرەمێردم، ئەویندارم، چاوی دڵم هەر لەتۆیە خۆشەویستەکەی جێ‌نیازم. تۆ ئەو پەڕی ئاواتمی. دەسا بەزییت پێما بێ‌و توزێکم بلاوێنەوەو دیدارێکم پێ ببەخشە.

٥ (فَرَّ عَقْلی مِنْ لَهیبی مِثْلَ‌باز اَوْعُقاب)
(ذَابَ روحی مِثْلَما انْحَلَّ فی نارِ جَلید)

**مانای وشە:**

فَرَّ: رای‌کرد؛ مِنْ: لە؛ لَهیبی: بڵێسەی‌من؛ مِثْلَ‌باز: وەك بازێك؛ او: یان؛ عُقاب: هەڵۆ؛ ذاب: توایەوە؛ مِثْلَما: هەر وەکو؛ انْحَلَّ: لەبەریەك بڵاوبو، تاوایەوە؛ نار: ئاگر؛ جَلید: سەهوڵ.

**پوختەی مانا:**

ئاخر تاکەی دوربم لە دیداری دەرگات. عەقڵێکم‌بو، بەگور وەکو بازو هەڵۆ، لەبەر تینی بڵێسەی

دڵ و هەناوم، لە هێلانەکەی تەڕەبو. ئەو گیانەش کە لە لەشمابو، وەك چۆن سەهۆڵ لەسەر ئاگر دەتوێتەوە، تاوایەوە.

٦ (دَمعُ عَینی مِنْ بُکائی مِثلَ نَهر فی سُکوب)
(نارُ قَلْبی مِنْ غَرامی فی ضَرامٍ فی الْوَقید)

**مانای وشە:**
**دمع:** ئەسرین؛ **عینی:** چاوم؛ **بُکائی:** گریانم؛ **نَهر:** چەم؛ **سکوب:** دارژان؛ **نارُقلبی:** ئـاگری دڵم؛ **غَرام:** ئەوین؛ **فی:** لەناو؛ **ضَرام:** گڕپە؛ **وَقید:** دەستە چیلەی ئاگر.

**پوختەی مانا:**
هێند گریاوم، لوزەوی فرمێسکی چاوم، وەك ئاوی روبار، دێتە خـوار. دڵ وا بە ئـەوین سـوتاوە، ئێژی گڕپەت لە پوش و پەڵاش بەرداوە.

٧ دل ژبەر ناری مەجازی بِالْحَقیقَتْ بو پەرەنگ
(نارُ قَلْبی فی هَواهُ مثلُ نار فی الحَدید)

**مانای وشە:**
**مەجازی:** داهاتوی بەدەڵ؛ **حەقیقەت:** راسـتـو رەسـەن؛ **پەرەنگ:** پۆلو، سکـڵ؛ **هَوا:** ئـەوین، مەیل؛ **حَدید:** ئاسن.

**پوختەی مانا:**
دڵم کە بەرلە دڵداری ساردو سـڕبو، هەرکە ئـاوری ئـەوینی تێدا هەڵکرا، راسـت وەك سکڵی گەش و بەگڕشەی بەسەرهات. ئەوئاگرەی کە لە ئەوینی یارەوە لەدڵمدا هەڵگـڕاوە، وەك ئـاسنی سورەوەبو، دڵم نەرمو پڕلەتینە.
شیاوی باسە، ئاسن کە سور دەبێتەوە، تینەکەی زۆر بەتەوژمەو درەنگیش سارد دەبێتەوە.

٨ (کَیْ خَلاص أزْ دوزَخِ هِجر تو یابَمْ ای جَوان)
(هَر نَفَسْ دارَد صَلاءو نعرهٔ هل مِنْ مَزیدْ)

**مانای وشە:**
**أز:** لە؛ **یابَم:** گیرم ئەکەوێ؛ **دارَد:** هەیەتی؛ **صَلاء:** بانگ و قاو؛ **نَعرَه:** گوڕە؛ **هەل:** ئاخۆ؛ **مَزید:** زیادە.

**پوختەی مانا:**

کەی لە دۆزەقـی دوریتۆ، رزگار دەبم، یارە تازە پێگـەیوە کەم؟ کە ئـەم دوریەت هەمو دەمان بە نەعرەتە هاوار دەکا: ئاخۆ لەوە زیاتر هەیە بیسوتێنم؟

لێرەدا مەلا ئیشارەی بە ئایەتێکـی قـورعان کردوە کە فـەرمویە: رۆژی قیامەت خـوا لە جەهەندەم، دەپرسێ ئەری پڕ بوی؟ دەڵێ ئاخۆ پتر هەیە بۆمی بێنن؟!.

**کێ دزانت من ژرمبازان دەما ئۆغلمە تێن**
**تێنە دل صەدرم ژوان‌و سینە تێنێ صەد جەرید**

**مانای وشە:**

**ئۆغلمە:** جەنگی مەغلوبە، هێرشی توندو تیژ؛ **جەرید:** جلیت، کورتە رمب.

**پوختەی مانا:**

کێ دەزانێ من لەدەستی چاوی مەستتچم بەسەردێ؟ بێ‌بەزە کەوتونە جـەستەی گیانی پرژانی دڵم. بویتە کوڵکی گۆڕو مەیدانی جلیت بازانی شۆرە سوارو نیشـانی نیشـان پێکـان بە پەیکـانان. هەردەمێ دێن‌و دەچن، سینگم بە رمبان کون کونەو دڵ بە نوکی تیری برژانگ بویتە بێژینگ.

**٩ من ژصەففەینان ژنیڤا مەقتەلێ رم تێنە دل**
**لێ لوان دەستان نیهن خونا غەزایا ئەز شەهید**

**مانای وشە:**

**صەففەینان:** دوریزان؛ **نیڤ:** ناوەراست؛ **مەقتەل:** شـەرگە؛ **لێ:** بەڵام؛ **نیهـن:** نین؛ **غەزا:** پەلامار بۆسەر دوژمن، خەزا؛ **شەهید:** کوژراو لە راهی خوادا؛ **شەهید:** حازرو ئاگادار.

**پوختەی مانا:**

کەزیەکانت لە دولاوە بە هۆی سـروەی شـنەباوە ـ کە تێکـەڵ بەیەکتر دەبن‌و روخسـارتم لێ دەشێرنەوە ـ وەك لێکدانی دوریز لە شەرکەران دەچێ. کە پەلاماری یەك دەدەن. منی بێچـارەی هەژاری دڵ بریندار، لەو ناوەدا بێ سـوچو تاوان، دەکوژرێم. خـوێنیشم بەفیرۆ دەرواو کەس کوشتنم ناگرێتەخۆو شەهیدی گوژەر نەناس خۆم.

شیاوی باسە، شەڕی صەفین کە لە ساڵی ٣٧ ی کۆچـی، سـەفـەرەمانگ. لە دەم فـورات، لە نزیکی شاری رەققەی لای حەڵەبێ، لە سـوریا، لە مابەینی عەلی‌و معـاویە روی داوە، لەم بەیتەدا ئیشارەتێکی بۆ کراوە. کێشە زۆرە؛ ئاخۆ کوژراوی ئەو شەڕە هەمویان شەهیدن یان‌نا؟

**١٠ موصحەفا حوسن‌و جەمالێ سورەتا خال‌و خەتان**
**(ماتَلَونا غَیرَ حَرفِ لا وَ قُرآنِ مَجید)**

**ماناى وشە:**

**موصحەف:** قورعان، پەراوى؛ **حوسن‌و جەمال:** جوانى‌و خوشیكى؛ **سورەت:** بەقەدرى‌و گەورەیى؛ **سورەت:** بەشێكى سەربەخوێ لە قورعان یان لە كتێب؛ **ما:** نە؛ **تَلَونا:** خوێندمان؛ **حەرف:** پیت؛ **لا:** نا؛ **وَقُرآنِ مَجید:** سوێند بە قورعانى جێ‌گەورەو پیرۆز.

**پوختەى مانا:**

سوێند بەقورعان، منى دڵدارى سەرگەردان لەوەتا هەم، بە ئاواتم لە كتێبى پڕلە پەڕى جوانى‌و دڵگرى ئەویارەو بەتایبەتى، لە سورەتى خەت‌و خاڵى سەر رومەتى تێر بڕوانم. بەڵام هێشتا جگەلە پیتى «نا»م نەخوێندوەو هەر وشەى نام گوێ لێ بوە كە ئەو نایەش «لا»ى تێك‌نانى نێوان دو برۆكانیەتى.

«نالى» دەڵێ:

وتم ئایا بەزارى خۆت دەپرسى حاڵى زارى من؟
برۆى هێنایە یەك وەك شكڵى‌لا یەعنى كە بێزارم

**١١ گەرچى هەردایم ژمیهرێ نەینەكا دل بەدرە من**
**وەك هیلالێ صوبح تێم ئەز جارنان‌بم ناپەدید**

**ماناى وشە:**

**میهر:** خۆر؛ **میهر:** ئەوین‌و خۆشەویستى؛ **نەینك:** ئاوێنە؛ **بەدر:** مانگى چاردە؛ **هیلال:** مانگى یەكشەوە؛ **تێم:** دێم؛ **بم:** ببم؛ **ناپەدید:** نادیار.

**پوختەى مانا:**

هەرچەند هەمیشە دڵەكەم وەك ئاوێنەى كە تیشكى رۆژ بداتەوە؛ لە تیشكى ئەوین رۆشنەو وەك مانگى شەوى چاردەهەم، روناكەو بگرە زیاتریش؛ بەڵام جارجار كە پرشنگى دیداریم لێ لادەكەوێ، دەبمە ئەو مانگە یەكشەوەى كە بەیانى بۆى بڕوانن. كە هەر نیەو بە یەكجارى تواوەتەوە.

«نالى» بەیارەكەى دەڵێ:

ئەى میهرى میهرەبان ومرە سەربام بامیداد　　تا مەهروان بین بەهیلالى شەوى محاق

**١٢ ما بلەعلێن جانفزا ناڤێ مەبینت جارەکی**
**(بِالدُّعا بَلِغْ تَحِیّاتی لِسَلْمیٰ یا بَرید)**

**مانای وشە:**

**ما:** بەڵکـو؛ **لەعلێن:** لەعلان؛ **جـانفزا:** پیتدەر بەگیان؛ **بالدُّعا:** بە نزاو پاڕانەوە؛ **بَلِغْ:** بگـەیەنە؛ **تَحِیّاتی:** درودو سەلامەکانم؛ **لِسَلْمیٰ:** بۆ سەلمایە؛ **یابَرید:** ئەی پەیتی نامەبەر.

**پوختەی مانا:**

ئەوە خوایە بەڵکو سەلما جارێك یادێك لەمن بکاو بەو دو لێوە تەنكو ئاڵە یاقیقیانەی - کە گەشەی گیان لەوان رایە - ناوی مەلا بدرکێنێ. دەتو خـــوا! پەیتی نامەبەر وێرای درودو ســڵاوان، بۆ پێکهاتی ئەم ئاواتەم، لەبەر سەلما بپارێوە.

**١٣ تو ژ «مەلا»یی هەر بپرس ئەسراری عیشقێ حەل دکت**
**ڤێ موعەممایێ چزانن صەد مەلاوو موستەعید؟**

**مانای وشە:**

**حەلدکت:** هەڵ دێنێ؛ **موعەمما:** مەتەڵ؛ **موستەعید:** فەقێی لەسەر ئیجازە، بەرەژورتر لە سوختە.

**پوختەی مانا:**

تۆ گەرەکتە نهێنی‌یە دژوارەکانی دڵی دڵداران بزانی؟ ئـەو مەتەڵە هەر لای مەلای جـــزیری هەڵدەهێندرێو کەسی‌تر نا. مەلایان‌و خوێندەوارانی لەزەبر، بە سەتانیش هیچی لەهیچ لێ‌نازانن.

**١٤ ئەر بکوشتن وەر بهشتن ئەمرو فەرمانا تەبت**
**(أحْمدُ عَبْدُ رقیقُ واقِفُ بَیْنَ العَبید)**

**مانای وشە:**

**عەبد:** کۆیلە؛ **رەقیق:** بەنی‌و کۆیلە؛ **رەقیق:** تەنك، باریك، نەرمونیان؛ **واقف:** راوێســـتاو؛ **عەبید:** کۆیلەگەل.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر دەتەوێ بمکوژی،یان دەتەوێ بمهێڵیەوە، فـەرمانت چـۆنە با وابیۆ بەدڵ رازیم. ئـەحمەد کۆیلەی ئـاڵقەبەگوێی بەر دەرگاتە. بۆ فـەرمانت لەناو کۆیلەکانی دیتدا، هەڵوێســـتاوەو گوێ لەمستو لەسەر هەستە.

## قصیدەی سی‌و پێنجەم

# «دادو مەدەد»

١ ئەی شەککەرا گەردن ژعاج  دیسا ژرەشتوزێن صەمەد
قەوسێن لبالا فەرق‌و تاج  کەیبەر رەشاندن بێ‌عەدەد

**مانای وشە:**

**ئەی‌شەککەر:** قامیشی شەکر؛ **رەشتوز:** رەشی بریقەدار؛ **صەمەد:** بێ‌نیازو جێ‌نیاز؛ **کەیبەر:** تیری دەم‌پانی وەك چەقۆ؛ **لبال:** لەکن؛ **لبالا:** لە بەرەژور.

**پوختەی مانا:**

بەژنی باریك بەراستی‌و شوشی‌و شیرینی ـ کە برەوی قامیشی شەکر دەشکێنێ ـ و، گەردنی زەردی سپی واش ـ کە عاج لە تماشا کردنی رادەمێنێ ـ ئەوا دیسان لەو جوتە برۆی سێونگی زۆر رەشی بریقەداری بەکەوانەی کە نێوانیان لە بڵندایی باڵای‌دا، بەرانبەر بە دوڕ کاکۆڵ‌و تانجی سەریەوە دیار دەدەن‌و ئەو دو کەوانە رەشانە دەسکردی وەستای بێ‌هاوتای دنیاسازدەری بێ‌نیازە؛ دەستی بە تیرەبارانی هەژاران لە دڵداران کرد.

٢ کەیبەر رەشاندن بێ‌حیساب  میصری کودان سیقال‌و تاب
صەد روستەم‌و ئەفراسیاب  کوشتن لوان کەرکر جەسەد

**مانای وشە:**

**رەشاندن:** پرژاندنی؛ **سیقال:** مشتو ماڵ؛ **تاب:** تیشکەو بریقە؛ **کەر:** لەت؛ **جەسەد:** لەش.

**پوختەی مانا:**

جگە لەوە چاوی مەستی بە مژۆڵان، تیرەبارانی دڵمی‌کردو لە هەژمار بەدەر بۆی هاویشت؛ برۆکانی - کە وەك شیری میصری تیژو خوارو جەوهەردارن - وەها مشت‌و ماڵ کریاوو بریقەداری کردبون، کە نەك هەر منی هەژاری بەستەزمانیان پێ دەکوژرا، ئەگەر روستەمی دەستان‌و ئەفراسیابی تورانی وەبەر هاتبا، بە قەڵتێك دای‌دەهێنان‌و کەلاکیشیان هەنجن دەبو.

٣ صەد پادشاهو خوسرەوان  جان دان ژعیشقیٚ‌و رەوان
نەسرین‌و لەبسیٚ ئەرغەوان  من دین لبەژنا سەرو قەد

٤ من دین لبەژنا عەرعەرین  تایێن زەبادو عەنبەرین
بایی صەبادا چەنبەرین  زولف چونە سەرنورا صەمەد

**مانای وشە:**

**خوسرەو:** قەراڵ؛ **رەوان:** گیان؛ **لەبس:** جلك‌و شمەك؛ **عەرعەر:** دارێکی راست‌و بڵندە؛ **تا:** هەودا؛ **تا:** لابار؛ **زەباد:** بۆن خۆشێکە لە جانەوەرێك هەڵدەوەرێ کە وەکو پشیلە دەچێ؛ **چەنبەر:** گەو، ئاڵقە.

**پوختەی مانا:**

من یارم‌دیت چیبینم؟ ئەو باڵا سەوڵ‌و عەرعەرە، بە بەرگی ئاڵ‌و واڵاوە. دەت‌گوت نەمامی عەرعەرەو بە نەسرین‌و ئەرخەوان گوڵی کردوە. کەزیەکانی ئەت‌وت تاتای میسکی زەبادو عەنبەریان بەر گرتوە. لەو کاتەدا بای بسکان هات‌و ئاڵقەی زولفان، چونە سەر رومەتی جوانی کە تیشکی روناکی خودا دەداتەوە. جا نەك هەرمن صەد پادشاو قەراڵیش ئەوە ببینن لە عەزرەتان گیان ئەدەن‌و فەراقی رەشیان لیٚ‌دەبرێ.

٥ زولف چونەسەرنورا زولال  جارەك وەرە بایێ شیمال
بسکان ژسەر دیمێ قەمال  زولفان ژبەر جوتیٚ ئەسەد

**مانای وشە:**

**زولال:** رون‌و لوس‌و رەوان؛ **دیم:** روخسار؛ **قەمال:** بماڵەوە؛ **ئەسەد:** شێر.

**پوختەی مانا:**

بای‌شەماڵ! دەستم دامێنت. وەرە ئەو بسکە رەشانەی کە نوری روخساری یاریان داپۆشیوە، لادەو ئەگەر دەتوانی راماڵەو با ئەو چاوانەش ببینم. کە لە کوشتنی دڵداران، لە جوتێك شێر خەتەرترن. چونکە من بەدڵ ئاواتمە بەو چاوە جوانانە بمرم.

٦ سەححار جوهتی جادوان  ئیروٚ ژرەمزا ئەبروان
دل گرت‌و دابەر کاشوان  کەر کر لمسکینان کەبەد

٧ دل گرت‌و دابەر خەنجەران  کوشتم نیگارو دلبەران
مە ژدەستی ظولما ئەسمەران  دِادو مەدەد، دادو مەدەد

**مانای وشە:**

**سەححار:** جادوگەر؛ **رەمز:** ئیشارەت؛ **کاشو:** گوٚچانی گەمەی شەقێن؛ **ئەسمەر:** گەنم رەنگ.

**پوختەی مانا:**

ئەو دوچاوە سیحراویانەی ـ کە وەك دو جادوگەر وانە ـ چاوێکیان لە بروٚیان داگرت‌و تیٚیان گەیاند کە دلٚمیان لەبەر لابەریٚ. بروٚی چەماو لەچەشنی گوٚچانی شەقێن، دلٚیان کردم بە گوٚی مەیدان‌و رفاندیان‌و کەلە خەنجەریش تیژترن، ئەو بێچارەیان هەنجنی‌و لەت‌بەلەت کرد. هاوار لەمن منی هەژار، بەر زولٚمی زوٚردار کەوتوم‌و زوٚر کاری من بازەنینێکی دلٚبەرو زەرد ئەسمەرە. ئەی خوایە بەدادم بگە، نیازم زوٚر بە یارمەتیتە.

٨ دلبەر ژلەعلێن خوٚی شەفاف  دامن مەیا گولگون‌و صاف
دەریایی عیشقیٚ قاف‌و قاف  پەیوەستە تیٚتن جەزرو مەد

**مانای وشە:**

**شەفاف:** رونی شوشەیی؛ **گولگون:** گولٚ رەنگ؛ **قاف:** کیٚوێکە لە دەریاداو دەوری هەمو دنیای داوە؛ **جەزر:** کشانەوەی دەریا؛ **مەد:** هەلٚکشانی دەریا.

**پوختەی مانا:**

مەلا دیارە زوٚر زو دوعای قبولٚ دەبن. لەپاش ئەو دادو هاوارە، دیارە دلٚیان داوەتەوە. کە فەرمویە: یارم لەو جوتە لێوانەی ـ کە وەك بلور، رون‌و پاك‌و لەئالٚی‌دا لە لالٚ دەکەن ـ بادەی گولٚرەنگی روناکی پیٚ چەشاندم‌و تیٚی گەیاندم کە ئەگەر لەسەر واز نەبو، جارجارە دلٚی ئێشاندم؛ گوٚیٚ نەدەمیٚ چونکە ئەوین وەك دەریایەو هەمو دنیای داگرتوەو دەریاش بیٚ جەزرومەد نابیٚ. جارێك لیٚم نزیك دەبێت‌و جارێکیان دەستم نایگاتیٚ.

٩ حوسنا مونەززە بیٚ میثال  سەردا لیباسیٚ خەت‌و خال
سەر گەشتە حەیران ماو لال  ئەحمەذ کودی نورا صەمەد

١٠ الله ژنورا سەرمەدی یەك قەطرە یەكدا ئەحمەدی
شیرینیو رەمزەك وەدی مەدهوشما حەتتا ئەبەد

**مانای وشە:**

**مونەززەه** : پاكو دور لە كەمایەسی؛ **سەرگەشتە:** سەرگەردان؛ **حەیران:** حەپەساو، سەرسورماو؛ **رەمز:** ئیشارە، نهێنی؛ **مەدهوش:** تاساو.

**پوختەی مانا:**

منی دڵدار، کە ئەو جوانیە پاكو بێ عەیبو بێ وێنەم بە گلێنەكانی خۆمدیتو سەیری خەتو خاڵانم کرد، کە بونە نەخشی روخساری، بە یەكجاری بوم دەركەوت کە وێنەی نوری خودایە لەو روخسارە جوانەدایە. ئیتر تاسام، سەرم سوڕا، لاڵو پاڵ بوم. خوایە نوری بێئاوابونو سنورت کە خۆی نیشانی بەندەدا، چەند گرینگە . من تنۆكێكم لە دەریای نوری هەمیشەیی تۆ، پێ گەیشت. شیرنایەتیو مژدەی نهێنی وای داومێ، کە هەتاهەتا سەرخۆشو بێ هۆشم دەكات.

## قصیدەی سی‌و شەشەم

# «سەفینەی مەی»

١ ئامۆ دەستی وێ سرێ دل بمەیێ حەوالە کر
هەرچی لمن‌کری «مەلا» جامی مەیا دوسالە کر

**پوختەی مانا:**

ئەی‌داخە کەم! هیچ نازانم مەبەستی نهێنی چبو. دڵە دەردە دارەکەی من، حەواڵەی پیاڵەی مەی کرا. مەلا! هەرچی بەسەرت هات، لەو بادە کۆنەی بزانە.

«حافظ» لەو بارەوە دەڵێ:

چل‌ساڵە دەردەدارەو وا تازە تێ دەگەم        چاری هەژاری دڵ‌بەجغار مەی دوساڵە بو

٢ شەنگێ بناز مەششها میسکو زەباد وەششها
روی‌ما دبن پیانە هێژ زێدە لمن دەلالە کر

**مانای وشە:**

مەششها: رۆیشت؛ وەششەها: وەشێنرا، داوەری، پەرژو بڵاو بۆوە؛ هێژ: هێشتا، هێمان؛ دەلال: ناز؛ ما: ئێمە.

**پوختەی مانا:**

ئەو شەنگ‌و شۆخە بەنازە، هاتو رابرد. رەوتە بەلەنجەو لارەکەی، میسکو زەبادی دەوەشاندو بۆنی خۆشی بڵاو دەکرد. بۆ پایەنداز لە رێبازی، ئێمەی دڵدار، روبەعاسمان تخێڵێ بوین‌و ویستمان بەختەوەرمان بکاو پێ لەسەر چاوانمان دانێت. بەڵام پێ لەچاوی تەڕو سور نان، بۆ بەری پێ ناسکەکەی ئەو، دیارە زۆر بو. بەنازەوە هێشتا ئێمەی بە تاوانبار دەرێناوەو منەت دەکا.

٣ چیچەکو گول سەحەرگەهان نەستەرەنێن دخەرگەهان
تێک ژمیسکو ماوەرێ ماهێ خوتاڤو ژالە کر

**مانای وشە:**

چیچەك: گولێ؛ سەحەرگە: دەمێ بەیانی؛ نەستەرەن: جورێ گوڵەباغی ئاڵە؛ خەرگە: خێوەتی گەورە؛

**خەرگەی کەسك:** بریەتیەلە عاسمان؛ **خەرگەی مانگ:** خەرمانە؛ **ماوەر:** گوڵاو؛ **ماە: هەیڤ؛ خوناڤ:** شەونم؛ **ژالە:** شەونم، ئاونگ.

**پوختەی مانا:**

یارم لە بەرەبەیاندا، کە روخساری خۆی نیشان‌دا، کوڵمی سورو لێوی ئاڵی‌و لاجانگی ژێرتای دەسماڵی‌و هەنیەی مانگ‌و کەزی‌و بسکی، بەرامە بڵاوکەرەوەی لەبەر ئەم عاسمانە شینەو لەسەر ئەم کۆنە زەمینە، دیمەنی دا. هەرچی گوڵ‌بون، لە خۆشیانی‌و لەشەرمانی کە لەجوانی‌دا تای‌ناکەن، ئارەقیان کرد. عاسمانیش بەئەستێرەوە، لە عەزرەتی ئەو دیدارەو لە پرشنگی ئەو روخسارە، تك‌تك ئاوی لەلێوان‌و ئەسرین لەچاوی دەباری. کە ئەو ئەسرینانە، دەگەڵ خوەدانی گوڵاندا، تێکەڵ بون‌و شەونم ئەنگوت. بەڵام نەك ئاونگی بێ‌بۆن، لە نیزیکی ئەو تازە گوڵە نازدارە، بۆنی میسك‌و گوڵاوی وەخۆ گرتبو؛ بەکوردی لێکی دەینەوە مەلا دەڵێ:

لە بەیاندا کەگوڵ شەونمیان لەسەر بو، یار هاتەدەر، لە ناو گوڵان پیاسەی کرد.

٤ دیمی دبسك‌و خەمری‌یان تاوو لەفێن دشەتری‌یان
مانە تەمام کەسك‌و صوڕ بەدرە لدۆری هالەکر

**مانای وشە:**

**دیم:** روخسار؛ **خەمری:** پەرچوکە، نیوەرو بەندێکی تۆڕی‌و بەگەو؛ **لەف:** پیچ؛ **شەتری:** گولینگەی بان شمدە؛ **کەسك‌و صوڕ:** کۆلکە زێرینە؛ **بەدر:** مانگی‌پڕ؛ **بەدرە:** بەهەڵپەو پەلە؛ **بەدرە:** کۆمەڵێك لە سکەی زێڕو زێو.

**پوختەی مانا:**

دیمەنی ئەو دەم‌و چاوە، لە ناو بسك‌و گێل‌گێلەو گوڵینگەو دەرزی‌و لاگیرەو خرینگەو سەرپۆش‌و سەرپێچ‌و هەوری‌و گەردنبەندان، وەك مانگێك دەهاتە بەرچاو کە لە شەوی چاردەدا بێ‌و پەلکەزێڕینە بوبێتە خەرمانەو دەوری لێ‌دابێ.

٥ دۆر کرین ژسونبولان چیچەك‌و بشکۆو گولان
دل مە ژرەنگێ بولبولان شبهەتی داغی لالەکر

**مانای وشە:**

**دۆر:** دەورە؛ **بشکۆ:** بشکۆژ، خونچە؛ **شبهەت:** وەکو؛ **لالە:** گوڵە مێلاقە.

**پوختەی مانا:**

بەو کەزیانەی، کەوەك سونبول بۆنیان خۆشە، خونچەی لیۆو گوڵی کوڵمی خستۆتەناو پەرژینەوەو دڵم لەتاو نەدیتنی، داخ لەدڵمو وەك مێلاقە، رەش‌بوە جەرگ‌و هەناوی‌و، بومە هاودەردی بولبولان لە ناڵەو گریانی بەکوڵ.

نالی دەڵێ:

گریانی بەیانانی منە یا عیشی خەندەتە پشکوتنی گوڵ مایەی لێنانی شەواوە.

٦ پیری موغان ژشیشەیێ دامە سەفینەکێ مەیێ
شوکری خودێ کوقولزمەك منژخوْرا قەبالەکر
**مانای وشە:**
**موغ:** مەلای زەردەشتی؛ **پیری موغان:** مەیخانەچی؛ **پیری‌موغان لە زاراوەی عارفاندا، بەپیری تەریقەت دەڵێن؛ سەفینە:** گەمیە؛ **سەفینە:** لەزاراوەی مەیخۆراندا، پیاڵەی پڕە؛ **قولزوم:** لەبنیچەدا ناوی دەریای سورەو چونکە نیزیك بەشاری «قولەیزمە»ی نزیك سویسی میصربو ئەو ناوەی بەسەرا براوە. بەڵام لەشیعری شاعیراندا تەنیا واتای دەریا دەدا؛ **قەبالە:** تاپۆ.

**پوختەی مانا:**
پیری تەریقەت، لە بادەی دڵداری خودا، پیاڵەیەکی دەخوارد مندا. سوپاس بۆخوا، کە لە سایەی ئەو پیاڵەوە، دەریایەکم وەگیر کەوت. واتا دڵم بوبە دەریا لەناسین‌و ئەوینی خودای مەزندا.
٧ خضری برەمزو موعجیزێ مەست مەدی ددینگزێ
هات پیالەیەك ددەست ئەشکەرە صەد پیالەکر
**مانای وشە:**
**خضر:** سەوز؛ **خضر:** ناوی یەکێك لە نزیکان بەخودایەو مەرگی لێ دور کەتۆتەوە دەڵێن ئاوی ژیانیشی خواردۆتەوەو هەمیشە هەر جوان دەمێنێ؛ **رەمز:** نهێنی‌و ئیشارە؛ **موعجیز، موعجیزە:** ئەو شتەی لە عەقڵ‌و دەسەڵاتی ئادەمی بەدورە؛ **دینگز، دینیز:** دەریا.
**پوختەی مانا:**
پیری‌من وەك خدری زیندە، لە دەریای دڵما خۆی نواند. ئێمەی دی مەستی ئەوینین؛ پیاڵەیەکی لەدەستدا بو، بەو پیاڵە صەدپێکی دامێ‌و صەد ئەوەندە مەستی کردم.
شیاوی باسە، قورعان باسی موسا دەکا، کە توشی یەکێك هاتوە زۆر لەخۆی زاناتربوەو لە دەریادا پێکەوە بون. تا ئاخری چیرۆکەکە. دەڵێن ئەو پیاوە خدر بو. مەلا لێرە ئیشارەتێك بەو باسەی قورعانەش دەکات.

٨ غونچە لەبازرەنگ گولێ دیمێ بسیرنوما «مەلێ»
شوبهەتی بولبولان سەحەر لەومە فغان‌و نالەکر

**مانای وشە:**
**لەب:** لێو؛ **سیر:** نهێنی؛ **فغان:** هاوار.

**پوختەی مانا:**
خونچە لێوەی بەرەنگ گوڵە. بەنهێنی لەبەیاندا، روخساری نیشان مەلادا. هۆی ئەمەیە کە هەمو بەرەبەیانان، وەك بولبولان ئێمە گاڵەو ناڵەمانە.

# قصیدەی سی‌و حەوتەم

## «حەجی گەورە»

١ دەری مەیخانەیا عیشقیٚ سەحەر عارف زیارەت کر
بـ‌ئابی چەشم‌و خونیٚ دل وضو بەست‌و طەھارەت کر

**مانای وشە:**

**چەشم:** چاو؛ **وضو:** دەسنویژ؛ **طەھارەت:** پاك‌و خاوێنی.

**پوختەی مانا:**

خواناس (عارف) لە بەرەبەیاندا، دەرگای مەیخـانەی ئـەوینی نیشـاندرا. بۆ ئـەوەی بۆماچ کردنی سەردەرانەو چونە ناو مەیخانە بشیٚ، گەرەكبو پاك‌و خاوێن بیٚ. لەسـەر دەسـتوری خـواناسان، لە خوێنی دڵدا خۆی ششت‌و بە ئاوی چاو دەسنوێژی گرت.

٢ ورین جاما ھیلالی دا ژعەکسی ماھی نەو بینی
کو خانی میھرو جەرگی چەرخ‌و خوانی روزە غارەت کر

**مانای وشە:**

**وەرین:** بهێنە؛ **ھیلالی:** لە بیچمی مانگی یەکشـەوە (یان، لە رەنگـی مانگـی یەکشـەوە)؛ **عەکس:** گەراندنەوە؛ **ماھی نەو:** مانگی تازە؛ **بینی:** ببینی؛ **خان:** ماڵ؛ **خوان:** سفرە.

**پوختەی مانا:**

مەیگێر! بەو پیاڵەی سەر دەستت کە لە شکڵی مانگی نویٚ دروست کراوە، مەیێکی زەردی تیشك دەر وەك مانگ بێنەو بمان دەریٚ‌و روخسـارتی تێدا بنوێنەو برۆکانت لەو بادەی لەرەنگ ئـاوێنەدا

تماشاکە، کە هەرچەند لەگوێن مانگی نوێ، کەوانیو باریك دەنوێنن؛ چۆن پشێویو ئاژاوەیان ناوەتەوە؟ تیری ئەوان لەو ماڵە کەوانیانەوە، ماڵی خۆرو جەرگو هەناوی عاسمانو سفرەی رۆژوی رۆژو دارانی تاڵان کردو سوتاندنی. لەوساوە تۆ دیاریتداوە، نە رۆژ پەرستن لەباوەو نە رۆژو لەبەرمانگ دیتن.

٣ بمیزان قەوسی ماهینەو لوەجهێ دلبەرێ من دی
ژچەشمو گوشەیی ئەبرۆ بدۆر جامێ ئیشارەت کر

**مانای وشە:**

**میزان:** تەراز، بەرانبەر؛ **میزان:** بورجی تەرازو لە عاسمان؛ **قەوس:** کەوان؛ **قەوس:** بورجێك لە عاسمان؛ **وەجە:** روخسار؛ **وەجە:** لا؛ **بدۆر:** بۆ دەورەی.

**پوختەی مانا:**

من کەوانەی برۆی یارم، لەبەر هەنیەی بەدی کردن. کە وەك مانگی تازە هاتو، لە گۆشەی عاسمانی ساودا، هاتە بەرچاو. لە تەرازیو رێكو پێکیو کەوانەی ئەودوکەوانە، بورجی کەوان لە عاسمانا، دەگەڵ ئەستێرەی تەرازو شەرمەندە بون کە گرۆی لێ بردبونەوە. یاری نازدار، بە گۆشەی برۆو تیلەی چاو، هانەیان دام کە لە پیاڵە نزیك‌کەومو لە تیشکی ئەوان لەمەیدا سەرخۆشو دورە هۆشبیم.

٤ بئەبصاران نەظەرمن چو ژچەرخی قەوسی ئەبرۆیان
شوکور خوازین کو چاڤان کار بەرعەینی بەصارەت کر

**مانای وشە:**

**ئەبصار:** چاوگەل؛ **بەصارەت:** عیلمو زانست؛ **نەظەر:** تماشا؛ **چەرخ:** سوڕاندن، بزواندن؛ **چەرخ:** جەغز؛ **چاڤان:** چلۆن؛ **چاڤان:** چاوگەل؛ **عەین:** چاو؛ **عەین:** خودیخۆ، تەواو.

**پوختەی مانا:**

کاتێ یارم گۆشەی برۆی بزواندنو بەتیلەی چاو تێی گەیاندم بادە وەخۆم؛ چاوم لە جەغزی برۆکەی هەڵخلیسکاو چاوە مەستەکانیم دیتنو بەوان مەست بوم. سوپاس بۆخوا، کە چاوانم هەلێك کاریان لەروی زانینەوە توشهات. سەیر ماوم چلۆن ئەوجارە بەختیمن ئەوەندە باشی هێناوە؟

۵ ژسەر دیمیٚ نیقاب ئاڤێتو دەستورا طەوافیٚ دا
دسەعییٚ بەیتو ئیحرامیٚو من ئەسوەد زیارەت کر

**مانای وشە:**

**نیقاب:** روبەند؛ **دەستور:** ئیجازە؛ **طەواف:** دەدەورە گەڕان؛ **سەعی:** رۆینی بەپەلەو غاردان بەتایبەتی بۆ حاجیان لە هەرەتی حەجدا؛ **بەیت:** ماڵ، ماڵیکابە؛ **ئیحرام:** دەربەستبون بە چەند شتێك کە هەرەتی حەج مەرجە بۆ حاجی؛ **ئەسوەد:** رەش، بەردی رەشی حاجیان.

**پوختەی مانا:**

یار روبەندی لەسەر روخساری تورٚ هەڵدا. ئیجازەیدا کە لە دەوری سەری گەڕێمو دنیا لەخۆم حەرام کەمو بەرەو کابەی روخساری ئەو، بەغار برۆم. خوا شوکور حەجم قبوڵەو خاڵی وەك بەردە رەشەکەی حاجیان ـ پیرۆزو رەنگ شەوەم ـ زیارەت کرد.

٦ ددیداریٚ هەزاران جان نثاری مەقدەمی یارن
کەسیٚ جانان بجان بینت دعیشقیٚ وی تجارەت کر

**مانای وشە:**

**نثار:** پەرژکردن، شاباش؛ **مەقدەم:** جێگەپیٚ، پێوقەدەم؛ **تجارەت:** قازانج لەمامڵە.

**پوختەی مانا:**

لە رێگەی دیداری یاردا، هەزاران گیان بەشاباشی بەری پێی کەم، لەقازانجمە. کەسێك یاری بەچاوی گیان ـ وەکو من دیومە ـ ببینیٚ، لە بازاری ئەوینیٚ، سودی بیٚهەژمار وەگیر دێنیٚ.

خوا لە قورعانا فەمویە: «خودا لە خاوەن باوەڕان گیانو ماڵیانی کڕیوەو بەهەشتیان لەبات دەداتیٚ. دەچنە خەزا لەرای خوادا، کافر دەکوژنو دەشکوژرێن. خوا لە تەوراتو ئینجیلو قورعاندا، ئەم گفتەی داوەو کیٚ لەو پەیمان پتەوترە؟ مزگێنی لەو سەودایەتان، کە بڕیارتان لەسەر داوەو لەراستیدا، سەرکەوتنێکی گەورەیە.»

۷ بدیناری دنیٚ زینهار دا یاری خوە نەفروشی
کەسیٚ یوسف فروتی وی دعالەمدا خەسارەت کر

**مانای وشە:**

**زینهار:** دەغیلە؛ **عالەم:** دنیا؛ **خەسارەت:** زیان.

**پوختەی مانا:**
دەغیلتبم نەچی هەرگیز بە زێڕو ماڵی دنیا، یار وەگۆڕێ. کەسێکی یوسفی میصری فرۆشت، هەر خوێ لەدنیادا، زیانبار بو.

**٨** **تنێ ئەو سەجدەیا شوکرێ تەبر میحرابی قەوسەینان**
**کودەلق‌و شەمل‌و سەججادە بقێ ئاڤێ قەصارەت کر**

**مانای وشە:**
**دەلق:** خەرقەی پڕلەبینەی دەروێشانە؛ **شەمل:** ئەو چارەکە یان عەبایە کە دەلەشیان دەهاڵێنن؛ **سەججادە:** دوگردی نوێژ؛ **قەصارەت:** شوشتن؛ **قەصصار:** گازر، جل‌شۆر.

**پوختەی مانا:**
تەنیا هەر ئەو سوژدەو کرنوشەت بەکار هاتوە کە بەرانبەر بە میعراوی کەوانەی برۆی یار، بۆ سوپاسی دیدارەکەی بەجێت‌هێناو هەرکەسێکیش وەك‌تۆ خەرقەو بەژن‌پۆش‌و بەرماڵەکەی بەئاوی چاوو خوێنی دڵ نەشورێ، بە ئاواتی دڵی ناگاو کرنوشی لێ قبولْ ناکرێ.

**٩** **دبەحتی لەعلی لەب هەرخام نارت طەبعی ئەلماسی**
**وەلی تەئثیرو فەیضی میهر تەدبیری حەرارەت کر**

**مانای وشە:**
**خام:** کاڵ، خاو؛ **نارت:** ناگاتە؛ **تەئثیر:** کارتێکردن؛ **فەیض:** بەهرە؛ **فەیض:** سەرڕێژ کردن؛ **میهر:** خۆر؛ **میهر:** ئەوین؛ **حەرارەت:** گەرما.
شیاوی باسە، لەعل‌و ئەڵماس دو گەوهەرن، کە دەڵێن کارتێکرنی رۆژ بە صەتانساڵ لە دڵی بەردا سازیان دەدا.

**پوختەی مانا:**
هەرکاڵ‌و خاوێك ناتوانێ مرخی وەك ئەڵماس برابێ‌و بتوانێ لەباس‌کردنی لەعلی لێوان‌دا سەرکەوێ. کەمن دەتوانم لێی بدوێم، تیشکی خۆری ئەوینی بە سەرڕێژی من، ئەو گەرمایەی داوە بەدڵ کە بتوانێ لەم دژواریە سەر دەر بکا.

**١٠** **دئیعجازی بەیانێ‌دا سوخەن گەر بێتە ئینصافێ**
**دزانت موختەصەر هەرکەس «مەلێ» سیحرە عیبارەت کر**

**مانای وشه:**

**ئیعجاز:** شتێك كه لەتواناى كەس‌دا نەبێ؛ **سوخەن:** وته؛ **موختەصەر:** كورته؛ **عیبارەت:** قسەدركاندن.

**پوختەی مانا:**

**ئەگەر خەڵك هەروا كەمێك ئینصافیان بێ، باش دەزانن مەلا لەو شیعرانەی خۆی‌دا، كارێك‌دەكا كه بەهیچ كەسێك ناكرێ‌و هەرچی لەدەمی دەردەچێ وەك سیحری جادوگەرانه.**

شیاوی باسه، **مەلا لەم قصیدەیه دا، شوێنی حافظی گرتوەو دوقصیدەی خواجه حافظ، لەو كێش‌و قافیەو مانایه، لەناو دیوانەكەی‌دایه.**

## قصیدەی سیو هەشتەم

# «هەمیشە بەهار»

١ خەلقوٚ لمن کن شیرەتیٚ ئەو دلبەرا زەررین کەمەر
من دی دحالی غەفلەتیٚ هات دەر ژبورجیٚ وەك قەمەر

**مانای وشە:**

**خەلقوٚ:** بەلوٚ؛ **شیرەت:** تەگبیر؛ **بورج:** مزلٚگەی مانگ؛ **بورج:** باڵە خانەی کوٚشك.

**پوختەی مانا:**

خەڵکینە تەگبیرم چیە؟ چم لیٚ دەکەن؟ نازانن ئـەمرِوٚ چـمدیە؟ لەپرِ دیتم یار ـ کەمبەرەی زیٚرن لەپشت ـ لە باڵەخانە دیاریدا، وەك مانگ هەڵیٚ.

٢ هاتدەر ژبورجو پەنجەران دڵگرتو دابەر خەنجەران
ئەڤ رەنگە حالی دلبەران لەو عاشقان خون بون جەگەر

٣ قەلبو جەگەر من بونە خوین لەورا کونو دەربون برین
ئەی جان وەرە حالم ببین وەز روح ژقالب بیٚتەدەر

**مانای وشە:**

**جەگەر:** جەرگ، کەزەب؛ **روح:** گیان؛ **قالب:** بەدەن.

**پوختەی مانا:**

هەر کە پەنجەرەی کردنەوەو لە دورەوە لەژوری باڵەخانەیدا خـوٚی نیشـاندام، ژانیٚکـی وام لەدڵ وەستا دەت گوت بەرخەنجـەر دراوە. خـویٚن لەجـەرگو هەناومەوە، هەڵدە چـوڕاو کوٚنەبرینم

کولانەوە. وەرە ئەی گیانی شیرینم. تۆ هیچنەبێ، لە برینەکانم بڕوانە کە دەشزانم گیانی ئامانەتی ناو لەش هەرتوی لێنزیك کەویەوە؛ خۆی لەلەش رادەپسکێنیو بۆ سەیری بەژنو باڵای تۆ، دێتە دەرێو نایەتەوە. کە بەراستی دەبێتە مایەی شانازیم.

٤ جانی من ئەر بێ سەر جەسەد مزگین بئافاقان رەسەد
عالەم حەمی پیێن حەسەد ئینسانو جینو جانەوەر

**مانای وشە:**

**جەسەد:** لەش؛ **ئافاق:** ئاسۆگەل؛ **ئـافاق:** هەمودنیا؛ **رەسـەد:** دەگا؛ **عالەم:** هەرچـی ئـافەریدەیە؛ **حەسەد:** ئێرەیی؛ **جین:** جنۆکە؛ **جانەوەر:** زیندەوەر.

**پوختەی مانا:**

یارم ـ کەگیانی بەراستم هەر خۆیەتی ـ گەر بێتە سەیری برینان، گیانە سیسەکەی ناو لەشـم، بۆ دیداری دێتە دەرو بەیەکجـاری لە لانی لەش تەرە دەبێ. کەوابو یار دێتە سـەیری جـەندەکە بێگیانەکەی من. بەڵام هەر بگاتە سەرم، لە دنیادا دەبێتە قـاو. خـۆشیو مژدەی دیدارەکەی گش ئاسۆیەك بەرخۆ دەدا. هەرچی ئافەریدە هەنە، مرۆو جنۆکەو زیندەوەر ئێرەیی بەلاشەم دەبەن.

٥ عالەم حەمی تێكبونە صەف سەیرین لشاهی من بەخەف
هاتن تماشا چار تەرەف شاطر خومار تیتن دبەر (یان، خیمار)

٦ هات پادشاهی پور سوپاه قامەت ئەلیف دیم شوبهیماه
دادو مەدەد صەد ئاهوئاه زولفان عەقارب تینە سەر

**مانای وشە:**

**سەیرین:** روانیان؛ **شاهی:** شادی؛ **شاه:** پاتشا؛ **خەف:** نهێنی؛ **شـاطر:** چـوستو مەزبوت؛ **شـاطر:** جڵەوداری پاتشایان؛ **خومار:** مەیگەستە، سەرگێژی سەرخۆشی؛ **خیمار:** نیوە روبەندێك؛ **سوپاە:** لەشکر؛ **قامەت:** بەژن؛ **عەقارب:** گەلە دوپشك.

**پوختەی مانا:**

مەلا بەخـەیاڵ دایناوە، کەیار بەزەی پێدا هاتو هاتە سـەیری کەلاکە بریندارەکەی. فـەرمویەتی: هەمو دنیا کۆ بوتەوەو ریزیان لە دەورم بەستوە. کە هیچ نەبێ بە دزیەوە، هەست بە شـادی لەشەکەم کەنو لەو پاتشای نازدارانەش، بەسیلە چاوێك بڕوانن. پیادەی جڵەوداری ئـەسپی ئـەو مەستە فەرمانڕەوایەش، لە جوانیەکەی مەی گەستەیەو پێشی تماشـای گرتوە، کەزیەکانیشـی ـ

که سەریان بەئاڵقە هەڵگەڕاونەوە ـ وەك دوپشك لەو سەرەوە، گەف لە تماشاکەر دەکەن. خیماریش نیوەی روخساری داگرتوە، هەی داد، هەی خودا کۆمەگێك لەدەس ئێرەیی پاسداری ئەو نازدارەو کەزیەی ئەو باڵا نەمامەی کەوەك پیتی ئەلف راستەو تەختی هەنیەی وەك مانگ‌وایە.

٧ گەستیمە خەلقۆ عەقرەبێ مەستم ژشەوقا غەبغەبێ
طالع تنێ مەد کەوکەبێ ئیرۆ عەقارب تینە دەر

٨ ئیرۆ عەقارب هاتە خوار چو نیڤی باغی گولعوذار
ئەو بوغچەیا هەر لێ بوهار لەو بولبولان لێ‌قالو شەر

**مانای وشە:**
**شەوق:** مەیل، ئارەزو؛ **شەوق:** پرشنگ؛ **غەبغەب:** بەرچێلە؛ **عوذار:** لاجانگ؛ **بوغچە:** باخچە؛ **بوهار:** بەهار؛ **قال:** گاڵە.

**پوختەی مانا:**
لە پرشنگی سپیایەتی ژێر چەناگەی، چاوم بەشەوارە کەوت‌و بە بۆنی ئارەزو، مەست بوم. هۆشم نەبو، سەری نوکی کەزی‌و بسکی ـ کە وەك کلکی دمارەکوڵ بیوە ئاڵقە ـ پێیەوە دام، سستی کردم. بۆ چارەنوس، کە لە فاڵنامە دەڕوانم هەر بورجی دوپشکی عاسمان لە بەختمە.
بەڵێ ئەمڕۆ کەیار کەزی بەشانە کرد، گەوەکانی هاتنە سەر رومەتی جوانی، دەت‌گوت هەزار دمارەکوڵ کەوتونە ناو گوڵزارەوەو لاجانگی وەك گوڵ ناسکی داپۆشرابو. بولبولان لە پیواربونی ئەو گوڵزارە، هەر بەهارە، کەوتونە ناڵین‌و گاڵین‌و لەگەڵ بەختی رەش، شەڕیانە.

٩ بی‌حەد ژدل نالی‌و کەیب دا بوغچەیا رضوانی غەیب
ڤا نالی‌یان نینن چوعەیب صوهتینە ئەم دل بوسەقەر

**مانای وشە:**
**بیحەد:** لەهەژمار بەدەر؛ **بی‌حەد:** بێ‌سزادان؛ **کەیب:** ماتی‌و خەمگینی؛ **رضوان:** بەهەشت؛ **رضوان:** بەهەشتەوان، رەزەوان؛ **سەقەر:** جەهەندەم؛ **غەیب:** نادیار.

**پوختەی مانا:**
ناڵەو گاڵەی خەمبارانەی ئەویندااران، هێند لە ئەندازە دەرچوە؛ ئەو بەهەشتی خودایەشی ـ کە

روی **یاره** ـ داگرتوه. بەڵام ناڵین بۆئێمەی دڵداری بێبەش، سزای نیەو ئاساییە. چونکە ئێمە دلمان وەك جەهەندەم گەرمەو خەڵکی جەهەندەمیش لەولا ناڵەیانەو دەنگیان دەگاتە ناو بەهەشتو هاوار دەکەن کە ئێوە فریامان کەون.

**١٠ صوتن لمن جەرگو هەناڤ وەردێن دهور گرتی خوناڤ**
**زولف هاتە سەر لێ کربلاڤ بایێ نەسیم وەقتێ سەحەر**

**١١ ترسم موخالیف بادەتێ زولفێن ددۆرا جەبهەتێ**
**راکت قیاما ساعەتی عالەم ببت زیرو زەبەر**

**١٢ ظاهیر دبێژم پەندگیر دادل نەدی زولفا حەریر**
**شوبهی «مەلێ» مێنی ئەسیر گوهدێرە قەولی موعتەبەر**

**مانای وشە:**

**وەرد:** گوڵ؛ **هور:** ورد؛ **موخالیف:** پێچەوانە؛ **جەبهەت:** توێڵ؛ **زیرو زەبەر:** ژێرو ژور؛ **راکەت:** هەستێنێ، پەیداکات؛ **قیام:** هەستان؛ **ساعەت:** رۆژی قیامەت؛ **پەند:** ئامۆژگاری؛ **گیر:** بگرە؛ **قەول:** گفت؛ **موعتەبەر:** بەئیحتوبار.

**پوختەی مانا:**

گوڵی روخساری ئەویارە، لە بەیانا وردە شەونمی لەسەربو. کەزیەکانی بەسەردا هاتو بای بەیان، لەسەر روخسار پەخشی‌کردن. سەیری گوڵانم لەدەس چو، لە تاوانا جەرگو هەناوم سوزاون. زۆر دەترسم ئەو بای پێچەوانەی بەختە، کارێك بکا، زولفان لە دەوری هەنیەشی بهاڵێنیو قیامەت لە دنیا رابێنێو دنیایە ژێرو ژور بکاو ئیتر بۆ دڵداری هەژار، هیچ دەروی خۆشیان نەمێنێ.

کاکی رێبوار! من کە مەلام، دەبێ بە رواڵەت پێت بڵێم: دڵت مەدە بە کیژۆڵەی بسك ئاوریشمی دڵرفێن. با وەك من گیرۆدە نەبی. بەڵام ئەم ئامۆژگاریەی من لە دڵمەوە هەڵنەقوڵیوە. پەندی بەراستیم ئەوەیە، دڵ دەگرۆی جوان چاکێك نیو گیرۆدەبە؛ تا ئامادەی دڵداری یاری مەزن بیت.

# قصیدەی سی‌و نوهەم

## «مەستی ئەبەدی»

١ جانا ژجەمالاتە موقەددەس قەبەسم ئەز
گەر حورو پەری‌زادە نەظەرکی تەبەسم ئەز

**مانای وشە:**
**موقەددەس:** پیرۆز؛ **قەبەس:** بزوت؛ **نەظەر:** تماشا؛ **ئەز:** من.

**پوختەی مانا:**
گیانە من لەخۆمەوە هیچ‌نیم. من گڕێکم‌لە کوێ گڕی تووە هاتوم. من نەهۆریم دڵ دەیگـری، نە لەشوێن پەریان دەگەڕێم؛ من لە دنیاو قیامەتما تماشایەکی تۆم بەسە.

٢ میثلی مەهی نەو گەرتە دڤێتن مەبینی
مێزەبکە جامێ تو دبینی چکەسم ئەز

**پوختەی مانا:**
راستە من لە دڵداریدا، هێندە لاوازو بێ‌ڕەنگم کە وەك مانگی یەکشەوەم بەسـەر هاتوەو دەبێ زۆر ورد بۆم بڕوانن تادەم بینن. بەڵام تۆ ئەگەر بەنیازی من‌ببینی، بڕوانە پیاڵەی مەیەکت خـۆت ببینە، منیش هەرتۆم، مەڕوانە ڕەنگـی دنیاییم. منیش‌و تۆش هەر دانەوەی تیشکـی جـوانی خـوای مەزنین.

٣ یەغما ژمە جان‌کر کو تەجەللایی لدلدا
من روحی دقالب توی تەنها قەفەسم ئەز

**مانای وشه:**

**یەغما:** تاڵان؛ **تەجەللا:** ئاشکرابون؛ **قەفەس:** رکە.

**پوختەی مانا:**

یاری نازدار! هەرکە پرشنگی جوانی تۆ، خۆی بۆ دڵم ئاشکرا کرد؛ گیانە رواڵەتیەکەمی بەتاڵان برد. ئێستا تۆم گیانی شیرینیو من بومە قەفەسێك بۆتۆ.

٤ **حوببا تەیە من رادهەژینی کوبنالم**
**شەب تابسەحەر ناله ژرەنگێ جەرەسم ئەز**

**مانای وشە:**

**راهەژاندن:** راتەکاندن، راژاندن؛ **شەب:** شەو؛ **جەرەس:** زەنگوڵە.

**پوختەی مانا:**

وەك دەنگی زەنگ، بەهۆی دەستێك پەیدا دەبێ کە زەنگوڵە رادەژێنێ؛ ناڵەی منیش نە بە خۆمە. ئەوینی تۆ دەمخاتە سەر ناڵەکردن.

٥ **من‌گۆ مەهی نەو چاشیتی‌یی ئەبروی یاری**
**گۆ من چحەدە شوبهەتی نەعلی فەرەسم ئەز**

**مانای وشە:**

**چاشیتی:** چەشیت، چەشن، لەگوێن؛ **گۆ:** گوتی؛ **نەعل:** ناڵ؛ **فەرەس:** ئەسپە چنیرچمێ.

**پوختەی مانا:**

بەمانگی تازەهاتوم گوت: تۆ لە چەشنی برۆی یاری. گوتی: رامناکەوێ ئەو پەسنە. من وەك ناڵی ئەسپانم.

«نالی» دەڵێ:

بەسەروم وت کە راستو سەرکەش‌و بەرزی کەچی، لەرزی

کە فەرقیشم بگاتە ئاسمان بەندەی قەدی یارم

٦ **ساقی ژئەزەل یەکدو قەدەح بادە بەمن‌دا**
**حەتتا بئەبەد مەستو خومارو تەلەسم ئەز**

**مانای وشه:**

**ئەزەل:** رۆژی بناوان؛ **قەدەح:** پیاڵە؛ **ئەبەد:** بێبڕانەوە؛ **تەلەس:** شلو شەویقو خونەگر، مەستی کەلەلا.

**پوختەی مانا:**

هەر لەرۆژی بناواندا، مەیگێڕ دوپیاڵە مەیدامێ. تا هەتایە مەستو سەرخۆشو کەلەلا دەمێنمەوە. ئەغیار بونەوەم بۆ نییە.

**٧** جانا تویی من جان، گولی بێخار گەرەبێ
مینەت کو نەوەك بولبولی میحنەت عەبەثم ئەز

**مانای وشە:**

**خار:** دڕك؛ **مینەت:** سوپاس؛ **میحنەت:** مەینەت؛ **عەبەث:** بێهودە.

**پوختەی مانا:**

گیانە لەوساوە تۆم گیانی، وەك خێوی گوڵی بێ دڕکم. سوپاس بۆخوا، کە وەك بولبول بابەدەستو رەنجخەسار نیم. چونکە گوڵی یاری بولبول بە چقڵ دەوری دراوە.

**٨** صەد جەورو جەفا دی بمە ناچین ژدەرێ تە
یەکسەر تو نەباتیو لطەبعی مەگەسم ئەز

**مانای وشە:**

**نەبات:** شەکرێکە لەکوڵاندنی چەوەندەر بەدەست دێ؛ **مەگەس:** مێش.

**پوختەی مانا:**

صەد جارانیش جزیام دەیو بێئەمەگیم دەگەڵ بکەی؛ لە دەرگاکەت لاناکەوم. تۆ نەباتیو تەبیاتی، منیش وەك مێشە، لە شیرنایەتی دەگەڕێم.

«سەعدی» دەڵێ:

دڵ وەلا ناکەوێ هەر دێتە وەلات تا ماوە شانە هەنگوین! لە وزەی مێش نیە لات لێ‌لادا

«ناری» دەڵێ:

مێشی خاڵت نافڕێ بەس باوەشێنی کە بەناز چونکە پابەندە بە شەهدی رومەتی زیباتەوە

٩ گەروە تە دڤێتن ببری سەر بکە فەرمان
داقێ سەعەتێ سەر ببرم خوەش مقەسم ئەز

١٠ سەرتا بقەدەم ئەز بصوژم شوبهی «مەلا»یێ
پەروانە صیفەت صوهتمو بی صەوتو حیسم ئەز

**مانای وشە:**

**سەعەت:** دەم؛ **مقەس:** قەیچی؛ **صوژین:** سوتان؛ **حیس:** هەست؛ **صەوت:** دەنگ.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر دڵت وادەخوازێ هەر سەرم پێوە نەمێنێ؛ فەرمانت هەر بدە بەخۆم. لەسەر پەراندنی خۆمدا، وەك مقەستم؛ هەر دەستبەجێ دەیپەڕێنم. ئەوسا وەك مۆم ـ کە بۆ داگریساندن هەودای سەری دەقرتێنن ـ سەرتاپام بۆسوتان دەبێو دڵدارانیش بە دەردی پەپولە دەبەم. هەروەك خۆمی مەلا، لە چەشنی پەپولە سوتامو هیچ دەنگو هەستیشم نەبو.

## قصیدەی چلەمین

# «دڵ دەریایە»

١ طورم بدلو پەیرەوی موسایم ئەز
ئاتەش پەرسو نوری تەجەللایم ئەز

٢ باری ژ «وَعَلَّمْ» کو خەبەردار کرین
ئیرۆ توبزان ئادەمی ئەسمایم ئەز

**مانای وشە:**

باری: خودا؛ عَلَّمَ: فێری کرد؛ ئەسماء: ناوان؛ ئەسما: هەرە بەرز.

**پوختەی مانا:**

لەقورعانێدا هاتوە: خوا بەفرشتەکانی فەرمو: «من جێنشین لەسەر زەمین ناودێر دەکەم. گوتیان: ئاخر لەسەردنیا، کاری خراپ وەدی دێنیو خوێن دەرژێنێ. ئێمەش پەسندی تۆ دەدەینو بەپیرۆزی تۆ هەڵدەڵێین... فەرموی ئەوی من دەیزانم، ئێوە سەرتان لێدەرناچێ.» خوا ناوی هەموشتێکی فێری ئادەم کرد. لەپاشان لەبەر فرشتانی راناو فەرموی: «ئەگەر لاتان وایە راستن، ناوی ئەمشتانە بڵێن. گوتیان خوایە، پاکی هەر بۆتۆ رەوایە. هەرچی بۆخۆت فێرمان نەکەی، لێی نازانین. زاناو هەمەکارە خۆتی. فەرموی: ئادەم! ناوی ئەوانەیان پێبڵێ. کاتێ ئادەم ناوەکانی لەلای فرشتەکان درکاند؛ خودا فەرموی: نەموت پێتان، من نادیاری عاسمانانو سەرزەویشم ئاگا لێیەو دەیانزانمو هەرچی ئاشکرایکەنو هەرچی گومو نهێنیتانە دەیزانم؟»

مەلا دەڵێ: لەشوێن موسام، کە لەگەڵ خوا گفتوگۆ کەمو بیدینم. لەلایەکیش وەك چیای تور، نوری خوا خۆی نیشانداوم. وەك موسا، بەرەو ئاگر چومو بۆتاوێك ئاگرپەرست بوم کەچی هەرخۆم نوری خودام. لەوساوە کە خوای بانیسەر، هەمو ناوی فێری بابەدەم کردوە؛ من ئەمرۆ

ئەشیٚبزانی کە جیٚبەرزتر ئادەمیم.

**٣ ئینشائی علومی لەدونی چونکە مەزانی**
**زانی بحەقیقەت کوچئینشایم ئەز**

**مانای وشە:**

**ئینشاء:** ایجاد؛ **علومی لەدونی:** زانستە تایبەتەکانی خودا.

**پوختەی مانا:**

چونکە خودا لە زانستیە تایبەتەکانی ـ کە هەر نزیکانی خۆی لیٚ شارەزا دەکا ـ تیٚگەیاندم؛ ئەوسا لەراستیدا، بەخۆم زانی کەمن چلۆن ئیجادیٚکم.

**٤ حەرفیٚن رەقەمی لەوحی وجودا مەبخوان**
**داقەنج بزانی کو چئیملایم ئەز**

**مانای وشە:**

**رەقەم:** ژمارە؛ **لەوح:** تەتەڵە؛ **ئیملا:** نوسینەوەی گوتراو.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر تۆ بەو پایە بگەی کە بتوانی لەسەر تەتەڵەی فەرمانی دیٚرینەی خودا، ژمارەو ناوان وەخویٚنی؛ ئەوسا باش بۆت دەردەکەویٚ کە من چۆن لەروی سیایی نزیکانی خودای گەورە، نوسراومەوە.

**٥ ظاهیر توپەریشانییی حالیمە نەبین**
**مەجموع دذاتیٚ خوەو طوغرایم ئەز**

**مانای وشە:**

**ظاهیر:** رواڵەت؛ **پەریشانی:** بڵاوی‌و پەشیٚوی؛ **نەبین:** مەڕوانە؛ **مەجموع:** کۆ؛ **طوغرا:** مۆری بەقیچەڵفیچی پادشایان لەسەر سکەو فەرمان.

**پوختەی مانا:**

نابیٚ تۆ لەوە بڕوانی کە بەرواڵەت، پەریٚشان‌و حاڵپەشیٚوم. لەراستیدا، من‌وەك مۆری پادشایان، هەرچەند بەدیمەن تیٚكهاڵاوو وشەکانی لیٚك بڵاون، بەڵام جوان‌و پڕلەمانان؛ منیش هەروام.

«حەریق» لەباسی شێخی خۆیدا دەڵێ:

**هەم حاضرو هەم غایبو هم جەمعو پەرێشان**
**ئەم جەمعە نەقیضەینە لەتۆ بوبە ریوایەت**

«حافظ» دەڵێ:

**لەمەیخانانِ گەدام ئەمما لەمەستیدا وەرە سەیرم**
**ستێرەم وان لەبەر دەستانو نازم پربەعاسمانە**

**٦ عالەم چِب ئیعرابو حروفو کەلیماتن**
**ئەو نوقطە دنەفسا خوەوو مەعنایم ئەز**

**مانای وشە:**

**ئیعراب:** سەرو ژێرو بۆر؛ **کەلیمات:** وشەگەل؛ **نوقطە:** خاڵ.

**پوختەی مانا:**

هەمو دنیا، بە سەرو بەرو ژورو ژێرو هەمو وشەو هەمو پیتێك ـ کە بونە ناو بۆ ئـافەریدانی خـودا ـ لە خاڵێکەوە دامەزران کە ئەویش بونی خـودایە. دەسـا من دەرچـوم لە پیتو سـەرو ژێران. من هەرخۆم، ئێستا بومەتە ئەو نوختەیەو مانای نوقطەش لەمندایە.

مەلا لێرەدا، وەکو زۆر لە صوفیەکانی مێژویی، وا تێکەڵ بەخودابوە؛ کە جیاوازی لەناو خـۆی، وەك ئافەریدێکو خودای سازدەری نەدیوە.

**٧ صەد نیلو فوراتْ تێنو دەرن قەلبی مەدا**
**پیْ ناحەسهین قولزمو دەریایم ئەز**

**مانای وشە:**

**نیل:** چەمی گەورەی میصر؛ **فورات:** روباری بەناوبانگی شَطُّالعَرَب؛ **تێنو دەرن:** دێنو دەرون.

**پوختەی مانا:**

صـەتان روبار بەپڕایی نیلو فـورات، لەزانسـتو بەهرەی خـوایی بەناو دڵما تێدەپەرن. من کە بۆخۆم بومە دەریا، هەست پیْ ناکەم.

**٨ توژ نوسخەیی تەوحید مەخون ئایەتی نەفییْ**
**بیْ ئالەتی ئیثبات کوالأیم ئەز**

**ماناى وشه:**

**نوسخه:** وەنوسراو؛ **تەوحيد:** بەتاك زانين؛ **نەفى:** دان‌پێدا نەهێنان؛ **ئـالەت:** ئـامراز؛ **ئيثبات:** وەراست گەڕاندن؛ **اَلّا:** بێجگە.

**پوختەى مانا:**

ئەى کەسێکى ئـەو نوسـراوە دەخـوێنيەوەو (لاالەالاالله)يە. و ماناى‌وايە هيچ شـت نيە کە بۆ پەرستن رەوابێ، جگە لەخوا. ناوى شـتو کەس زيادە. هەر بێجگـە لەخـوا هيچ مەڵێو ئـەو بێجگەيەش بزانە خۆم دەگرێتەوە.

شياوى باسە، زۆر لە صـوفيان، وەك «بايەزيدى بوسـتامى» و «محـى‌الدين ابن العـربى» و «هەللاج»و گەلێك وەك ئەوان، وەها تێکـەڵ بەخـودا دەبون، کە دەيانگـوت خـوا ئێمەيەو ئێمە خوداين‌و هەر يەکين‌و نەلێك جـوداين. هەللاج دەڵێ: من خـودام‌و خـوا لە باڵاپۆشـەکەمدا. محى‌الدين عەرەبى دەڵێ: هەرچەند پەسنى خودا ئەدەم پەسنى خۆمە...

٩ صەد نەقل‌و ريوايەت دمەيا صافى‌يە مويەك
ئيرۆ کو ژپيرێ خوە بفتوايم ئەز

**ماناى وشه:**

**نەقل:** راگوێزان؛ **ريوايەت:** گێڕانەوە؛ **فتوىٰ:** ئيجازەدان.

**پوختەى مانا:**

ئەوەى کە دەڵێن وانوسراوەو واگوتراوەو دەبێ وابکرێ‌و وانەکرێ، لەکن صوٚفى کە دەگەڵ خودا تيکەڵە؛ وەك مو وايە کە لەناو بادەى بێخلتە ديارى بدا. من هەرچـى دەيڵێم‌و دەيکـەم، بە فتواى پيرى دەستگير رێمدراوە.

١٠ پەيوەستە تو هەربانگى مەکى شوبهەتى نايێ
بێ‌يارو مەى‌و ساز مەگۆ نايم ئەز

**ماناکەى:**

کاوراى مەلاى زانستە رواڵەتيەکان! ئەگەر قـورگت وەك بلوێر بلورێتەوەو گازيم بکـەى کە بێم‌و ببمە پەيرەوت؛ بێبەهرەيە. من پێم گوتوى کەناچمە ناو کوڕێکـەوە، بادەو سـازو يارى بەنازى لێ نەبێت.

١١ هەرچی تەبڤێتن ژمە وەر جان بخوێتن
جانا بکە فەروار ڤەوەستایم ئەز

**مانای وشە:**

وەر: تەنانەت ئەگەر؛ فەروار: فەرمان؛ ڤەوەستان: هەڵوەستان.

**پوختەی مانا:**

یارە جوانە تاقـانەکەم، هەرچیەکم لێ داوا بکـەی، گیانیش دەگەڵ. بۆ فـەرمانت هەڵوەســتاوەو ئامادەم کە پێکی بێنم.

١٢ صەد شیش ددلدانە ژمیهری مە «مەلا»یێ
لەو هەر بفغان میثلی نەی‌و نایم ئەز

**پوختەی مانا:**

ئێمەی مەلا، دڵمان بەئاگری ئەوین دەبرژێنرێ. لە صەد لاوە لەشیشی مژۆڵ دراوە. کزەو چـزەو هەڵچزانم، وەك بلوێر دەنگ ئەداتەوەو هاواریەتی.

«ناری» دەڵێ:

روت وەکو ئاگر، موژەت وەك شیش‌و ئەبرۆت قیمەکێش
میروەحەت زولفـو کەبابت جەرگی پارەی ناری‌یە

# قصیدەی چل‌و یەکەم

# «عیشقی مەجازی»

١ عاشق ئەر جارەك ژبالا لێ بدەت بەرقا مەجاز (یان، موجاز)
دێ لنك صاحیبدلان حەتتا ئەبەدبت سەرفیراز

**مانای وشە:**

**بالا:** بەژن؛ **بالا:** بەرەو ژور؛ **بەرق:** بروسکە؛ **مەجاز:** نارەگەزی؛ **موجاز:** مەرەخەس کراو؛ **سەرفیراز:** سەربلند.

**پوختەی مانا:**

هەرکە جارێك بروسکەیەك لەدلداری، وەبەر دلی هەرکەس کەوێ؛ تاهەتایە، لەکۆڕی دڵڕوناکان‌دا رێگەدەدرێ‌و سەرفرازە.

٢ کەشفی ئەسراری صیفاتان بێ‌محەببەت نابتن
صورەتی ئەسما دڤێتن دابکین ژێ فەهمی‌راز

**مانای وشە:**

**کەشف:** پێزانین؛ **صورەت:** وێنەی دیاردی؛ **ئەسما:** ناوان؛ **فەهم:** تێ‌گەیشتن؛ **راز:** نهێنی.

**پوختەی مانا:**

هەتا گیانێك تامی ئەوینێ نەچێژێ؛ وزەی نابێ کە لە رازی نهێنی بارەگای خودا، هیچ بوێژێ‌و هیچ تێبگا. گەرەکە ئاکاری خوداو وێنەی رەوشت‌و صیفاتی، بێتە بەرچاوو دەربخرێ. ئەوسا دەکرێ بێژین خودامان ناسیوە. یەکێك لە صیفاتی خودا، خوشیکی‌یە.. پیاو هەتا رێز لە جوانی‌و

دڵراکێشانی جوانانی سەردنیا نەگرێ، چوزانێ جوانیەکەی خودا مانای چیە؟! خوا بۆ ناوی خۆی ناوە جوان؟ جارێ دەبێ لەو جوانانەی، کە بەر تیشکی جوانی خودا کەوتون، دڵ بۆ دڵداری رابێنێو ئامادەبێ تا لەجوانی خواش حاڵی‌بێ.

«جەلال‌الدین رومی» دەڵێ:

ئەو مەلایەی لە دڵداری بێ خەبەرە گاجوتێکە، مێزەرێ زلی لەسەرە

٣ **لامیعا حوسن‌و جەمالێ دی ژعیلمێ بێتە عەین**
**عیشق دا ژێ هلبتن کی‌دی حەقیقەت بێ مەجاز**

**مانای وشە:**

**لامیع:** بریقەدەر؛ **عەین:** خودی‌شت؛ **هلبتن:** هەڵ‌بێت.

**پوختەی مانا:**

پێویستە هەست بە بریقەی جوانی کردن، لەچاو راگویزرێو بێتە دڵو گیان بیچێژێو لێی تێ‌بگا. هەروا دیتنی دوراودورو پێ‌زانینی بەکارنایە. دڵداری جوانی دنیایی، کە ناونراوە: ئەوینی بەدەڵ (عیشقی مەجازی) وەك ئەو بەردەستیێە وایە کە ئاگری پێ هەڵ دەکەن. تا ئەو نەبێو پزیسکی لێ نەبێتەوە، بڵێسەی ئاگریش نیە.

٤ **حوسن‌و حوب بێ‌یەکدو نابن دی بکن شاهو گەدا**
**نور نادەت شوعلەیا مەحمود بی شەمعا ئەیاز**

**مانای وشە:**

**حوب:** خۆشەویستی؛ **مەحمود:** سوڵتان مەحمودی غەزنەوی کە دەڵێن دڵی خۆی داوە بە خوڵامێکی کە ناوی «ئەیاز» بوە.

**پوختەی مانا:**

تینی جوانی‌و خۆشەویستی، لێك جیاواز ناکرێنەوە. لە بازاری دڵداریدا، شاو گەدا، دێنە رێزی یەك. ئەوینی بەگڕیەی مەحمود، لە چوڵەچرای روی ئەیازی هەڵگیرساوەو لەو بارەگای ئەوینەدا، ئەیاز لە مەحمودی ئاغای بەرێزترە.

٥ **مەعنی‌یا عیشقێ دزانی ئایەتا حوسنێ بخون**
**داتو حەرفێن موجبەتێ یەك‌یەك ژهەڤ کی ئیمتیاز**

**پوختەی مانا:**

ئەگەر لەمانای ئەوینێ دەگەڕێی، دەبێ ئـایەتی جـوانی بزانیو بیشـیخوێنیو زۆری خـۆتێدا سەرراست کەی. تا بتوانی پیتەکانی خـۆشەویسـتی شـیکەیتەوەو پلەپلەی ئـەویندارییت بۆدەرکەوێ.

٦ کی خەبەردار بت ژعیشقێ کەی ژبەر وەستاگرت
گەرچی راه ئەز ذەرره ذەرره سینەسوزو جانگوداز

**مانای وشە:**

**وەستا:** وەستان، وچان؛ **راه:** رێگە؛ **ذەرره:** تۆسقالێ؛ **سوز:** سوتمان؛ **گوداز:** توانەوە.

**پوختەی مانا:**

کێ لەئەوین ئاگادار بێت، هەرگیز لەرێی دڵداریدا، وچانو پشـو نازانێ. بارێگـەشـی هەمو تۆزو تۆسقاڵێکی سینگسوتێنو گیانتاوێن بێت.

٧ عاشقان بێگاڤ لەوگالین ژدل تێن شوبهی رەعد
وان ژبالا لێدبارن وەك بروسکان رەمزو ناز

**مانای وشە:**

**بێگاڤ:** بێوەخت؛ **رەمزو ناز:** ئیشارەتو ناز.

**پوختەی مانا:**

دڵداران وەختو بێوەخت بۆیە وەكهەور دەناڵنو حاڵیان نیە، چونکە لە بەژنو باڵاوە تیری چاوان وەك لەدوی هەورەتریشقەی بەریژنە بۆیان دەبارێ.

٨ ئافەرین صەدئافەرین هەیمن ژوانرا ئافەرین
ئیژتیرێن دلبەران دایم ددل پەیکانو گاز

**مانای وشە:**

**پەیکان:** سەرەتیر؛ **گاز:** قەیچی، قرتێن.

**پوختەی مانا:**

هەرئەوانە هونەرمەندو دڵپەسندن، کە دڵیان بەگازی ئەوینێ قرتێنراوەو سەرەتیریان تێ چەقاوە.

صەد ئافەریم بۆ ئەوانەو ئافەرینم پێش‌کەش بەو دڵ بەئەوین گازانە.

٩ گوه دەئاوازی نەیێ وەقتی سەما تێن موغبەچە
فەهمی رازێ گەردکی چاوا دنالن چەنگو ساز

**مانای تێکڕا:**

وەرە صوفی، لەو کاتەدا کە بەزمە لەمەیخانەداو بەچکەگاور مەی‌دەگێڕن‌و بەدەم سەماوە سوز دەدەن؛ ئەگەر هیچ لەنهێنی ئەوین گەیەنرابی، دەزانی‌کە دەنگی چەنگو لێدانی بلوێرو سازان چیت پێ دەڵێن.

١٠ ئەو دلی من وەك کەبوتەر نابتن کەس لۆمەکەت
لەو دفێ توریێ وەدا کەفتی مەدین صەد شاهباز

**مانای وشە:**

کەفتی: کەوتو؛ شاهباز: بازی‌سپی؛ کەبوتەر: کۆتر؛ لەو: چونکە.

**پوختەی مانا:**

بۆکەس ناشێ سەرکۆنەی دڵی من بکا؛ کە چۆن کەوتۆتە تۆڕەوە. دڵم وەك کوترێکی بێهێز، لەتۆڕی ئەوینێك گیرە کە صەد شاباز لەو تۆڕەدا گیرۆدەن‌و کەوتونە پەلەقاژەوە.

١١ وەر دلۆ داچین تماشایا جوانانێن چەمەن
وی‌هلانی سەربنازو سایەبان دایێ نیاز

١٢ زولف‌و سونبول موشك‌بوی‌و بسك‌و سوسەن سۆرشیرین
سەرو بالا سەبزپوش‌و گل‌نیشان‌و غونچەباز

١٣ نیرگزێن قامەت زومەررەد سەرگران هاتن خەرام
چارنەطرافان برەف رەف لێ‌بمەش تێن سی‌و قاز

١٤ دل بکی‌دەم ئەز ژوان هەریەك بغەنجان دل‌دبن
دل روبایێن، جان فزایێن، دلبەرێن عاشق‌گوداز

### مانای وشەی ئەو چوار بەیتە:

**وەر:** وەرە؛ **دلۆ:** هەی‌دڵ؛ **چین:** بچین؛ **چەمەن:** مێرگ، چیمەن؛ **هلانی:** هەڵی‌هێناوە؛ **سورِ شیرین:** دڵکێش‌و رەزا شیرین؛ **باز:** ئاواڵە؛ **زومەررەد:** گەوهەرێکی سەوزە؛ **خەرام:** لەنجە؛ **رەفرەف:** پۆل‌پۆل؛ **غەنج:** ناز؛ **دل‌روبا:** دڵرفێن؛ **جان‌فزا:** گیان‌گەشێن؛ **گوداز:** توانەوە؛ **نیشان:** خاڵ.

### پوختەی مانا:

ئەی دڵ وەرە بچینە سەیری مێرگوڵان. تازەگوڵان سەریان بەناز هەڵێناوەو خۆیان وەبن سێبەر داوە. گوڵی سمڵ، بۆنی میسك‌و عەنبەر دەدەن. وەك بۆنی زولفی یارەکەم. سوێسنە لە رەزاسوکی‌داو لەبۆن‌و بەرامەی خۆش‌دا، وەك بسکی ئەو شۆخە دەچێ. داری سەوڵ سەوزە پۆشە. وەك بەژنی‌یار کە جلکی سەوز دەبەرکا. بەڵام ئەوەندەیان فەرقە، کە باڵای یار، خاڵی‌هەیە. وەك کلەسوبحانی دەچێ‌و خونچەی دەمی پشکوتوە، کە لە باڵای سەوڵا نیە. گوڵی نێرگز کە لاسکیان وەك زومەررەدە، لەسەوزایی. وەك چاوی مەستی یارەکەم بە سەرخۆشی‌و بە لەنجەو لار، خۆ دەنوێنن. لەهەرچوارلاوە، پۆل‌پۆلی قازو قورینگ، دێنە سەیرانی مێرگوڵان‌و لەناویاندا دێن‌و دەچن. هەرچی دەیبینم بەنازو دڵرفێنەو گیان گەشێنەو ئەویندار دەتوێنێتەوە؛ تێماوم کامیان پەسندکەم‌و خوی پی‌بگرم‌و بیکەمە خەمرەوێنی خۆم؟

**١٥** **عەقدی ئیحرامێ دەما دلبەر خویابێ فەرضی عەین**
**سەجدەیەك بەروان دوبرهان ناگرت جیهصەد نوماز**

### مانای وشە:

**عەقد:** بەستن؛ **ئیحرام:** کەوتنە ناو هەرەتی حەجەوە کە زۆرشت لەپیاو حەرامە؛ برە : برۆ؛ **فەرضی عەین:** هەرە پێویست؛ **نوماز:** نوێژ.

### پوختەی مانا:

مەلا کە پەسنی مێرگوڵان لە جەنگەی بەهارادەداو دڵخۆشی دڵ دەداتەوە کە پێکەوە برۆنە سەیری گوڵان‌و هۆگر بەهێندێکیان بگرێ؛ دڵی بیری‌دەخاتەوە کە ئەوینداری بەراستی، ناشێ بەجگە لە یارەکەی، دڵ‌بدا بەهیچ شتی‌تر. بۆیە دەڵێ:

خۆ بی‌بەش کردن لە زۆرشت لەکاتی زیارەتی کابەی پیرۆزو بەرزی دڵداران، وەك نوێژ لەسەر پیاو واجبەو سوژدە بردن بەرەو میحرابی برۆی یارێ هێندەبەجێ‌و جێ‌گەورەیە کە صەد نوێژی بەرەو میحرابی مزگەوتان، جێی ناگرن.

١٦ **عیدەوو میری‌مە ئیرۆ دەرگەهی لوطفێ ڤەکر**
**گۆ «مەلا» هنگی بخوازی دیێدەم بەس توبخواز**

**مانای وشە:**

**هنگی:** ئەوەندەی.

**پوختەی مانا:**

جێژنەیەو ئەو سەروەرەی من، ئەمرۆ دەرگای ئیلتیفات ولاواندنەوەی خستە سەرپشت. فەرموی مەلا! هەرچی نیازێکی تۆ هەتە، لێم بخوازە. تۆچیت ئاواتە، دەت دەمێ.

خوا لەقورعانا فەرمویە: «ئەگەر بەندەی من! لێت‌پرسن خودا چۆنە؛ من‌نزیکم بەدەنگ ئەو کەسەوە دەچم کە هانام دێنێتە بەرێ. دەبا هاوارم بکەنێو برۆای تەواویان بەمن بێ. شایەت شارەزای رێ‌بین.

## قصیدەی چلو دوهەم

# «کوژراوی چاو»

١ ژرەعنا نێرگزێن تەی‌مەستو خون‌ریز
زەمان بوعەهدی جەنگ ئەنگیزی چەنگیز

**مانای وشە:**

رەعنا: نەرم‌وشل؛ رەعنا: توندو بزۆز؛ رەعنا: جوان؛ عەهد: دەوران؛ جەنگ ئـەنگیز: شـەر هەڵایسێن؛ چەنگیز: خانە خوێن رێژە بەناوبانگەکەی مغول (لە ١١٦٢ تا ١٢٢٧ م) کە هەر لەچینەوە تا سـەرکەنارەی دەریای رەشی، خستە ژێرچۆکی خۆیەوە.

**پوختەی مانا:**

لەسۆنگەی نێرگزی مەسـتی دوچـاوی‌تۆ ـ کە خـوێنی هۆگران دەرژن ـ زەمانی بێ‌ئـەمانی خوێن‌رژانی دەوری چەنگیزمان وەبیر دێنێ... دەبێ کێ‌بێ، بەتیری چاوەکانت، نەنگوا بێت‌و دەبێ کێ‌بێ، کە لەم کوشتارە بێ‌ئامانە سەر دەرکا؟!

«حەریق» دەڵێ:

قرانی عاشقانە کەس‌نەما دەرچێت‌و سەر دەرکا
مەگەر بۆ موفلیسی وەک‌من کەبێ‌قران‌و پەناباتم

٢ تەجانێ من دڤێت ئەی جانی عالەم؟
ژمن بستین بلەعلێن خۆی شەکەر ریز

**مانای وشە:**

دڤێت: دەوێ؛ شەکەر ریز: شەکر هەڵرێژ.

**پوختەی مانا:**
تۆ کەگیانی هەمو ئافەریدەکانی؛ کەنگیٚ بەزمت بەمن‌دادیٚو بەو لیٚوە ئاڵی یاقیقیو شیرینە شـەکر پژانەت، فـەرمان دەدەی کە بەگیان دەبەرت مرم؟ دەتۆخـوا دڵم مەشکیٚنەو خـۆت دوایی بەژینم بیٚنە.

٣ دو عەنبەر بو لشمشادیٚ ب مەستی
ڤەبەستن لەو هەوابو عەنبەر ئامیز

**مانای وشە:**
ڤەبەستن: بەستنەوە؛ لەو: بۆیە؛ ئامیز: تیٚکەڵاو.

**پوختەی مانا:**
پرچەکانت لە دولاوە ـ کە هەمیشـە بۆنی خـۆشیان لیٚ بڵاوە ـ لە جـوانی بەژن‌و گەردنت مەسـتی شەشدانگ لە دەوری لاجانگ دەهەژان‌و بەم‌لاو بەولادا دەکەوتن. لەبەژنی راست‌و بیٚگریٚی وەك داری شمشاڵت بەستن چونکە مەسـتن. کەچـی هیٚشـتان راناوەسـتن‌و بزۆزن. کە رادەژیٚن بۆنی عەنبەر بڵاو دەبیٚ. بۆیە هەوا لە دەوری تۆ بەبۆنی خۆش هەڵازناوە.

٤ ژئاخا ئاستانیٚ مستەکی بین
لداغان دا ببینم خوەش صەبا تیز

**مانای وشە:**
ئاخ: خاك؛ ئاستان: سەردەرانە، بارەگا؛ تیز: بەپەلە؛ خوەش: ساغ.

**پوختەی مانا:**
ئەی سروەبا! زۆر داخ‌دارو بریندارم. تۆخوا کەدیٚی، لەریٚی خۆتا، لەخاکی بەر دەرگای یارم، مشتە خۆڵیٚکم بۆبیٚنە. دەرمانی دەردم هەر ئەوەو یەکاویەك هەمو برینم ساریٚژدەکاو بلۆقم دەپوچیٚنەوە.

٥ تنیٚ فەرهاد دزانت لەذەتیٚ عیشق
کووی جان دایە شیرینیٚ، نە پەرویز

**مانای وشە:**
لەذەت: خۆشی؛ پەرویز: نازناوی خوسرەوی پادشای ئیٚرانی میٚردی شیرینی بەناوبانگە.

**پوختەی مانا:**

حەزلێ کردویی خوسرەوم بۆشیرینێ، بەدلێ نیە. وەك پێویستە دەردی دڵی نەچێشتوە. تەنیا فەرهاد تامی ئەوینی چەشیوەو خۆشی دیوە؛ کە گیانی شیرینی خۆی دا بە شیرینە دڵبەندەکەی.

«سالم» دەڵێ:

بەئیمای دیدەیی مەعشوقە عاشق کێو لەبن دێنێ

لەلای سالم کەنندەی بێستون موژگانی شیرین بو

٦ تەبو تابی هەزار ئەشکەنجە دادل
ژشیرازی نیگاهی مەستی تەبریز

**مانای وشە:**

**تەب:** تا؛ **تاب:** یاو، هەڵچوٚقان؛ **ئەشکەنجە:** ئازار؛ **شیراز:** ناوی شارێکە؛ **شیرازە:** کەنارە؛ **شیرازە:** بەندی بنەکتێب؛ **تەبریز:** ناوی شارێکە؛ **تەبریز:** نوبەتێ ڕێژ، نوٚبەتێ پەڕێن؛ **نیگاە:** ڕوانین.

**پوختەی مانا:**

ڕوانینی چاوی مەستی یار کە دەرمانی گش‌دەردانەو بەسیلەی چاو، یاووتا چا دەکاتەوە ـ بۆمن پێچەوانەی هێنا. هەر کەتیلەی چاوی دامێ؛ هەزار ئازاری دابەدلێ. دڵم وەك نوٚبەتێ داران هەڵدەچوٚقێو هەڵدەبزوٚقێ.

٧ إلٰهی نێرگزا مەی مەستو نازك
ژدەستی خوارو بەدخواهان بپاریز

**مانای وشە:**

**إلٰهی:** ئەیخوایە؛ **خوار:** ناراست؛ **بەدخواە:** دڵپیس.

**پوختەی مانا:**

ئەی خودایە! ئەو یارەی من ـ کە وەك چڵەنێرگز شلكو تورتەو چاوی گرۆی لەنێرگسی مەست بردەوە ـ بیپارێزەو وامەکە خوارو بێفەڕان، بۆ چاوێنی تماشای کەن.

٨ کولێ تێت ئەو قەبایی ئاسمانی
لەطیفا شەنگو نازك وەك بەلازیز

**مانای وشە:**

**کولیْ دیْت:** چەندەی لیْدیْت؛ **قەبا:** کەوا؛ **ئاسمانی:** بەرەنگی عاسمان؛ **بەلازیز:** گەزیزە.

**پوختەی مانا:**

ئەی خودایە! ئەو کەوایە رەنگ عابیەی، چەندە جــوان لیْ دەوەشــیْتەوە. نەرمە، شــەنگــە، لەشــیناسکــەو هەروەك گوڵە گەزیزەی دەمەو بەهارە، کە ســەرەڕای دیمەنی جــوان، موژدەی نەمانی دەمی زستانی خەمانو هاتنی هەرەتی خۆشیو دیمەنی جوانی بەهاری بەپیْوەیە.

٩ سەوا شەك ریهتە دیسا عالەما دل
بجادویی دوچەشمی فیتنە ئەنگیز

**مانای وشە:**

**سەواش:** شەڕو هەرا؛ **ریهتە:** رژتیە؛ **عالەم:** جیهان؛ **فیتنە:** گومڕایی، ئاژاوە؛ **ئەنگیز:** هەڵایسیْن، هۆ.

**پوختەی مانا:**

ئەو چاوە سیحر بازانەی، کە دنیا لەسۆنگەی ئەوان، پڕلە ئاژاوەو هەرایە؛ ئەوا دیسا خۆیان نواندیو بەجیهانی رواڵەتیەوە نەوەستاون. دنیای دڵی خاوەن دڵانیشــیان تیْکــداو پڕیان کرد لە پشــیْویْنیو ریْگەی چارەیان لیْگوم‌کرد.

«نالی» دەڵیْ:

وەرە تا عالەمی قەلبت نیشان‌دەم  کەوا فەقری غینایەو مردنی‌ژین

١٠ «مەلا» جانی‌تە چاوان پەهلەوان کر
لتایی خەمری‌یان زولفا دل‌ئاویز

**مانای وشە:**

**پەهلەوان:** پاڵەوان، تەناف‌باز؛ **خەمری:** بسکوڵە؛ **دل‌ئاویز:** دڵ‌پیْوە هەڵاوەسراو؛ **ئاویزە:** هەڵاوەسین.

**پوختەی مانا:**

مەلای دڵدار! ســەرم لەکارت ســوڕماوە. تۆ لەلایەك، دڵت بەتای کەزیەکانی گیرۆدەیەو هەڵواســراوە، لەولاشــەوە، گیانت هەروەك هونەرمەندانی تەناف باز، لە ســەرتای بسکــوڵەکانی دیْنو دەچن. چۆن ناترسی؟

١١ ژحوسنا بیٚنیشان نادەی نیشانەك
«نیشانی» گەرژدل نەکراتە پەرهیز

**مانای وشە:**

**بیٚنیشان:** نادیار؛ **نیشانی:** نازناوی مەلایە لەشیعردا.

**پوختەی مانا:**

جوانی یارم وێنەی نیەو وەك هیچ جوانیەکیتر ناچیٚو کەمکەس هەیە ئەم جوانیە، بەچاو ببینیٚ. توٚش ئەی نیشانی بویٚژ! بوٚیە توانیوتە بیبینیو پەسنی بدەی، چونکە لەخوٚت لەگیانو دلٚ، دەستت بەرداو جگە لەیار، پاریٚزت لە هەمو شت کرد.

١٢ خەباثەت طەبعە ژەهلی سەگ سرشتە
یەقین ئەوکەر ژجانان لەو دکەت بیز

١٣ مەبین ئەو گەر بصورەت ئادەمینە
هەمی دارن ژئێگر ڕاکری ریز

**مانای وشە:**

**خەباثەت:** پیسی؛ **ژەهلی:** لە ئەهلی، لە رەگەزی؛ **جانان:** دلٚبەر؛ **بیز:** خوٚپاریٚزی، قیٚز؛ **صورەت:** شکلٚ، بیچم؛ **ئێگر:** ئاگر.

**پوختەی مانا:**

توٚ تادلٚ نەدەی بەیاریٚك، نابی بەپیاو. ئەوکەسانەی دەلٚیٚن دلٚداری خراپەو بەبیٚزەوە لیٚی دەڕوانن؛ وەك کەرانن هیچ تیٚناگەن. دەرونپیسن وەك سەگ بە گلاٚویان بزانە. توٚ مەڕوانە کە لەبیچما وەك مروٚنە. گشتیان داری قەلاٚشکەرین بوٚ سوتاندن ریٚز کراون.

# قصیدەی چل‌و سێهەم

## «شەو و ڕۆژ»

١ تودزانی بخودیٚ من توخەیالی شەبو روز
بخەیالا خوە مەدام من تو لبالی شەبو روز

**مانای وشە:**
مەدام: هەمیشە؛ بال: دڵ؛ لبال: لەکن؛ شەبو روز: شەوو ڕۆژ.

**پوختەی مانا:**
ئەی‌یار! سوێندەکەم بەخودا. واتا سوێندەکەم هەر بەخۆت. خۆت دەزانی کە شەوو ڕۆژ، هەر بیر لەتۆ دەکەمەوەو تۆ لە خەیاڵم دەرناچی. بەبیری خۆم، هەمیشە لەناو دڵمدای‌و شەوو ڕۆژ هەر لەلای خۆمی‌و لەدیدارت بێ‌بەش نابم.

٢ هەر بمیزان درەشێنی جەگەریٚ تیرو خەدەنگ
ژنەسەق صاعیقە مەژقەوسیٚ هیلالی شەبوروز

**مانای وشە:**
درەشێنی: دەپرژێنی؛ نەسەق: تەرتیبو تەکوزی؛ صاعیقە: بروسکە؛ قەوس: کەوان؛ هیلالی: لەبیچمی مانگی یەکشەوە.

**پوختەی مانا:**
خوا فەرمویە: «هەمو شتێك لەخوداوە ئەندازەی بۆ داندراوەو بەتەکوزی‌و ڕێك‌وپێکی، دێتە بەرهەم.)

مەلا دەڵێ: ئەگەر بروسکە لەهەورەو ئەگەر تیر لە کەوان رادیێو ئەگەر نیوە جەعزو کەی مانگ، بۆ وەختو کات ناسینەوەو بۆ روناکی دێتە بەرچاو؛ تۆ بەمیزان بەوپەڕی رێكوپێکیەوەو بێهەڵبواردن، بەبێ هیچجار هەڵەکردن، جەرگی منت وەبەر تیری بژانگ داوەو لەکەوانەی مانگیەکشەوەی برۆرا، ئەو تیرانەم دادەرژێنە سەر جگەری و شەوو رۆژیشیان بۆنیە.

٣ میثلی گوێین تەرەوان نال ژدلی میسکین تێن
ئەمنزانن توچرا هەروە دنالی شەبو روز

**مانای وشە:**

**گوێین:** باڵندێکە شەو هەتا رۆژ دەناڵێنیو بێدەنگ نابێو هەرلات وایە لەبەر خۆیەوە دەڵێ: نا. نا؛ **رەوان:** بەدویەك داهاتنی بێپسانەوە؛ **چرا:** بۆچی، لەبەرچی؛ **میسکین:** هەژار.

**پوختەی مانا:**

مەلا ئەی دڵداری هەژار! چیتە وەکو گوێین، هەر دەنگی ناڵەو ناناکەت لە دڵیبێچارە دەبیسرێ. ئەگەر گوێین هەرلەشەودا دەناڵێنێ، دڵیتۆ بەشەوو بەرۆژ ناڵەیەتیو پشونادا.

٤ تە بفەرِیادو فغانان بخوە بولبول کەرکر (یان، کرکر)
الله الله ژچدەردێ وەدکالی شەبو روز

**مانای وشە:**

**فەریادو فغان:** دادو هاوار؛ **کەڕ:** گوێکپ؛ **کڕ:** ماتو بێدەنگ؛ **کالین:** لەبەر دەرد هاوار کردن.

**پوختەی مانا:**

دەمانگوت بولبول لەخوێندن چەقەسرۆیەو بێدەنگ نابێ. بەڵام تۆی دڵ بریندار ی تیری بەژانی دڵداری، بەهاوارو گاڵەو ناڵەت کارێکت کرد، کە تەنانەت هەرخۆی بولبول وازی لەخوێندن هێناوەو کڕوماتو دوژ داماوەو لە بەرهاواری زۆری تۆ، گوێی کەڕبوە. کە شەوو رۆژ، نای بڕیەوە. دەبێ دەردت چەند گران بێ؟ هەرخودا بۆخۆی دەیزانێ، راستی سەیرە، راستی سەیرە.

٥ داکو دلبەر قەدەمێ لێ بنەهەد رەوشەن کەت
لەو توخونی وە ژچەهڤان ڤە دمالی شەبو روز

**مانای وشە:**

**قەدەم:** پێ؛ **بنەهەد:** دابنێ؛ **لەو:** بۆیە؛ **ڤەمالین:** ماڵینەوە.

**پوختەی مانا:**

تۆ شەوو رۆژ، هەر خەریکی خـوێن لەچـاوانت دەماڵی. بەخـەیاڵی کە جـارێكیار، بەلاتا بیۆو بتلاوێنیۆو پیێ لەسەر چاوانت دانیۆو ببێتە مایەی رۆشنیو سوٚمای چاوە کوێرەکانت. کە لەسـوێی دیدارێکی ئەو، تانەیان پەریوەتە سەر. جا ناشتەویێ یار پیێ لەخـوێن بنیۆو ئـەو لاقـە ناسـكو خاوێنەی خوێناوی بێت.

٦ تەتنی ذەوقو صەفا کر بـصەیین دلبری‌را
سەرنخون گاه شوبی‌نون گاه وەکو دالی شەبو روز

**مانای وشە:**

صە: سەگ؛ گاه: جار؛ شوب: وەکو؛ نون: ماسـی؛ نون: پیتی «ن»، لە ئـەلفـوبێتکەدا کە قـەدیم بەراوەژوی ئێستایان دەنوسی: دال: داڵاش؛ دال: پیتی «د» لە ئـەلفو بێتکـەدا؛ «ن» و «د»: دەبێتە، ند؛ ند: واتا هاوتاو هەواڵ.

**پوختەی مانا:**

مەلا! ئەگەر خۆشی لەژیانتدا دەس‌بکەویێ، هەر ئـەوسـایە کە دەگەلێ سـەگی بەر دەرگای یاری دڵبەر، کەوتبویە بەزمو کایە. جـارێك لاسـای ماسـی‌گرتوت دەکردەوەو خـوٚت وەك «نون» هەڵدەگێڕاوەو جارێك وەك دال باڵت ئەگرتو بەرەو ئەو سـەرنخـون دەهاتیە خـواریۆو ئـەویش پەلاماری ئەدایو بەوکایە دەگەلێ کردنەخۆت کردە هەواڵۆو هاوتای.

«نالی» دەڵیێ»:

هەر لەحظە دەڵێم من سەگی دەرگامو رەقیبیش دێتە سەرو چاوم کەمنیش سەگ‌مەگەسێکم
گرتویە سەگت چاکمو لای توٚمەوە دێنیێ یعنی وەرە نالی کەمنیش دادرەسێکم

٧ فتوەیا پیری «مەلا»یان تو بـایلهامی نەبی
ڤیمەییێ هەر وەدنوشی بـحەلالی شەبو روز

**مانای وشە:**

فتویٚ: ئیجازەدان؛ ایلهام: خستنەدڵەوە؛ نەبی: پێغـەمبەر؛ نەبی: کەسـی کە لە نادیار پیاو ئـاگادار دەکا، پێشکۆ؛ حەلال: رەوا؛ نوشین: وەخواردن.

**پوختەی مانا:**

مەلا چیتە دەت‌بینم بەشـەوو بەرۆژ بەبیێ وچـان مەی دەنۆشـیو لات رەوایە. ئـاخۆ لات‌وایە

نەخۆشی‌و بەفتوای شـــەرعی پێغـــەمبەر، کە مەی بۆ دەرمان حـــەڵاڵە دەخـــۆیتەوە؟ یان پیرە دەستگیرەکەت ڕێگەی داوی بخۆیەوە؟

## قصیدەی چلو چوارەم

# «ئاوێنەی دڵ»

١ شاهیدی جیلوەنوما قودسی‌یی فەیروزە لیباس
هەرچی رەنگی‌تە نیشان‌دەت تونیشانی خۆبناس

**مانای وشە:**
**شاهید:** دڵبەر؛ **جیلوە:** خۆ ئاشکرا کردن؛ **قودسی:** پیرۆز؛ **فەیروزە:** پیرۆزە.

**پوختەی مانا:**
پێغەمبەری خوا (ص) فەرمویە: (هەر کەسێکی خۆی نەناسێ، خواش ناناسێ).
مەلا دەڵێ: تۆ مەگەڕێو چاو مەگێڕە، کە دڵبەرت دەلیباسی رەنگ پیرۆزەو عاسمانی یان بەهەر رەنگێکی دیکە، خۆت‌نیشاندا؛ دەبێتە مایەی ناسینو شارەزاییت. تۆ هەرخۆت یەك لەو رەنگانەی، کە یارت خۆی پێ دەنوێنێ. کەوابو تۆ خۆت بناسە، ئەوسا کەیارت ناسیوە.

٢ حوسن بێ ئایینەیی عیشق تەجەللی نادت
عیشقی مەحمود دمەعنی نەمەکی حوسنی ئەیاس

**مانای وشە:**
**ئایینە:** نەینك؛ **مەحمود:** پەسند؛ **مەحمود:** مەبەست مەحمودی غەزنەوی؛ **نەم:** تەڕایی، نم؛ **نەمەك:** خوێ؛ **ئەیاس:** هەیاسی خاس، دڵبەری مەحمود غەزنەوی.

**پوختەی مانا:**
ئەگەر تۆ خۆت باش نەناسیو دڵت ئەوەندە پاك‌نەبێ لەئەوین، کە وەك ئاوێنە بنوێنیو بۆیار،

دەوێرا بڕوانی؛ هەرگیز چاوی دڵ و گیانت، بەجوانی دڵبەر ناکەوێ. ئاوێنەی دڵی دڵدارە، کە دڵبەری تیا دیارە. دڵ و دڵدارو دڵداریش، تنۆکێکن لەدەریای پڕلەشەپۆلی خۆ ئاشکراکردنی‌یار. ئەوینی پاك و پەسندی، سوڵتان مەحمودی غەزنەوی، شەیەك بو لە دەریای جوانی هەیاسی خاسی دڵبەری. (یان، چێژەی خۆشی دڵداریەکەی، ئەو دڵ بەهەیاس دانە بو کە خوی و تامێکی تێ گەڕێ.)

٣ هەرچی رەنگی‌تە بڤێتن خوە ببینی لله
نەظەرێ وەربدە کاسێ چخوش ئاییەنیە کاس

**مانای وشە:**

**لله**: بۆخوا؛ **نەظەر**: روانین؛ **کاس**: پیاڵە، کاسە.

**پوختەی مانا:**

دەغیلە بۆخوات پێ‌دەڵێم، کە دەتەوێ خۆت ببینی، داخۆ لەکام پلەدای و بەکام رەنگی. چاو لەولاو لەم‌لا مەگێڕە، بڕوانە پیاڵەی پڕ لەمەی، ئەوینی پاك و بێ‌خەوشت. بڕوانە خۆت، کە خۆشت وەکو ئاوێنە، وێنەی یارت تێدا دیارەو ئەوسا تێ‌دەگەی چرەنگی و سەنگت لە بارەگای یاردا چەندە. ئەی‌نامە خوا پیاڵە چۆن ئاوێنەیەکی وێنەدەرە!!

٤ توشەرابێ بغەرابێ بنەهەنگان دەدەمی
دێ کیفایەت بەچرەنگێ مەبکت کوزەوو طاس

**مانای وشە:**

**غەراب**: جۆرێ کەشتی بارکێش؛ **غەراب**: مەشکە؛ **غەراب**: دۆڵچەی گەورە؛ **غەراب**: پیاڵەی زێوینی مەیخۆران، غەررابە؛ **قەررابە**: کوپەی گەورە؛ **کوزە**: گۆزە، جەررە؛ **تاس**: زمرك.

**پوختەی مانا:**

مەی‌گێڕ! تۆ ئێمە ناناسی. ئێمە لەدەریای ئەوین‌دا، بوینە نەهەنگ، بە زمرك و پیاڵەی چکۆلە. سەرخۆش نابین. تینوایەتیشمان ناشکێنێ؛ ئەشێ بادە بۆ نەهەنگان بکرێتە ناو گەمیەی باری. ئەوسا بەنیازبی مەستبیین و بەنیاز بگەین.

بوێژێکی فارس دەڵێ:

تینوایەتیم بەتاس و زمرك چاری ناکرێ  مەیگێڕ بەگۆزە بادە بڕێژە بەقورگما

**٥ ڕەمزو ڕازێن نەی‌و نایێ کوسەماعینە هەمی**
**ژمحالاتە بعەقلێ خوە بزانی ژقیاس**

**مانای وشە:**

**ڕەمز:** ئیشارە؛ **سەماع:** بیستن؛ **محال:** نامومکین، نەشیاو؛ **قیاس:** بەراورد کردن.

قیاس لەزانستی مەنطق‌دا، مەبەستێکە چەندلای جیاجیای هەیە. ئەگەر یەکێکیان سەلمێنرا؛ خوانەخواهی ئەوی‌تریش دەسەلمێنرێ. بۆنمونە، ئەگەر گوتمان: جیهان گۆڕانی بەسەر دێت. هەرچی گۆڕانی بەسەربێت، دیارە دروست کراوێکە. کەوابو ناچارین بێژین دنیا تازە پەیدابوەو هەر لە پێشورا وا نەبوە.

**پوختەی مانا:**

ئاوەز لەناسینی یاردا، بێچارەیەو بێکارەیە. ئەوی لەوبارە دەیبیسی، لەرێگەی گوێوە دێتە دلّ. بیستنی دەنگی بلوێرێ، چلۆنایی قامیشت بۆ دیاری ناکا. تۆ ناتوانی لەبیستنی بەڵگەی تاقانەیی یارت، یار وەك‌پێویستە، بناسی‌و بزانی بەراستی چۆنە. بەراورد کردن لێرەدا، لنگی شەلەو چاوی کوێرە. گەرەك واز لەبیستن بێنی‌و بۆخۆت ئەوەندە بکۆشی، تایار ڕوبەرو دەبینی. هەردوك پیاڵەی بیستن‌و بەراوەرد کردن، دەس بۆمەبە. بە دەفری گەورەی وەك گەمیە، بادەی یارناسین پێداکە.

**٦ وی‌دکەت مەغلەطە هەردەم لحەریفان بجەدەل**
**بدوجامان ڤەدخۆن سیرەت ئەبیەض وەسواس**

**مانای وشە:**

**مەغلەطە:** هەڵەکاری، بەهەڵە بردن؛ **حەریف:** هاوپیشەو هاودەم؛ **جەدەل:** دەم لەدەم نان، کێشەی بەدەم؛ **ڤەدخۆن:** دەخۆنەوە؛ **ئەبیەض:** سپی؛ **وەسواس:** دودڵی.

دەڵێن شەیتانێکی سپی، کاری دودڵی‌و گومانە کە بیخاتە ناو دڵی خاوەن باوەڕان.

**پوختەی مانا:**

ئەو کەسانەی گەرەکیانە کە بەمەنطیق‌و فەلسەفەو بەبیستن‌و بەراوردکردنی خۆیان، چۆنیەتی یارمان بۆدەرخەن‌و بەو دوپیاڵە گێژمان‌کەن‌و هۆشمان بەرن؛ وەك ئەو شەیتانە سپیەوان، کە توشی هەڵەی گومان‌و تەڵەی دودڵیمان دەکەن. بونی خودا، دەلیل‌و بەڵگەی پێ‌ناوێ‌و ئەوانەی لەوبارە دەدوێن، دەنگی بلوێریان بیستوەو بلوێرو بلوێرژەنیشیان هەر نەدیوەو ناشی بینن. لنگیان‌دارەو ناتوانن ئەم ڕێگە سەختەو دژوارە لەپێش بەرن.

# قصیدەی پەنجاو سێهەم

# «ئاگری رەوان»

١ بێ لەبی لەعل «مەلا» من ژمەیا ناب چحەظ؟
صوحبەتا تێ نەبتن یار بـهەرحال چحەظ!

**مانای وشە:**

**ناب:** بێخەوش؛ **حەظ:** بەش، بەهرە؛ **صوحبەت:** کۆڕی هەواڵان.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر ئەو لێوە ئاڵە، رەنگ لاڵەم لێدیار نەبێ؛ من چدڵخۆشیم بە مەی بێ؟ جا با ئەو بادەش، بێ خەوش‌و زۆر نایاببێ. ئەگەر یارم، لەکۆڕی یاران‌دا نەبێ؛ با ئەو کۆڕە بەهەشـتیش بێ، من هیچ خۆشی لێ نابینم.

«نالی» دەڵێ:

شەرابی لەعلی روممانی لەنالی　　　خەرامە بێمەزەی ماچێکی لێوان

«سەعدی» دەڵێ:

هێندەگێل نیم فێرنەبوبم چیحەرامە وچیحەڵاڵ　　　مەی لەگەڵ تۆدا حەڵاڵەو بێتۆ ئاوم لێحەرام

٢ قەدەحەك بادە بدەستێ خوە لقەلبیمە برێژ
عاشقی سوختە بێ ئاتەشی سەییال چحەظ؟

**مانای وشە:**

**سوختە:** سوتاو؛ **ئاتەش:** ئاگر؛ **سەییال:** رەوان، جاری.

**پوختەی مانا:**

گڕگرت لە ئەوینی تۆ دڵم هەمو بۆتە پشکۆ. لەو مەیە زۆر مەستی هێنەی کە وەك ئاگر. بەڵام ئاگرێکی ڕەوان، هەر پریشكو ئاورینگی لێ دەبێتەوە. پیاڵەیەك ئەگەر نەرێژیە ناو دڵ؟ کوڵوکۆم، دانامرکێتەوە.

٣ **نەکو وەك طەیر ژموژینیتە ببارن پەیکان (یان، ژرەمزێنتە)**
**ژبرینێن ددلی شوبهەتی غیربال چحەظ؟**

**مانای وشە:**

**طەیر:** باڵدار، وێشدەچێ نیازی تەرنەبابیلەبێ، کە لەشکری ئەبرەهەی پادشای یەمەنیان سەنگباران کرد؛ **تەیروك:** تەرزە؛ **موژینیتە:** مژۆڵانی تۆ؛ **رەمز:** ئیشارەت؛ **غیربال:** بێژنگ، قەڵبیر.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر لە مژۆڵەکانتەوە، بە فەرمانت، پەیکان وەك تەرزە نەبارن بۆ سەر دڵمو بە دەردی پەیژەوەکانی ئەبرەهەی یەمەنی نەبەنو هەمو ئازای وەك بێژنگی کونکون نەکەن؛ ئەودڵە بەهرەی چیهەیە؟

٤ **حەظظو لەذذەت مە بعومرێ خوە دعیشقاتە نەدی**
**هەم بڤان دەردو غەمان زێدە تو ئیسال چحەظ؟**

**مانای وشە:**

**حەظظ:** بەخت؛ **لەذذەت:** خۆشی؛ **ئیسال:** ئەمساڵ.

**پوختەی مانا:**

لە هەمو تەمەنی خۆمدا، لە ئەوینی باڵاکەی تۆ، هیچ بەختو خۆشیم هەر نەدیت. ڕۆژ دەگەڵ ڕۆژ، خەمو دەردم پتر دەبێ. دەبێ ئەمساڵ بەختی کڵۆڵ چیم بۆبکا؟!

«نالی» دەڵێ:

هەمو ڕۆژێ لەتاو هیجرانی ئەمساڵ     تەمەننای مردنی پێرارە بێتۆ

٥ **حوسنو سوڕ ذاتی نەبت، جەذبە لدل دەت مەحبوب**
**مە ژزولفو خەطو خالو قەدی مەییال چحەظ؟**

**مانای وشه:**

**ذاتی:** دەخوێیەتی خوّدا؛ **جەذبە:** راکێشان؛ **مەحبوب:** خوّشەویست؛ **مەییال:** بەلەرە.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر یار وەك بەرو جوانە، لە دەرونشیدا جوان نەبیّو بەدڵکێشی دڵمان بەرەو خوّی نەکێشیّ؛ تەنیا زولفو خەتو خاڵو بەژنی بەلەرەی زراوی، بەهرەی چی‌یە؟

٦ **عیلمی عیشقی بتو لاتان بریوایەت نابت**
**قەدەرەك حال کونەبت شبهەتی هەرقال چحەظ؟**

**مانای وشه:**

**لات:** ناوی‌بتێك‌بوەو لێرەدا هەر مانای بت دەگەیەنیّ؛ **ریوایەت:** گێڕانەوەی باس؛ **قەدەر:** ئەندازە؛ **حال:** زانستی دەرونی؛ **قال:** گفتی سەرزمانی.

**پوختەی مانا:**

دڵ دان بەبت، پەرستنی جوانان وەك‌بت، بە گێڕانەوەی سەرهاتی فڵانو فیسارە دڵدار، بەهرە نادا. گەرەك بە ئەندازەی وتار، لە دەرونو هەناویشدا، هەست بە ئەوینداری بکەیت. تا تیّبگەی حاڵی عاشق نەك هەر هێندە، کە توّ لە خەڵکت بیستوە.

٧ **بە دەوی پاك چکەت فەسحەتی مەیدان کونەبت**
**موستەمیع گوّ نەدرت موطریبو قەووال چحەظ؟**

**مانای وشه:**

**بەدەوی:** چوّڵپەرست، صەحرانشین؛ **پاك:** سوارچاکی هونەرمەندی بیّعەیب؛ **فەسحەت:** گوشادی؛ **موستەمیع:** بیسەر؛ **گوّنەدرت:** گویّدێر نەبیّ؛ **موطریب:** بەزمگێڕ؛ **قەووال:** زوّربێژ، خوّش‌بێژ؛ **قەووال:** بەو مەلا گچکە یەزیدیانە دەڵێن کە بە ماڵانەوە دەگەرێنو گوّرانی دینی دەڵێنو کریّی زەمانیان دەستێنن.

**پوختەی مانا:**

ئەسپی عەرەب زوّر کەحێلو نەجیمزادەن. سوارچاکی زوّر چالاکیشیان لەناو هەیە. مەیدانی ئەسپغاردانیّ ئەگەر نەبیّ؛ سوار چوّن هونەری خوّی دەرخا. با بەزمگێڕ، باقەووال، زوّریش بزانن. ئەگەر کەس گویّ یان لیّ نەگریّ، کام بەهرەو بەشیان پیّدەگا؟

٨ **دوڕی ناسوفتە دیێژم ژلەبی لەعل «مەلا»**
**گەر ڕەوان بەخش نەبت نەظم کەرولال چحەظ؟**

**مانای وشە:**

**دوڕ:** مرواری درشت؛ **سوفتە:** سواو، سماو، **نەظم:** هۆنراو.

**پوختەی مانا:**

مەلا! شیعرت دەربارەی لێوی ئاڵی یار، وەك مرواری سەرمۆڕو دەست لێنەدراوە. بەڵام ئەگەر هۆنراوەکەت گیانی بیسەر نەبزوێنێو گیان وەبەر وشکەسوفیانی دورە دڵداری نەهێنێ؛ قسەبو کەڕو لاڵ دەکەی کە هیچ بەهرە ناگەیەنێ.

شاعیرێكنایناسم دەڵێ:

خەڵکی هەمو کەڕن، منی خەو دیتە بێزوان     توانام نیە بڵێم وبڵێم. نایبیەن ئەوان

# قصیدەی پەنجاو چوارەم

## «موبتەلای زولف»

١ سەرددت ئاوی کەوثەری   زەمزەمەو سەمای زولف (یان، زلف)
سایەنومایی خاوەری  سیدرەیی مونتەهای زولف

**مانای وشە:**
**سەرددت:** سەر دەگەیەنێتە؛ **کەوثەر:** چاوە کانیەکە لە بەهەشت؛ **زەمزەم:** ئاوێکی پیرۆزە لە مەککە؛ **زەمزەمە:** دەنگی سەبرو ویرەویر؛ **سیدر:** داری کنار؛ **سیدرةُالمُنتَهی:** دارکناری ئەوپەر، دارکنارێك لەلای راستی عەرشی خوداوەیە. **سەما:** عاسمان؛ **سەما:** هەڵپەرکێ؛ **سایە:** سێبەر؛ **خاوەر:** خۆرهەڵات؛ **زولف:** نزیکی؛ **زولف:** پێشکەوتن؛ **زولف:** قەدرو حورمەت؛ **زولف:** بەشێك لەشەوی لایەبیان؛ **زیلف:** باغچە.

**پوختەی وتار:**
بەژنی یارم وەك دارەکنارەکەی دەستە راستی عەرشی خوایەو هەمو بەرزایی دنیایەی بەزاندوە. لكوپۆپی، کە بریەتین لە پۆرو کەزیو بسکانی، کە بەدەم بای بسکانەوە، سەما دەکەن؛ سێبەر لە رۆژهەڵات دەدەن. واتا: لەوجێ کە روخساری یار دەنوێنێو خۆیان نزیك دەکەنەوە، تا سەریان دەگاتە سەر لێوکە چاوەی ئاوی کەوسەرەو خورەو زەمزمەی کەوسەرێ لە خۆشیانا تانە دەزەمزەمێ دەگرێ. پرچی رەشی، نمونەیەك لە تاریکی نیوەشەوی لای بەیانە. روی وەکو باغچەی بەهەشتەو ئەوبسکەی بەسەماکردن لەو باغچەدا، دێتو دەچێ. خۆی زۆر بەقەدر دەزانێو لە هەرشت بەختەوەرترو لەپێشترە.

٢ سایەنومایی جەبهەتێ  نەقشو خەطی ژقودرەتێ
نوقطەو حەرفو جەزمەتێ  بالو پەرین هومای زولف

**مانای وشه:**

**جەبهـەت:** هەنیە؛ **نەقش:** نەخش؛ **حـەرف:** پیت؛ **جـەزمە:** زەنە؛ **هوما:** مەلی پیرۆزە کە دەڵێن سـێبەر لەهەر کەسێك بکا، دەبێتە خونکارو پاشا.

**پوختەی مانا:**

هەنیەو روخساری یاری‌من، بە دەستی قـودرەتی خـودا نەخشـێنراوەو خـەت دراوە. پڕە لەپیتی نورانی. نونی بەراوەژوی برۆی، صادی چـاوی، ئـەلفـی کەپۆی، میمی‌دەمی، لەم‌لا و لەولاش بە نوختەو زەنەی وردە خـاڵ، دەورە دراوە. بۆ ئـەوەی بەتینی تاوی، ئـەو تازە خـەت‌دراوانە، کاڵ‌نەبنەوە، بسکی ـ کەوەك شاباڵی پیرۆزە وایە ـ سێبەر لەو بەهەشتە دەکا.

٣ باڵو پەرێن صیفەت هوما  سایە لجەبهەتێ نوما
خەمری‌و لەف دچن سەما  یەك‌بیەك ئەو لبایی زولف

**مانای وشە:**

**خەمری:** پەرچوکە؛ **لەف:** پێچراو؛ **لبا:** لەکن، دەگەڵ.

**پوختەی مانا:**

پرچـەکانی بەتێك‌رایی، بڵاوی‌و بادراوی‌و بسکـی، وەك شـاباڵی پیرۆزی مەلی پیرۆزەن. کاتێ لەبەربا دەلەرن، سێبەر دەخەنە سەر توێڵی‌و لەخۆشی ئەو بەهەشتەیە دێنە سەما.

٤ نەترك‌و بەرگ‌و شەتری‌یان  رەقصە ژرەنگی خەمری‌یان
بازو عوقاب‌و قومری‌یان  سەیرە سەحەر تەبایی زولف

**مانای وشە:**

**نەترك:** مانگوڵەی بنی لەرزانە؛ **بەرگ:** پەرەنگی‌زێڕ وێنەی گەڵا؛ **شـەتری:** گوڵینگـەی سـەر؛ **عوقـاب:** هەڵۆ؛ **قومری:** یاکەریم؛ **تەبایی:** ئاشتی؛ **تەبا:** دەگەڵ؛ **ژرەنگ:** وەکو، لەچەشن.

**پوختەی مانا:**

کە سروەو شـنەی‌بای بەیان، لەو پرچو بسکـانە دەدا؛ وەرە سـەیری چلۆن بەزم‌و گۆوەندێکـە. هەروەك پەرچوکەو بسکانی ـ کە دەلەرێن ـ خشڵەکانی، بە گوڵینگەو مانگـوڵەو لەرزانەکانی‌و ئـەو زێڕانەی کە لە وێنەی بازو هەڵۆو قومری‌یانن؛ دەلەرنەوەو لە خۆشیانا سەما دەکەن.

٥ هەرمە ژبورجی سونبولە  پەنجە دسینەو و دلە
دورو درازو موشکیلە  قیصصەیی ماجەڕایی زولف

**ماناى وشه:**

**بورج:** کۆشك؛ **بورج:** مزگەی ئەستێرە لە عاسمان؛ **سونبولە:** گوڵی دەغڵ؛ **سونبولە:** شکڵی بورجێکە لەعاسمان، کە شەشەمین بورجی ساڵە؛ بە دیمەن چەند ئـەسـتێرەیێکـن بەتێکـڕایی وێنەی کیژ عازەوێك دەدەن. وەك فرشتە دوباڵیشی لێ ڕواوە. بە دەستێکی داوێنی بەلادا دەکا. زۆر لەزانای ئەستێرەناس ناویان ناوە «عەذرا» واتا کیژی شونەکردو؛ **دراز:** درێژ؛ **موشکیل:** دژوار؛ **قیصصە:** چیرۆك؛ **ماجەرا:** ڕوداو.

**پوختەی مانا:**

ئەوکیژە تازە عازەبەی لەو شانشینو کۆشکـەدا ـ کە لە عاسـمانی جـوانیدا، وێنەی بورجـی سونبولەیەو پرچەکانی وەك دوشاباڵی فریشتە لەسەر تا پایان گرتوە ـ داوێنی بەلادا دەکا وا دەزانم خەریکی کوشـتنی منە. زۆر دەترسـم وەك با بەدەم، دڵی بۆ گوڵە گەنمەکەی بەهەشـتیـخـوا بەهەڵەی برد؛ دڵە هەژارە کەی منیش، بۆ سەیری پرچی بادراوی، ڕکەی سینە هەڵتەکێنیو بێتە دەرێ. ئەوسا بەبێدڵ بکوژرێم. لەوترسـانە، من هەمیشـە، دەسـتم بەسـینەو دڵمەوەو دڵەتەپێم وێکەوتوە. چیرۆکی منو کەزیەی یارەوەك درێژی کەزیەکانیو تێكهاڵقانی تایەکانی پڕلەگرێو ئاڵۆزاوەو زۆر دژوارە باسکردنی.

شاعیرێك نایناسم دەڵێ:

لەگەڵەی بەختی ڕەشم ڕۆژی قیامەت چدەکا؟     لەشەوی پرچەکەتا گازنی دڵ دوایی نەهات

٦ بەستنە زولف دەر کەمین  حەلقە بحەلقە چین بچین
یەغمە دکن دلان نهین  تێنە یەقین خەطای زولف (یان، نینە...)

**ماناى وشه:**

**کەمین:** بۆسە؛ **یەغمە:** یەغما، تاڵان؛ **خەطا:** هەڵە؛ **خەطا:** وڵاتی خەتایە کە بەئاسکی میسك بەناوبانگە.

**پوختەی مانا:**

ناهەق نیە هەمیشە دەستم لەسەر دڵمبێ، لەترسانا. ئاڵقەئاڵقەو چین لەسـەرچین، کەزیەکانی بونە داو لەڕێگەی دڵانو دەیانگـرنو دەیانکـەنەماڵی تاڵان. لەهەمو لا بەداوەوە بۆسـە بۆدڵ داندراوە. ناشتوانین خەتای ئەوکارە، بخەینە سەر پرچەکانی. ئـەوان وەك ئـاسکی خـەتایە بارەمیسـك هەڵدەرێژن. دڵی هەژار چۆن بەو بۆنو بەرامە خۆشە، گێژ نەبنو نەچنو نەکەونە داوەوە.

«نالی» دەڵێ:

زولفت لەقەدتدا کە پەرێشانو بڵاوە     ئەمرۆ لەمنی شیفتە ئاڵۆزو بەداوە

٧ رومو عەجەم ژهەر طەرەف جەنگو سەوا شەوان بخەف
هیندیو زەنگی صەف بصەف هاتنە بەر لیوایی زولف

**مانای وشە:**

**سەواش:** شەروپێك هەڵپرژان؛ **زەنگی:** قولەرەشە؛ **لیوا:** ئاڵا.

**پوختەی مانا:**

لەهەردوك لا، ریزی پەرچوکەو بسکانی ـ کە بەدەم باوە دەلەرن ـ وەك لەشکـری رۆمو عەجـەم، تێك بەربنو پێك دابدەن. لەسەرو، توشـی‌یەك دەبن. وردەخـاڵە رەشـەکانی ـ کەدەڵێی رەشـی زەنگینو لەفلفلی هیندی دەچن ـ لەبن ئاڵای پرچەکاندا، پەناگرتەو خۆوەشارتون.

٨ هەردەمو هەرسەعەت ژنو پێتە دسینە نارودو
صەبرو قەراری من ژکو عاشقو موبتەلایی زولف

**مانای وشە:**

**پێت:** گرپەو بڵێسە؛ **نار:** ئاگر؛ **دو:** دوکەڵ؛ **موبتەلا:** گیرۆدە.

**پوختەی مانا:**

من واگیرۆدەو دڵداری پرچی یارم؛ وا لەتاوان، بێ وچـانو بێ‌ئـارامو بێ‌قـەرارم؛ کە هیچ ئـاگام لەخۆ نیە. ئـاگر بەربوتە هەناوم. وا سـوتاوم هەمیشـەو هەمودەم لەنوێ، گرو گرپەی دڵی ژارم، لەسینەوە دێتە دەرێو دوکەڵی هەناسەم بەرزە.

٩ زولفی سیاهی بێ‌وەفا قەط مەنەدی ژوی صەفا
کوشتمە ئەز بصەد جەفا ئاە ژدەست جەفای زولف

١٠ زورو فەقیرو موبتەلا زاهیدو صوفی‌یو مەلا
کوشتنە ئەو بصەد بەلا کەس نەکەفت بەلایی زولف

**مانای وشە:**

**وەفا:** ئەمەگ؛ **قەط:** هەرگیز؛ **صەفا:** خۆشیو ئاشتی؛ **جەفا:** ئازار؛ **زور:** زویر، وەڕەزو نارەحەت.

**پوختەی مانا:**

ئێمە هێندە بەو کەزیە ڕەشە هەڵدەڵێین؛ ئـەوەندە خـۆشمان گەرەکە. کەچـی ئـەو نامان لاوێنیۆ و صەد بەڵامان بەسەردێنیّ. هەرگیز خـۆشیمان لیّنەدیو هەر ئـازاری دڵمان دەدات. ئێمەی دڵدار، زویرو هەژار، کە بە هەزار، صـوفیو مەلاو تەرکەدنیامان تێدایە؛ بەو کەزیانەوە گیرۆدەینو کوشتەی ئەو کەزیە ڕەشانەین. ئاخ لەدەست ئازاری زولفی. داخ لەدەست بێ ئەمەگیەکەی.

## قصیدەی پەنجاو پێنجەم

# «فینجانا صەدەف»

۱ ئیرۆ ژشەهکاسا سورێ  مەی هاتە فینجانا صەدەف
میننەت کوئیرۆ دیم دورێ  دامن مەیا حوسنا خوەخەف

**مانای وشە:**

**شەهکاسە:** شاکاشی؛ **میننەت:** سوپاس؛ **دیم‌دورْ:** رومرواری.

**پوختەی مانا:**

زۆر لەخودا منەت‌بارم. کە یارە رومرواری یەکەم، لە بادەی دڵگری‌و جوانی ـ کە خودای گەورە پێی‌داوە ـ بەنهێنی بە شاکاشی کردە ناو صەدەفی دڵم. بەو بادەی دیداری یارە، لەمەیخورەوە مەستترم.

۲ خەف دامە جاما کەوثەری  شیرین قەدو لەب شەککەری
بایی صەبا دا چەنبەری  هاتن سەما شەتری‌و لەف

**مانای وشە:**

**چەنبەر:** ئاڵقە؛ **شەتری:** گوڵینگ؛ **لەف:** پێچراو.

**پوختەی مانا:**

بادەی دیدار ـ کەیار منی پێ سەرخۆش کرد ـ بادە نەبو؛ پیاڵێك لە ئاوی کەوثەری بەهەشتێ بو. کەلەو باڵا تەرزوجوان‌و لێو قەیتانەشەکرینانەوەپێم‌گەیشت. لەوکاتەدالەبەختی‌من،شنەئەنگوت، گوڵینگەی سەرومێزەری‌وبسکوڵەپێچدراوەکەی. کەوتنەسەماوبەدەم باوەئاڵقەیان‌داو رادەهەژان.

٣ شەتریو زولفو بەلگو پەر  هەمیان لدیم دەعوییو شەر
ئیلان لسەلویٚ بونەگەرٚ  عەقرەب خویان ئەز هەر طەرەف

٤ عەقرەب نهن ئەو سونبولن  بو عەنبەرن داڤا دلن
نیشان ژمیسکو فلفلن  وان سینەییٚ من کر هەدەف

**مانای وشە:**

**بەلگ:** گەڵا، خشڵی لە شکڵی گەڵادار؛ **پەر:** خشڵی لەگوێن گەڵاگوڵان؛ **ئیلان:** مار؛ **گەرٚ:** گەڕان.

**پوختەی مانا:**

ئۆخەی چەند دیمەنیٚ جوانم هاتە بەرچاو. گوڵینگو کەزیو پەرەنگی خشڵەکانی، تێکڕایی دەلەرینەوە. قەفقەف کەزیە رەشەکانی ـ وەكمار ـ لەو بەژنو باڵایە هاڵابونو دەبزوتنەوە. سەری بسکی هەڵقرتاوی هەڵگەراو بەرەو بەرەوژور، لاسای کلکە دوپشکانیان دەکردەوەو لە هەمولاوە دەبینران.

بەهەڵەچوم، دوپشکی چی؟ ئەو بسکانە، لەسونبولن؛ بۆن عەنبەرن؛ داوی دڵن. ناوو نیشانیان بپرسی، لە رەشیدا بەشی میسکو، لەتیژیدا، ئیسوٚتن کە ئەویش رەشە. ئەو هەموانە: کەزیو بسكو خشڵەکانی دڵیان کردبومە نیشانە.

٥ داسینە جوهتیٚ تیر خوەشە  قەوسی هیلالی توز رەشە
یەكتیر پورٚ کوشتن لەشە  خونیٚ دجەرحان دایە کەف

٦ منخون بجوٚ تێتن ژدل  ئەو بازییٚ بیٚ توٚرو سل
داکەفتە نیڤ توٚرا قزل  قومری نەهشتن رەفبرەف

٧ رەفرەف نهشتن زاغزاغ  دانین لدل من داغداغ
دیکی بمینت ساغساغ  وەستانە لەشکر صەف بصەف

**مانای وشە:**

**خوٚش:** تیژروٚ؛ **توزرەش:** رەشی بریقەدار؛ **جەرح:** برین؛ **کەف:** خەستاوی صابونو ئەسپوٚنو...؛ **کەف:** لەپی دەست؛ **سل:** سرکو قوشقی، سلٚ؛ **قزل:** سور؛ **رەف:** پوٚل؛ **زاغ:** قاڵاو؛ **داغ:** بەئاسنی گەرم چزاو؛ **داغ:** کێو.

**پوختەی مانا:**

لە کەوانەی مانگی یەکشەوەی بروٚیان، جوتە تیرێك زوٚر بەپرتاو، هاتنە سینەم. ئەوا دلٚ خوێن

دەدەلێنیٚو بە جـوٚگە لەبەری دەروا. ئـەگەر بوٚمن دوتیر هاتن؛ هەریەکێکیان هەزار کەسـی پیٚ کوژراوەو لەشی لەخوێندا گەوزاندون‌و کەفـی خـوێنی ئـەو دڵدارە کوژراوانە وا بە لەپی سـوری گەشی یارەوەیە. چـاوی یارم وەك ئـەو بازەن، کە نەتوڕٚ خـوٚی لەبەر دەگریٚ، نە لە سـرکی‌و سڵیانیشی بوٚ هیچ کەس دەستەموٚ دەبیٚ. دڵداری یار، لە هەمو توخم‌و توٚوێك بون. زوٚری وەك من، هەژاروٚکەی دڵ بریندارو خوێناوی. زوٚریش لەوانەی دنیایی، دەبنە دڵدارو،دڵیان لەراسـت ئـەوینی پاك، رەش‌و برشە. واتا هێندێکمان بەسـتەزمان، وەك قـومری توٚق لەگەرداندا‌و هاوارمان دەکرد یاکەریم. هێندێکیش وەك قەلە رەشە، دیدار شوم‌و دەم‌بەقـرەو گرانجـان بون. بازی چـاوی ئـەو یارە، بەڵەك چاوەمان، بەرلە هەرشت، ئێمەی گیروٚدەی توٚرەکەی ـ کە بەخـوێنی دڵمان سـوربو ـ پوٚل‌پوٚل کوشت‌و هەر تاقیشی لیٚ نەهێشتن. ئەوجار نوٚرەی راوکردنی قاڵاوان هات. قەل بەقەلی هەڵبژاردن‌و بەدەستی مەرگی ئـەسپاردن. بوٚکلوٚلیم، تەنیا هەرمنی هێشـتەوە؛ بەو دڵە بریندارەوەو بەو هەڵبواردن لەکوشتنە، داخی دڵم چـەند داخـی تری هاتە سـەرو داغ وەك کێو، بەسـەریەکدا هات. ئاخر ئـەگەر کلوٚلی‌و بەدبەختی نەبیٚ؛ کیٚ لەبەر ئـەو چاوە بازەو ئـەو هەمو تیری کەوانەی جوتە بروٚو مژوٚڵانەی، وەك من ساغی‌ساغ دەمێنیٚ؟! جگـە لەچـاوو بروٚیان، ئـاخر کەزیەکانیشـی هەن. کە هەتا با لیٚیان بدا، پێك دادێن‌و دڵدار دەبەرپیٚدا دەچـن. دەبروٚوانە هەر ئێسـتاکە رێزرێز بەرانبەر بەیەکتر راوێستاون...

**٨ صەف‌صەف مەدین هیندی‌یو زەنگ چەنگیز هات تەیموری لەنگ**
**خەفوان رەشاندن دل خەدەنگ تەشبیهی تیرێن خان شەرەف**

**مانای وشە:**

**چـەنگیز:** لەبەشـی زیٚدا باس‌کرا؛ **تەیموری لەنگ:** (٧٣٦-٨٠٧ کوٚچـی) بەرانبەربە (١٣٣٦- ١٤٠٥ میلادی) لەشاری کەش، لای سەمەرەقند هاتەدنیا. تەمەنی ٢٤ ساڵ‌بو، کە بە خـوێن‌رێژ ناوی دەرکرد. لە روسیا موسکوٚشی گرت. شـاری بەغدایەی وێران کرد (١٣٨٦ م) لە سـاڵی ١٤٠٢ ی میلادی سـوڵتان بایەزیدی دوهەمی عوثمانیانی بەدیل‌گرت لەکن (ئەنکارا). سەمەرقەند پایتەختی‌بو؛ **خان شـەرەف:** کوڕی خان‌ئەبدال، میری جزیری بوٚتانیٚ کە شەرەفخانی بدلیسـی لە سـالی ١٠٠٥ کوٚچـی زوٚر بە ئـازایی‌و خێرخوایی‌و ئیمانداری، بەو خان‌شەرەفە هەڵدەلیٚو چەند روپەڕیٚ لە شەرەفنامەکەی خوٚیدا، بوٚ خان‌شەرەف تەرخان دەکات. مەلای جزیری روٚژگاری ئەوخانە، لە جزیر ژیاوەو لە مزگەوتی دەسکـردی ئـەو، دەرسـی عیلمی گوتوٚتەوەو هەر لەو مزگەوتەش نێژراوە؛ **هیندی:** شیری دەسکاری هیند.

**پوختەی مانا:**

کەزیەکانی لەدولاوە، بەرانبەربەیەك وێستابون. لەوناوەدا، بروٚ دیاربون لە شـیری هیندی براتر. خاڵت دەدین زوٚر لە قوڵەزەنگی‌یان رەشتر. شنەبای بسکان هەڵیکرد. هەردوك لەشکری کەزیانی،

وەك لەشکری تەیمور لەنگو چەنگیزخانی بێڕوحمانە، گەینە یەکتر. تیر بۆ دڵیمن، دابارین. بەڵام زۆر تیری نادیاری. لەتیژیو کاریگەریدا، دەتگوت تیری خانشەرەفن کە بەدوژمنیەوە دەنێ.

٩ تیرەك ژقەوسێ مال زراف  تیدل قەوی تاڤێژە ناف
خون تیێوڕی تەشبیهی ئاڤ  فەریادو ئەفغان صەد ئەسەف

١٠ جان دی نەدت ئەو مالخەراب  هەرسینەیێ جوتەك غوڕاب
تێدابرن پەنجەو کولاب  وی جان ژدەست وی روح دکەف

**مانای وشە:**
**مال:** گوشادی ناو کەوان؛ **زراف:** باریك؛ **قەوی:** توند، بەهێز؛ **تاڤێژە:** دەهاوێژێ: **ئەسەف:** داخو حەیف؛ **کولاب:** قولاپ.

**پوختەی مانا:**
تیرێکی خانشەرفیانەی مژۆڵانی، لەماڵی کەوانی ناسکی برۆکانی، بە تەوژم، وە دڵم کەوتو لە ناوەراستەکەی چەقی. خوێن سەریکرد وەك ئاوی رەوان، رەوانبو.
ئەودڵەماڵوێرانەیمن، چەندبێبەختوچەندگیان سەختە؛ جگە لە تیژی مژۆڵیش، لە دولاوە بسکەکانی - کە وەك قاڵاون بەرەشی - پەنجەو قولاپیان لەسینەی سەردڵم گیرەو گیانم بەدڵ ئامادەیە خۆی بەدەست ئەو دوانەوە داو گیانی لەسەر دەست داناوە. ئامادەیەو بەتاسەیە کە بەقوربانی تیری کەن. بەڵام دڵم بەم هەمو برینەشەوەو بەو هەمو خوێن لەبەرچونەش؛ هەر واماوەو هەرگیان بەدەستەوە نادا.

١١ جانێ مەلێ روحا مەلێ  نورا ژقودرەت نوقطە لێ
رەمزەك نهین دامن وەلێ  نالی ژبەر وەك نایو دەف

**پوختەی مانا:**
گیانە راستینەکەی مەلا - کە ئەو گیانە ئامانەتیەش هەر لەورایە - نیشانێکی لە نوری توانایی بەرزی، بەنهێنی نیشانی گیانی مەلادا، کە تنۆکێكو نوختەیەك لە دەریاو پەراوی گەورەی خواناسی بو.
وا لەوساوە گیانی مەلا، وەك بلوێر دەستی بەناڵە کردوەو،وەکو دەفەی دەس دەروێشان، کەوتۆتە دڵەتەپێوەو هەر تەپە لە دڵیەوە دێت.

# قصیدەی پەنجاو شەشەم

## «تانە لەگوڵ»

**١** **نازکامن دسەمایێ بسەرئەنگوشتی عەقیق**
**دامە ئیرۆ دسەرایێ قەدەحەك تازە رەحیق**

**٢** **مە ژدەستو یەدی بەیضا قەدەحەك صافی ڤەخوار**
**(شعشانیِ کَنَجْمِ بسناهُ و بریق)**

**مانای وشە:**

**ئەنگوشت:** ئەنگوست، تلی؛ **سەرا:** کۆشكو سەرسەرا؛ **رەحیق:** مەی؛ **تازە:** لە نەوعی هەرە باش؛ **یەدی بەیضا:** دەستی سپی، (یەك لە موجزاتی موسا، دەستێك لەناو باخەڵنانو بەسپیەتی دەرهێنان بو)؛ **شعشعانی:** روحسوكو خۆشدیمەن؛ **شعشعان:** شەرابێك كە ئاوی تێكەڵ کرابێ؛ **نەجم:** گیا؛ **نەجم:** ئەستێرە؛ **سەنا:** رۆشنایی؛ **بەریق:** تروسكەدەر.

**پوختەی مانا:**

یارە ناسكو نازدارەکەم، ئەمرۆ لە کۆشکەکەی خۆیدا، لەکاتی سەماو هەڵپەرکێ، پیاڵەیەك بادەی زۆر توندو بێخڵتەو تڵتەی تێکردو بە سەرپەنجە سورەکانی ـ کە یاقیقیان بەزاندوە ـ و بەو دەستوپەنجە ناسکانەی وەك دەستی سپی موسایەو بە موجزات دەژمێردرێ؛ بەمنی بەخشی. خواردمەوە چۆن بادەیەكبو؟ رەوان، بێخڵتە، دیمەن جوان، لە ئەندازە دەگەڵ ئاوا تێکەڵکراو. لەروناکیو بریقەدا، وەکو ئەستێرە دەدەرەوشا.

**٣** **سیرری لەعلی لەبی جانبەخش نزانی تو ببەحث**
**(أعِدِالنَّظْرَةَ یاناظِرُ فالسرُّ دَقیقْ)**

**مانای وشه:**

**أعِذ:** دوپاتەی کەوە؛ **نظْرە:** روانین؛ **ناظر:** تماشاکار؛ **ناظر:** بەکێشەو دمەقاڵە؛ **دَقیقْ:** باریك، ورد.

**پوختەی مانا:**

کابرای بەدەم داتمەزراندوّتە قسەو باس، دەربارەی ئەو لێوە تەنکەی ـ کە گیان بەمردو دەبەخشێ ـ لێم رونە چی لیٚنازانی. دیسان تماشای کەرەوە، دیسان زۆر لێی وردبەرەوە. رازی تەنکایی لێوانیو نهێنی پچوکی زاری؛ لە وزەی باس لێوە کردنی سەرزارەکی زۆر بەدەرە.

«نالی» دەڵێ:

**بەحثی سیرری دەهەنی نوقطەبەنوقطە بگەڕێی    سەری موییٚ نیە بیٚنوکتە لەدیوانمدا**

٤ **بلەبی لەعلی شەکەرخەندە شکێنا شەکەرەك**
**(أنا بالْوعدِ لَواثِقْ فَلَهاالْوَعْدُ وَثیق)**

**مانای وشە:**

**وەعد:** پەیمان؛ **واثق:** بە باوەڕو خاترجەم؛ **فَلَها:** بۆ ئەو هەیە؛ **وثیق:** قایمو پتەو.

**پوختەی مانا:**

یار بەو لێوە تەنكو جوانەی ـ کە وەکو دەنکی لالْ ئاڵەو لەکاتی پێکەنینیدا، شەکری لەلێوان دەبارێ ـ ئەمرۆ شەکری بۆمن شکاندو بەڵێنی دیداری دامێ. دڵم خۆشە. چونکە دەیناسم. بەڵێنی ناشکێنیٚو لەپەیمان پێك هێنانیٚدا، زۆرپتەوە.

٥ **دریا دوری مورادیٚ مە سەریٚ دانیەریٚ**
**(خُضْتُ فیالْبَحْرِ وَلاَزَوْرَقَ والْبَحْرُ عَمیقْ)**

**مانای وشە:**

**خُضْتُ:** خۆم تیٚخست، چومەناو؛ **فیالْبَحْرِ:** لەدەریا؛ **وَلاَ:** نەیش؛ **زَوْرَق:** بەلەم؛ **عمیق:** قولْ.

**پوختەی مانا:**

هەڵوەدا بوم کە مرواری مرادان، وەدەس خۆم بخەم. سەرم لەو رێگەیە دانا. خۆم هاویشتە ناو دەریاوە. هیچ بەلەمیشم پیٚنەبو؛ دەریاش بەگێژو بیٚپەی بو.

٦ مه ژغەفلەت سەحەریٚ دیو دو رەمزان کوشتم
خوەش بحەققیٚ خوە گەهیشتم (اَنَا بِالْقَتلِ حَقیق)

**مانای وشە:**

**رەمز:** ئیشارەت؛ **خوەش:** زو؛ **اَنَا:** من؛ **قَتْل:** کوشتن؛ **حَقیق:** مستەحەق.

**پوختەی مانا:**

لە بەرەبەری بەیاندا، لەپر دەیار هەڵەنگوتم. بەدیتنی چـاوی، کوژرام. زوم توڵەی ئـەو دینە داوە؛ گۆڕی گیانمە، کوشتنم بوئەو رەوایە.

٧ قەط نەگوٚ قەتلە دکم بیٚگونەهو مەظلومە
(رَشَقتنی بِنبالٍ وَرَمتنی بِرَمیق)

**مانای وشە:**

**رشَقَتنی:** هاویشتیە من؛ **نِبال:** تیرگەل؛ **رَمَتْنی:** پیٚیەوە نام، بوٚی فریٚدام؛ **رمیق:** سوکە تماشا.

**پوختەی مانا:**

هیچ بەزەیی پیٚما نەهات. نەیگـوت بیٚسـوچو تاوانە، بوٚ بیکـوژم. بیٚ سـیٚو دو، بەر بارانی تیری دامو بەگوٚشەی چاو، سەیری کردم. تاگیان بوٚ دیتنیٚ چاوی لەقالبی لەش بیٚتە دەریٚ.

٨ تیرورم هەردو لدلدان لجەگەر چەسپان‌کر
ئەو ژخونا مەنەرشتی تلیٖین صوهری عەقیق

**مانای وشە:**

**چەسپان:** لکاو، پیٚوە نوساو؛ **تلی:** قامك؛ **صوهر:** سور.

**پوختەی مانا:**

بژوٚلی لەپیلوەکانی سەرو ژیٚرو ـ کە وەکو رمبو تیران وان ـ لە دڵدرانو جەرگیشـمیان پیٚوە درو. ئەو قامکە سورە ئاڵانەی لەخویٚنی ئیٚمە رشتوە. نازانم کیٚ لە شاعران گوتویە:

بەرگی گوڵە یان خویٚنی دڵە ناو لەپی مشتت     دەینی بە ملت عاشقی بیٚچارە کە کوشتت

٩ سوسنیٚن تەی تەرو نازك لگولان طەعنە ددن
(فَیِها الْعَنْبَرُ فائحٌ و بِهاالمِسكُ عَبیق)

**ماناى وشه:**

**ﭬيها:** بەو؛ **فائح:** بۆندەر؛ **عبيق:** بۆنبڵاوكەر.

**پوختەى مانا:**

بسكـەكانت كە بەسـوێسنەى تەڕوتازە دەشـبهێنرێن؛ تانە دەگوڵى تر دەگرن. چـونكە عەنبەر لەسايەى پرچەكانى تۆ، بۆنى هەيەو ميسكيش بەرامەى ئەوانى لەباخەڵدا.

١٠ **چبەكوشتن چبەهشتن توكو فەرمان بكرى**
**ئەز بحوكمىَ تە خوەشم (أحْمَدُ عَبدُ وَرَقيق)**

**ماناى وشه:**

**عەبد:** بەندە؛ **رەقيق:** بەندە، بەنى.

**پوختەى مانا:**

من هەرپێم خۆشە دەربارەى من فەرمان بدەى. ناوى منت بێتە سـەرلێو. ئيتر فـەرمان بەكوشـتن يان بەهێشتن‌بێ، فەرقى نيە. هەر دڵخۆشم. ئەحمەد خوڵامێكى تۆيەو بەندەى ئاڵقەبە گوێتانە.

«حافظ» دەڵێ:

وەدەر نرێمو سزاى زۆر درێم، گرژ نابم    گوناحو كفرە وەرمز بون لە شەرعى دڵداران

# قصیدەی پەنجاو حەوتەم

## "لەعلێن شەفەق"

**١** **مندی ژغەفلەت جام دکەف  شاهی نەجەف دل کر هەدەف**
**رۆژ هات شەرەف ستێر بونە خەف  هەر چارطەرەف نورا یەقەق**

**٢** **ظولمەت نەما صوحبەت وەما  نورا شەماڵان چو سەما**
**لێ ئەو دەما زولف بون جەما  هاتن سەمایێ یەك نەسەق**

**مانای وشە:**

**کەف:** لەپ؛ **شاهی نەجەف:** ئیمام عەلی؛ **هەدەف:** ئامانج؛ **شەرەف:** بڵندایی؛ **ستێر:** ئەستێرە؛ **خەف:** وەشارتو؛ **یەقەق:** زۆرسپی؛ **ظولمەت:** تاریکی؛ **صوحبەت:** گفتوگۆ؛ **صوحبەت:** کۆبونی دۆستانە؛ **شەماڵ:** مۆم؛ **لێ:** لەو؛ **جەما:** کۆمبو؛ **نەسەق:** رێكوپێکیو بە تەرتیب.

**پوختەی مانا:**

لەپڕ، چاوم بەیار کەوت. نیشانەی لەدڵ گرتبو. وەکو چۆن ئیمامی عەلی، بەنیازی شەڕی کافران، ئامادەی مەیدانێ دەبو؛ سەرەڕای چاوە مەستەکەی، ـ کە هەستی عالەمیان دەبرد ـ پیاڵەی بادەی لەدەستابو. لەوکاتەدا روی‌نیشاندا؛ نورێکی زۆر سپیو بەهێز، هەرچوار قورنەی دنیای داگرت. ئەستێرە خۆیان شاردەوە. خۆر هاتەدەر تا لەو سەرە، تماشای‌کا. تاریکی بەجارێك رەوی. تەنانەت گڕی سەرمۆمان، بۆ تماشای دیداری ئەو، هەڵکشان تا چونە عاسمان. لەودەمەدا کەزیەکان دەوری رویان‌داو لە خۆشیو جوانی دیمەنی، هەمو زۆر بە رێكو پێکی، دەستیان بەرەقصو سەماکرد.

**٣** **وەردان گولاڤ گرتن خوناڤ  لێ‌من دناڤ صوهتن هەناڤ**
**مندی بچاڤ زولفێن بلاڤ  لێ‌بونە داڤ بەندکر بناڤ**

٤ **نورا بەصەر گفتو خەبەر  قەندو شەکەر زولفان لسەر**
**خالێن دقەر بایێ سەحەر  دابێتەدەر صوبحا بحەق**

**ماناى وشە:**

**وەرد:** گوڵ؛ **خوناڤ:** ئاونگ؛ **تاڤ:** تیشکو تینی هەتاو؛ **داڤ:** داو؛ **بناڤ:** لەناوەندا؛ **بەصەر:** چاو؛ **قەر:** رەش؛ **صوبحا بحەق:** فەجرى صادق، بەیانى راست.

**پوختەى مانا:**

گوڵان بەدینى کوڵمەکەى ئاونگى گوڵاویان لێ‌نیشت. بەڵام من لەتاوو تینان، بەجارێك جەرگو هەناوم، بەتیشکى روخسارى سوتا. بەچاو دیتم؛ کەزیە پەرژو بڵاوەکەى، بونە داو لە دەورى گۆناى بۆ ڕاوى دڵى دڵداران‌و ئەو روخسارە جوانەیان، دەنێوان خۆگرت.
سروەى بەیان! تۆخوا وەرە. زولفان لەسەر وردە خاڵى رەش لابەرە. با ئەودەم‌و لێو شیرینەى گفت خۆشە ـ کە روناکى چاوانمانە ـ روى بۆ ئێمە هەڵبێتەوەو سۆمامان بێتەوە چاوان‌و بەختى رەشى سەرگەردانمان، لە تاریکى‌شەوى زولفان‌دا، توشى بەربەیان بێتەوەو بەیانى لاجانگ ببینێ.

٥ **مە ژبەهریان پورێ نالیان  شەڤ تاریان جەنگ بومیان (یان، مە ژبوهرى‌یان...)**
**وەر کوشتى‌یان ژوان بەنگى‌یان  بوان تلى‌یان خوەش کەگیان**

٦ **کر شەفقە میر ئانى مەبیر بەردان مەتیر کرمە ئەسیر**
**نەگها فەقیر زولفا حەریر  ئاڤیهتە شیر داپێ مەحەق**

**ماناى وشە:**

**بەهر:** روناکایى زۆر بەهێز؛ **بەهر:** تروسکەى بروسکە؛ **بوهر:** پشوبران؛ **وەر:** وەرە، سەیرکە؛ **تلى:** قامك، تبل؛ **ئەسیر:** دیل؛ **فەقیر:** هەژار؛ **حەریر:** ئاوریشم؛ **مەحەق:** لەناوبردن، مراندن، هیلاك.

**پوختەى مانا:**

لەو شەڕەدا ـ کە لەنێوان، ریزە پرچەکانى قەوماو لەسەر روپێلکدا هاتن‌و شەوى تاریك لەمە داهات ـ ئێمەى دڵدار، گشمان هەناسەمان سواربو. لەتاو کەوتین. کوژراوى تیرى مژۆڵان، لەو تاریکیەدا، گەل بەگەل، گیانیان سپارد. وەرە سەیرکە! کوژراوان،کەبێ تاوان، بەتیرى ینگى کوژراون‌و کوشتەى مژۆڵانى چاون. بۆ خوا شوکور، میرى جوانان ئێمەشى وەبیر هاتەوەو، چەند تیرێکى دەئێمەش گرت‌و یەخسیرى پرچى خۆى کردین. دەمانەویست دڵ‌و گیانمان بە هەوداى ئاوریشمى خاوى کەزیەکانى، هەڵاوەسرێن. بەڵام کوا! بۆ پیاوى هەژار، دەستى دڵ‌و دڵى گیانى، بە هەوداى بسکى یار بگات؟ چارى ناچار، هەر بەدینى برۆ شیر ئاساییەکانى، بەرقەڵت دراین، و

هەر نەماین. دەسا ئێستاش نەچوە بچێ یاری نازدار. تۆ ئەگەر قرانمان تێخەی؛ یەکی بازاری خۆت دەخەی. هەروەك مردنت بەدەستە، ژیانەوەش وا لەپەنجەتا. بەو قامکە باریکانەی خۆت، کەزیت لەسەر رو لابدە، تا هەمو کوژراوی دەردت، پێکەوە زیندو ببنەوە.

**٧ ای موشتەری دیمی زەری نەبر سەری نەی جان‌بەری**
**ئاڤیت سەری گاڤا بەری لازم هەری وی ئەڤ‌پەری**

**٨ کەلبی دەری نیشان بەری تیر ئاوری موژگین پەری (یان، ئاورێ)**
**بەحرو بەری عشق‌و سورێ ئاڤیهتەری سەرما قەلەق**

**مانای وشە:**

**موشتەری:** کڕیار، مەبەست دڵدارە؛ **دیم:** روخسار؛ **زەری:** سپی ئامالْ زەرد، سئوزە رەنگ؛ **نەبرسەری:** سەری خۆی دۆڕاند؛ **نەیجان‌بەری:** نەگیانی دەربرد؛ **ئاڤیت‌سەری:** سەری هاویشت؛ **گاڤابەری:** لەهەنگاوی هەوەڵ‌دا؛ **لازم هەری:** هەر لازمیە؛ **کەلبی دەری:** سەگی دەرگا؛ **نیشان بەری:** دروشمێك هەڵگرێ؛ **تیرئاوری:** تیری ئاگرینی؛ **تیرئاورێ:** تیری ئاوڕدانەوە؛ **موژگێن:** بژانگان؛ **ئاڤیهتەری:** هاویشتە رێگە؛ **قەلەق:** لە نارەحەتیان بەجوڵەو بزوتن.

**پوختەی مانا:**

ئەو دڵدارەی بە ئارەزوی دیتنی ئەو، دەمو چاوو روخسارە سەوزەڵەی سپی، ئامالْ بەزەردی بێگەردی دڵ تاڵان کەری دڵبەر بێ؛ گەرەك ئەوەندە بزانێ، کە لە رێگای دڵداری‌و بەیار گەیشتن، هەوەڵ هەنگاو دۆڕاندنی سەرو گیانەو، ئەشێ سەری لەم رێگەیەدا بروا. دەنا هەنگاوێکیش نارْوا. با بۆ نمونەی دڵداران، من ببینن؛ چونکە ئەو پەریزادە شۆخەی وا بەدڵکێشی‌و دڵبەری خۆی، دەریاو بەژی خستۆتە ژێرفەرمانەوە. سەگی دەویست کە پاسی ئەو هەمو سامانەی جوانی بکا. منی هەڵبژارد پاسداربم. سەگی پاس لە دەرکی هەرکەس، دەبێ داغی خاوەنی لە لەشی دیاربێ. ویستی بەتیری ئاورێ ـ کە ئاوری لە مژۆڵانی دەپریشکان ـ من داغبکا. خۆ ناشکرێ هێندە خۆی نزم‌کاتەوە، دەس لەمن‌دا. تیری ئاورینی هاویشتمێ. لەجیاتی داغ سەرم پەری‌و ئێستاش سەرم بە سەرسورمانەوە، لە بەر پێی داو لەسەر رێدا، هەڵدەبزوقێ‌و نارەحەتە کە نیشانەی داغی یاری، پێوە نیە تا بیکاتە شایەتی شەهید بونی خۆی‌و لەناو کوڕی کوژراوانی دڵداری‌دا، بەشانازی نیشانی دات.

نازانم کێ‌گوتویە:

رێرەوی ژیژ لەبیابانی ئەوین وشیار بە      سەربەبادان‌و نەمان مەرجی یەکەم هەنگاوە

٩ من‌دی دنەو بیٚیار تەو (نەو) سوندی (سوندم) ب‌ئەو بێم بیٚ دەرەو
من‌بو دەقوسی بوی ئەو شیڤان مەلەو نایی‌ٚمە خەو

١٠ هیٚستر رەوان تیٚن وەك جوان تیردان ئەوان رەش ئەبروان
دل وەك گوان بەرکا شوان سەر لوئلوان بەرگیٚن وەرەق

**مانای وشە:**

**دنەوبیٚ:** لەوەختی کیٚشكو شەو بیٚداری‌دا؛ **تەو:** تەواو؛ **نەو:** تازە؛ **بێم:** دەبیژم؛ **بیٚ دەرەو:** راستو بیٚدروٚ؛ **دەق‌وسی:** دەردەباریکە، سیل‌ودیق؛ **شیڤان:** شەوانە؛ **شیڤان:** شیٚواند؛ **لەو:** بوٚیە؛ **نایی‌مە خەو:** خەوی ئیٚمە نایە؛ **نایێمەخەو:** ناکەومە خەووەوە؛ **هیستر:** هسر، فرمیٚسك، ئەسرین؛ **جوان:** جوان، جوٚگەلان؛ **گوان:** گوٚگەلی شەقیٚن؛ **کاشو:** گوٚچانی گەمەی گوٚییٚن؛ **لوئلوان:** مراوری‌یان؛ **بەرگ:** پەرٚە؛ **وەرەق:** گەلاٚ.

**پوختەی مانا:**

لیٚم دەپرسن بوٚ هیٚندە زەردو لاوازو پەژارو کزو نزاری؟ خواردن‌و خەوت لیٚ حەرامەو هەمیشە دەگری‌و دەباری‌و گوٚنای زەردت، فرمیٚسکی پیٚدا دیٚنە خوار. راستو دەویٚ، راستی دەلیٚم‌و سوێند بەیار، دروٚ ناکەم. شەویٚك لەشەو بیٚداریمدا؛ کە گیان بەرەو بارەگای یار، پاسی دەداو دلم سەری لەژیٚر دەرانەی دەمالیٚ. بە ئاشکراو بەتەواوی، یاری خوٚم هاتە بەرچاوی‌و ئەو دیدارە بوٚمن نوی‌ٚبو. والەوساوە، بوٚ ئارەزوی دیداری یار، جاریٚکی‌تر، دەردە باریکەم گرتوە. جا هەرچی لەمنی کردوەو ژیانی منی شیٚواندوە، ئەو شەوە بو کە یارم خوٚی‌دا نیشانم. جا چوٚن من خەو ریٚگە دەدەم بیٚتە چاوم؟ چوٚن شەو دەنوم؟ هەر چاوەنوٚری دیداری دوبارەی ئەو یارەم دەبم. لەو سوی‌ٚیانە، ئەسرین لەچاوم رەوانە. وەك جوٚگەلان فرمیٚسکی رون لەسەر لاروٚمەتی زەردم، وەك مرواری لەسەر گەلاٚی وەریوی پاییزان، دەبیندریٚن.

شیاوی باسە، لەو نوسخانەی کەمن دیومن؛ ئەو شیعرە ئاوا نوسراوە:

| | |
|---|---|
| من‌دی دنو بی یاری تو | سندسە أوبیم بی درو |
| من بو دقوسی بوی أو | شیڤان مەلو ناییمە خو |
| هیستر روان تین وەك جوان | تیردان أوان رش ابروان |
| دل‌وك گوان برکا شوان | سر لوءلوٚان برگین ورق |

من بوٚ ئەوە شتیٚك لە شتیٚك حالیٚ ببم؛ دەستیٚکی کەمم تیٚداوە. بەلاٚم رەنگە خویٚندەوار باشتر بزانیٚ‌و سندس کە بە پارچیٚك دەلیٚن؛ لەو شیعرەدا، جیٚ بکاتەوەو باشتر مانای لیٚداتەوە ـ هەژار ـ

١١ بەژنا شەپال دیمی بخال ئیعراب‌و دال قەوسیٚ هیلال
نەقشیٚ جەلال جاما زەلال خەمرا حەلال صوحبەت بخال

**١٢** **ئەز طەلبەیا ئاوا حەیا  تی‌بوم تیا کەژ بادەیا**
**جاما خویا بو عیشوەیا  یار لەوٚ پەیا پەی تیٚن سەبەق**

**مانای وشە:**

**شەپال:** خونچیلەو دڵگرو ڕەزاشیرین؛ **ئیعراب:** دەربڕینی مەبەست؛ **ئیعراب:** بزاوی سەرپیتان؛ **دال:** شارەزایی کەر؛ **دال:** پیتی (د)؛ **جەلال:** شکوٚ؛ **جەلال:** ناوی خودا؛ **خەمر:** بادە؛ **صوحبەت:** گفتوگوٚ، هەواڵەتی؛ **حال:** ئیٚستا؛ **حال:** چلوٚنەتی باری دەرون؛ **طەلبە:** داخواز؛ **حەیا:** حەیات، ژیان؛ **تیا:** تیهـ ، سەرگەردان‌و ڕی‌ٚگوم کردو؛ **خویا:** ئاشکرا؛ **پەیاپەی:** بی‌ٚبڕانەوە؛ **سەبەق:** ملەکار لە کی‌ٚبەرکی‌ٚدا. **کەژ:** کە، لە.

**پوختەی مانا:**

**من هەڵوەدای ئاوی ژیان بوم. لەو ڕیٚگەدا، سەرگەردان بوم. تا خوای گەورە، ویٚنەی جوانی نەمری خوٚی، لەروی سەلمادا، نیشاندام. ئەم ویٚنەی جوانی خودایە، ئەی خودایە چوٚن نەخشاوە؟! بەژن تابڵیٚی ڕیٚك‌و پیٚك‌و ڕەزاشیرین‌و ئیٚسك‌سوك. وردەخاڵ لەسەر ڕوانی‌و کەوانەی مانگی یەکشەوەی بروٚکانی‌و بسکی وەکو دال شکاوی، وەك نوسراوی سەرو ژیٚرو بوٚرکراوبی؛ زوٚر هاسان لە دڵدارانیان حاڵی دەکرد، کە ئاشکرا نوری خوایەو لە ڕوخساری سەلمادایە.**

**ئەو دیدارە، وەك جامیٚکی پڕلەبادەی حەڵاڵی ڕوٚشن‌و زوڵاڵ؛ کە بەرهەمی عیشوەو نازی تی‌ٚکرابو، صەدقات لەبادەی ئاسایی بەهیٚزتربو. منی مەست‌کردو دەستم‌کرد بە گفتوگوٚ دەگەڵ یارم. بەڵام گفتوگوٚ نەبەدەم، بەدڵ، بەگیان، بە دەرونی پڕلە ئاگری دڵداری. دەمەقاڵەی تیٚدا نەبو؛ دەمە حاڵ‌بو. بوبە مایەی ژیان‌و مان‌و هەڵنەوەرین. هەر بوٚیەشە کە دەستەدەستە دڵداران، ملە دەکەن‌و لەغاران. بە ئارەزون وەك‌من بە ئارەزو بگەن. وەك‌من چیٚژەی بادەی دیداری یاربکەن.**

**١٣** **جانی «مەلیٚ» ژقالو بەلیٚ  بەندم وەلیٚ دەر کاکولیٚ**
**بەلگیٚن گولیٚ رو هەیکەلیٚ  ئەو میسکە لیٚ جارەك هەلیٚ**

**١٤** **پەردەو ستور دابیٚ قصور  بیٚتن ظوهور دیمیٚ بنور**
**نورا غەفور خالیٚن دهور  جاما طەهور لەعلیٚن شەفەق**

**مانای وشە:**

قالو بەلیٚ: گوتیان ئاریٚ، لەپیٚشدا باسمان لیٚوە کرد؛ **وەلیٚ:** بەڵام؛ **بەلگیٚن:** گەڵایانی؛ **هەیکەل:** وشەیەکی لەرەگەزدا یوٚنانی‌یە، واتا بەژن‌بڵند، بەلەنجەولار، بت‌و کوٚتەل؛ تمثال؛ جیٚگەی قوربانی موقەددەس لەکلیسا؛ **هلیٚ:** لادریٚ، لاکەویٚ: **ستور:** پەردەگەل؛ **قصور:** دریغ، کوٚتایی؛ **ظهور:** دیاردان؛ **غەفور:** ناوی خوایە بەمانا بەخشندەی گوناح؛ **طەهور:** خاویٚن کەرەوە (خوا فەرمویە:

بادەی طەهور دەرخواردی بەهەشتیان دەدریّ)؛ **شەفەق:** سورایی ئاسوّ ئیّواران.

**پوختەیٚ مانا:**

سەلما گیانە شـیرینەکەی مەلا! هەر لەو سـاوە خـوا گیانەکانی دروس‌کردو هیّشـتا دەناو رکەی رەشی لەشی خاکی نەکردبون؛ من گیروّدەم. بەڵام گیروّدەی کاکوڵت. گیروّدەی ئەو دیمەنەتم کە وەك بت دەپەرستریّو وەکو بتی زوّر جـیّ‌گەورە، جـوانکراوە. سـەری کوڵمەت، وەکو پەڕی سورەگوڵە. وردە خاڵت، وەك هەڵوەریّنراوی میسکـن. بەئـاوات لەخـوا دەخـوازم، پەردەو لەمپەر لەنیّوانمان‌دا نەمیّنیّ، روخساری گەش‌و روّشنت ـ کە نمونەی نوری خوایە ـ خـوّی بنویّنیّ. خـاڵە وردەکانی سـەرروت، لیّوەکانت ـ کە وەك پیاڵەی مەی‌و بادەی بەهەشـتی‌یەو رەنگـی ئـاڵی لاڵ ئاسایەو لەو بەرزە سورایی ئاسوّی عاسـمانی جـوانی و نازداریت دیّتە بەرچـاو ـ بەچـاوی دڵ، تیّربیینم.

**١٥** **یار هات‌و مەست، صوبحا ئەلەست  من دەست بدەست دی‌جام ددەست**
**کاکول دبەست تایەك ڤەرەست  ڤیّرا شکەست نیشانە قەست**

**١٦** **ئەو لەب شەکەر وا هاتە دەر  رابو ژبەر تاییّن دبەر**
**خالیّن دقەر زولف چونە سەر  ئەصلان سەحەر لیّ‌بون فەرەق**

**مانای وشە:**

**صوبحا ئەلەست:** بەرەبەیانی ئەو روّژەی خـودا گیانی دروسـت کردن؛ **دەسـت بەدەسـت:** روبەرو، لەنزیکەوە؛ **ڤەرەست:** دەرچو، دەرپەڕی؛ : **نیشان:** خالّ؛ **قـەسـت:** ئـامانج؛ **رابو:** هەسـتا؛ **بەر:** پیّش؛ **دبەر:** لەبەردا؛ **قەر:** رەش؛ **ئەصلان:** شیّر؛ **ئەصلان:** رەگەزان، بنەڕەتان؛ **فەرەق:** ترساو، بڵاو؛ **فەرەق:** پەیدابونی سپیایەتی بەرەبەیان.

**پوختەی مانا:**

لەروّژی هەرە بەریّوە، کەخوا گیانی دروست کردن؛ زوّر لەنزیك، توشی ئەوسـەلمایەی خـوّم‌بوم. پیاڵە بەدەست، هاتە دەریّ. بەلەنجەو لار، دەستی برد کاکوڵەکانی شانە بکاو تیّك‌پەڕیّنیّ، چەپکـە تاڵیّك لەو ناوە، جیا بونەوەو خوّیان گەیاندە خاڵی رەشی سەر روٚمەتی. ئەو لیّو شەکرینە شـیرینە، کە پەیدابو هەمو گیان، لەبەری هەستان؛ تەنانەت تاڵیّ بسکانی ـ کە دەوری خاڵانیان دابو ـ لەبەر ئەو نازدارە، هەستان‌و چونەوە سەر بنکەی خوّیان لەو سەرەدا. بەو تاڵ لەسەر خـاڵ‌لادانە، شـەو نەماو سپیّدە دەرچـو. (یان، کە زولفـەکانی هەڵاویّزنی چـاوی کە بەهەیبەت شـیّرن، بەو بەیانە مەستانە خوّیان وەدەر خست، شیّران لەترس‌و عەیبەتان، واترسان هەر زراویان چو.)

# قەصیدەی پەنجاو هەشتەم

## «یەک و یەک»

١ **دلبەرا من سەحەری هات بتوٚخو بیەدەك**
**صەد یەدەك بون دبەری تێك بسنجابو وشەك**

**ماناى وشە:**

**توٚخ:** جوقەی سەر لە توٚپەڵێكمو؛ **یەدەك:** سوخمە؛ **سنجاب:** جانەوەرێکە خزمی سموٚرە، کەوڵەکەی زوٚر بەنرخە؛ **وشەك:** وشەگ، جانەوەرێکە خزمی شێرو پشیلەو لەتایەفەی گوێ رەشانە. کەو ڵەکەی زوٚر بەقیمەتە.

**پوختەی مانا:**

یارەکەم بەری بەیان هات. کاکوٚڵی وەك جوقەی شایان، لەسەر دیاربو. سوخمەیەکی دەبەردابو بەصەتان سنجابو وشەگ، بەئاوات بون کەوڵیان لەو سوخمەدا بوایە.

٢ **یاربو چومە بواری بزیارەت کەفی پا**
**(قَالَ یاعاشِقُ هاتیكَ یَدی هاتِ یَدَكْ)**

**ماناى وشە:**

**بوار:** رێباز؛ **کەفیپا:** بەریپێ؛ **قال:** گوتی؛ **یاعاشِقُ:** ئەی دڵدار؛ **هاتیك:** ئەوەتانێ؛ **یَدی:** دەستم؛ **هاتِ:** بدە؛ **یَدَكْ:** دەستت.

**پوختەی مانا:**

خوٚم خستەسەر رێبازەکەی، کە ماچی بەری پای بکەم. فەرموی دڵدار دەستت بدە هەڵت هێنم‌هانێ دەستم، ماچی‌بکە.

٣ **دلوجان هەردو مەدانیٚ کو ئیجازەت ژمە خواست**
**(قُلتُ أَستَوْ دِعكَ اَلباری اَللهُ مَعَكْ)**

**مانای وشە:**

**قُلتُ:** گوتم؛ **أَستَودِعُكَ:** بە ئامانەتت ئەدەم؛ **باری:** خودا؛ **مَعَكَ:** دەگەڵتۆ.

**پوختەی مانا:**

یار کە رابرد، فەرموی بەئیجازەی تۆ ئەوا دەڕۆم. گوتم بەخودات دەسپێرم، خوات دەگەڵبێ.

٤ **تەدقیٚ صافو زەغەل ژیٚك قەدی تەجرەبەکە**
**داعیاریٚ بتەمامی بنومیٚتن تەمحەك**

**مانای وشە:**

**صاف:** پاكو بیٚخەوش؛ **زەغەل:** چروك؛ **ژیٚكقەدی:** لیٚكبکەیەوە؛ **عیار:** هەڵسەنگانو ناسین؛ **محەك:** ئامرازی کڕاندن؛ ئەو بەردەی چۆنیەتی زیٚڕی پیٚ دەردەخەن.

**پوختەی مانا:**

دەتەویٚ بیٚخەوشو چروك، لەیەکتری هەڵاویٚری. پاكو پیسان، تاقی کەوە. محەك دەزانیٚ زیٚڕ تەواوە، یان چەند مسی تیٚکراوە.

واتا ئەگەر لاتوایە دڵداری راستنیم، بمئەزمو تابوٚت دەرکەویٚ چەند پاكو ساغم بوٚئەوین.

٥ **دەوری زولفاتە موسەلسەل بنەظەر حەل کونەبت**
**نەظەری صافی دلی سەر ددرت نوقطەیی شەك**

**مانای وشە:**

**دەور:** دەورەدان، ساڵ، خەرمانەی مانگ؛ **دەور:** لەزاراوەی زانایانی عیلمی کەلامدا، دو مەبەست بەستە بەیەکن کە بیٚیەکتر یانناکریٚو ئاکام هەردەبیٚتەوە یەکو پیٚدابڕوٚ؛ **موسەلسەل:** بەزنجیرە؛ **موسەلسەل (یان، تەسەلسول):** لە زاراوەی زانایاندا، چەند کاریٚك یا چەند مەبەستیٚك یەك بەیەکەوە لکاونو هیچیان بەبیٚ هیچیان نابنو بڕانەوەشیان بوٚنیە؛ **نەظەر:** دیتن بەچاو؛ **نەظەر:** لە زاراوەی زانست، چەند مەبەستیٚکی ئاشکرا بیٚنیە پاڵیەك تا نائاشکرای پیٚ دەرخەی؛ **شەك:** گومان؛ **نوقطەی شەك:** واتا کە لە دەورو تەسەلسولدا، پیاو سەرگەردان دەمیٚنیٚتو ریٚگەی حەلکردن ون دەکات. بەخەیاڵو نەظەرییە، ئەڵگەیەك دەدوٚزیٚتەوە کە کلیلی رزگار بونە. واتا بەگومانی دەراوی دەرەتان رەچاو دەکا؛ **سەر ددرت:** سەر هەڵدەدا.

شیاوی باسەمەلا لەو بەیتە شیعرەدا، مەبەستەکانی لیٚكجیای عیلمی حیکمەتو کەلامی، داونەپاڵیەك.

**پوختەی مانا:**

دەورەدانی خەرمانەی مانگی روخسارت، کە زنجیرەی لێك نەپساوی کەزیەکانت، لەکەزیە بێبڕانەوە کانت دەوری‌داوە؛ سەری ئێمەی لەناو ئەو جەغزە بێدەرکە، گێژ کردووەو کەوتوینە باسی دژواری دەورو تەسەلسول لەسەرروت. کەزیت جوانیەکەی لەروتە، جوانی روت بەو پرچانەوە. هیچیان بێ یەکتریان ناکرێو هەتا زۆر لێی بکوڵینەوەو لەنوختەی خاڵ وردبینەوەو بەگومان بەهۆی خاڵەوە، دەرەتانێك بەدی‌بکەین؛ لەشكو گومان دەرناچینو لەوهەمو بەچاو دیارانە، ناگەینە مەبەستی نادیار، کە هۆی جوانی لەبسكو خاڵو رودایە. دەبێ چاوی دڵمان رون‌بێو، بەو بروانینە جوانی‌تۆ. ئەوسا سەرەتای کڵافەی گومانو شك، سەرهەڵدەداو دەزانین جوانیت لەچیەو حاڵی دەبین.

«مەلا حیسام‌الدینی سەرا» دەڵێ:

به صوغرایی دەمو کوبرایی چاوت مەطلەبێکم بو

بەصەد دەورو تەسەلسول هاتە پێش زولفی پەرێشانت

٦ **ئاهوا من نەکورەنجەك تە بخاطر بگەهت**

**بەخودیٚکی تو کو ئەوسەگ بەخودی هاتە مەسەك**

**مانای وشە:**

**خاطر:** دڵ، بیر؛ **بەخودیٚکی:** تۆبیو خودا؛ **خودی:** خۆبەخۆ، لەخۆیەوە؛ **مەسەك:** گیران؛ **مەسەك:** بەناچاری قافیەوە هاتوە.

**پوختەی مانا:**

ئاسکە چاوجوانو ناسکەکەم! تۆبیو خودا لەمنی دڵدار ـ کە سەگی بەر دەرکی خۆتم ـ دڵ مەگۆرەو لێم مەرەنجێو مەڵێ سەگ هاتوەبۆ راوەئاسك. نەخێر ئەم سەگەی بەردەرگات. خۆی بە ئارەزوی دڵی‌خۆی، کردۆتە نێچیری چاوتو گیرۆدەی داوی جوانیتە.

نازانم کام شاعیر دەڵێ:

سەیری نابینم نێچیروانێك بەشوێن نێچیرەوە

سەیری خۆش ئەو حانەیە نێچیر وەدوی راوکەر کەوێ

٧ **بنەڤینێ مەلەكو چەرخو فەلەك تێنە سەما**

**رەوشەنن تێك بمیهرێ ژسەما تابسەمەك**

**مانای وشە:**

**میهر:** هەم ڕۆژ هەم خۆشەویستیو دڵداری؛ **سەمەك:** ماسی، نیاز ئەو ماسیەیە کە زەمینی لەسەر پشتە.

**پوختەی مانا:**

سەروبەر عاسمانو زەویو بەرزو نەویو هەرچی لەناویاندا هەیە، بە فریشتەو بەعاسمانو بە عەرزەوە، تەنانەت بەو ماسیەشەوە کە دەڵێن لەژێر عەرزایە، لەشۆقو شەبەق دانەوەی خۆری ئەوینی خودایی کەوتونە سەماو هەڵپەرکێو بێ‌ئارامن.

**٨** نەکو پەیوەستە بیەك‌بن ژسوری عیشقێ دوروح
دێ بئەشباح ببن واصیلو پەیوەستە بیەك؟

**مانای وشە:**

**سورژ:** دڵکێشی، جازیبە؛ **ئەشباح:** تارمایی‌گەل؛ **ئەشباح:** بریەتیە لەو گیانانەی کە لەسەر زەوی کۆچ دەکەنو بەدیمەن دەچنە ناو لەشێکی روناك کە لە لەشە گڵینەکەی ژیانی سەرزەمینیان دەکا؛ **واصیل:** گەیشتو؛ **پەیوەستە:** هەمیشە؛ **پەیوەستە:** لکاو.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر دوگیان لەسەردنیا، بەر کێشەری دڵداری نەکەوتبێتنو ئەوین لێکیان پیلۆز نەکا؛ چۆن لەو دنیا لەپاش کۆچ‌کردن لەزەوی، تارمایی ئەو دوگیانانە بەیەك دەگەنو هەمیشە پێکەوە دەبن؟!

**٩** ژموسەمما عەدەدو کەثرەتی ئەسما تومەبین
زەیدو عەمرێن مەحەتا چەند؟ دونینە یەك‌ویەك

**مانای وشە:**

**موسەمما:** ناوبراو، ناونراو؛ **کەثرەت:** زۆری؛ **زەیدو عەمر:** ناوی پیاوی کەس‌نەناسن، کە لەکتێبی ڕێزمانانلدا بۆنمونە باسیان دەکرێ.

**پوختەی مانا:**

لەبازاری دڵداریدا، من‌منو تۆتۆ یەك‌نیە. با لەناونرانیش جیابن؛ بۆ ناسینەو رزگاربون لەسەر تاسینە. زەیدو عەمر هەر یەکێکن. مەڵێ دوانن. ئەوین دوەتی نازانێ.

شیاوی باسە: مەلا باسی ناوە زۆرە کانی خودا دەکا کە هەمویان ناون بۆ تاقە خودایەك.

١٠ چفەصاحەت بمەلاحەت وەددێری تو«مەلا»
ئەڤ ئەدایاتە دشیعرێ وەشرینو بنەمەك

**مانای وشە:**

**فەصاحەت:** گفترەوانی؛ **مەلاحەت:** مەزەداری؛ **نەمەك:** خوێ، لێرەدا بریەتیەلە دڵڕفێنیو مەزەداری.

**پوختەی مانا:**

مەلا! بەراستی لەشیعرا گاڵە دەکەی. ئەوگفتو لفت رەوانیو قسەبەتامو خۆیانەت چلۆن بۆدێن؟ شیعرەکانت هەتا بڵێی رێكو شیرنو مەزەدارن.

## قصیدەی پەنجاو نویەم

# «پارەی جەرگ»

١ تَعالیٰ‌الله زەهی حوسنا موبارەك
تەبارەك، صەد تەبارەك، صەد تەبارەك

٢ مەگەر شیرین بڤویٚ شیرانی‌یێ بو؟؟
(الا شَمْسُ المَلاَحَةِ قَدْ تُشارَكْ)

**مانای وشە:**

**تَعالَ‌الله:** پایەبەرزی بۆخوا؛ **زەهی:** چزۆر، عەجـایب؛ **موبارەك:** پیرۆزو بەپیت؛ **تەبارەك:** پیرۆزی بۆخـوا؛ **شیرانی:** شیرنایەتی؛ **ئەلا:** ئاگاداربە؛ **شەمس:** خـۆر؛ **قـەد:** لێرەدا واتای (دەبیٚ؟)؛ **تُشـارَك:** هاوبەشـی لەگەڵ بکریٚ.

**پوختەی مانا:**

چۆن جوانیەکە خودای گەورە بەتۆی‌داوە؛ دەس‌رەنگینی‌و پایەبەرزی هەر بۆخوایە. هەی ماشاالله صەد ماشاالله! صەد ماشاالله! کەی شیرینەکەی کە فەرهاد دڵی‌دایە، بەجوانی‌و شـیرینی تۆبو؟ تۆ خۆرێکی لەعاسمانی دڵکێشی‌و مەزەداریدا. خۆر لەعاسمان هاوتای کوانیٚ؟

٣ ژغونچێن بوغچەیا ویٚ گولعوزاریٚ (یان، گولعیذاری)
ژهەر غونچە ددلدا مایە خارەك

**مانای وشە:**

**بوغچە:** باخچەی گوڵان؛ **عیذار:** لاجانگ؛ **ما:** ئێمە؛ ددلدا مایە: دەدڵدا ماوە (یان، دەدڵی ئێمەدایە).

**پوختەی مانا:**

ئەهەر خونچێکی ناو باغچەی گوڵی ئەم گوڵ لاجانگەدا، درکێکی داخو عەزرەتمان لەدڵدایە.

٤ **لتەختی دلبەری رونیٚ بشاهی**
**لتەشاهی موبارەك بت موبارەك**

٥ **ژدیداریٚ مورادا من ببەخشە**
**مورادا من ژتە دیدارە جارەك**

٦ **ددل دائی یودیسا دل دصوژی**
**(أتحرق یاملیكَ الحُسنِ دارَك؟)**

٧ **عیزاری گەر لمن دی تو لدلدە**
**لاِنَّ الْقلبَ قدیهوی عیزارَك) یان (عِذارَك)**

**مانای وشە:**

**شاهی:** شادیو دڵخۆشی؛ **دصوژی:** دەسوتێنی؛ **أ:** ئایا؛ **تَحرق:** دەسوتێنی؟؛ **یا:** ئەی؛ **ملیك:** خاوەن، پادشا؛ **حُسْن:** جوانی؛ **دارَك:** ماڵیخۆت؛ **عیزار:** تیری هەردو قەراغ تیژ؛ **عیزار:** بسەرکۆنەو لۆمە؛ **عِذار:** لاجانگ، کاکۆڵ، رومەت؛ **لاِنَّ:** چونکە؛ **یَهْوی:** عاشقەبە.

**پوختەی مانا:**

تۆ سەردا ِی دڵبەرانیو هەمو دڵبەر تۆیان بەگەورە قبوڵە. دەبە شادی لەسەر تەختی گەورەییو سەروەری جوانان، رۆنیشە. لێت پیرۆزو ممبارەكبیٚ.

هەر شایەکی لەسەر تەختی بەختەوەری جێگیردەبیٚ، هەژاران دەلاوێنێتو خێریان بەسەردا بەشدەکاو بەخشش بەبیٚ بەشان دەدا؛ منی هەژاری دڵدارت، هەمو ئاواتو ئارەزوم، دیتنی دیداری تۆیە. بیکە بەخێر بۆجاریك خۆتم نیشاندە.

زۆر پێم سەیرە تۆ لەناو دڵمدا دەژیو کەچی بەر ئاگری دەدەی. پاشای جوانی جاوادەبیٚ تۆ ماڵی خۆت بسوتێنی؟! ئەگەر هەر بڕیارت داوە، بەتیری تانەو سەرکۆنە، یان بە پەیکانی نوكتیژی سەری بسكو موی کاکۆڵت، من بکوژی؛ دڵەکەم تیرەباران‌کە چونکە ئەوی گیرۆدەی لاجانگو کاکۆڵانتە دڵە شێتو دێوانەو بیٚ ئارامەکەمە.

٨ **تەجەرگیٚ من ژدل کر پارەپارە**
**(فَجارَكْ یا بدیعَ‌الحُسنِ.جارَكْ)**

**مانای وشە:**

**ژدل:** هەر بەراستیو لەتەهیدلٚ؛ **جارَكْ:** هاوسات؛ **جارَەك:** پەنادانیتۆ؛ **جارك:** پەنابەربەتۆ؛ **بَدیع:** تازە

داهاتو؛ حُسن: جوانی.

**پوختەی مانا:**

لە تەهی دڵدا دەتەویست جەرگەکەم پارەپارەکەی. ئەوا کردت. ئەی تازە جوانی بیٚوێنە! چۆن تۆ دەبیٚ گویٚ بەو فەرمودەیە نەدەی کەپێغەمبەر فـەرمویەتی: هاوسـایەکەت، دیسـان هاوسـات ئەمجاریش هەر هاوسایەکەت. خـۆت ئـەزانیت؛ جـەرگ هاوسـای دڵەکەمەو تۆش لە دڵمای. کەوابو جەرگ هاوساتە. پەنام بدە، پەنام بەجوانیت هێناوە. خوا فـەرمویە: (ئـەگەر کافـری خـوا نەناسـیش بێتە پەنات، پەنای بدە). تۆ چـۆن لە ژێر پەنای خـۆتا، منو دڵو جـەرگو هەناوی سوتاوم، پەنا نادەی؟؟!

٩ وەرە خانم بکوژ بستە بخەنجەر
«مەلیٚ» ئەمما بدەستی خۆی موبارەك

**مانای وشە:**

**بستە:** بی‌ترس، بەراشکاوی، بی‌سلٚ کردن.

**پوختەی مانا:**

میروگەورەم! (یان، خانمە نازەنینەکەم!) لە کوشتنم بەخەنجەران هیچ سلٚمەکە. خوێنەکەمت لیٚ حەڵاڵ‌بیٚ. بەو مەرجەی بەو دەستە جوانو پیرۆزەی خـۆت خـەنجـەرم لیٚ داوەشـێنیو دوایی بە بەدبەختیم بێنی.

## قصیدەی شێصتەم

# «چاوی بەڵەک»

۱ نازکەك من سەحەرێ دی بجەمالا خوە نەوەك
حورو ویلدان‌و پەری بو نەبەشەر بونە مەلەك

**مانای وشە:**

**ویلدان:** ئەو کوڕە تازەلاوانەی لە بەهەشتان؛ **بەشەر:** مرۆ.

**پوختەی مانا:**

سەرلەبەیان، جوانێکی ناسك‌و نازدارم، هاتە بەرچاو. وەك چی ئەچو؟ سەرگەردانم بڵێم وەك‌چی. کچوڵە چاورەشەکان‌و لاوە خوێن‌شیرینەکانی بەهەشت‌و پەری‌و فرشتە، لێم رونە - بەجوانی - نەدەگەینە ئەو. خۆ مرۆش هەر باسی‌مەکە.

«خانی» دەڵێ:

پەسنت چبدەم؟ ئەوەندە جوانی وەك هەرچی بڵێم جوانی وانی

۲ وەر تەماشایی شەهیدێن خوەکە جارەك توبنێ
(احسَن اللهُ تَبارَك) ژدو چەهڤێن دبەلەك

**مانای وشە:**

**بنێ:** بنۆرە، بنێڕە؛ **أَحْسَنَ:** چاکەی‌کرد، جوانی دروس کرد؛ **تەبارەك:** گەورەیی‌و پیرۆزی بۆخوا.

**پوختەی مانا:**

گەورەیی‌و پیرۆزی بۆخوا؛ جوانی چۆنی دروس‌کروە. تۆ بۆئەوە کەبزانی چەندە جوانی، هەر

جارێك وەرەو بنوڕە لە کوژراوانی چاوانت. ئەی نامەخواو پەنا بەخوا، لەو دوچاوە بەڵەکانەت.

٣ سونبولێن تەر لگولان پال بمەستی ددرن
سوسنێن تازە لنەسرین وەرەقان بونە هەلەك

**مانای وشە:**

**ددرن:** دەدەن؛ **وەرەق:** پەڕە؛ **هەلەك:** ئاڵقە؛ **هەلەك:** سەرگەردان؛ **هەلەك:** بەلاداهاتن‌و شکان؛ **هەلەك:** تەماحی زۆر؛ **هەلەك:** تینوەتی گیای بێباران.

**پوختەی مانا:**

کەزی یارم ـ کە بە.سمڵی تەر دەشبهێنرێن ـ بە دینی کوڵمە سورەکەی ـ کە وەك پەڕی گوڵی ئاڵە ـ سەرخۆش بون‌و بەمەستی پاڵیان وەگوڵدا. سوێسنەی هەرە پەسندو جوان ـ کە مەبەست بسکەکانیەتی ـ لەسەر پەری هەرە سپی گوڵی نەسرین ـ کە نیازم لەلەجانگانە ـ بونە ئاڵقە. یان، لە تاوان تێك شکان‌و بەولاو بەملادا دەکەوتن.

٤ نازکامن کوبمەستی دچەمەن هات خەرام
ژحەسەد چونە خوسوفێ مەهو میهری دفەلەك

**مانای وشە:**

**حەسەد:** ئێرەیی؛ **خوسوف:** قوپان؛ **خوسوف:** گیرانی مانگ.

**پوختەی مانا:**

یاری ناسك‌و نازداری من، کە لەجوانی خۆی مەست بیو، بە لەنجەو لار، هاتە گوڵزارو مێرگوڵان. مانگ‌و خۆر کەدیتیان یارم زۆر جوانترو لەبارترە لە هەردوکیان، لەعاسمان خۆیان شاردەوەو بەپەڵەی ئێرەیی گیران.

٥ ئی ژغەفلەت تەبینت کو دمینت هەیهات
تە بچەهڤێن دبەلەك کوشتنە مەظلوم گەلەك

٦ ذەررەیەك عیشق گەهاکیێو ژعەقلێ خوە نەبر
(کُلُّ مَنْ صادَفَهُ داهِیَةُالْعِشقِ هَلَكْ)

**مانای وشە:**

**هەیهات:** دورە، هەیهو؛ **گەلەك:** یەکجار زۆر؛ **کُلُّمن:** هەرکەسێك؛ **صادَفَهُ:** توشی‌هات؛ **داهیە:** بەڵای

زل؛ **هەلەك:** بەهیلاكچو.

**پوختەی مانا:**
هەركەس لەپڕ تۆ ببینێ، چۆن دەمێنێ؟ دورە مانی، هەیهوی دەوێ. تۆ بەو چاوە بەڵەكانەت، زۆر بێسوچو گوناحت بەكوشتنداوە. هەر تۆزقاڵێك لە ئەوینێ، وەكام پیاوی ژیر بكەوێ؛ ئاوەزی لەبەر نارڤێنێ؟ هەركەس توشی بو بەتوشی ئەو بەڵایە ـ كە ناو نراوە دڵداری ـ دەبێ فاتیحای بخوێنن.

**٧ خوسرەوی عیشقێ كورونیشتی لسەر تەختی وجود**
**(فَتحَ الْقلبَ عَلَی الْفَورِ وَلِلرَوحِ مَلَكْ)**

**٨ وە چعیشقو چسەلامەت كود دورن ژیەكی**
**(كُلُ مَنْ یَسئلُكُ حُباً سُبُلَ النَار سَلَكْ)**

**مانای وشە:**
**وجود:** بونو هەیەتی؛ **فَتحَ:** كردیەوە؛ **فَتحَ:** گرتی؛ **قلب:** دڵ؛ **علی الْفَور:** دەستەولەجێ؛ **مَلَكْ:** بوبە خاوەن؛ **یَسئلُكَ:** دەروابە؛ **حُبَ:** ئەوین؛ **سُبُل:** ڕێگایان؛ **نار:** ئاگر؛ **سَلَكْ:** ڕۆیشت پێدا.

**پوختەی مانا:**
پادشای ئەوین هەركە گەییە سەرتەختی سەروەری دنیاو هەبون. دەستەولەجێ بوبە خێوی مولْكیگیانو هەمو شاریدڵانیگرت.
ئێوە چۆن دەگەڵ ئەویندا باسی مانو ساغیدەكەن. هەركەسێ ڕێگەی ئەوینی گرتۆتە بەر خۆی خستۆتە ناو ئاگرو لەسەرپۆلوان هەنگاو دەنێ.

**٩ ئاهی بێگاڤ ژدلتێن مە ژپێتاد جەگەر**
**بەس توبێ فەیدە نەصیحەت كە مەدل بویە پەلەك**

**١٠ ما ژعومرێ مەچمابت وەرە ئیدی قمەرا**
**دا دئەقطاری وجودێ بكرین سەیری مەلەك**

**مانای وشە:**
**گاڤ:** وەخت؛ **پێت:** بلێسە؛ **فەیدە:** بەهرە، فایدە؛ **پەل:** پۆلو، سكڵ؛ **ما:** ئەشێ؛ **قمەرا:** وێرای ئێمە، دەگەڵمان؛ **ئەقطار:** مەڵبەندگەل؛ **سەیر:** ڕۆیشتن، تماشا.

**پوختەی مانا:**

بۆ جەرگی من، وەختو بێوەخت نەماوە. هەمو دەمان، لەو بڵێسەی کە تیایە؛ دوکەڵی هەناسەی بەرزە. برا بەس ئامۆژگاریم‌کە. بەهرەی نیە. سەرەرای جەرگی پڕ لەگڕ، دڵیشم وەك سکلْ وایەو هەر خۆی، پەنگری ئاگرە. هەودای تەمەن، وا هەڵدەکرێو بۆ مردن زۆرم نەماوە. یاری جوانم دەسا بەزەییت پێم‌دابێ. بمخە شوێن خوَت؛ با لەهەمو مەڵبەندی ئەم دنیایەدا، گەشتێکی فرشتەئاسام بەنصیب‌بێ.

**١١** دەستیوائیێ کو ژحوسنا تەڤدا لامیعەکی
«نَظَرالشَمس مِنَ‌الشَرق اِلیٰ‌الغَرْبِ دَلَكْ:

**١٢** ئافتابێ کونە تەصویر ژحوسناتە بتن
(نورُها فی‌نَظَری ظُلْمَةٌ داجِ وَحَلَكْ)

**مانای وشە:**

**استیواء:** راست‌بون؛ **خەتی ئیستیوا:** ئەو هێڵەیەکە رۆژ لە ناوەندی عاسمان بەرخۆی دەدا؛ **ڤەدا:** دایەوە؛ **لامعە:** بروسکەدار؛ **نَظَر:** چاو، تماشا؛ **مِنَ‌الشَرْق:** لە خۆر هەڵات؛ **اِلی‌الغَرب:** بۆلای رۆژ پەڕ؛ **دَلَكْ:** بەرەو ئاوابون چو؛ **نورُها:** رۆشنی ئەوخۆرە؛ **فی‌نَظَری:** لەبەرچاوی من؛ **ظُلْمَة:** تاریکی؛ **داج:** شەوی تاریك؛ **حەلەك:** زۆرتاریكو رەش.

**پوختەی مانا:**

لە جوانی‌تۆ، بروسکەیەك گەیشتە خەتی ئیستیوا. خۆری هێندە شەرماوی کرد، کە چاوەی چاوی لە ئالی رۆژهەڵاتەوە وەرگێڕاو، روی کردە لای خۆرپەڕەوەو بەرەو ئاوابون، راخوشی... ئەو خۆرەی کە وێنەی جوانیت نەداتەوە، لەبەرچاوم رەشە وەك شەوی تاریکی ئەنگوست لەچاو.

**١٣** ژهەویٰ بەند تەکرم شوبهەتی بایێ دسڤك
چژ بسکاتە ببیم؟ ئاە ژبسکاتە چەلەك

**١٤** ئەز ژزولفاتە ڤەرستم مەطەلەب کر لەبی لەعل
لێ دچاها ذەقەنێ بێ‌سەروپا چومە هەلەك

**مانای وشە:**

**هەوا:** ئەوین؛ **هەوا:** با؛ **هەوا:** بەرزایی، حەوا؛ **سڤك:** سوك؛ **ببیم:** بێژم؛ **چەلەك:** چەلەنگو شۆخ؛ **چەلەك:** خوارایی سەری دارگۆچان؛ **ڤەرستم:** رایسکام؛ **ذەقەن:** چەنە؛ **هەلەك:** سەرگەردان، پشوسوار، هیلاك.

**پوختەی مانا:**

لە ئەوینت وا تاسابوم، دامابوم کە بۆکوێ بچمو چمبەسەردێ. لەپڕ بەندی بسکەکانت ئاڵقەیان‌دا لەگەردنمو وەك بایەکی سوكو بێ‌سەنگ، هەڵیان بڕیم. لە حەوادا، ملم لە پەلەقاژە نا. ئاخ لەو بسکە رەشانەی تۆ! نەك هەرمن، باشیان ـ بەوسوکی‌یە ـ لەناو خۆیاندا گرتوە.

لەپڕێکا خۆم لەگەوی بەندی بسکـانت، راپسکـاندو بەهەڵەداوان دەچـومە تماشـای لێوە ئاڵەکەت. خوتو خافڵ دەچاڵی چـەناگەت کەوتم. وەك مەلێکـی بێ‌باڵو پەڕ، بێ دەسـتوپێ، لەو چاڵەدا سەرگەردانمو بێ‌پشومو بەرەو نەمان شۆڕ دەبمەوە.

«حافظ» دەڵێ:

دڵە نەم‌گوت کە بەپارێزبە لەپرچی یارم باش تەنانەت لەگەوی بسکی ئەوا گیراوە؟!

**١٥** **بئومیداتە هومایێ نە «مەلێ» تۆر قەدا**
**وەر تماشای جیهان بویە هەمی‌تورو شەبەك**

**مانای وشە:**

**هوما:** پیرۆزەی سێبەرپیرۆز؛ **قەدا:** نایەوە؛ **شەبەك:** تۆڕی‌راو.

**پوختەی مانا:**

نەهەرمەلا بە هومێدی گرتنی سـێبەرەکەی تۆ، کە پیرۆزەی سـێبەر پیرۆزی بەودمی. داوی ناوە. وەرە سەیرێ هەمو دنیا تەپکەو داوەو هەمو عالەم وێڵن لەشوێن سێبەری تۆ. بۆ هەرکوێ دەچـی هەر تەپکەو فاقەو داوموسکە دانراوەو لەرێتا نراوەتەوە.

## قصیدەی شێست‌ویەکەم

# «دڵ پەرەنگە»

١ کو ئیشارەت ببیشارەت بدرت نەغمەیی چەنگ
ژروی ئایینەیی دل برتن پەردەیی زەنگ

٢ فەهمی راز ئەر بکری وەرببهی موژدەیی ساز
چەنگ بێ پەردە دبێژت نەنەی‌و نای بدەنگ

**مانای وشە:**

**بیشارەت:** مزگێنی؛ **نەغمە:** ئاواز؛ **زەنگ:** ژەنگ؛ **ببهی:** ببیسی.

**پوختەی مانا:**

هەر ئەگەر مزگێنیەکی خۆش، لە ئاوازی چەنگەوە چەنگ لە دڵماندا؛ ئـاوێنەی دڵ مشــت‌و ماڵەو ژەنگی لەسەر رادەماڵێ. ئەگەر لەوانەی کەشیاوی راز پێ‌وتن‌بی‌و لەنهێنیان حاڵی‌ببی؛ وەرە گوێ لە سازان بگرە، کە چۆن رازان وەدەر دەخـەن. چـەنگ بەئـاشکرا پێت دەڵێ چخــەبەرەو بلوێرو شمشاڵیش بەدەنگ بانگت ئەکەن.

٣ وەه کوبێ شاهیدو مەحبوب تەعومرێ خوەبوار
کارەکی رابەبکە وەقتە کوئێوارە درەنگ

٤ بەری مەقصودێ ژطوبی نەگرین مەعلومە
مە ژدەستی خوەیی کوتاهو ژپایی خوەیی لەنگ

**ماناى وشه:**

شاهید: دڵبەر؛ **بوار:** رابوارد؛ **رابه:** هەستە؛ **طوبیٚ:** خێرو خۆشیو بەختەوەری؛ **طوبی:** دارێکە لە بەهەشت. بەهەشتیەکان دەچنە بنی؛ **کوتاه** : کورت، کن؛ **لەنگ:** شەل.

**پوختەی مانا:**

بەداخەوە تەمەنی خۆت بیٚیارو دڵبەر گوزەراند. هەستە چارێکی خۆت بکەو کارێك بکە. تەمەن گەیوەتە ئێوارەو هەربینا لەدنیا دەرچوی.. هەتاخێوی ئەمدەستە کورتو قولانەو، ئەم لاقە شەلو گێرانەی؛ هەر دەبیٚ بەتەمانەبی بەر لەداری بەختەوەری دا بوەریٚو بیچنیەوە.

خەییام» دەڵیٚ:

حەیفم لەدڵیٚ دیٚ کە بەبیٚ سوتمانە  دڵداری تیا نەکردوە هیٚلانە

هەر رۆژیٚ کە بیٚ دڵبەرو بیٚ دڵداری  بیٚنرخە پروپوچە زیانی ژیانە

٥ دلی یاریٚ مە نەبو نەرم بصەد ئابی گری
ئەثەریٚ دیٚ چبکەت ئاب بصەد قەطرە لسەنگ؟

٦ سینە گەهـ تیٚت کوبکەربیٚت ژدەربیٚ عیشقیٚ
مە جەگەر شوبهەتی باروتەو دل مایە پەرەنگ

**ماناى وشه:**

**ئاب:** ئاو؛ **گری:** گریان؛ **ئەثەر:** شوێن؛ **دەرب:** زەبر؛ **پەرەنگ:** پۆلو، سکلیٚ.

**پوختەی مانا:**

زۆر گریامو زۆرم فرمێسك داباراند. بەڵام دڵی ئەویارەی‌من، بەئاوی چاو نەرم نابیٚ. بەردی رەقە. ئاو کەنگیٚ کاری لیٚدەکا. دیومە وەستای کەڤرتاشین بەرد دەکوڵن، باروت دەکەنە ناوکوڵیاو. پۆلوێکی لەسەر دادەنێن. بەرد ئەتەقیٚو بەجارێك لەبەریەك دەچیٚ. سینگم جارجار لەبەر زەبری خۆشەویستنی ئەو یارە، بەدەردی بەردەکە دەچیٚ. جەرگم رەشە وەك باروتو وەکو باروت ئاگرگرە. دڵەکەشم بەتەواوی بویتە پۆلو. چۆن سینگی هەژار نەتەقیٚو هەڵنەتەکیٚ؟!

«بابا هەژاری موکوریانی» دەڵیٚ:

بەگریەم پیٚکەنی، خەندەت بەشینە  دەڵێی پاش‌گریە نۆرەی پیکەنینە!

دڵت گەر صەدپەکی سینگت نەرم‌با؟  نەرم بوی ئێستە بوٚماچێك لەسینە

٧ بجرەنگیٚ مەددل خەفبیتن گەوهەری عیشق
عاشقان موحبەتو میهرا زەرییان کفشە ژرەنگ

**٨ کفشە مەجموعو پەریشانی‌یی حالی مە ددل**
**ژسەری زولفا پەریشان‌و ژبسکا تەیە شەنگ**

**مانای وشە:**
**کفش:** دیار، کەشف؛ **زەری:** سەوزە رەنگ، سپی پێستی ئامالْ زەرد؛ **مەجموع:** تۆپەلْ؛ **پەریشان:** بڵاو.

**پوختەی مانا:**
گەوهەری بێوێنەی ئەوین، چۆن دەتوانین لەناو دڵماندا وەشێرین. خۆشەویستی زەرد ئەسمەرو سەوزە رەنگان، زەردی دەدەن بەرەنگی دڵدارەکانیان‌و دڵیان دزی گەوهەری لێ دەردەکەوێ. لەولایشەوە سەری پرچی پەرێشان‌و تۆپەڵە موی بسکی شەنگت، پەرێشانی‌و بڵاوی دڵ‌و دەرونمان وتێکە ڵاوی پڕایی دڵدارەکانت، نیشان ئەدەن.

**٩ نەتنێ گەزمە دبارن مە ژقەوسی دوهیلال**
**مە ژموژگانی سیەهـ تێنە جەگەر تیرو خەدەنگ**

**١٠ میثلی وی قەوسی هیلالی کو دونون رەیحانی**
**کی نیشان دانە ژشیرازو کی‌ئانینە ژیەنگ**

**مانای وشە:**
**رەیحانی:** وەك ریحان؛ **رەیحانی:** شێوە خەتێکی زۆر جوانە؛ **شیرازو یەنگ:** دوشارن بەکەوانی چاك ناسرابون.

**پوختەی مانا:**
جگە لەوەی کە لەکەوانی دوبرۆی ـ کە وەك مانگی یەکشەوەنە ـ تیرمان بەسەردا دەبارن‌و، ئەو کەوانە برۆیانەش، لەوانەنین کە لەشیرازو ینگەوە، دەیان هێنن. نەخێر ئەوانە بەتیشکن وەك مانگی یەکشەوە دەچن، کە خەڵك دەس لەبان چاوان بەخۆشی بۆیان دەڕوانن. دەگەڵ تیشك‌و بەرچاویشدا، وەك دونونی زۆر هونەرین کە بە دەسخەتی رەیحانی نوسرابن‌و بۆنی ریحانانیش دەدەن؟ لە تیری مژۆڵەکانی، رەشی‌و تیژیش، بێبەش نەبوین. لەپەستا تیری ئەوانیش دادە رژێنە سەر جگەرمان.

**١١ هەر لەدۆرا حەجەرئەسوەد حەبەشان چەرخ‌و طەواف**
**تێن‌و قوفا عەرەفاتێ بسەمانوبی‌و زەنگ**

١٢ صەف بصەف تورکو موغول دوگوشو هیندی دکەمین
بعەجەب هاتنە جەنگیٚ حەبەشو رومو فەرەنگ

١٣ میرو کرمانج لهەولان (لهوڵان) قەدەرەك وەستانە
لیٚبنیڤیٚ بصەفو تیپی عەرەب هاتنە جەنگ

**مانای وشە:**

**حەجەر:** بەرد؛ **ئەسوەد:** رەش؛ **چەرخ:** خول؛ **وقوف:** ویٚستان؛ **عەرەفات:** جیٚگەیەکە لەمەککـە حـاجی وچانی لیٚدەدەن؛ **نوبی:** خەڵکی نوبە کە وڵاتیٚکە لەنیٚوان میصــرو ســوداندا؛ **زەنگ:** خــەڵکــی زەنگبار، قولەرەشە؛ **موغول:** خەڵکی مغولستان؛ **دوگوش:** شەرٚو کیٚشــە؛ **میر:** نەجیمزادە؛ **کرمانج:** لیٚرە مەبەسـت ئاپۆرەی کوردە؛ **هەول:** ترس؛ **هوڵ:** گەمەی شەقیٚن؛ **تیپ:** دەستەسوار.

**پوختەی مانا:**

هەرگا یارم دیٚتە دەریٚ، یا لە پەنجەرەی کۆشکەوە ســەر دەردیٚنیٚو تماشـای دەشـتو دەر دەکاو، ریٚزی بسكو کەزیەکانی بەسروەی با دەهەژیٚنو خاڵو میلان لەرومەتو گەردنو لاجانگەکانی دا دەپۆشنو جاروبارە دیاری دەدەن؛ دڵم دەرٚوا. دیمەنی سەیرو سەمەرەم دیٚنە بەرچاو. جاریٚك دەڵیٚم: خاڵی سەررٚوی، بەردی رەشی حاجیەکانە. بسکەکانی ـ کە بەرەشی وەك حەبەشیو نوبیو زەنگین ـ لە دەوری، چەرخو خولیانەو دەڵیٚی حاجین لە تەوافیٚو لەســەر چیای عەرەفـاتی ئـەوباڵایە جــار دەویٚستن پشو دەدەن، جار لەخۆشیان سەما دەکەن. خۆ ئـەگەر شـنەبای بسکـان، تۆزیٚك بەهیٚزو گور هەڵکاو کەزیەکانی بلەریٚنیٚو بیان خاتە ســەر دەمو چــاویو لەســەر هەنیەی بیٚنو بچــن، یەکجاری دڵم دەشیٚویٚو کۆنە شەرٚی دەوڵەتانم دیٚتە بەربیرو خـەیاڵو خـۆم هەر لەبیر دەچیٚتەوە. لەلام وایە کەزیەکانی لە دولاوە بۆکیٚشەو شەرٚو ئـاژاوە، ئـامادەنە. لەشکــری تورکو مغــولان لەلایەكو لەشکری حەبەشــیو رۆمو فـەرەنگ لەو ئـالیەوە بۆیەكدیٚنو دەبیٚتە شـەرٚو پیٚكدادان. خاڵە رەشە ئیسوٚتیەکەی ـ کەوەك ئیسوٚتی هیند ئەچــیٚ لە رەشــیو جــەرگ‌بریدا ـ لەبۆ ســەدا ماتەی داوەو دیاری نادا. لاجــانگو بەرچیٚڵەی سپی ـ کە لەپاکیو روناکیدا وەك بەگزادەو ئاپۆرەی سادەی کوردانن ـ لەو مەیدانە بۆ سەیری گۆی چـەناگەیو بسکـی سـەرلیٚچـەماوەوەی کاشۆ ئاسای راویٚستاونو لایان وایە جــەنگ بەســەروان‌دا نایە. بەڵام زۆر خــەیاڵیان خــاوە. پرچەکانی پەریٚشانی ـ کە لە بیٚروحمیو دڵرەشی، وەك عارەبە رەشکە وانە ـ هیٚرش دیٚننو ئـەو مەڵبەندانەش دەستیٚنن کە بوٚمنو چاوی دڵم، جیٚگەی هومیٚدو ئاوات بون.

١٤ ژگوهەر غونچە گوشایی دکرت دورجیٚ عەقیق
بشەکەر خەندە زەنی گەر بگریت شەککەری تەنگ (یان، تونگ)

**ماناى وشه:**

**گوهەر:** گەوهەر؛ **گوشايى:** بکەيەوە؛ **دورج:** قوتوى جەواهيرات؛ **خەندە:** كەنين؛ **زەنى:** لێدەى؛ **بگريت:** دەگرى؛ **تەنگ:** بار؛ **تەنگى شەكر:** بريەتيەلە لێوى دڵبەر؛ **تونگ:** كوپەڵەى دەمتەنگ.

**پوختەى مانا:**

خونچەى دەمت، بپشكوىٚو ددانە وەك گەوهەرەكانت ببيندرێن؛ ياقيق لەبەر تەريقى خوٚى، دەرگاى قوتوەكەى تێىدايە گاڵەدەدا، تا نەيبينن. ئەگەر بەلێوى شەكرينت، زەردە خەندەى شەكربارت بێتە سەرزار؛ بارى شەكر بەديل دەگرىو شەكر لەناو تونگەى دەمتەنگ بەزەى بەخوٚى داديٚتەوەو بوٚ حاڵى زارى خوٚى دەگرىو لە عەيبەتان دەتوێتەوە.

۱۵ **وەرە بىپەردە «مەلا» وىٚ غەزەلىٚ بينە مەقام**
**هەردەما بينە سەما دەفبدەفو چەنگ بچەنگ**

**ماناى وشه:**

**پەردە:** لەمپەر، هەواى گوٚرانى، ژىٚ تارو تەنبور؛ **پەردە:** قوٚناغ لەتەريقەتدا؛ **غەزەل:** گوٚرانى دڵدارانە، بەستەو هوٚنراوەى دڵدارى؛ **مەقام:** لاوكو گوٚرانى؛ **مەقام:** كوٚرو مەجليس؛ **دەف:** دەفە؛ **دەف:** پەلەكردن؛ **دەف:** تەنشت.

**پوختەى مانا:**

مەلا! وەرە ئەو غەزەلەت بەراشكاوىو بىٚ وەشارتن، بخە كوٚرى يارانەوە. با بەهەواى گوٚرانيەوە بيخوێننەوەو با كوٚرەكەش دەفەو چەنگى تێدا لێدرىٚ. لێم رونە لەو غەزەلەى توٚ، دەفە وەپەلە دەكەوىٚو لەسەر تەنيشت، دەس بەسەما كردن دەكاو چەنگيش بەدەنگيشو بەچنگ، هەڵدەپەرىٚو هەڵدەبەزىٚ.

## قصیدەی شێصتو دوهەم

# درمانی دەردان

**١ گەر بدیا (گەر نەدیا) ئەو صەنەما سور جەمیل**
**نازلی ئەرضان نەدەبو جوبرەئیل**

**مانای وشە:**

**صەنەم:** بت؛ **جەمیل:** جوان؛ **نازل:** داکەوتو؛ **جوبرەئیل:** فرشتەی وەحی.

**پوختەی مانا:**

روی مەلا دەپێغەمبەرەو بەسیمای جوانی نورانی پێغەمبەری‌خوا (ص) هەڵدەڵێ. کە پێی دەڵێ:

ئەگەر فرشتە جوبرائیل، ئەو سیما جوانەی لەعاسمانان‌دا بدیبای کە بۆ دڵان وەك‌بت جێگەی پەرستنیو ئەو هەمو جوانیو دڵکێشیەت لەلاهەیە، دانەدەکەوتە سەرزەمین. هەر لەعاسمان، لەجوانیت دەبورایەوە. بەڵام چونکە تۆی نەدیبو زۆر بە تەمابو بت‌بینیو دڵو چاوی بەدیدارت رۆشنو شادو گەش‌بکا. هاتە سەرزەویو لێت‌گەڕاو دۆزیتیەوەو بە دیدارت بەختەوەربو. (یان، ئەگەر بەگیان نەی دیبای کە خوا چەندی دڵکێشیو جوانی بەشداوی، بۆ دیتنت دانەدەکەوتە سەرعەرزان.

**٢ من نەظەرەك حوسن‌و جەمالا تەکر**
**ئایینەیەك دی مژنورا جەلیل**

**٣ لەو ژلەبی لەعلێ تە جام‌بۆ خەجل**
**بادەیی ئەنگوری کوجا، سەلسەبیل**

**ماناى وشه:**

**جەليل:** خاوەن‌شكۆ، يەكێك لە ناوەكانى خوايە؛ **خەجل:** فهێت‌كارو شەرمەزار؛ **ئەنگور:** ترێ، هەنگور؛ **كوجا:** لەكوێ؛ **سەلسەبيل:** ناوى كانيەكى بەهەشتە؛ **م:** من.

**پوختەى مانا:**

لە دەرفەتێك روانيمە روخسارى جوانت. ئاوێنەم دى تيشكى خوداى لێوە دياربو. بۆيە لەتاوى لێوى تۆى ئاڵ، پياڵەى بادە، لە شەرمان سور هەڵگەراوە. چونكە دەزانێ ئەم لەكوێ كە ئاوى ترێى تێدايەو لێوى ياقيقى تۆ لەكوێ؟ كە ليكاوى لەسەرچاوەى سەلسەبيلە.

٤ **ديلمە هەزاران تە دبەندێ وەلێ**
**(ليس لنا عنك مجالٌ بديل)**

٥ **(ماانا وَحْدى بكَ مِنْ مُغرَمٍ. يان، مغرمٍ)**
**(كم لك قبلى شغفاً مِن قَتيلْ)**

**ماناى وشه:**

**ديل:** يەخسير؛ **ليس:** نيە؛ **لنا:** بۆمان؛ **عنك:** لەتۆ؛ **مجال:** دەرفەت؛ **بديل:** بارتەقا؛ **ما:** نە؛ **انا:** من؛ **وحدى:** تەنيا خۆم؛ **بك:** بەتۆ؛ **مِنْ:** لە؛ **مغرەم:** شێتى ئەوين؛ **مغرم:** ئەويندار؛ **شغف:** پەردەى دڵ؛ **شغف:** بەهەڵپە لە دلدارىدا؛ **قتيل:** كوشتە.

**پوختەى مانا:**

يارە جوانە تاقانەكەم! دەزانم بەجگە لەمنيش هەزاران دڵدارى ترهەن كە ئامادەن بەگيان‌و دڵ، خۆ بەقوربانى تۆبكەن‌و لەسەر ژێردەرانەت بمرن. ئەوانە هەمو ديلى‌تۆن. گيرۆدەى داوى دڵدارين. منيش نەبم، تۆ بە هەزاران دڵدارت، لە دورەيەو پەكت لەسەر كەس ناكەوێ. بەڵام بۆ ئێمە دەڵێى چى؟ تۆ ئەو گەوهەرە تاقانەى كە وێنەى تۆ، لەم سەرزەويە، تازە نايەتەوە بەرچاو. كێ هەيە وا بەدڵ‌وگيان، خۆمانى دەگرێو بنێين؟ هەر تۆمان هەى.

٦ **داروى دەردێ مە تويى جانى من**
**(هَلْ يسوىْ الْوَصْلِ شِفَاءُ الْعَليلْ)**

٧ **صەبرو سكون چونە مەنيف دەجلەدا**
**لەو ژدو چەشمان مە دزێت ئابى‌نيل**

٨ بەس نەمە صەد چەشمە ژچەشمان دزێت
(مَزجُ دَمٍ دَمعُ عُیونی یَسیلْ)

**مانای وشە:**

**دارو**: دەرمان؛ **هەل**: ئاخۆ؛ **بسوێ**: بەغەیرەز؛ **وصل**: پێك‌گەیشتن؛ **شفاء**: خـۆش‌بون؛ **عَلیل**: نەخـۆش، دەردەدار؛ **سکون**: ئۆقرە؛ **دەجلەو نیل**: دو روباری گەورەن؛ **نیل**: خم، چویت؛ **چەشمە**: کانی، سەرچاوە؛ **مَزجْ**: تێکەڵ؛ **دَمْ**: خوێن؛ **دَمعْ**: ئەسرین؛ **عیون**: چاوان؛ **یسیل**: ڕەوان دەبێ.

**پوختەی مانا:**

بریندارو دەردەدارم. صەبرو قەرارم نەماوە. هەرچـی ئـارامو ئـۆقرەم بو، لەناو روباری فـرمێسکی وەکو دەجلەی بەتەوژمم، بەدەم شەپۆلی ئاودا چو. فـرمێسکی رون، لە چـاوانم وشکـاوی هات. ڕەنگی فرمێسکی ئێستاکەم چویتین کەنیشانەی شینە بۆدڵ، جار سوری تێکـەڵ بەخـوێنو وەك قوڕاوە سوری نیل، دەنوێنن. هەرمن وانیم، بە صەتان چاو وەك سەرچـاوە ئـەســرینی خــوێن، هەڵدەرێژن. سا بەزەییت پێما نابێت. دیتنی تۆ دەرمانی هەمو دەردانەو خۆت دەزانی هەر گەیشـتن بەوباڵایە، چابونو شابونی تیایە.

٩ پوڕ مەنەظەر داتە ژسەر تاقەدەم
(قد رَجعَ الطَّرْفُ وَعَقْلی کَلیلْ)

١٠ میثلی تەما بونە؟ وەیا ما دەبن؟
ڕۆژ کو تەجەللایە چحاجەت دەلیل؟

**مانای وشە:**

**رَجعَ**: گەڕایەوە؛ **طرف**: چاو؛ **کَلیلْ**: کولو بێ‌سۆ؛ **ما**: بۆ؛ **دەلیل**: بەڵگە.

**پوختەی مانا:**

وا دیارە یار بەزەی بەمەلای هەژاردا هاتۆتەوە. خـــۆی شــانداوەو مەلا تێری تێ‌ڕوانیوە کە فەرمویە: زۆرم روانیە ئەوجوانیە. هەر لەسەر هەتا بەری‌پێم، بەچاو پێوا. بەڵام هیچ تێ‌نەگەیشتم. چاوم بەکولیو بێ‌سۆیی، بەروناکایی ئـەنگـوتو لە رومەتی هەڵبەزیەوەو دابەزیەوە، بەشـەکەتی. دەروانمەچی؟ چۆن پەسنت دەم؟ کەجوانیو بەڵگە بۆجوانیت بهێنمەوە. خۆرەتاو کەخۆی نیشـاندا، ئێتر بەڵگە بۆ بونی خۆر، هیچ مانای تێدا نامێنێ. بۆچـی جـوانو نازداری وەکو تۆ هەرگیز لەدنیادا هەبوە؟ یان تازە دێتە سەرزەوی؟

«مەولەوی رۆمی» دەڵێ:

بەڵگەیە بۆ بۆنی خۆشی گوڵ، گوڵاو        ڕۆژی ڕۆشن شان‌دەدا تیشکی هەتاو

١١ (قَدْ سَلَبَ الروُحَ عَلىٰ غَفْلَةٍ)
(إذهَجَمَ اَلْقَلْبَ بِطَرفٍ كَحيلْ)

١٢ گەرچی لبەر ضەربو جەفان فیل‌بوم
بێ مەفەر ئەز مات کرم شاهوفیل

**مانای وشە:**

**سەلب:** داگیرکردن، زەوت؛ **غەفلەت:** نەخافڵ، لەنکاو؛ **هَجَمَ:** پەلاماری‌دا؛ **کَحیلْ:** بەسورمەڕێژراو؛ **ضەرب:** زەبر؛ **جەفان:** ئازاران؛ **شاه:** بێزەلەتو بەدشکڵ؛ **شاه:** داشە گەورەکەی شەترنج؛ **فیل:** کەمزانو بیرسست؛ **فیل:** جانەوەرێکی زەلامە؛ **فیل:** داشێکی گەمەی شەترنجە؛ **مەفەر:** دەرەتان.

**پوختەی مانا؛**

یار بەتیلەی چاوەکانی - کە هەر دەڵێی بەکلە سوبحانی ڕێژراون - لەپڕ دای‌بەسەر دڵم‌داو لەنەکاو بێ هەستو چرپە، گیانی دەست بەسەردا گرتو تاڵانی‌کرد. هەرچەند من خۆم لەبەرانبەر زەبرو ئازار، وەکو فیل بە هێزدەزانی؛ لە کایەو گەمەی دڵداری، گیانم داناو ئەو سەروەرو شای جوانانە، وەهای منی - فیل‌ئاسایی - دەماڵی، کول پەستاوتوە کە هیچ دەرەتان نەماوە لێی دەرچمو بیرو مێشکیشم کارناکا کە تەگبیرێك بۆخۆم بکەم. بۆیە دژومات داماوەو لەوگەمەدا مات‌کراوم.

١٣ جان ددرم گوفت بیەك بوسە دە (یان، گفت...)
لی‌بیتن لەعلی شەکەرخا کەفیل

**مانای وشە:**

**گوفت:** وتی؛ **گفت:** بەڵێن؛ **بوسە:** ماچ؛ **شەکەرخا:** شەکرکرۆژ؛ **کەفیل:** دەستەبەر.

**پوختەی مانا:**

یارم فەرموی: خەمێ مەخۆ ئەگەر گیانت لەڕێگەی دڵداری دەرچێ، لێوی ئاڵی شەکربارم، دەستەبەرەو بەڵێن ئەدا، کە لەو دنیا بەماچێك بت‌خوێنێتەوە. دەی‌سا من چۆن ئەو سەودایە بەگیان ناکەم؟

«هەژار» دەڵێ:

سەرو ماڵو گیانم دابە ماچێك        وتی پێك‌نایە زۆری من کەمی تۆ

١٤ گەرچی دنیف حەلقەیی شیرانم ئەز
(لَيْسَ عَلَيْنا لِعِدانا سَبيلْ)

١٥ زور «مەلا» فیرقەتیٚ ئەبتەر کرین
(إنَّ مِنَ السّاعَةِ يَوْمَ الرَّحيلْ)

**مانای وشە:**

**ليسَ عَلَيْنا:** بەسەر ئیٚمەدا نیە؛ **عِدا:** دوژمنان؛ **سَبیل:** ڕیٚگە؛ **زور:** زولْم. زۆر، زویری‌و خەم؛ **زۆر:** گەلیٚك؛ **ئەبتەر:** دواِبڕاوو بیٚپیت؛ **ساعە:** ڕۆژی قیامەت؛ **یَوْم:** ڕۆژی بەرانبەری شەو؛ **رَحیل:** بارکردن.

**پوختەی مانا:**

زۆر لەو خـەڵکـە کە دەبینن، زەردو کزو لانەوازم؛ وا دەزانن دوژمنان جـــزیایان داوم. نەخیٚر. من لەناو ڕیزی دڵداران ـ کە هەمو لەســایەی دڵیان وەك شـــیٚری بەهەیبەت وان‌و کەس ناویٚریٚ بەدوژمنی توخنیان کەویٚ ـ ترســـم لە دوژمنان نیەو دوژمنان ڕیٚیان ناکەویٚ بگــەنەمن. بەڵام دەستی زۆری دوری لە پەڕوپۆی کردومەوەو خـۆشی لەبیر بردومەوەو پیتو پیٚزم لیٚبراوە، ڕۆژی جیابونەوە لەیار، پاژیٚکە لە ڕۆژی قیامەت، کە منداڵیش لە عەیبەتانی پیردەبن.

## قصیدەی شێستو سێهەم

# «بادەی ئەبەدی»

١ شاهیدی قودسی نیشان حوسنە ژرەمزا ئەزەل
دامە بدەستی سوری جامی مەیا لەم یەزەل

٢ مەی کوبچت ساغریٚ هێژ ددەست دلبەریٚ
صوندی بخالق دخوٚم روٚژە دبورجا حەمەل

**مانای وشە:**

**قودس:** پاکیو پیروٚزی؛ **قودسی نیشـان:** سەر بەبارەگای بەرزو پیروٚزی خـودایی؛ **لەمیەزەل:** هەرگیز لانەچوە، هەمیشەییو نەمر؛ **ساغر:** پیاڵە؛ **صوند:** سوێند؛ **خـالق:** دروس‌کار، داهێنەر، مەبەستخـوایە؛ **حەمەل:** بەرخ؛ **بورجا حەمەل:** بورجی هەوەڵ بەهاریٚ، خاکەلێوە.

**پوختەی مانا:**
دڵبەری من ـ کە لەجوانی ئەزەلیو ئەبەدی خودا، نیشـانەیێکـی پیروٚزە ـ بەدەسـتی دڵ‌ڕاکێشـی خـوٚی، پیاڵەیەك بادەی بارەگای دوانە هاتوی خـوای مەزنی، دایە دەسـتم. بادە لەناو پیاڵەدا، کەهێشتا هەر لەدەست یاردا. دەتوانم سوێند بەخـوا بخـوٚم کە روٚژێکـە لەسـەرەتای بەهاردا دێتە بەرچاوان. کە ئەو سەردەمانە، روٚژ لە هەمودەمانێ گەشترە.

٣ دیم دجامیٚ مەدی سورٚ دمەدامیٚ مەدی
لەو مە ژمەیخانەییٚ گرتیٚیە بەر دەر مەزەل

٤ هەر ژکەڤانی بوەش قەبضە زەری گوشە رەش
گەزمە بجوهت تێنە دل کەس دمرت بیٚ ئەجەل؟

**ماناى وشه:**

**مەدام:** هەمیشه؛ **مەدام:** باده؛ **بوەش:** وەشێنەر؛ **قەبضه:** دەسگره، جیٚدەست له شیرو کەواندا؛ **جوهت:** جوت؛ **ئەجەل:** وەختی دیاری کراوی مەرگ؛ **مەزەل:** مەنزلٚ، جیٚگەی ژیان.

**پوختەی مانا:**

دەپیاڵەدا وێنەی روخساری یارم دیت. لەو مەیەوە رازی دڵراکێشی خودا، خۆی نیشاندام. بۆیە هەروام لەبەر دەرکی مەیخانەدا، بومبە سیپالٚو کردومەتە ماڵی حاڵی یەکجاری خۆم.

دایمو دەرهەم لەکەوانی تیر پرژێنی دەست وەشێنی بروٚکانی، که زەردە وردە موەکانی ناوەراستی وەك دەستگیرەی کەوان زەردەو هەروەك پەرٚە تیری لەزێرٚوانەو ئەو تیرانە گۆشە رەشنو بەرەشاوی دڵی ئێمە، ئاو دراون. جوتجوت تیرم بۆ دەبارن. هەرجارە لەبرۆ یەکەوەو هەرجارە لەچاوێکەوە. هەمو تیر لەدلٚ دەنیشن. کەچی بەو حاڵەش هەر دەبزومو هێزی ناڵینم هەرماوە. بۆ نەمردوم؟ چونکە خودا هێشتا لە روٚزی نەکردومو هیچکەس تاوەختی خۆی نەیە، نامریٚ.

«شیخ رەضا» دەڵیٚ:

دەزانی بۆ لەدوری تۆ نەمردم ئەمن سەگمەرگمو گیانسەختو دلٚرەق

**٥** **حوسنو سورٚا صورەتیٚ کەس ددرت قودرەتیٚ**
**لەو دئەصل دورە ژیٚ طەعنەیی (لَمّا أفَلْ)**

**ماناى وشه:**

**صورەت:** شکلٚو وێنە؛ **قودرەت:** توانایی؛ **ژیٚ:** لیٚ؛ **طەعنە:** تەوس، تانە؛ **لَمّا أفَلْ:** وەختیٚ ئاوابو..

خوا لەقورعاندا دەربارەی ابراهیمەوە فەرمویە: «کە شەوی لیٚتاریك داهات، ئەستێرەی دیت. گوتی ئەمەیە خودای من. کاتیٚ ئەستێرە ئاوابو، گوتی: خۆشم لە ئاوابوان نایە. کاتیٚ کە مانگی دیت هەڵات، گوتی: ئەمەسا خودای من. هەر کەدیتی مانگ ئاوا بو. گوتی ئەگەر خودای خۆم شارەزام نەکات، یەکیٚ دەبم لە گەلی ریٚ لیٚ ونبوان. وەختیٚ دیتی وا روٚژ هەڵات، گوتی: ئەمە خودای منە، ئەمە لەگشت گەورەترە. وەختیٚ خورٚەکەش ئاوابو، گوتی خزمینە بیزانن من بەدورم لەو شتانەی ئێوە بەشەریکی خوای دەزانن.»

**پوختەی مانا:**

جوانیو دڵکێشی لە یاردا، لە دەسکردی هەمو داهێنەرێکی جیا لەخوا، زۆر بەدورە. ئەو جوانیە نەوەك ئەستێرە یامانگە. نەوەك روٚژە کە ئاوابیٚو تانەو تەوسی تیٚ بگیریٚ. جوانی یارم کە وێنەیەك لە جوانی خودای مەزنە، پەیدا نەبوە لەهەرە پێشینەوە هەبوەو هەر دەشمێنیٚو هەڵاتنو ئاوابونیشی بۆنیە.

٦ **زوربەوە تیّتن عەرەب تیّك چەڤاندن قەصەب**
**قەنج بچەهڤان مەدی چەنگو جیدالا جەمەل**

**مانای وشە:**

**زوربە:** یەتەوژم؛ **زوربە:** بەشی هەرەزۆر؛ **عەرەب:** لە زاراوەی بویّژە کوردەکاندا، بەمژۆ لی جوانان دەڵیّن؛ **چەڤاندن:** تیّکیان‌راکرد؛ **چەڤاندن:** چەماندیانەوە؛ **قەصەب:** قامیش؛ **قەصەب:** رمبی بەقەف؛ **جەمەل:** وشتری نیّر؛ (شەری جەمەل بەناوبانگە. دوای کوژرانی عوثمانی خەلیفەی سیّهەم؛ تاوان خرایە سەر عەلی، عایشەی ژنی پیّغەمبەر، دەگەڵ طەلحەو زوبەیردا ـ کە هەردوکیان ئەصحابە بون ـ بۆ خویّنەخۆیی لە عوثمان، لە شکریان هیّنا سەرعەلی. لەبەیانی رۆژی دەی مانگی جیمادی دوهەمی ساڵی سی‌وشەشی کۆچی؛ لە نزیك بەصرا دو لەشکر پیّك هەڵپرژان‌و تیّك‌چرژان. عایشە لە کەژاوەدا ـ کە لەسەر پشتی وشتربو ـ سەر کردەیی شەری دەکرد. طەلحە لەمەیدانا کوژرا. زوبیّر بەپەندی عەلی کرد. لە شەرەکە خۆی کیّشاوە، لە مەیدان دەرکەوت‌و کوژرا. تابەرە بەری ئیّوارە، بڵیّسەی شەر هەر گەرم‌بو. یەك لە چەکدارانی عەلی، بەناوی «مالکی ئەشتەر» خۆی گەیاندە بەر کەژاوەکەی عایشەو پەلی وشترەکەی پەیکرد. کەژاوەکە بەلادا هات. عەلی عایشەی بەدیل‌گرت. زۆر بەحورمەت ناردیە بەصراو بەمحمدی برای‌دا. ـ مُحمّد کوڕ ئەبوبەکر ـ بەریّی کردەوە مەدینە. لەو شەرە عەلی سەرکەوت‌و دەستی بەسەر عیراق داگرت. شەر بەناوی وشترەکەی عایشەوە ناوی دەرچو.)

**پوختەی مانا:**

وەختیّ دەمدی یاری نازدار، بەچاوی بەڵەك دەیروانی‌و بژانگی دریّژو کورتی، وەك رمبو تیری رەش دەچون؛ کە پیلوی‌پیّك دادەهاتن؛ وام سەرشیّواو کەوتمە دەریای مەترسی‌و خەیاڵاتەوە، کە شەری جەمەل دەبینم‌و هەروا چەکداری عارەبن بەتەوژم پەلاماری یەکتر دەدەن‌وبە تیرو بەرمب، تیّك بەربون.

٧ **شیرو رمان ڤیّك ران پەنجەبرن تیّك‌ران**
**لەو مەدکن ژیك‌ران قیمەدکن دل دگەل**

**مانای وشە:**

**ڤیکران:** تیّکرا؛ **قیمە:** گۆشتی هەنجناو.

**پوختەی مانا:**

بەچاوی خەیاڵ باش دەمدی، کە چەکدارە عارەبەکان، بەشیر بەرمب، بە چنگورك، یەکتر دەکوژن‌و دەدرن، هەر بۆیەشە کە ئەو مژۆڵە رەشانە، لاسای عەرەب دەکەنەوە. ئیّمە گەلی دڵدارانیان، تیّکرا وەبەر زەبر داوەو دڵمانیان پیّ هەنجناوە.

٨ نازك‌و قەنجا شەپال دل قەگەرینت محال
لیٚ ژمەدیٚ دل ببەت دل بمەدەت موحتەمەل

**مانای وشە:**

**محال:** نەشیاو؛ **موحتەمەل:** وێدەچیٚ، ڕێگەی تیٚ‌دەچیٚ.

**پوختەی مانا:**

یاری جوان‌و خـونچیلانەو نەرم‌و ناسـك، تازە کەدڵمان دەسـتێنیٚ ڕێی تیٚ ناچـیٚ هەرگیز بۆمان وەگەڕێنیٚ. بەڵام ڕەنگە لەجیاتی ئەو دلٚ بردنە، دڵمان داتیٚ‌و تۆزێك دڵداریمان بدات.

٩ نەی‌شەکەرو دیم دوریٚ دامە بدەستی سوریٚ
جام‌و قەدەح شوبهی ئاڤ لەو مەرەوان تێن غەزەل

١٠ گەرچی دچەهڤێن (انا) عالەم «مەلا» کر فەنا
(دونَ فَنا بابِکُمْ إنَّهُ عَبْدٌ أقَلّ)

**مانای وشە:**

**انا:** من؛ **عالەم:** هەمو ئافەریدەی خوا؛ **مەلا:** پڕ؛ **فەنا:** لەبەین‌چو، نەبو؛ **فەنا:** بەر دەرگای حـەوش؛ **باب:** دەرگا؛ **إنَّهُ:** ئەو؛ **أقَلّ:** کەمترین.

**پوختەی مانا:**

ئـەو بەژن قـامیشە شـەکرەی لارومەت وەك مرواری‌یە، بادەیەکی پڕلە ڕازو دلٚ‌ڕاکێشـــی، دەناو پیاڵەو جام دا دامیٚ. پیاڵەو جام لەڕەنگی ئـاو بون. بۆیە هەڵبەسـتەکانی من، ئـەمرۆ وەك ئـــاوی ڕەوانن. من بەو مەیە وا سەرخۆش بوم، هەمو دنیا لەبەرچاوم تاوایەوەو هەستم نەدەکرد هەر بش بێت. خۆم وا تێکەلٚ بەخودا دیت، بانگاوازم دەکرد «هەرخۆم». بەڵام هەرچەندکە خـۆم لە تۆش‌دا دەبینم، وەکی دیکە من لە بەر دەرگانە کەی تۆدا، سەری نیازم لەسەر خـاکەو خـۆم بەکەمترین و سوکتر بەندەی بارەگات دەزانم.

## قصیدەی شێصتو چوارەم

# «مەنصورە دڵ»

١ ئیروٚ ژرەمزا دیم دوریٚ  میننەت کومن مەسرورە دل
دلبەر بفنجانا سوریٚ  مەی دامەوو مەخمورە دل

٢ رەمزەك نهین ئاڤیتە دل  میهری ژباطن میهتە دل
شەهزادەیێ سوژ ریهتە دل  شەهکاسەیا فەرفورە دل

٣ هوٚستایی عیشقیٚ دل هەڤوٚت  سەرتا قەدەم هنگی دصوٚت
رەمزا (اناالحق) هەر دگوٚت  باوەر بکن مەنصورە دل

**مانای وشە:**

**مەسرور:** شاد؛ **مەخمور:** مەست؛ **میهت:** مژی؛ **ریهت:** رژاندی؛ **فەرفور:** کاسەی چینی، فەخفوری؛ **هەڤوٚت:** فێری کرد؛ **هەڤوٚتن:** فێرکردن، تەعلیم؛ **هنگی:** ئەوسا؛ **انا الحَقْ:** منخوام؛ **مەنصور:** سەرکەوتو؛ **مەنصور:** حوسێن کوری مەنصور کە بە مەنصوری هەللاج بەناوبانگە. خواناسێكبو جەزمە دەیگرتو لەوەختی حاڵ لێهاتندا، هاواری دەکرد: «منخودام». لەسەر ئەوتاوانە ساڵی ٣٠٩ ی کوٚچی بەرامبەربە ٩٢٢ ی میلادی گرتیان، جەزرەبەیانداو کوشتیان.

**پوختەی مانا:**

سوپاس بوٚخوا، من ئەمروٚ زوٚر دڵم شادە. دڵبەری‌من کە شاو شازادەی جوانانەو روخساری وەك مرواری‌یە. لەبادەی دڵرفێنی خوٚی، فینجانێکی بوٚتێکردم. بادە هەر گەیشتە دڵم، لەرازی نهێنیٚو گرینگ، ئاگادار بوم. دڵ لەدەرون ئەوینی هەمیشەیی مژت. وەك شاکاشی گەورەی لێهات کە پڕبێ لەمەی ئەوینیٚ. ئەوجار ماموٚستای ئەوین هات؛ دڵمی فێری دڵداری کرد. وا لەوساوە دڵ سەرتاپای بوٚتە ئاگرو گری بەرزەو (هەر خوٚم خودام) دەدرکێنیٚو بویتە هاودەنگ دەگەڵ

مەنصوری هەللاجدا. باوەربکەن دڵم هیچ تاوانی نیەو لە ئەویندا، سەرکەوتوەو هەرچی بڵێ، پێویستە باوەری پێبکەن.

٤ دل لێبدەت نورا مەیێ وەقتی سەواش‌و هەی هەیێ
فەهم ئەر بکت وەحیا نەیێ ژێدت خەبەر مەئمورە دل

٥ نورا ژقودرەت لێ دونون ژێرا دنالن ئەرغنون
وەر ئایەتا عیشقێ بخون خۆش نوسخەیەك مەسطورە دل

**مانای وشە:**

**سەواش:** شەرو هەرا؛ **هەی‌هەی:** گورەگوری مەستانە؛ **وەحی:** وڵامی‌خوا؛ **مەئمور:** فەرمانبەر؛ **ئەرغنون:** ئەرگانون، سازێکە یونانی پێشو سازیان دەکرد. حەوت لولەی کورت‌و درێژی هلولیان لەیەکتر دەبەست. وەك بلوێر تێیان دەتوراند. مەزامیریشیان پێ دەگوت. سرودی داود پێغەمبەر کە ناو نراون مەزامیر، وا دیارە حەزرەتی داود لەلێدانی ئەوسازەدا زۆر سازبوە. سازێ تریش بەناوی ئەرغنون هەیە کە وەك دەفەی جوڵا دەچێ‌و زۆر هەودای تێلی تێدایە. لەزاراوەی شاعیراندا، هەمو سازو ئامرازێکی موسیقایە؛ **نوسخە:** نوسراوە؛ **مەسطور:** خەتدراو.

**پوختەی مانا:**

دڵ گەر بەر تیشکی مەی کەوێ لە جەنگەی مەستی‌و هەو هەوێ
لەوەحیی بلوێریش بگات فەرمانبەرە خەبەر دەدات

روخساری یار، تیشکی توانایی خودایە. خوا ئەگەر سوێندی بەنون خوارد؛ دونون لەو روخسارە دایە. کە بونە قاشی بروێان. هەرچی سازو بەئاوازن، بۆ بروی ئاواتەخوازن‌و لەتەهی دڵیان دەناڵن.

وەرە صوفی ئایەتی ئەوین وەخوێنەو رامەمێنە. تابزانی کە دڵ نوسخەی خەت دراوی ئایەتی تیشکی رووی‌یارەو زۆریش خۆش نوسراوەتەوە.

٦ تەفسیری سیررا ئایەتێ عارف دقێتن گۆە دەتێ
رازا رموزێن قودرەتێ گەر دین بکت مەعذورە دل

٧ دل کەعبەیە مەولایەلێ ناری کەلیم ئیسایە لێ
بانگی (اناالله) دایە لێ هەم کەعبەو و هەم طورە دل

**مانای وشە:**

**تەفسیر:** راوە، ماناکردنەوە؛ **گۆەدەتێ:** گوێبداتێ؛ **رموز:** ئیشارەت گەل؛ **دین:** شێت، لیوە؛ **مەعذور:**

عوزر قبول؛ **مەولا:** بەردەست؛ **مەولا:** دۆست؛ **مەولا:** گەورەو خاوەن؛ **نار:** ئاگر؛ **کەلیم:** دوێن؛ **کَلیمُ‌الله:** نازناوی موسایە کە خوا دەیدواند؛ **اناالله:** من خودام.

خوا لەقورعانی پیرۆزدا، روبە پێغەمبەر فەرمویە: «ئەدی تۆ چیرۆکی موسات گەیوەتەلا؟ کە ئاورێکی چاوپی‌کەوت‌و بە خێزانەکەی خۆی‌وت: ئاگرێکم بەدی کروە ئەشیێ بچم بەڵکو سەرە بزوتێکتان بۆ بهێنم. یان لەسەر ئەو ئاگرەوە توشی شارەزایەك بیم. وەختێ لێی نزیك کەوتەوە. بانگی لێ کرا: موسا! من خوداتم سۆڵەکانت دابکەنە، تۆ لەناو شیوی پیرۆزدای.»

## پوختەی مانا:

ئایەتی خوا پرە لە رازی نهێنی. خواناسی بەراستی دەوێ گوێچکەی بداتێ‌و تێ‌بگا مانای‌چیە؟ ئیشارەت‌و رازی توانایی خودایی، ئەگەر دڵ، شێت‌و دین‌بکا؛ نابێ سەرکۆنەی دڵ‌بکرێ. دڵ کابەیەو خودای تێدا. ئاگرەکەی موسای بانگ دەکرد، لەچاوگەی دڵدا دایساو «من‌خوداتم»ی بەموسا گوت. دڵ هەم کابەیە هەم طورە.

**٨** صەد حۆو صەد جوبارەتێ  صەد گولشەن‌و گولزارە تێ
چەندان ژعیشقێ نارەتێ  صافی نەظەر دی نورە دل (یان عیشقی یارەتێ...)

**٩** صوحبەت کوکامیل بو بری  جارەك بجایی عەنبەری
قەلبێ بئاڤێ مەجمەرێ  خوەش عەنبەرو کافورە دل

## مانای وشە:

**گولشەن:** گوڵجار؛ **کامیل:** بێ‌کەمایەسی؛ **بری:** برۆی؛ **بری:** بەی؛ **بری:** بریا، خوزیا؛ **عەنبەر:** بۆن‌خۆشێکە لەورگی جورەماسیەکدا؛ **مەجمەر:** مقەڵی، ئاگردان؛ **کافور:** شیرەی دارێکە لەژاپون‌و چین‌و ئەندونیزیا دەڕوێ. بۆنی خۆشەو بۆ سەرێشەی بەکاردێنن‌و لەشی مردوی پێ دەهەنون تا نەگەنێ. بۆ بۆن خۆشی بەسەر ئاگریشی دادەکەن.

## پوختەی مانا:

ئەو دڵەی من، لە پیرۆزی ئەوینەوە، بۆتە بەهەشت. پریە لەجۆگەو روبارو تژیە لە گوڵ‌و گوڵجارو ئەوەندەی دڵداری تێداو، ئاوری ئەوین ئەوەندی تێ هەڵگراوە، ئەگەر بەچاوی رون‌و پاك لێی بنۆڕی؛ ئاگر نیەو تیشکی خوایە. خوزی هەرگا کۆڕی یاران گەرم دەبێ، جارێك لەجیاتی عەنبەرێ، دڵم بخەیە سەر پۆلوان، لە ئاگردانی مەجلیس‌دا: تابزانی چۆن لەعەنبەرو کافوریش بۆن خۆش‌ترە.

**١٠** شوخ‌و شەپالا لەب ژقەند  ئەو نازکا وی قەنجو رەند
وی دل ژدل دلداو خوەند  ئیرۆ یەقین فەغفورە دل

١١ ئەر دل ژتە مەسرور بتن  من ژی «مەلیٚ» دەستور بتن
دی کت جیهان پڕنور بتن  لیٚ دائیما ڕەنجورە دل

**مانای وشە:**

**قەنج:** لەبار؛ **ڕەند:** جوان‌و پەسند؛ **خوەند:** خویٚندیەوە؛ **فەغفور:** قەراڵی مەملەکەتی چین؛ **دەستور:** ئیجازە؛ **دی‌کت:** کارێکی وادەکا؛ **ڕەنجور:** نەخۆش‌و دەردەدار.

**پوختەی مانا:**

یارە شۆخ‌و خونچیلانەو لیٚو قەندەکەم، ئەو ناسکە جوان‌و ڕێک‌و دڵ‌پەسندە، ئەمڕۆ بەراستی‌و هەر بەدڵ، دڵی هەژارمی خویٚندەوەو لاواندەوە. دڵی من ئیٚستا دەتوانیٚ بە قەراڵی چینیش بڵیٚ: کاورای هەتیمچە چکارەی؟ من هەمیشە دڵم بە دوری‌و بی‌مەیلیت نزارو دەردەدار بوە. بەڵام ئیٚستا کە دڵداریت داوەتەوە ئەو شادیەی هەروا بمیٚنیٚ‌و منی مەلاش ڕیٚگەی بدەم کە رازی دڵ بدرکیٚنیٚ؛ لیٚم رونە کاریٚ وا دەکا هەمو دنیا پربیٚ لەنور.

# قصیدەی شیێصتو پێنجەم

# «زەکات بەعەبد»

١ شەربەتا لامو بیان ئەز بەحەیاتێ نادم
بادەیا لەعلێ بتاڤا ظولوماتێ نادم

٢ حورو ویلدانو پەری جوملە جەمابن ئیروٚ
مویەکی پێ ژخەطێ وی بتو لاتێ نادم

٣ گەر بدەت دەست طەوافا پی ودەستان بگرم
وی مەجالێ بوقوفا عەرەفاتێ نادم

**ماناى وشە:**

**شەربەت:** شلیٚنوٚشین؛ **لاموبێ:** لەب، لێو؛ **حەیات:** ژیان؛ **حەیات:** ئاوی ژیان؛ **ظولومات:** تاریکستان؛ (سەرچاوەی ئاوی حەیاتێ لەناو تاریکستان دایە)؛ **جوملە:** بەکوٚمەڵ؛ **طەواف:** لەدەورە گەڕان.

**پوختەی مانا:**

تەڕایی وشەی ئەو لێوانەت، نادەم بەئاوی حەیاتێ. چوٚن بادەی ئاڵی خودایی بە ئاوی تاریکستانێ دەگوٚرمەوە؟!

هوٚریو لاوانی بەهەشتو فرشتەو پەری، کوٚوەبنو بێنەسەودا؛ من هەموویان بەتێکڕایی بە تاڵێك موی سەرو پوٚری ئەو بتو لاتەی خوٚم ناکڕم. ئەگەر خودا بەختم بداو دەدەوری یارم بگەڕێمو لەجیاتی بەردی ڕەش ماچ کەم، ڕێگەم هەبێ بکەومە سەرپاو پلیو دەستەکانی رابموسم؛ پێم لە ڕاوەستانی حاجیان، لە عەرەفاتێ باشترەو بەخێرترە.

٤ ئەزویار گەر شەڤەکێ هەردو هەمئاغوش ببین
لَیلَةُالقَدره مە ئەوشەڤ بیەراتێ نادم

٥ **جانی شیرین کو ژیاررا بخودان ئەز دکرم**
**نە بیاریٚ خوە دوەقتیٚ سەکەراتیٚ نادم**

**مانای وشە:**

**ئاغوش:** هەمێز، باوەش، هەمبێز؛ **لَیْلَةُالْقَدْر:** شەوە پیرۆزەکەی رەمەزان؛ **بەرات:** شەوی پازدەی شابان کە رسق‌و رۆزی تێدا بەش دەکریٚ؛ **خودان:** صاحیب، خاوەن؛ **سەکەرات:** وەقتی گیانەڵاو.

**پوختەی مانا:**

گەر منویار، شەوەکی یەکدی دەباوەش بگرین، شەوی قـەدری منە، هەرگیز بە بەراتی نادەم. یار ئەگەر گیانی منی جاریٚ بەخاوەن کربا؛ لە سـەرەمەرگ‌و دەمی گیان لەبەدەن دەرچـونا، جگـە لەو یارە، گیانم بەکەسی تر نادەم.

٦ **شەربەتا زەهری هەلاهیل کو حەبیبیٚ مە بدەست**
**بگولاب‌و شەکەرو قەندو نەباتیٚ نادم**

٧ **نەبقانون کوئیشارەت بشیفاییٚ بکرت**
**ئەز هیلاکیٚ خوە دعیشقیٚ بنەجاتیٚ نادم**

٨ **طەلبەکر وەصلیٚ ژدلبەر مە بعنوانی زەکات**
**گوٚ تو عەبدی‌و بعەبدیٚ خوە زەکاتیٚ نادم**

**مانای وشە:**

**قانون:** رێوشوێن؛ **ئیشارەت:** دەس‌نیشان کردن؛ **شیفا:** خۆش بونەوە؛ **نەجات:** رزگاری؛ **شیاوی باسە:** **قانون، شیفا، ئیشارات، نەجات،** ناوی چـوار لە کتێبەکانی ئـەبوعەلی ابن‌سـینای بەناوبانگــن (٣٧٠ تا ٤٢٨ ی کۆچی)؛ **عینوان:** ناوونیشان؛ **عینوان:** مەبەست.

**پوختەی مانا:**

جامی ژەهراوی هەلاهیل بیٚ کە یار بمداتیٚ؛ بە گوڵاوو شەکەرو قـەندو نەباتی نادەم. گوێم لە رێو شوێنی حەکیمان نیە چاکم کەنەوە. لە ئەویندا بمرم، چیمە بەسەر رزگاری.

وتم: هۆ جوانیٚ! بەشم‌کوا لە زەکاتی جوانیت؟ وتی: تۆعەبدی. زەکاتی مە بە کۆیلان ناشیٚ.

٩ **وی بپەیکی بکرین مات رەقیبی دیسا**
**بروخ‌و فیل‌و فەرەس ئەز شەهوماتیٚ نادم**

١٠ دسەمایا سەحەریٚ دەست بکەس دی ئیروٚ
غەیری شیرین قەدو مەوزون حەرکاتیٚ نادم

١١ هاتە دەستیٚ مە درەقصیٚو دگوٚ بل ژمەلیٚ
دەست بکەس دی دسەمایا کو مەلاتیٚ نادم

**مانای وشە:**

پەیك: پیادەی شەترنج؛ رەقیب: چاو نەزێر، هاوبازی؛ روخ: قـەڵا. کە داشـێکی گەمەی شـەترنجـە؛ فەرەس: ئەسپ؛ فیلو فەرەس: دو داشن لە شەترنجدا؛ شامات: واتا، شای شەترنج لە کار کەوتو مرد. یان، ماتەیدا؛ مەوزون: رێكو پێك؛ حەرەکات: بزاو؛ بل: جگە؛ کومەلاتیٚ: کە مەلای تێدابیٚ؛ شامات: شامەگەل؛ شامە: خاڵی سەرزو.

**پوختەی مانا:**

چاوچنوٚکی پیسو شوٚفارو زمانشرٚ؛ کە لەبازاری دڵداری بویتە سەربارو چـەلومل؛ ئـەوا دیسـان توشی ماتی کردم. پیادەی پیٚیەو دەیەویٚ بارگینو فیلو قەڵاکەشم لەناو بەریٚو پاشان شاماتم پیٚبڵیٚ. من هەرگیز نابیٚ بدوٚرێمو قەت رێگەی شاماتی نادەم. وا ئاکەم لە سەیری خـاڵان دەگەڵما بیێتە هاوبەش. برٚیارە ئەمروٚ بەیانی، کوٚری سەما دامەزرێنن. من دەستی خوٚم باهەرکیٚبیٚ بەجگە لەو بەژن باریکەو لارو لەنجە رێكو پێکەو خوێن شـیرینە، بەکەس نادەم. ئـوٚخەی شـوکور ئـەوا لەگەڕیٚ هەڵپەرکیٚ، یاری شوٚخم دەستی گرتمو بەدەم فـەرموی: لەهەرکوٚری داوەتێکـدا مەلای لیٚ بیٚ، من جگەلەو دەستی هیچ کەسی تر ناگرم.

هەر لەبارەی شەترەنجەوە «حەریق» دەڵیٚ:

هەمو عالەم دەزانیٚ من کە سەودای زولفی تاتاتم
لەخانەی کوڵمدا کولم بەفەرزی شای روخت ماتم

«کوردی» دەڵیٚ:

تو بەو دوروخی خوٚتەوە وەك شاهیو فەرزە     دایم کە لەپێش ئەسپەکەتا وەك نەفەرت بم

«هەژار» دەڵیٚ:

کشوماتە جیهان لەژوانی لەنویٚ     گەلاوێژ بوٚمە دەرٚوانیٚ لەسەر سویٚ
چریکەی بولبولێك دیٚ وا دەزانم     چیەی ماچی منوتوٚی هاتە بەرگویٚ

# قصیدەی شێصت‌و شەشەم

# «فینجان‌و جام»

۱ عیدەوو داعالەمیٚ بانگی صەفاییٚ خاص‌و عام
ماهی نەو ئەبرو نوماندن چو ژبەر عەورو غەمام

۲ خوەش بدوٚر جامیٚ ئیشارەت‌کر هیلالیٚ ساقیان
ماهتابێن زوهرە سیما چاردەسالی تەمام

۳ نامەطەی‌کر روزەئی عیدیٚ قەکر فەصلا مەییٚ
لیٚ بزەمزەم تێن بئاوازی نەییٚ فینجان‌و جام

**مانای وشە:**

**عەور:** هەور؛ **غەمام:** هەور؛ **ساقی:** مەیگێڕ؛ **ماهتاب:** مانگەشەو، ترێفە؛ **طەی:** پێچانەوە؛ **روزە:** رۆژو؛ **فەصل:** کژ، هەرەت؛ **زەمزەم:** زەمزەمە، ویرەویر.

**پوختەی مانا:**

ئەوا جێژنەو هەمو عالەم گەورەو کچکە، گش لەگشتیان بەدڵخۆشی مژدە دەدەن، کەوا ئەمرۆ مانگی لەنویٚ ـ وەك بروٚی‌یار ـ خوٚی نیشانداو پەڵەهەوری لەبەر رەوین.

بوٚ مەیگێڕانیش بروٚی یار ـ کە لەمانگی یەکشەوە گەلێك جوانترە ـ هاتە بەرچاو. بە گوٚشەیەکی نازاوی تێی گەیاندن کەدیسان با دەبگێڕن. جا ئەگەر مانگی عاسمانیٚ، زەردو لاوازو باریکەو هیچ روناکاییشی‌نیە؛ مانگی مەیخوٚرو مەیگێڕان، لە روخسارێکەوە دیارە کە لەباتی چاردە شەوی مانگیٚ، ئەو چاردە ساڵی تەواوە روٚژ لەروٚژیٚ جوانتر دەبیٚ‌و ئاوابون‌و کەم‌کردنیشی بوٚنیە.

دیمەنی ـ بەتیشك‌و رونی ـ وەك زوهرەیە. بەڵام پتر لەمانگی شەوانی چاردە، ترێفەی داوەتە دنیا.

نامەی روٚژو پێچرایەوەو فریٚدرا. هەرەتی مەی وەخواردنە؛ لەم روٚژەدا، فینجان‌و پیاڵەی

مەیگێڕان، بەدەنگ‌و صەدای بلوێران، هەر خرینگەو زرینگەو ویرەویریانە.

«خەییام» دەڵێ:

| | |
|---|---|
| ئۆخەی کەنـەمـا بـاوی خەیاڵی خاڵی | مەیگێڕی دەبینمەوە بەبادەی ئاڵی |
| گێرەی رەمەزان بەربو ئەوا جێژن هات | دەم‌بێنی لەدەم گاوو کەران داماڵی |

٤ شاهیدێن گوڵرەنگ ساقی بەلکە نەسرینن بەشەر
ئی دلەبسێ ئەرغەوانی نێرگزێن عەرعەر خەرام

٥ یارەب ئەو روحن موجەسسەم یان میثالی روحن‌ئەو
لەو بسیرێ جامان دبەخشن نازکێن شیرین کەلام

٦ ئەو چەالی گەوهەرن هاتن لیباسی جیسمو جان
عیشوەیێن وان شوبهی ئیکسیرێ دقەلبانن مەقام

٧ وەك «مەلێ» گاڤەك تنێ غائب ژدیداری نەبم
وەربیم وێ ساعەتێ لێ‌بن ژمندا صەد سەلام

**مانای وشە:**

بەشەر: بەشەرە، پێست؛ لەبس: بەرگوشمەك؛ موجەسسەم: هاتوەتە ناو لەش، بەچاو دەبینرێ؛ میثال: پەیکەر، کوتەڵ؛ گەوهەر: رەگەز؛ گەوهەر: جەواهێر؛ کەلام: گفتو لفت؛ ئیکسـیر: تۆزێکـە بەسـەر مسی‌داکەی دەیکاتە زێڕ؛ قەلب: دڵ؛ قەلب: چروك؛ مەقام: جێگە؛ گاڤەك: تاوێك؛ گاڤەك: هەنگاوێك؛ وەر: وەئەگەر؛ وەك: دەغیلە، هۆشتبێ.

**پوختەی مانا:**

ئەی خوایە! ئەو مەیگێڕانە، بەو هەمو شوش‌و ناسکیە، گیانن ئێمە دەیان بینین؛ یان پەیکەرن بۆ نازکی گیان، نیشاندان؟ چۆن گەوهەرێکن ئەوانە؟ دەبێ لەچی دروسـت بوبن‌و چـۆنە هاتونە ناو لەشی بنیادەمەو؟ زمان خۆشن، بەنازو ناسـك ئـەندامن، ئـەگەر پیاڵەت دەدەنەدەســت؛ وادەزانی بەنهێنێ ئەوپیاڵە هات. چونکە هێند رون‌و ناسکن نایان‌بینی. نازو قەمزەی ئـەوان دەیکـەن، دڵی قـەڵبیش وەکو ئیکسـیر دەکا بەزێڕ. دڵمان بویتە مزڵیان‌و لەناو دڵماندا دەرناچــن. مەلا هۆشــت لەسەر خۆبێ! نەچی جارێك بۆ تاوێکیش هەنگاوێکیش لەیارت دور بکـەویەوە. ئـەگەر هەرتاوێك دورکەوتی، سەلامان بنێرەو بڵێ: من ئیتر لەدنیا دەرچوم.

شیاوی باسە، بەعەرەبی لەباتی بڵێن فــاتیحای بۆ فــلانەکەس بخــوێنن؛ دەڵێن: ســەلامی لەسەربێ.

# قصیدەی شێصتو حەوتەم

## «جەذبەیا عیشقێ»

١ دانەیێن عەنبەر لنەسرینان رەشاندن خال خام
سوسنێن نازك لسەرخالان چەڤاندن دالی دام

٢ جەبهەتو دیمێ لقودرەت لێ نڤیسی حەرف و حەرف
کاکولان تاتا لسەر حەرفان کشاندی لامو لام (یان، لامُلام)

٣ لیلةالقدرو بەراتن زولفو جەبهەت صوبحیعید
دیم وەکو فەصلا بەهارێ لێقیامەت قەددو قام

**مانای وشە:**

**دانە:** دەنك؛ **خام:** خاو؛ **چەڤاندن:** لارکرنەوە؛ **حەرف:** کەنار، لێوار؛ **لام:** پیتی (ل)؛ **قام:** بەژن؛ **قام:** هەستا؛ **لاملام:** کەس لومە ناکرێ؛ **قەد:** نوشتانەوە.

**پوختەی مانا:**

ئەو لارومەتو لاجانگەی ـ کە وەك پەڕیگوڵی نەسرین، ناسكوسپین ـ خاڵی رەشو بەبەرامەی وەك عەنبەری خاوی دانەدانە لێپرژاوە. بسکەکانی کە لە سوێسنە زۆر تورتو زۆر بۆنخۆشترن؛ لەسەر خاڵان لار بونەوە، وێنەی دالن (د)و بونە داو لە راوگەی دڵان. دەستی هونەری بەهێزی خودای مەزن، چەند پیتێکی زۆر پیرۆزی ناو قورعانی وەکو: صادەکانی چاویو نونی برۆو ئەلفی کەپۆو لامی بسكو میمی دەمو نوختەی خاڵان ـ کە دڵان دەبەن بەتاڵان ـ لەسەر هەنیەو روخساری یار، لە ناوەوەو لە کەناران نەخشاندوە. کاکۆڵەکان لەسەروی ئەو پیتانەوە، بەزوانی حاڵ پێمان دەڵێن: دڵدار کەشێتو هاریشبن، لۆمە ناکرێن. شەوی رەشی کەزیەکانی وەك شەوی لیلةالقدرو بەرات وانە، کەهەم تیشکی جوانی خوایان دەناودایە؛ هەم هەمو بەرەکەتو

پیتی رۆژی دڵمان لەوانرایە. تەختی سپی‌ناو چەوانی، سپێدەی جەژنی پیرۆزە. روخساری جـوانتر بەهارە، نەخێر. وەك باغی بەهەشـتە، کە هەرگیز پائیزی نیە. ئـەگەر دەڵێن بەهەشـت لە رۆژی قیامەتا دەبیندرێ، دەلەو باڵایە برۆانن. کە هەرگا یار هەڵدەوسـتێ، قیامەت دەکاو هەرگا قـەد دەنوشتێنێتەوە ئێمەی دڵدار، قیامەت بەچاوان دەبینین.

٤ ئەوپەری وەقتێ دسوندوس‌دا ژقوندوس بت خویا
بەندەدێ شاهو گەدابت خوسرەوی شیرین کەلام

٥ هەرکەسی جارەك دیە ئەو زیندەما حەتتا ئەبەد
وی نەدیتی ئەوپەری رو، زیندەگی لێ‌بت حەرام

٦ هەرکەسی جامێ ژدەستی وی بنوشت نوش‌بت
ئی ژوی دەستێ نەنوشی زەهربت ئەو لێ مەدام

**مانای وشە:**

**سوندوس:** پارچەی ئاوریشمی بەزێڕ چنراوی زۆر نایاب؛ **قوندوس:** تاریکـایی خـەسـتی شـەوێ؛ **گەدا:** پارسەك؛ **مەدام:** هەمیشە؛ **مەدام:** بادە.

**پوختەی مانا:**

ئەو پەریە ناسك‌و نازدارە، دەم‌کوڵ‌و شیرین وتارە ـ کەشای سەرتەختی جوانی‌یە ـ بە بەرگی ئاڵ‌و واڵاوە ـ کە لە قوماشی سوندوسە ـ لەشەوی ئەنگوست لەچاوا، بێتەدەرو خۆی نیشان‌داو تیشکـی روخساری لەدنیا پرشنگ بدا. هەمو شاهانی سەرزەوی، باخوسرەوی شـیرینیش‌بن؛ لەبەر دەرکی ئەو دەکەون‌و لە دامێنی ئـەو دەنەون‌و دەبنە عەبدێکـی سـەرکزی‌و بەگەدایی لەدەرگای شـانازی دەکەن. چونکە هەرکەس هەرجارێك یارم ببینێ، هەرگیز مردن توشی نابێ‌و هەرکەس چاوی بەو دیدارە رۆشن نەبێ، خۆشی‌و ژینی لێ حەرامە.

هەر ئەو بادەی، لەدەستی ئەو ئەخورێتەوە، نۆشـی گیانەو بەگیان خـۆشە، بەدەسـتی ئـەو ژەهریش هەمیشە لەبادە بەرێزترە. هەرکەسێ لەیارم دورەو دەیەوێ بادەبنۆشێ، یاخـوا بادەی لێ ببێ بە ژەهری مارو سندان‌و قوززە ڵقورتی‌بێ.

٧ وان درەقصێدا کودیم ئاور پەیاپەی دانەمن
بەرق‌و تیرێژان لدلدان جەذبەیا عیشقی رەقام

٨ عومرەکە دوربوم ژجانان کەتمە بەندا فیرقەتێ
ناگەهان پەردە هلانی گۆ: مەلایم السلام (یان، مولایم...)

**مانای وشە:**

**وان:** ئەوان، بۆ ڕێزگرتن بۆ یەکێك ئەوان دەگوترێ؛ **ئـاور:** ئـاگر؛ **ئـاوڕ:** بۆ دواوە ڕوانین، بەتیلەی چـاو ڕوانین؛ **پەیاپەی:** بەشوێن یەکا، خۆش‌خۆش؛ **تیرێژ:** تیشك؛ **جەذبە:** کێش؛ **رەقـام:** رفێندرام؛ **هلانی:** لای‌برد، لای‌گرت؛ **مولایم:** هێدی‌و لەسەرخۆ؛ **مەلایم:** مەلای من؛ **اَلسلام:** سـڵاوت لێ؛ **اَلسـلام:** هەر نەماوی.

**پوختەی مانا:**

لەکۆڕی گۆبەندو بەزما، یار دیتمی‌و لەسـەریەك ئـاوڕی وی دەدامو ئـــاوری دەهەناوم بەردا. بروسکەو تیرێژی جوانی، هاتنە دڵ‌و کێشەری ئەوین ڕای‌کێشامو ڕفاندمی‌و من هەرنەمام. دوری لەیار هەرتاوێکیش بێ، عومرێکــە. من عومرێك بو کەوتبومە ناو زیندانی خـــەمی دوری یاری دڵبەند. ئەو ڕۆژە لەو گۆوەندەدا، لەپڕ یار لە پەردە دەرهات؛ لەمپەری جودایی پەڕاند، زۆر بەنەرمی پێمی فـەرمو: مەلای منی؟ سـڵاوت‌لێ. هەر بەو تۆزە دواندنەی ئیتر من یەکجــاری مردم. ئەلفاتیحا.

# قصیدەی شێستو هەشتەم

## «نەترک و بازن»

١ رەمزێن‌تە دجانان نە بەئەندازە درازن
هەریەك بهەزار رەنگ رەوانێ مە دخوازن

٢ وان دەر بەلجانان مەوەکی بەرق‌و بروسکان
تیرێ تە دجانان نەتنێ سینە گودازن

٣ جانا ژجەفایاتەو ظولمێ چخەبەر دین
کوتیر ژجەوراتە ددلدامە بگازن

٤ پەروانەو بولبول بدلن شوعلەیی عیشقێ
لێ‌کوتو نەظەردی بخوە ئەو گولشەنی رازن

**مانای وشە:**
دراز: درێژ؛ رازان: راکشان؛ درازن: رادەکشێن، خۆ درێژ دەکەن؛ رەوان: گیان؛ رەوان: پەلەو خۆش‌رۆ؛ دەرب: زەبر؛ دەرب: رێگە؛ سینە گوداز: سنگ تاوێن؛ جەور: زوڵم؛ جەور: لەرێ کلابون؛ جەور: دەنگی بەقەوی هەورە تریشقە؛ گاز: گەزی پێوان‌و گەزی ددان؛ گازن: گلەو شکایەت؛ گولشەنی راز: باغچەی پڕلەنهێنی؛ گولشەنی‌راز: کتێبێکە شیخ محمودی شەبستەری (ساڵی ٧١٧ کۆچی) لە هەزار بەیتا، دای‌ناوەو هەمووی هەرباسی عیرفانە.

**پوختەی مانا:**
ئیشاراتی نهێنی تۆ، لەگیانانلدا، لەو ئەندازەیە دەرچو، کەهیچ گیانێك دەری بەرێ‌و گیانمان زۆر بەرتەسك‌ترە لەوەی رازی تۆی تێ‌بچێ‌و جێی بێتەوە. کە لە گیاندا پاڵ دەکەوێ. هەریەك لەو رازی واگرینگ بە هەزار رەنگ‌و تەرزەوە خۆ دەنوێنێ‌و دەیەوێ گیانمان بستێنێ‌و بە پەلە بیبا بۆ

خۆیو دەرسی دڵداری ئەوینی پێ ڕەوان‌کاو گیان ئەو ئـەرکەوا گرانەی زۆردژوارە، بۆ هەڵگیرێ. ڕازی ئەوین، وەك تیرێکن لە بروسکەی عاسـمان دەکەن. تەنیا بەوەندە بەس ناکەن. سینەمان بتاوێننەوە. نیشـانەیان لە گیانمانەو هەر دەپێکـن. یارە گیانە شـیرینەکەم، چـۆن ڕێم دەکەوێ بەگلەیی لەدەست ظوڵمت بناڵێنم. ئەوی منیش ئازار دەدا، هەر ڕوحمو بەزەیی تۆیە و من نایزانم. من لەدەس تیران دەناڵم. تیریش گلە لەبەختی خـۆ دەکەن؛ کە تۆ دورت خستونەوەو لە دڵی مندا جێگـات داون. چیرۆکی منو تیری‌تۆ، وەك چیرۆکی بولبولو پەپولە دەچـێ. بە ڕواڵەت گڕی ئەوینێ بڵێسەی داوەتە دڵیان بەڵام بێ‌ینە باری ڕاستی؛ ئـەو هەردو دڵسـوتاوانە بونەتە گوڵجـاری ڕازانو لەناو بەهەشتی ئەویندا، دێنو دەچنو دڵیان بویتە گوڵشەنی ڕاز. پڕیە لە باسی خواناسی.

٥ پەیوەستە ژوەصلێ تەدمێنم کوسەراسەر
بشکوژ وطەلیسمو وەرەقو نەترکو بازن

٦ سوببوحیو قودوسیو حورێن دبەهەشتێ
پەیوەستە شەبی قەدری لیقایاتە دخوازن

**مانای وشە:**

**پەیوەستە:** هەمیشە، بێ‌نێوان؛ **بشکوژ:** قۆپچە؛ **طـەلیسـم:** پارچێك خشـڵی زێوینە. دوعای لەسـەر هەڵدەکەنن تا لە جنۆکەو دێوو درنج بیارێزرێن؛ **وەرەق:** گەڵا. خشـڵێکە وەك گەڵا دەچـێ؛ **نەترك:** مانگوڵەی لەرزانە؛ **باز:** دەرزیلەی خشڵ بەشکڵی‌باز؛ **بازن:** دەسـتەوانەی لە زێڕو زیو؛ **سـوببوح:** ناوێکـی خوایە؛ **سوببوحی:** بەو فـرشتانە دەڵێن کە هەر دەڵێن سـوببوح، سـوببوح، واتا خـوایە پاکی هەربوتۆیە؛ **قوددوس:** ناوی‌خوایە؛ **قوددوسی:** ئەو فریشتانەن کە هەمیشە دەڵێن قـوددوس، قـوددوس، واتا خـوایە هەر تۆ خاوەنی پیتو پیرۆزیت؛ **لیقا:** توش‌بون.

**پوختەی مانا:**

یاری نازدار! خۆت لە دڵی من بەئـاگای. جیا لەتۆ، هەمو شـتێك لەبەرچـاوم بێگـانەیە. دەمەوێ ئـەگەر بت‌گەمێ هیچ‌شـت، هیچ ئـافەریدەیەك بەگیان، بێ‌گیان، بەنهێنی نێوان منو تۆ نەزانێ. نامەوێ تەنانەت قۆپچەو خشڵە زێڕو زێوەکانیش، کە تەلیسمو پەلكو خرینگەو مەنگوڵەو دەرزیلەو لەرزانەو بازنو خـرخاڵنو لەسـەر تاپای تۆ هاڵاون؛ پێ بزانن. بەزرینگـە، دەنگ دەدەنو لێم تێك دەدەن. بۆیە هەمیشە لەهاتن بۆ بارەگاو دیداری تۆ، من داماومو بەش‌بڕاوم.

نازانم کێ گوتویە:

قەڵەم بێگانەیە تابێ لەرازی ئێمە ئاگابێ     مەڵێ بۆ نامە نانوسی، لە نێوانی منو تۆدا

٧ سونبول بسەماتێن‌و گولان پەردە دراندن
بشکفتنە ئال‌ئال‌و هشین بونەتەڕازن

٨ جوبار درەوانن چەمەنان تەرح جوانن
مەستانە برەف رەف لکەناران سی‌و قازن

٩ هەریەك بتەماشاگەهی حوسناتە ژهەرجا
تەشبیهی نیگاران بجەمالاتە دنازن

**مانای وشە:**

**ئال‌ئال:** گوڵێکی کوێستانە؛ **هشین:** شین، کەوە؛ **هشین:** سەوز؛ **تەراز:** ڕێك‌و لەبارو بەرانبەر؛ **تەڕازن:** مێرگی بەتەڕایی، تەرەزن؛ **تەرح:** بیچم، لق، چڵ.

**پوختەی مانا:**

ئەی‌دڵە! وەرە بڕوانە؛ بەهارە دنیا خەمڵیوە. سمڵان بەدەم شنەباوە سەمایانە، دەلەرنەوە. گوڵی گوڵاو ـ کە خونچە بون‌و لە شەرمان، دەرنەدەچون ـ لە خۆشیانا، سەرخۆش بون. پەردەیان دڕاند. بڕوانە چلۆن پشکوتون. گوڵی ئال‌ئال، بەهەزار ئاڵ‌و واڵاوە، خۆ دەتوێنن. هەرچی چیمەن‌و مێرگوڵەن، لە خۆشیانا گەش بونەوەو لەتاسەی دیداری گوڵان، ئاویان دەچاوان تزابو. ئێستە لە خۆشی دیمەنیان، هەمو دەمیان پڕ لەئاوەو لە تریقەی خەندەی جوگەلان، هێند پێکەنین، شین بونەوە. بڕوانە چەند ڕێك‌و پێکن، تیپی گوڵان، بە تەکوزی هەڵوێستاون. جوگەی ئاوان، بە ڕەوانی‌و بیچمی چیمەن وابەجوانی، کارێکی وای‌کرد کەسی‌وقاز لەو دیمەنە گەشکە بن‌و وەك سەرخۆشان، بێنە دەورەی گوڵ‌و ئاوان‌و پۆل پۆل لە دەورەیان گەڕێن. یاری گیانم! دڵی‌دڵم! هەم گیان هەم دڵم، هەم گوڵم. ئەو هەموانە چگوڵن، چمەلن؛ چقل. چئەو سەوزەی لە چیمەندا پی‌دەکەنن؛ گشتیان سەریان دەرێناوەو بە چاو، بەدڵ‌دەڕوانن‌و بەتاسەوەن تۆببینن. هاتونە سەیری جوانی تۆ. هەمو گیاندارو بی‌گیانێك، وەك هەمو جوان‌و دڵبەران، بەجوانیت شانازی دەکەن.

١٠ تیران لمەدەت دوست مەتیٚ سێنە هەدەفکر
نازان لمەکەت یاری، مەزاری‌و نیازن

١١ میحرابی دوئەبرو کو ژبالاتە خویابن
دەر سەجدەگەهی عیشق نیازی مە نەمازن

١٢ گەر حوسن‌و مەحەبەت بسەراپەردەیی جان‌بن
گەه شاهو گەدا، گەه بخوە مەحمودو ئەیازن

**١٣ ئەڤ حورو پەریچیهرە بتولاتی جەماڵێ**
**دەر صورەتی تەحقیق «مەلا» عەینی مەجازن.**

**مانای وشە:**

**هەدەف:** ئامانج؛ **زاری:** گریان‌و شیوەن؛ **نیاز:** پاڕانەوە؛ **نەماز:** نوێژ؛ **نەمازە:** تایبەتی؛ **چیهرە:** روخسار.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر یار تیرمان باوێتێ؛ ئێمە سینەی بۆدادەکەین بەنیشانە. ئەگەر ئەو دەسکا بەنازان؛ ئێمە بەگریان‌و نیازو پاڕانەوە دەیدوێنین.

ئەگەر طاقی برۆکانی، لەو باڵایە بێنە بەرچاو؛ سوژدە دەبەین لە جێگای سوژدەی ئەویندا. نوێژەکانمان تایبەتین‌و نوێژو نزای دڵدارانەن. ئەگەر جوانی دەگەڵ ئەوینی راستیدا، بکەونە ناو سەرسەرای گیان‌و تێکەڵاوبن؛ نەشایەتی لەناو دەمێنێ‌و نەروتی، لە بازاری ئەوێنێ، سوڵتان‌و گەدا دەبنە یەك‌و مەحمودو هەیاسێك نیە. هەر یەك لەوان هەم مەحمودە هەم هەیاسە. چونكە تازە لە بوتەیەکدا تواونەوەو جیاوازی لەناو نەماوە. ئەو جوانانەی کە وەك حۆری‌و روخساریان وەکو پەریانەو، ئەو بتە جوان تاشراوانەی ـ کە خەڵکیان پێ گومرا بوە ـ ئەگەر بەراستی بڕوانین‌و بەوردی لێی وردبینەوە؛ پێدەزانین جوانی بەدەڵن‌و جوانی راست لەپشت پەردەی ئەزەلیەوە تیشکی داونێ.

# قصیدەی شێصت‌و نۆیەم

## «دەینی بوسە»

١ مەلامە لگەردنا دلبەر ژنوصەد بوسە ماین دەین
مەجالێ دێ بخوازم ژێ دبێ دەینی‌تە (فَوْقَ‌الْعین)

٢ برەمزا قاب قەوسەینێ ژوان بورهان خەبەردارین
(فاتِ‌القَوْسَ بٰاریهٰا اَلاٰ یارامیَ الْقوسَیْن)

**مانای وشە:**

**مەجال:** وەخت؛ **دبێ:** دەبێژێ؛ **دەین:** وام، قەرز؛ **فَوْقَ‌الْعَیْن:** باڵای چەم، لەسەر چاو؛ **قاب قەوسەین:** بە ئەندازەی ژێ کەوانێك (باسمان لێکرد)؛ **فات:** دەبێنە؛ **بٰاریها:** تاشەرەکەی؛ **الا:** هۆی؛ **یا:** ئەی؛ **رامی:** هاوێژ؛ **قەوسەین:** دوکەوان.

**پوختەی مانا:**

یار دەیفەرمو ئەگەر لە ئەویندا مردی؛ ماچێکت پێ قەرزداربم. تۆ لە کۆنە قەرزان گەڕێ کە نەگەیون. وا سەرلەنوێ، صەدجار لەبەر پێی‌دا مردوم. دەبێ صەد ماچی گەردنیم لەسەری‌بێ. هەتا دەڵێم کوا قەرزەکەم، دەڵێ قەرزت لەسەر چاوان. ناڵێ لەسایەی گەردنم، دیارە دیسان وای‌نیازە چیم پێ نەگا. هەر لەباسی قابەقەوسەین لەرازی نهێنی بروّی ـ کە ئەندازەی دوکەوانن ـ ئاگادارین. کەوان بدەرە دەست وەستا، ئەی تیر بەدو کەوان هاوێژ.

هەروەك لەکوردی‌دا دەڵێن «نان بۆ نانەوا رەوایەو گۆشت بۆ قەصاب». لەناو عەرەب بوّتە مەسەل «کەوان بدە دەس کەوان تاش». واتا هەریارم دەزانێ دڵان بەتیری مژۆڵان‌و لە کەوانی بروّی کەوانیەکەیەوە، بهەنگێوێ. هەمو تیر هاوێژێکی‌تر، بابچنەوە ماڵی خۆیان.

**٣ ژسیررا لامەکان واجب تەنەززول کر دئیمکانیٚ**
**(فَأینَ العِلمُ، أینَ العینُ، وَأینَ اللاَّین إِذلاَأینْ)**

**مانای وشه:**

**لامەکان:** بیٚجیٚگە؛ **واجب:** پیٚویست؛ **واجب‌الوجود:** خودا، واتا بیٚگومان هەر هەیە؛ **ئیمکـان:** شـیاوی، ئیمکان لە زاراوەی فەلسەفەدا، بۆ کرداریٚك یان شـتیٚکیوا دەبیٚژن کە لەسـەر بون‌و نەبونی پەك نەکەویٚ. وەك بونی مرۆو شـینایی‌و جـانەوەرو دورەگیانی بیٚبزوتن. ناوی مومکین لە بە رانبەر وشـەی واجبدا دەگوتریٚ؛ **اِین:** لەکویٚ؛ **عَین:** چاو، بەرچاو؛ **إذ:** کە.

**پوختەی مانا:**

خودای گەورە، لە نهیٚنی بیٚجیٚگەیی دەستی هەڵگـرتو خـوٚی لە شـیاوان (لەئیٚمکـانی)دا، نیشان‌داین. وەك خوٚی فـەرموی: «گەنجینیٚکـی نهیٚنی بوم، ئـافەریدەم هیٚنانە گوٚڕ تا بمناسـن» ئەگەر لەبەر ئەو رازە گرینگە نەبا؛ چوٚنمان دەتوانی بیناسین؟ کوانیٚ زانست، کوا سوٚمای چاو، کوا شتی دیار، تەنانەت کوا لەکویٚ هەبو، کە ئەگەر خوا، دنیای دروس نەکردایەو وەختو روٚژو شەوو دەمی دانەنایە؛ وشـەی کوانیٚو لەکویٚش، نەدەزانرا چیە. بوٚخـوای گەورە نە دەم‌و کات‌و سـات هەیەو نە جیٚگەو شویٚن.

**٤ ژمابەینا دوئەبرویان پەیاپەی بەرقی لامیع تیٚن**
**بعەینی گەربی صافی چنورەك صیرفە ئەو مابەین**

**مانای وشه:**

**مابەین:** نیٚوان؛ **مابەین:** دەرباری سوڵتان، هوٚدەی چاوەنوٚڕی بوٚ دیتنی سوڵتان؛ **صـیرف:** خـالیص‌و پاکی بیٚ خەوش.

**پوختەی مانا:**

لەنیٚوان هەردو ئەبروٚیان، لە سەریەك هەر بروسکەی پڕتروسکە دیار دەدەن بوٚمن. بەچاوی رون‌و بیٚتانە، کە بی‌بینی، دەزانی لەو نیٚوانەی‌دا نیشانەی کامە نوری‌پاکە دەنویٚنیٚ.

**٥ بدەستورا تەدا، وی ژی ژقیٚ ناقیٚ ڤەریٚکم ئەز**
**(فَصَنِّفِ العَینُ نورَ العَینِ اَلاٰ یا زَینَ کُلِّ اَلزَّینْ)**

**مانای وشه:**

**دەستور:** ئیجازە؛ **ویژی:** ئەویش؛ **ژقیٚ‌ناقیٚ:** لەمونیٚوانە؛ **ڤەریٚکم:** بەریٚ بکـەم، لەنیٚوان لابەم؛ **فَصَـف:**

دەسا رون بکەوە؛ **نورَالْعَين:** ئـەی نوری چـاو؛ **ئـەلا:** بریەتیەلە: دەگەڵ توٚمە؛ **یا:** ئـەی؛ **زَيْن:** زینەت‌و جوانی؛ **کُلّ:** هەمو، گش.

**پوختەی مانا:**

یاری تاقانەی بیٚهاوتام! ئەگەر توٚئیجازە بدەی‌و ڕێگـە بدرێم بوٚ بارەگای نزیکـانت؛ من گەرەکمە ئەو نێوانەش کە بروٚی یاری دنیایین‌و لەوانەوە تیشکی خـوٚتت نیشـانداوم؛ لە ناو بچـی‌وٚ چـاوم بەخوٚت ـ کە سوڵتانی سـوڵتانانی ـ بە بیٚ نێوان‌و ناوبژی‌و پەردەو لەمپەر رون بیٚتەوە. دەزانم ئـەو دیتنەی توٚ، چاوی دڵی رونی دەوی‌وٚ ئـەمشـیٚ تانەی لەســەر نەبیٚ. دەســا بەزەییت پیٚمدا بیٚت. روناکایی چاوەکانم چاوی دڵم رون‌کەرەوە؛ با جوانیەکەت بیٚ پەردە بیٚتە بەر چاوان؛ ئـەی جـوانتر لە هەمو جوانان‌و ئەی مایەی جوانی گش‌جوانیٚك لەعالەمدا!

٦ بەهایی عیشوەیەك لەعلان مەیەکسەر (مامَلَكْ) بەخشی
دل‌و جان ژی لسەردانی‌و ظالم هیٚژ دبیژت: دەین

**مانای وشە:**

**بەها:** نرخ، بایی؛ **یەکسەر:** بەیەکجارەکی؛ **مامَلَك:** هەرچی شکـی دەبرد، هەرچـی هەمبو؛ **هیٚژ:** هیٚشـتا، هیٚمان.

**پوختەی مانا:**

لە نرخی نازی لیٚوانی، بەجاریٚك هەرچی هەمبو دام
دل‌و گیانیش کرا پارسەنگی، زاڵم هەر دەڵیٚ: کوا وام
«نالی» دەڵیٚ:
قیمەتی ماچی دوصەد کیسەیی ساغەو نیمە غەیری یەك کیسەیی صەدپارە لە گیرفانم دا

٧ مەلا هەروی ببین هەروی ئەگەر هەروی دناسی‌تو
(هُوَالْمَعْبود. هُوَالْمشهود. بَلْ لاغَيْرَ فِیاَلدّارَيْن)

**مانای وشە:**

**هُوَ:** ئەو؛ **مَعْبود:** پەرسراو؛ **مَشْهود:** دیارو بەرچاو؛ **بَلْ:** بەڵکە؛ **لاغیر:** نەشتی‌تر؛ **فِیالدّارَين:** لە هەردوك ماڵاندا، واتا، دنیاو قیامەت.

**پوختەی مانا:**

مەلا لەکویٚی؟ لە بارەی کیٚوە توٚ دەدویٚی! ئـەگەر یاری تاقـانەی سـەروەری یاران، دەناسـی‌و تانە

لەسەر چاوی دڵت نیە؛ هەر لەو بڕوانە هەر لەوی. هەر ئەو شیاوی پەرستنە. هەر ئـەو دیاری بێ پیوارە. تەنانەت ئـەوەش بزانە کە لە هەردوك دنیایاندا، جگـە لەخـوێ؛ هیچ‌کەس نیە کە بۆ پەرستنێ بشێ.

## قصیدەی حەفتایەمین

# "چیرۆکی جوانیت"

١ من دبەر (قالوابَلیٰ) باطن ڤەویرا بو ئەڤین
هێژ لسەر عەهدا ئەلەستم تابرۆژا ئاخرین

٢ من دڤیٚ لیٚ ئەشکەراکەم جارەکی داغا نهین
(گُفْتَمْ اورا ما دُعاگوی ِ توایم أیْ حورعین)
(أعْرضَتَ عَنّی وَقالَتْ مادُعاءُ الْکافِرین)

**مانای وشە:**

**قالوابَلیٰ**: باسی‌کرا؛ **ڤەویرا**: دەگەلٚ ئەو؛ **عەهد**: پەیمان؛ **عەهدا ئەلەست**: پەیمانی ئەو رۆژەی کە خـوا گیانی دروس کردن؛ **گُفْتَم**: گوتم؛ **ما**: ئێمە؛ **حورعین**: کیژە چاو رەشەکەی بەهەشت؛ **عین**: چاو گەورە؛ عین: گاکێوی کە زۆر بەچاو جوان ناسـراوە؛ **أعْرَضَتْ**: روی وەرگێڕا، نارمزایەتی نیشـان‌دا؛ **عنّی**: لەمن؛ **قالَتْ**: گوتی ئەو مێوینە؛ **ما**: چیە؟؛ **دُعاءُالکافرین**: نزای خـوانەناسـان. خـوا لەقـورعان وتووێژی جەحەندەمیان دەگەلٚ پاسەوانی تونی ئـاورمان بۆباس دەکاو فـەرمویەتی: «ئـەوانەی لەناو ئـاگران بە پاسداری دۆزەق دەلێن: داوامان بۆ لەخوا بکـەن رۆژێك لەسـزامان سـوك‌کا. پاسـدار لەوەراما دەلێن: راسپاردەتان لە ئێمەوە نەهاتەلا، بە بەلگەی زۆر ئاشکراوە. دەلێن بەلیٚ: دەلێن بۆخـۆو دوعابکـەن. دوعای کافران، جیا لەریٚ لیٚ‌ون‌کردن؛ چیتر ناکا.»

**پوختەی مانا:**

من بەرلەو رۆژەش کە خودا گیانی بۆ لەشـان دروسـت کرد؛ بیومە دلداری یارم لە دەروندا. هەتا ئێستاش، هەر لەسەر پەیمانم ماوەونەگۆڕاوەو، تا دواڕۆژیش هەروا دەبم. هەمو ئـاواتم ئـەمەیە جارێك داخی ناودلم ئاشکرا بکەم.

پێم گوت: ئێمە نزاگۆتین، هۆی چاورەشـە بەهەشـتیەکە! روی لەمن وەرگێڕاو گوتی: دوعای

کافر بەچی دەچیٚ؟!

٣ ئەی شەهی عالیجەناب، پور عاجزو پەرگەندەئەم
ئاە ژدەست جەورا ئەڤینیٚ چبکرم؟ من بەندەئەم

٤ صەبرو طاقەت من نەمان لیٚ بی‌کەس‌و دەرماندەئەم
(گر بخوانی ور برانی بندەام تازندەام)
واجِبٌ لی إمتثالُ الآمرِ ماذا تَأمُرِین)

**مانای وشە:**

**عالی:** بڵند؛ **جـەناب:** لایەن؛ **عالیجـەناب:** وشـــەی ڕێزگرتنە بۆگەوران، واتا: پایە بەرز؛ **پەرگەندە:** پەراگەندە، پەرێشـان وبڵاو؛ **دەرماندە:** داماو؛ **بخـوانی:** بانگ‌کەی؛ **برانی:** دەرکەی؛ **واجـب:** پێویسـت؛ **لی:** بۆمن؛ **إمتِثال:** بەجیٚهێنان؛ **ئەمر:** فەرمان؛ **ماذا:** چی؛ **تأمُرِین:** ئەمر ئەفەرموی خانمەکە.

**پوختەی مانا:**

پادشای پایەبەرزی جوانان! زۆر وەرەزو پەرێشانم. ئاخ چی‌بکەم لەدەس ئازاری ئـەو دڵداریە. من کۆیلەی تۆم. ئۆقرەو ئارامم پیٚنەما. یەکجـار بی‌کەس‌و داماوم. گەر دەرم‌کەی یان وەمخـوێنی، من هەر کۆیلەم هەتا زیندوم. پێك هێنانی فەرمانی‌تۆ، بە ئەرکی پێویست دەزانم، چۆن دەفەرموی تا وابکەم.

٥ صوهتم ئەز پێتا ئەڤینیٚ تێك بو ئەم گەردو هەبا
(إنّ لی آیاتُ صِدْقٍ کانَ فی‌هذا النَّبا)

٦ حوری‌یا ڕوٚژا لیقائیٚ، نازکا مەخمەرقەبا
(حَبّذا رَوْضاتُ نَجْدٍ زُرْتُها عَهْدَالْصبا
(رَوْضَةٌ یَجْری عَلیٰ اَرْجائِها ماءُمَعینْ)

**مانای وشە:**

**پێت:** گڕ؛ **گەرد:** تۆز؛ **هەبا:** تۆزە وردیلەی دەوری هەتاو؛ **إن‌لی:** تەواو بۆم هەیە؛ **ئـــایات:** نیشـــانگەل؛ **صِدْق:** ڕاست؛ **کانَ:** بو؛ **فی:** لەناو؛ **هذا:** ئەم؛ **نَبا:** خەبەر؛ **لیقـا:** توش‌هاتن؛ **مەخمەر:** پارچێکـە؛ **حَبَّذا:** چەند خۆش‌بو، ئای کەباش‌بو؛ **روضات:** باغچەگەل؛ **نەجد:** زورك؛ **نەجد:** تەپۆڵکەی بی‌گیا؛ **نەجد:** ناوی ئەو گردەیە کە قەیسـی عامری (مەجنون) لەسـەر ئـەویٚ دوربەدور دەیڕوانیە ڕەشـماڵەکانی هۆبەی لەیلیٚو گۆرانی پێدا هەڵدەگوت؛ **زُرْتُها:** دیدارم لی‌کرد؛ **عَهْد:** زەمان‌و چاخ؛ **صبا:** منداڵی؛ **یەجـری:** ڕەوان دەبیٚ؛ **عَلیٰ:** لەسەر؛ **ئەرجائِها:** لایەن‌گەل؛ **ماء:** ئاو؛ **مَعین:** ڕەوان.

**پوختەی مانا:**

بەگڕی ئەوینێ سوتاوم؛ توزو خوڵیشم بابردی. درۆ ناکەم شایەتم هەن. هەرچی بو، دڵداری کردی. حۆریەکەی بەهەشتی خودا، نازکوڵەی کەوا مەخمەرم! بیریك لە هەژاریم بکە. ئاخر بێ‌تۆ چۆن دەربەرم؟ خۆزگەم بە دەوری مندالی‌و چونە نەجدی پڕلەوەڕی. چەند کانی‌و ئاویشی لێبون. داخم ئەو خۆشیە تێپەڕی.

شیاوی باسە، ئەو بەیتە لە شیعرەکانی قەیسە بۆ لەیلای داناوە. گۆیا دەگەڵ لەیلایەدا بەمندالی لەنەجد، بەرخو کاریان دەلەوەڕاند.

**٧** من لسەر بەدری مونیر مەکتوب دیە نەقشی سەواد
سەر بەیەك ئانی دونونان خەططی ڕەیحانی دوصاد

**٨** حادری من سەجدەبر لەو غەرقی خونیٚ بو فوئاد
بَرْ دَرِ باغِ وصالَشْ هاتِفی آواز داد:
(هٰذِهِ جَنّٰاتُ عَدنٍ فادخُلواها خالِدِین)

**مانای وشە:**

**سەواد:** ڕەشایی؛ **حادری:** دەس‌بەجێ، هەرلەجێ؛ **فوئاد:** دڵ؛ **بەردەری:** لەبەر دەرکی؛ **وصال:** پێك گەیشتن؛ **هِذِهِ:** ئەمانە؛ **جَنّٰاتْ:** باغات؛ **عَدْنْ:** ئەو بەهەشتەی خوا دابوی بە بابە دەم؛ **فادخلواها:** بچنە ناویەوە؛ **خالدین:** هەتاهەتایە.

**پوختەی مانا:**

لەسەر مانگی چاردەشەوەی ترێفەدەر، من نەخشێکی ڕەشم دیوە. دو نونی خەتی ڕیحانی ـ کە وەك دو برۆی یارم دەچون ـ گۆشەیان دابوە سەر دوصاد ـ کە بە چاوی یار، دەشبهان ـ دڵم بوبە گۆمی خوێنێ لەو دیمەنەو سەرم خستەسەر سوژدەوە. لەو حانەدا، لە دەرکی باغی یارەکەم ـ کە جێ ژوان بو ـ دەنگێکی بێ‌ڕەنگم دەبیست دەیگوت: ئێرە بەهەشتی ئادەمە بچنە ژورو لێی دەرمەچن.

**٩** نائیتن گۆتن بقال شەرحو بەیانی حوسنی‌تو
دی بحالو سێربناسن دل فەسانێ حوسنی تو

**١٠** خوەش «مەلا» ئامانجی تیران‌کر کەمانی حوسنی‌تو
قِصەی عِشقِ جَلالو داستانِ حُسنِ تو
تِلْكَ أنْباءُ یَقولُ اَلنّاسُ مِنّا بَعْدحین

**ماناى وشه:**

**فەسانە:** ئەفسانە، چیرۆکی کۆن؛ **داستان:** سەرگوروشتە؛ **تِلْكَ:** ئەمانە؛ **انباء:** دەنگو باس‌گەل؛ **یقــولُ:** دەڵێ؛ **ناس:** مەردم؛ **مِنّا:** لەئێمە؛ **بعد:** دواى؛ **حین:** ماوەیەك لە رۆژگار.

**پوختەی مانا:**

هەر بەگفتی سەرزارەکی باسی جوانی تۆناکرێ. دەبێ ئەهلی دڵ بزانن چیرۆکی جوانی تۆ چـۆنە. ئەم جـوانیەی چـەندبە باشـیمەلای وەبەر تیران داوە. چیرۆکی دڵداری «جــەلال» لەگەڵ باسی‌جوانی تۆدا، دەبن بەباس‌و خەبەرێك کە مەردم لە دوارۆژێکا، بۆ یەکتری دەگێڕنەوە.

شیاوی باسە، وەختە بڵێم بێ‌گومانم ئـەو شـیعرانە هی بوێژێکـی ناو «جــەلال» بوە. مەلا تەضمینی کردوە. بەڵام داخـەکەم نەمزانی ئـەو مەلا جـەلالە کێ‌بو. جــەلال‌الدین رۆمی نەبوە. جەلال‌الدین دەوانیەکی شاعیر هەبو؛ لە چەرخی نۆ تا سەرەتای چـەرخـی دەهەم (٨٣٠ تا ٩٠٨) ژیاوە. نازناویشی فانی‌بوە. سەیرئـەوەیە: لە هەمو ئـەو نوسـخانەدا، کەمن دیومن؛ هەوەڵ لەتی دوامین بەیتی قصیدەکە، زیاد لەهەموان، تەواو کوردانە نوسـراوە. نوسـیویانە عشـقا جـلال‌و داستانا. بۆ ئەوەی سێ لەتەی مەلاش وەك ئەوبچی. پاشڵەکانیان دەگەڵ ئەو هێناوەتەوە. بەیانا، فەسانا، کەمانا، ئـەمانە هەر ویسـتویانە قصـیدەکە خـڕوپڕ هەر هی مەلابێ بەڵام پیاو کە مرخو چێژەی شیعری مەلای باش چێژتبێ؛ دەزانێ شیعری ئەو نیە (هەژار)

گفتەکانی وەك مرواری لیّ دەپرژا.

زۆر لەمێژبو، لەیار دوربوم. بۆ خوا سوپاس بەودیدارەی کە روبەرو بەچاو دیتم؛ خەمی دوریم لیّتاران و سەبوریم هات. ئۆخەی ئەوا بەدیداری یار گەیشتم. شوفار وەختە لەعەزرەتان وەزگ بدەن. لە ئێرەییان لەش بەبارو شەرمەزارن. هەی نەحلەتی خوایان لیّبیّ.

یاری نازداری خوێن‌شیرین، کە منی بەدەم خوێندەوە، گفتەکانی بادەی حەڵاڵی‌بەهەشت بون - کە هیچ تلّتەی تێدانیە. هەرچەند صەد لەمپەرو وارش، لەنێوان من و یار هەبو، کەپێك بگەین؛ بەڵام ئەوین زۆر بەهێزە، لەمپەری لەبەر پەڕاندم و پەردەی بەرپیواری سوتاندو منی‌بەو دیدارە شادکرد.

شاهی جەڤین غەم ژی رەڤین ماری شەڤین ئیساند ئەڤین
دەردو بەلاوین چون هەلا عومرەك مەلا مەهجور بو

۱٤ پورمن زەجر دیتن هەجر مابو ئەجر صبح و فەجر
شەمعا مە هەل‌بو صەد مەحەل میننەت مەدل مەسرور بو

۱۵ یار وەعدەدا بلەعلێن خوەدا وەربا مەدا چین پەردەدا
دسپێدەییّ چوم وەعدەیی کوژ بادەییّ مەخمور بو

۱٦ ئیحرام مەبەست ئەسوەد بقەست یار هاتە مەست ئەز چومە دەست
جوهتی حەبەش تیردان بوەش حەججا مەخوەش مەبرور بو

۱۷ ڤیّ کاکولیّ چینێن دلیّ قەلبیّ «مەلیّ» داڤ دانەلیّ
داڤا دلان نیڤ سونبولان سەرصوڕ گولان مەنقور بو

**مانای وشە:**

شاهی: شادی، گۆوەند، شایی؛ جەڤین: کۆوەبون؛ شەڤین: وەك شەوی رەش؛ شەڤین: خوارو چەماو؛ ئیساند: ئایساندی؛ بەلاوی: بەلوایان، دەردوئازارگەل؛ هەل: بەرمژور؛ ئەجر: پاداشت؛ فەجر: سەرەتای بەیان؛ مەحەل: جێگە؛ مەحەل: جار؛ وەر: وەرە؛ بامە: دەگەڵ‌مە؛ چین: دەچین؛ مەبرور: بەخێرو قبولّ؛ چینێن دلیّ: چینی تێدان؛ مەنقور: دندوك لیّدراو، غونچەی تازە پشکوتو کە هێشتا تەواو بڵاو نەبوە، بولبول دەچێتە سەری بەدندوك لیّ‌دەدا، تاخۆی بەتەواوی نیشاندا. پێی دەڵێن: گوڵی مەنقور.

**پوختەی مانا:**

بەمەی کەیار خوێندمیەوە، خۆشی و شادیم لیّ کۆ بۆوە. خەم و کولّ لەبەریان رەوین. کەزیەکانی - کە وەکودوشا ماری رەش لەسەرشان پاپۆکەیان بو - بزوتن و خۆیان راوەشاندو باوەشێنی گڕی ئەوینیان بۆکردم. هەرچی دەردو بەڵا هەبون، بەرەو ژورچون. پەڕینە کێو. بەڵیّ عومرێك لەیار

دوربوم. لەو دوریەدا زۆرم ئازارو جەفا دیت. هەزاران سوپاس بۆخودا؛ کە توڵەی دەردی کردەوەو شەوە زەنگی لەسەر بەختی رەشم رەواندو بەسپێدەی بەختەوەری دیداری یاری گەیاندم. وا لەوساوە لەصەدلاوە، مۆمی خۆشیم داگیرساوەو تیشك دەدا. کێ بێ لەمن دڵخۆشتربێ؟ یار بە لیوە ئاڵەکانی، بەڵێنی پێدامو فەرموی: وەرە لامان هەر بەتەنیایی ذەتبینم. لە بەرەبەیانێکدا چوم؛ کە هێشتان لە بەندی شەوێ بەیان تەواو بەرنەبیو. دیارە زیارەتی ئەو، حەجە. ئیحرامم بەست، رومکردە خاڵی سەر گۆنای ـ کە وەك «حَجَـرُالاسوَد» رەشو بەودمو پیرۆزە ـ یاری چاومەست، لەجوانی مەست، دیداریدا. چومە راموسانی دەستی. لە دوچاوە رەشەکانی، تیری مژۆڵم دارژانێ. بۆم دەرکەوت کە حەجەکەم قبولێ بوە.

(شیاوی باسە: لەوەختی حەج ئەگەر بارانە بیارێو حاجی بچنە بەر پلوسکی بانی کابە، کە پێی دەڵێن: لوسی رەحمەت. و، تەربین؛ نیشانەی حەج قبولێ بونە). ئەو کاکوڵە بەچینانەی، داویان بۆ دڵی هەژاری مەلای دڵدار ناوەتەوە. داو لەنێو چڵە سونبولی بسکانیدا شێراونەوەو گەیشتونە سەر کوڵمانی. کەتازە لە پشکوتنان. جاچۆن دڵم پێوە نەبێ؟!

## قصیدەی هەشتایەم

# «بەختی دەرویشان»

١ ددەستدا یەنگیەك نوبار منڕدی ئەو کەمان ئەبرو
لبالا جەدوەلەك جەبباری لێدا هەمقیران ئەبرو

٢ کوحەق ئەڤ حەرفو خەط کێشان لطالایی مە دەرویشان
دو قەوسان گوشە لیٚ بادانو سەرپەیوەستەمان ئەبرو

٣ تە دیداری، تە رەفتاری، تە ئەلماسین شەکەر باری
بعەینی ریٚ لسەر صادان، دونون رەیحان نومان ئەبرو

٤ (بِحمدِالله) بفەیروزی لوەجهیٚ دلبەریٚ منڕدی
کوماهی نەو نیشان منڕدان لطاقی ئاسمان ئەبرو

٥ تعالیالله نیشان دانە، بحوسنیٚ ئەو نەسەق دانە
ژنەقشو صەنعەتیٚ حەق ئەڤ نیشان چەشم، ئەڤ نیشان ئەبرو

٦ ژرەعنا نیرگزێن شەهلا مەجالیٚ هەمقیران بینم
هەزار رەمزو ئیشاراتن ژوان قەوسێن چەڤان ئەبرو

٧ «مەلا» دل تێك تەپەیکانن، ژمەحبوبان مە نیشانن
کەماندارین دغەددارن دبورجا ئەسمەران ئەبرو

**مانای وشە:**

**نوبار:** تازە وەکارخراو؛ **جەدوەل:** جەغزینگ؛ **جەببار:** زۆر خاوەن زۆر؛ **جەببار:** ناوی خودایە؛ **طالا:** بەخت؛ **تەدیداری:** دیداری تۆ؛ **بِحَمْدِالله:** بە شکورانەی خوا؛ **فەیروزی:** سەرکەوتن، بەمرادگەیشتن؛ **وجە:** روخسار؛ **چەڤان:** چەماو، خوارەوەبو.

**پوختەی مانا:**

یارم کەخۆی جوتە برۆی وەك کەوانن؛ ئەمرۆ دیتم کەوانێکی کاری یەنگی تازەکاری لەدەستا بو، روانیمە بەژن‌و باڵاکەی، لەو باڵایە، جەغزینگی قودرەتی خودا، دو برۆی بەرانبەر بەیەك زۆر لە ئەندازەو رێك‌و پێك دارژتبو. خوا ئەوپیتە پیرۆزانەی ـ کە ناویان خەتی روی‌یارە ـ چۆن کێشاوە. دەڵێی خەتی بەسەر بەختی ئێمەی هەژارانی دەروێش‌دا کێشاوە. هەردو کەوانی برۆیان سەریان گەیشتوتە یەك‌و گۆشەیان بای داوەتەوەو بەرەولا رومەت چەماون. وەك پیتی رێن لەسەر صادان. کە دوبەدو، وشەی «رص»یان لێ ساز دەبێ. کە واتا، پاڵ‌پێکەوەداو. بۆ کوشتنی ئێمەی دەروێشی جەفاکێش؛ دیداری تۆ، رەفتاری تۆ، ددانی سپی ئەڵماسی ـ کە لە دەمی شیرینتدان ـ ئەو دوبرۆیە ـ کە وەك دو نونی هەرە جوان، بەخەتی ریحانی نوسراو ـ بۆ نیشیان، وەك ریحانەیە. خۆزگەم بەوەی دەیان بینێ.

سوپاس بۆخوا بەختم هێنای وسەر کەوتم. برۆی یارم لەسەر هەنیە پاکەکەی دیت. کە عەیناً مانگی یەکشەوە، لە عاسمانی ساو. بنوێنێ چۆنە؛ وابو. گەورەیی هەر بۆ خودایە. چەند ئاکارو کردەوەکانی جوانن. دەبروانن، چۆن بەتەکوزی‌و رێك‌و پێك ئەو روخسارەی رازاندەوە. چاوی‌و برۆی هەریەکەی نیشانەیەکن لە صنعەتی خودای جوانی.

لەکاتێکا کە دوبرۆی چەماوەی وەکو کەوانی بەرانبەر بەیەك دەبینم‌و ئەو چاوە مەست‌و کاڵانەی لەژێریاندان؛ هەزار ئیشارەت‌و بەڵگەم لەدەست رەنگینی داهێنەر نیشان دەدەن.

مەلا! تۆ خۆت هەمو گیانت لە دلبەر نیشانی پێوە. بەتایبەتی دڵی ژارت، پڕ لە تیری دڵداری‌یە. ئەو کەوانداره بەهێزە، لەو کۆشکەوە ـ کە بورجی گەنم رەنگانە ـ بە کەوانی برۆیان دڵی پێکاوی.

## قصیدەی هەشتاویەکەم

# «ماهی نەو»

١ وی سپیدە ژبورجی قەوس ئەبرو نوماندن ماهی‌نەو
خوەش ژقەوسی ئەبروان ڤیرا کشاندن ماهی‌نەو

٢ گوشەیێن نونان بسەربادان ژقەوسی بیٚ وەتەر
میثلی ئەنگوشتانەبی صەدسیر بەیاندن ماهی‌نەو

٣ کەششفی بەدرا تەمام ئەحسەن ژبالا طەلعەتی
ژە ستیوادا گەزمەیان چەرخیٚ رەشاندن ماهی‌نەو

٤ وی لوەجهی ئافتابیٚ گاهی کفش‌و گاهی خەف
عارفی ئەهلی بەصارەت حەیێراندن ماهی‌نەو

٥ مل دزانم دانە بەر قەوسیٚ هیلالی گوشە زەر
لەو ژبالا گوشەییێن نونان لڤاندن ماهی‌نەو

٦ ئەز دبیژم دی لمن دیسا جەگەر صەد پارەکن
وی بمیزان هەردو شیرازی چەڤاندن ماهی‌نەو
داخلی مەجلیس بوی ئیشەڤ «نیشانی» لەو کوخەف
جامی روحانی لئەهلی دل نەشاندن ماهی‌نەو

**مانای وشە:**

**بادان:** بەبادان، چەرخاندن؛ **بەیاندن:** درکاندن، مەعلوم کردن؛ **کەششفی:** ئاشکرابو؛ **ئەحسن:** جوانترو باشتر؛ **کفش:** دیاری؛ **حەیێراندن:** سەرگەردان کردن؛ **لڤاندن:** بزواندن؛ **شیراز:** شاریٚکە جیٚگەی سەعدی‌و حافظ؛ **شیراز:** داریٚکی سورە وەك بەڵاڵوك دەچیٚ؛ **شیرازی:** جوٚرە کەوانیٚك بوە کە لەشیراز دروست کراوە.

**پوختەی مانا:**

ئەم بەیانە، مانگی تازە وێنەی برۆ لە بورجی قەوس، خۆی نواند. من وای بۆ چوّم، کە ئەم مانگە، لە وێنەی برۆی یاریمن، دروستکرا. گۆشەی برۆی وەك نونی سەر بەرەو ژێری، لە کەوانی ژی تیّ نەخراویکیان دەکرد. کە بۆ سەربەبادادانی دڵدارانی ئامادەیە. هەروەك قامکی ممبارەکی پێغەمبەر (ص)، کە مانگی تازەی لەتکردو صەد نهێنی کەس نەزانی ئاشکرا کرد.

یارم کە روخساری دەرخست، مانگی چاردەو جوانتر لە مانگی چاردە بو. لەو باڵایە ـ کە سیمای لیوە خویابو ـ شەوی چاردە بیّ مانگی یەکشەوە دیارە. بەڵام روخساری یاری من، لەسەر خەتی ناوەراستی عاسمانی ساوی هەنیەیدا برۆی کە وەك مانگی نویّ، لەو عاسمانەوە تیرداویّ بۆ دڵداران دیّتە بەرچاو.

روخساری یارم وەك خۆرە، کەچی برۆی ـ کە وەك مانگی یەکشەوەیە و نەدەبو دەگەلّ خۆر دیاربیّ ـ جارجار دیارو جارجار ونە. نەك هەرمن بگرە ریناسانی چاوی دلّرون، وەك من لەو مانگی تازەیەی ئەو روخسارە سەرگەردان بون. من دەزانم یارەکەی من، شانی داوەتە بەرکەوان، واتا ئەبرۆی ئامادەی تیر هاوێژی کرد. بۆیە لەو ژورووی عاسمانە، گۆشەی مانگی نویّ دەبزونو دەیانەوی لاسای برۆی ئەو کەنەوە؛ کە لەو باڵا بڵیندەوە دیاری دەدا.

وا بیردەبەم، برۆکانی ـ کە وەك کەوانی شیرازیو حەستەم ترن ـ دیسان خەریکن جەرگیمن بەصەد لەت کەن، بویە وا دیسان چەماون. وەك مانگی نویو رێك بەرانبەریەك وێستاون.

نیشانی! وادیارە ئەم شەو بە دزیەوە چوبویە ناو کوڕی بەزم. هیچ کەس توّی بانگ نەکردبو بۆیە ئەو مانگی تازەیە، جامی بادەی گیان گەش کەری، بۆ دڵدارەکانی نەنارد.

## قصیدەی هەشتاو دوهەم

# «جەردەی دڵان»

١ ژرەمزێ دلبەرێ دیسان لمن باطین ڤەژین دەردە
دلەبسێ طاری‌یێ من دی خویا بو ئەو سیا چەردە

٢ دلەبسێ طاری‌بو نورێ پەری رەنگێ صیفەت حورێ
ژوادی ئەیمەنا طورێ موقەددەس کر لمن عەردە

٣ ژنارو نوری تەقدیسێ تەجەللاکر لمن دیسێ
لسەر تەختێ خوە بەلقیسێ هلانین بێ‌حیجاب پەردە

٤ حیجاب‌و پەردە ئاڤیهتن صەبا رەیحان هلاڤیهتن
ژبورجان تیر پورێ ریهتن گەهان من راست‌و چەپ جەردە

**مانای وشە:**

**باطین**: هەناو؛ **باطین**: بەنهێنی؛ **ڤـەژین**: ژیانەوە؛ **لەبس**: پۆشـاك؛ **سـیاه چـەردە**: گەنم رەنگ، رەش‌ئەسمەر؛ **وادی ئەیمەن**: شیوی هەرە پیرۆز؛ **تقدیس**: پاکی‌و پیرۆزی؛ **دیسێ**: دیسان، دەئـایسێ؛ **هلانین**: لای‌دان؛ **هلاڤیهتن**: پەخش‌و بڵاوی‌کردن؛ **جـەردە**: ڕێگـر؛ **جـەردە**: تیری بێ‌پەڕ؛ **جـەردە**: جلیت.

**پوختەی مانا:**

خەنی لەخۆم، ئەوا بۆ جارێکی تریش، یاری خۆم دیت. ئـەم جـاریش بە جـۆرێکی تر کە فێڵێکـی داهاتوبو لە دڵبردن، خـۆی نیشـاندام. بەرگی رەش‌بو. خـۆی لەوێدا وەك ڕۆشـناکی دەینواند. گەنمرەنگە، وەك حۆری بەهەشت، چاورەشە. ئـاکاریشی حـۆریانەیە. ئـەو دیدارە، وەك چیرۆکی موساو چونی بەرەو چیای طور، وایە. کە هەم ئاگر، هەم نوری خـودای بەدی‌کرد. بەو دیدارەی ـ

که ماڵەکەی وەك شیوی هەرەپیرۆزی جیٚ راوەستانی موسایە ـ تیریژیٚ‌یار، دایە دەرو هەمو دنیای کردە سەرزەوی ممبارەك، وەك هەردی بیت‌المقدس. وەکو شازادە بلقیسیٚ لەسەر تەخت رۆنیشتبو. روبەندی بەرووەوە نەبو، پەردەی لادان. سروە، ریحانەی بسکانی پەخش‌کردو رای هەژاندن. بۆن‌و بەرامە بڵاوبو. لە دودەری‌و شانشین‌را، لەمنی روانی. چاوی مەستی بەمژۆڵانی بەریژنە تیریان تیٚ‌گرتم‌و لەراستو چەپ، ریٚگری دڵ‌و گیان رفیٚن، دەورەیان دام‌و کردیانم بە کۆلکی ئەزمون بۆ جلیتان.

٥ کرم ئامانجی میزراقان ددلدا تیر چون فاقان
بجەللادی خوە ئەو خاقان دبیٚژت هیٚژتو خەنجەردە

٦ بدەربیٚن خەنجەران کوشتین بخونا صوهر لیٚمشتین
دچینا سونبولیٚن قشتین مەدل پرٚمیسكو ماوەردە

٧ گولیٚن هەر میسکی ئەذفەرلیٚ عەبیرو عەنبەری تەرلیٚ
سەمایا سوسنان هەرلیٚ بزولفان ماتو ماوردە

**مانای وشە:**

**کرم:** کردمیە؛ **میزراق:** کورتەرمب، نیٚزە؛ **فاق:** گیرگەی تیر لە ژی‌کەوان‌دا، بنی تیر کە دەکەویٚتە سەر ژیٚ‌کەوان؛ **خاقان:** قاقان، قەراڵی مەملەکەتی چین؛ **لیٚمشتن:** تیٚ گەوزاندن، تیٚ‌وەدان؛ **قشت:** بسکی سەر هەنیە؛ **ماوەرد:** گوڵاو؛ **ئەذفەر:** زۆر بۆن خۆش‌و بیٚن بڵاوکەر؛ **عەبیر:** چەند بۆن‌خۆشیٚکی تیٚکەڵاو؛ **عەنبەری‌تەر:** عەنبەری هیٚشتا وشك نەکراوی تازە لەورگی ماسی عەنبەر دەرهیٚنراو؛ **ماوەر:** گوڵاو؛ **ماتو:** دەی‌ساتوٚ؛ **ما:** بۆچی؛ **تو:** هیچ.

**پوختەی مانا:**

چاوی مەستی کە بەرەو رومی هەڵیٚناو لەراستو چۆپ وەکو چەتە شاڵاویان بۆگیان‌و دڵ بردو تیریان تیٚ‌گرت. مژۆڵیشی وەکو نیٚزە بەریٚزە، دەدڵم چەقین. سەرەرای ئەمەی کەتیری غەمزەو نازی چاوەکانی، هەتابن چەقینە دڵم‌و کرام بە نیشانە نیٚزە، ئەو قەراڵی مەملەکەتی دڵدار کوژان، میرغەزەبی چاوەکانی لیٚ‌هان دەدام. کە نیزیك‌تر تماشام‌کەن. واتا، نە وەك دوربەدور بۆی تەواو نەبم، با بە خەنجەری مژۆڵان تەواوم کەن. ئیتر هومیٚدی ژینەوە بۆ گیان‌ودڵ لەناو بچیٚ. بە زەبری خەنجەری کوشتین. دڵی دەخویٚنی خۆ گەوزاندو خەنجەرە خویٚناویەکانی، پیٚ سریەوە. بەڵام دڵی هەرزەکارم، بەو هجوم کردن‌و کوشتنە، زۆر دڵخۆشە. لە تماشای بسکە سەر قرتاوەکانی بان هەنیەکەی، پربو لە بۆنی میسك‌و گوڵ. لە تماشای گوڵی رومەت، تاهەتایە بۆنی میسکی هەرەباش‌و بۆنی عەنبەری هەرتەری، لیٚ نابریٚ. لە سەیری عاسمانی روخسار ـ کە

سوێسنەی بسکـان لەوێدا سـەمایانەو دەلەرنەوەو بەو کەزیانە لە ڕەشـیـەتیو بۆنخـۆشیدا، تانە دەعەنبەر دەگرن ـ کە نزیك کەوتون لەدڵم. دڵ ئـەوەند بۆنی گرتوە، کە نیازنیە گوڵاو لە لاشەکەی مردوی بپرژێنن؛ وەك بۆ مردوی دورلەدڵداری دەکاردێنن.

٨ بسەروی سونبولێن تاری بهەڤرا بازیو یاری
بجودا خون بیت جاری ژقەوسان گەزمەیان بەردە

٩ ئەزم ئامانجی وان تیران ژپەیکانانو سەرتیران
بویم پولاد لبەر شیران سەراسەر تێكمام بەردە

**مانای وشە:**

**وی:** ئەو، مەبەست روخسـارە؛ **پەیکـان:** سـەرەتیر؛ **پولاد:** پۆڵا؛ **تێكمام:** بەتێکـڕاییمام؛ **بەردە:** لەپێشیدا؛ **تیر:** سەرکۆنە، تیرو تانە.

**پوختەی مانا:**

لەسەر ئەو روخسارە پاکەت، بسکەکانت ـ کە ڕەنگ ڕەشو لە بۆنخۆشیدا، سـونبولن ـ پێکـەوە گاڵتەو گەپیانەو دێنە یاریدەی یەکتری. ئەگەر تماشا دەستبدا ـ وەك دەسـتیدا ـ کوژرانی چیو مردنی چی؟ هەزار هێندە جەزرەبەو ئازاری بدرێ، هێند بەو بەرامانە مەستە، هەست پێناکا. دەبێ منەت بەو، لەبەریشـت وەدەپارێم تا دەتوانی لە کەوانی برۆ کەوانیەکانتەوە، تیر باوێژە، بم کە نیشانەو بمپێکە. با بەجۆگە خـوێن لە لەشـمەوە جـاری بێ. تابۆتدەکرێ کارێكبکـە، برینم پتر کاریبن. گوێ نادەمێ. هێندەم سەرەتیری چـاوی، پر لەنازو تیری بەهانەی نازاویم وێ کەوتوەو نوکی مژۆڵ وەك سەرەتیر لەگیانی دڵم چەقیون، هەمو گیانم وەکو پۆڵای لێهاتوە. شیرم لێدەن زرینگـەم دێ، چـونکە لە هەر لاو یمکەوێ، هەر سـەرەتیری وەبە ردێ. گیان بەئـاواتی دیداری چاوەکانت هەر دەمێنێو هیچ هێزێك لەبنەی ناهێنێ.

١٠ کو دلبەر هاتەوی یولێ ژبەر پورێ هن کەتن چولی
ژقەنجان کورەڤاند هولێ ژمەحبوبان برن نەردە

**مانای وشە:**

**یۆل:** ڕێگە، ڕەوشت؛ **هن:** هەن؛ **قەنج:** جوانو لەبار؛ **هۆل:** بازیگوێین؛ **تو:** هیچ.

**پوختەی مانا:**

کاتێ دڵبەر لەخـۆپۆشین بەروبەندی وازیهێناو ڕەوشـتی خـۆنیشاندانی کردەپیشـە؛ زۆرکەس

هەبون، لەتاوان شێتو شەیدابون. کەوتنە چۆلان. دڵبەرانی لەبارو جوان، لەمەیدانی ملەی جوانیو دڵرفێنیدا، دۆڕاندیان. گۆی سەرکەوتنی بۆخۆی برد. لە باری جوانیو لەباریو لەنەردی گەردن زەردیدا، دەستی هەمو نازدارانی لە تەختە بەستو صەد دەستی لێبردنەوە.

١١ ژقەددو بەژنو بالایێ ژرەنگێ دیمو سیمایێ
تو رەنگی قەط خەبەر نایێ دحوسنێ جەوهەرەك فەردە

١٢ بخەملو رەنگو رەعنایی بمەحبوبی، بزیبایی
بئەو حوسنا خودێ دایی ژگول رەنگان گولا زەردە

**مانای وشە:**

**تورەنگی:** هیچ رەنگێك؛ **رەعنا:** شلكو شۆخ؛ **زیبا:** جوانی بەردڵ؛ **خودێ:** خودا؛ **خەمل:** خشڵ؛ **جەوهەری فەرد:** ماکی بێهاوتا؛ **جەوهەری فەرد:** ئەو عەصڵەیە کە خۆی بەخۆیەوە بەندەو بۆبەشو پاژکردن ناشێ.

**پوختەی مانا:**

هیچ جوانێكو خوێن شیرینێك، بەرەنگو خشڵو زەنبەریش خۆ جوان بکەن؛ هەرگیز لە رەزاشیرینیو رەنگو رو، لە بەژنو باڵاو سیمادا، تۆزقاڵێکیش وەك یار ناچن. جوانی یارم ـ کە تایبەتی بەشێکە، خوا بەوی داوە ـ لە دنیا جەوهەری تاکەو ماکی جوانی هەر خۆیەتیو کەس ناتوانێ بەشێکی لەوجوانیە هەبێ. گوڵی زەرد، لەو ئێرەییانەی کە نەیتوانی وەك ئەو جوانبێ؛ رەنگی زەردە. شیاوی باسە، خوا فەرمویە: «هیچ شتێك وەك خودانیە». مەبەستی مەلا ئەوەیە، جوانی سەلما، وێنەی جوانی خوای سەلمایەو کەس لەرەنگی خودا نیە.

١٣ نەباتو شەککەرا لێڤێ نەسیمێ وی گولو سێڤێ
هلینت پەردەیا شێڤێ شیفایا هیندەکی دەردە (یا، هندکی...)

١٤ ژنەقشو صونعی جەبباری موطەررا طوررەیا طاری
لنورێ میسکی تاتاری لسەروان خەمریان بەردە

١٥ لبەر روژی بیت خێلی بنێرم قامەتا عێلی
قەدیفو زەرکەشو تێلی زەبادو میسكو عەنبەردە

**مانای وشە:**

**هلینت:** لادا؛ **شیفا:** عیلاج؛ **هندك:** کەم؛ **موطەررا:** کۆوەکراو؛ **طوررە:** بسکی لای لاجانگ؛ **طاری:**

تاریك؛ **خێلی:** تەمو سـێبەر؛ **بنێرم:** بڕوانم؛ **عێلی:** بڵند؛ **قـەدیف:** مەخمەر؛ **زەرکەش:** زەرری؛ **تیلی:** پارچەیەك کە هەودای زێوو زێڕی تێوە درابێ؛ **زەباد:** بۆن خۆشی زەباد، کە جـانەوەرێکـە لە بەرەی شـێرو پشیلە.

**پوختەی مانا:**

شەکرو نەباتی لێوانی، سێوی چەنەی، گوڵە باغی سەر کوڵمانی ـ کە سروەی هەناسـەی سـاردم دەیانگـاتێ ـ شـەوە رەشـی کەزیەکانی ـ کە بونە پەردە لەرویدا ـ وەلا بەرێ. هەر کەمێك لە دیتنیوان، دەرمانی هەمو دەردانە.

ئـەوبسکـە لێك هاڵاوانە، کە بەم لاو بەولادا کراون‌و رەنگـی تاریکـاییان هەیەو بۆنیان وەك میسکی تاتاری، تۆمار بەتۆمار بڵاوەو لەسـەر وانیش پرچ بەندت ـ کە لەسـەر توێڵ دیاری ئـەدا ـ لەسەر روخساروە لابەرە؛ با ئەو نورو تیشکی خـوایە، بێتە بەرچـاوی دڵداران‌و ئـەو سـێبەری بسکانەی‌تۆ چیدی بەری رۆژی نەگری‌و مەخمەرو زەرری وزێڕپۆیان با لەجیرانەتی لەشـت، بۆنی عەنبەرو زەبادو میسك بگـرن. بێرە دەرێ با دەو بەژن‌و باڵایە زراوەو کە لەگەتەی تۆ ـ کە نمونەی دەسکاری خوای شیرینکارە ـ تێر رامێنم.

**١٦** بسیماڤێ بزێراڤێ  توروژێ نەقشەکی باڤێ
کودا ئەرژەنگ ژوێ ناڤێ  لبەر رۆژێ نەبت پەردە

**١٧** ئەگەر بەرقەك ژوێ روژێ  ژبەروێ عیقدو بشکۆژێ
بدت قەلبێ وەکی دوژێ  لبەر دوژە دبت بەردە

**مانای وشە:**

**سیماڤ:** ئاوەزێو؛ **باڤێ:** بهاوێژە؛ **ئەرژەنگ:** وێنەنامەی مانی وێنەگرو پێغەمبەری موجـزات وێنەکێشـان؛ **وێ‌ناڤێ:** ئەو ناوە؛ **عیقد:** گەردانە؛ **بشکۆژ:** قوپچەو خونچە؛ **دوژ:** جەهەندەم؛ **دوژەھ** : دۆزەق؛ **بەرد:** سەرما، ساردی.

**پوختەی مانا:**

یاری نازدار! هەر تۆ رۆژێك وەرە دەرو خۆت نیشان‌دە، با ئەو نەخشەی دەستی خـودا، ببیندرێ. با لەشەرمان، وێنەنامەی موجـزاتی مانی، ون‌بێ‌و خـۆ وەشـێرێ‌و خــۆ لەبەر رۆژی روت نەگرێ‌و، نەبێتە پەردەی بەرچاوان‌و چاوان بەخۆ خەریك نەکا. من لێمرونە هەر لەو شوێنی بە گەردانەی کە دنیای لێ سەرگەردانەو لەو سـینەو بەرۆکەی قـوپچەت لێ‌کردۆتە جــەزایەرچــی. تۆزێك وەکو بروسکەیەك دیاری بدات. دڵی پرلە ئاگری من ـ کە لەناو بڵێسەی ئەوینی تۆدا، قەتیس ماوە ـ لە

سوتان رزگاری دەبیٚو تەنانەت دوٚژەهی گەورەش، لەرویا سارد دەبیٚتەوە.

شیاوی باسە، مەلا چیروٚکی ئیبراهیم پیٚغەمبەر بیر دیٚنیٚتەوە. کە بتەکانی شکاندو لەسزادا، خستیانە ناو ئاگرەوە، خودا فەرموی: «ئاگر ساردی سلامەت بە!» ئاور نەیتوانی ئیبراهیم بسوتیٚنیٚ.

**١٨** دمەیدانیٚ شیرین غەنجان بچەرخن میثلی شەطرەنجان
توراٚبا بەرپییی قەنجان زەبادو عەنبەرین گەردە

**١٩** دبت بیٚژن وی سولٚتانی بهەفت ئایاتی قورئانی
لمەحبوبان تو خاقانی وەرە دەربیٚ لقەیصەردە

**مانای وشە:**

**مەیدان:** گوٚرەپان؛ **توراٚب:** خوٚلٚوخاك؛ **گەرد:** توٚز؛ **قەیصەر:** قەراٚلیٚروٚم؛ **هەفتُ ئایاتی قورئانی:** واتا، هەمو قورعان، یان سورەتی فاتیحا، یان حەوت سورەتی هەوەلٚی قورعان. کە لەقورعاندا خوا فەرمویە «وَ آتیناكَ سَبعاً من‌المثانی» داومانە پیٚت حەوتی لیٚكچو. ئەوکەسانەی تەفسیرنوسن، زوٚریان لەوبارەوە گوتوە.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر لە دەشتایی جیٚی داوەتیٚکدا؛ هەمو نازدارانی رەزاشیرین، کوٚببنەوەو بەلاسایی تەختەی شەترنج، هیٚندیٚکیان لەپلەی جوانیدا، بە وەزیرو روخو فیلٚو ئەسپ، دابندریٚن‌و هیٚندیك پیادە بمیٚننەوەو بەتیٚکراٚش ئەوەندە جوان‌و نازداربن، کە توٚزی بەر پاٚلاٚکەیان، وەك عەنبەرو زەبادی دابیٚژراو وابیٚ؛ بەتیٚکراییو بیٚ لامو جوم، توٚ بە شای خوٚیان دادەنیٚن. سویٚندم بەحەوت ئایەتەکانی قورعانیٚ، توٚ لە ناو جوانانی دنیا، وەکو قەراٚلی چینیٚ وای. تانجی سەری قەیصەرانی. دەتوانی لەباری جوانی، زەبریکیٚ باش لەوانەدەی کە بەجوانی خوٚ دەنازن‌و لایان‌وایە، بونە قەیصەر لەناو جوانان.

**٢٠** مەلا زانم ژمەجذوبان تنیٚ ناژی توبیٚ خوبان
دەما دلٚدی بمەحبوبان بشوخو شەنگو ئەسمەردە

**٢١** دەما جەللاد بیٚن بازی بشیرو خەنجەریٚن طازی
لدەرگەدا نەکی گازی دەلالٚو نازپەروەردە

**٢٢** ئەمانەت دا ژبیٚ هوشی دوریٚن ناسوفتە نەفروشی
«مەلا» زانم ژمەدهوشی تەدل بیٚخوابو بیٚخوردە

**ماناى وشه:**

**گازى:** گله؛ **گازى:** بانگ، هاوار؛ **سوفته:** سماو؛ **مەدهۆش:** لەهۆش‌چو.

**پوختەى مانا:**

مەلاى دڵدار! دەزانم چيت. ئەگەر ريزەوانى تەريق ـ كە هاتونە ناو ريزى خوا ناسـانەوەو ئـەوينى خودا كيشاونى‌و دڵ‌و گيانيان لەهۆش چـوە ـ گشـتيان بەبێ يارى مەجـازى، هەڵبكـەن؛ تۆ لەو ناوە، تەنيا كەسێكى هەڵناكەى. جا ئەگەر هەردڵيش دەدەى بە دڵبەرێكى دنيايى؛ شۆخ‌و شـەنگـى گەنم رەنگى وەك سەلمات قەط دەسناكەوێ. دڵەكەت دەقەبەڵ ئەوكە.

هەرگاش چـاوە دڵداركوژەكانى ـ وەك ميرغەزەب ـ بەشـيرى تيژى برۆيان، بەخـەنجـەرى مژۆڵانيان هاتنە گەمەى دڵداركوشتن؛ نەچـى هاوارو دادبكـەى! ئــەويارە، هێندە ناسكــەو هێند نازدارە، لە دەنگى گلەت دەرەنجێ. نازكۆڵەيە، مەيرەنجێنە. تۆزێكيش ئاگات لەخۆت‌بێ تۆ لەكاتى حاڵ‌لێ‌هاتن، رازى گرينگ ـ كە وەك مروارى نەسماون ـ ئەدركێنى. دەزانم خـەوو خـواردنت لێ حەرامەو دڵت گەرمەو هۆش‌و گۆشت، لەدەست داوە، بەڵام ديســان ناشـێ ئـەوى ناشــێ بێژى، بێژى.

# قصیدەی هەشتاو سێهەم

## «عیشق وجەذبە»

١ دلبەری سەرداری خوبان ئەز نزام ئاگاه هەیە
حەبسی زیندانێ‌و ئەسیرو گرتی‌یێ دەرماندەیە؟

٢ گرتی‌یم مایم دحەبسێ کی گەلۆ مەهدەر بکت؟
چارەکی ناڤێ مەبینت پورێ ئەوابەك زێدەیە

٣ میحنەت‌و حالێ ئەسیران کی لمیران عەرضە کت
دی‌بتن پورسی لمن لەو پور برەحم‌و شەفقەیە

**مانای وشە:**

**ئاگاه:** خەبەردار؛ **دەرماندە:** داماو؛ **گەلۆ:** خەلکینە، ئاخۆ؛ **مەهدەر:** تکا؛ **ئەواب:** خێر؛ **میران:** میری‌گەورە؛ **عەرضە:** لەبەر رانان؛ **لەو:** چونکە؛ **شەفقە:** بەزەیی؛ **ئەز نزام:** من‌نازانم.

**پوختەی مانا:**

من نازانم ئەو دڵبەرەی سەروەری گش جوان چاکانە، خەبەرداره کە من لەزیندانی ئەوا بەندو دیل‌و سەرگەردانم، زۆر دەمێکە بەندکراوم‌و لەو زیندانەدا داماوم. ئاخۆ هیچ کەسێ وا هەیە چارو بارێك، ناوی ئێمەی بێتە بیرو ئەو خێرە گەورەیە بکا. مەینەت‌و دڵپەریشانی یەخسیرانی ئەو جوانی‌یە، بە عەرضی میری مەزنی موڵکی جوانی بگەیەنێت؟ لیم رونە لێمان دەپرسێت. چونکە دەیناسم کە بەزەو دلۆوانی یەکجار زۆرە.

٤ گەر بپرێست چارەکی خاتون لحالێ سوختەیێ
قوفل‌و زنجیر دێ ڤەبن بێ‌ئیسم‌و دەست‌و میفتەیە

٥ بەندو زنجیر دیٚ ڤەبن جەرحێن دکول دیٚ خوەش بکت
لەو کوناقیٚ دلبەریٚ دەرمانیٚ دەردیٚ بەندەیە

٦ هەرچی بیٚڤیری کو ناڤیٚ دلبەریٚ بیتن لسەر
خوەش دبت حادر (هادر) دگاڤیٚ بیٚگومان‌و شوبهەیە

**مانای وشە:**

**خاتون:** وشەی ریٚزلیٚنانە بۆ ژنان؛ **سوختە:** تازە فەقیٚلە؛ **ئیسم:** ناو، مەبەست ئیسمی ئەعظەمە، ناوی هەرە گەورە؛ **میفتە:** کلیل؛ **کول:** بەژان، بەناسۆر؛ **بیٚڤیر:** نەخۆشی لەسەر مردن، لەهیٚز کەوتو؛ **حادریاهادر:** دەستەو لەجیٚ؛ **دگاڤیٚ:** هەر دەم‌و دەست.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر جاریٚك ئەو خاتونە پایە بەرزە، لەمنی تازە فەقیٚلەی دەرسی دلٚداری، پرسیار بکاو بلیٚ چۆنە؛ قوفلٚ‌و زنجیری دەست‌و پیٚم، بەبیٚ دەست لیٚدانی کەس‌و، بیٚ کلیل‌و بیٚ خوێندنی ئایەتی قفلٚ کرنەوەو ناوی دایکی موسا زانین، دەکریٚتەوە! هەر ناڤی خۆی لەبەربیٚنیٚ؛ یان هەر دەردیٚك دلٚمان بگریٚ‌و ناوی ئەو بیٚتە سەر زارمان کارمان سازەو رزگاری‌و چا بونەوەمان، کە کۆیلەی بەردەرگای ئەوین‌و بە ئەوینی ئەو گیراوین. بەوی بەندە. هەر بەندەیەکی لەش بەبار، ـ با کەوتبیٚشتە گیانەلٚاو ـ ناوی یارمی لەسەر بیٚنن، دەستەولەجیٚ، نون دەلەشیدا نامیٚنیٚ‌و چابونەوەی هیچ گومانی تیٚدا نیە.

٧ بیٚگومان خاکا رێاوی توتیاو دانەیە
گەر دچەهڤێن کور ڤەئینن خوەش دبن پیٚ دیدەیە

٨ مەییتی صەدسالە ژی وی ری ڤبەر ڤەبری کەڤت
دی ڤەژی روح بیٚتە سەر ساتا خوەبیتن زیندەیە

**مانای وشە:**

**توتیا:** بەردیٚکە بۆ روناکی چاو دەیهارن‌و چاوی پیٚ دەرێژن؛ **ڤەئینن:** دانێن، تیٚبکەن؛ **مەییت:** مردو؛ **ڤبەر:** دەسەر، دەبەر؛ **سات:** کات؛ **دانە:** دەرمانیٚکی چاوانە.

**پوختەی مانا:**

خاك‌و خۆلی رێبازەکەی، وەك توتیاو دانە وایە. ئەگەر دەچاوی کوێر کریٚ؛ بیٚگومانم دەستبەجیٚ، سۆمای دیٚتە بەرو زۆر بە رۆشنی دەبینیٚ.

ئەگەر یارم، ریٚگەی بەسەر گۆری مردوی صەدساڵەدا برۆا. یان دەبەر گۆری ببوریٚ؛ هەر

ئەوساتە کۆنەمردو گیانی دێتەوە بەرلەش‌و وەك گوێزی ئازا، دێتە دەر.

٩ مەییتان لەورا دکت یەکسەر دلان یەغما دکت
ئیسمی ئەعظەم ما دزانت یا مەسیح ئەو بخوەیە

١٠ ئەز دبێم عیسایە ئەو، یا بوعەلی‌سینایە ئەو
لەو برەمزو عیشوە یان پوڕ موعجیزات‌و شیوەیە

١١ عیشوەو ڕەمزێن دوی تەشبیهی بەرقێ لامیعن
کوهی قاف بت کەردکت ساتا خویا بت پەردەیە

**مانای وشە:**

**ما:** مەگەر، چما؛ **مەسیح:** هەنواو؛ **مەسیح:** دەست‌پێدا هێنراو؛ **مەسیح:** ممبارەك؛ **مەسیح:** شومو بەدفەڕ؛ **مەسیح:** نازناوی عیسا پێغەمبەرە لە ممبارەکیان؛ **مەسیح:** بە جرجاڵ دەڵێن لەبەر شومی‌و جوت قۆشەیی؛ **کوهی‌قاف:** کێوی قاف (باسکراوە)؛ **کەر:** لەت.

**پوختەی مانا:**

جا وەختێ یارم دەتوانێ مردو زیندو بکاتەوە؛ دیارە تاڵان کردنی دڵان، کارێکی زۆر هاسانترە. ئاخۆ ناوی هەرە گەورەی، فێر کراوە؟یان هەر خۆی وەکو عیسایە، کە دەیتوانی بە ئیزنی‌خوا، کۆنەمردوش زیندو وەکات؟ بەڵام دیسان لەوناوە سەرم سوڕماوە. ئاخۆ وەك عیسا نەفەسی ممبارەکە؟ یان وەك ئەبوعەلی‌سینا، بە لێزانی نەخۆشان خۆش‌دەکاتەوە؟ بە ئیشارەتی چاوانی، دەڵێم مۆجزەی عیسایە. بە گفت‌و نازو نیمنازی دەڵێم بژیشکی چازانە. هەم شێوەو هەم مۆجزاتی، وەك بروسکەی تروسکە دەر، یەکاویەکن. یار دیار نیە، ئەو مۆجزاتە دەنوێنێ. ئەگەر تاوێك خۆی نیشانی دنیا بدات‌و پەردە لەناوا نەمێنێ؛ چیای قافیشی بێتەبەر، لەت‌لەت دەبێ.

خوا فەرمویە: «ئەگەر ئێمە ئەوقورعانەن ناردبایەتە سەر کێوێك؛ دەت‌دی سەری کز دەکردو لەترسی‌خوا، شەقار دەبو، هەڵدەتەکا.

مەلا، لەو چەند بەیتانەدا، ئەو ئایەتەو باسی موساو کێوی طورو نوری خوامان وەبیر دێنێ.

١٢ پەردەیا مەحبوب دنیڤ قەلبان کودێ کەرکەر بکت
قەط دپەردێ خەفدبن خورشیدو ماهو زوهرەیە

**مانا:**

ئەو پەردەی دڵبەر، لەنێوان خۆی‌و دڵمان رای‌هەنگاوت؛ دڵمی خستە تاریکایی. ئەو پەردەیە لەت‌لەت بکاو فرێی بدات؛ دڵ وەك خۆرو مانگ‌و زوهرە، تیشك‌ئەداو هیچ ئافەریدێکی خودا،

وەك ناتوانیٚ پەردە لەبەر خۆرو مانگو زوهرە بگریٚتەوە. ناتوانیٚ دڵمان داپۆشیٚو روناکی لیٚ نەدیو بکا.

**١٣ زوهرەو خورشید من دیتن دقەوسیٚ هەم قیران**
**سورری دا دل عەقرەبان چەرخو سەماوو هەیهەیە**

**١٤ عەقرەبو قەوسو قەزەح، ڤیرا موقابیل موشتەری**
**رۆژو شیڤو نورو تیریٚژ، بەرقو هەم ئیسپیٚدەیە**

**١٥ ئەو حەمی ڤیٚکرا مەدین، تیٚکل دچەرخیٚ جارەکی**
**هی ژوان بیٚحالم ئەز ئەحوالو عیشقو جەذبەیە**

**مانای وشە:**

**هەمقیران:** نزیكو بەرانبەر بەیەك؛ **سورر:** دڵکیٚشی؛ **قەوسو قـەزەح:** پەلکـە زیٚرینە، کەسـكو سـۆر؛ **موشتەریو زوهرە:** دو ئەستیٚرەی گەریدەن؛ **تیریٚژ:** تیشك؛ **ئیسپیٚدە:** سپیٚدە، بەرەبەیان.

**پوختەی مانا:**

چـاوم‌کەوت بە رومەتو چـاوەکانی؛ کە دوبرۆ کەوانیەکەی لەسـەر دیار بون. دەت گوت خـۆرو ئەستیٚرەی زوهرەو موشتەری، لە مزڵگـەی قـەوسـی عاسـمان، لیٚك نزیكو بەرانبەر بەیەك دیار ئەدەن. دڵکیٚشی ئەو لیٚكنزیکیە، بسکە سەر خـوارەو بوەکانی ـ کە وەك کلکـی دمارەکوڵی رەش دەچن ـ بزواندەوەو دەت‌گوت لە خۆشیان دەرەقسن. لارومەتو کەزیو هەنیەو لاجانگو تیشكو پرشنگی چاوەکانی، دەت‌وت خۆرو شـەوو رۆژو بریسکـەو بەرەبەیانن. پارچـەی هەمەرەنگـەی سەرپیٚچو خشڵی سەرو، گەردانەکەی، ببونە کۆڵکـە زیٚرینەی بەر هەتاویٚ. من جـاریٚکی ئـەوانەم هەمو بەچاوان دیتن. کە لە کۆڕی هەڵپەرکیٚدا، تیٚکەڵ ببون. وا لەوساوە، حاڵم شرەو دڵم سـەری لیٚشیٚواوەو جەزمەی ئەویٚنیٚ گرتومیو بەرم‌نادا.

**١٦ حال ژویٚ رەمزیٚ گەها من مەستی ویٚ رەمزیٚمە ئەز**
**سەرخوەشم حەتتا ئەبەد بیٚجامو توقلو بادەیە. (یان، نەقلو...)**

**١٧ سەرخوەشم بیٚ جامو مەی، رەمزا نهین ئەبتەر کرم**
**ناگەهان تیر دانەدل لەو کوشتە حادر سوختەیە**

**١٨ کوشتی‌یان خون دیٚن لیقائیٚ لەو بوی دی خۆش‌بین**
**هیٚڤیان قەط نابرم مەقصود مە دیدارا تەیە**

**مانای وشه:**

**نوقل (یا) نەقل:** مەزەی بادەخۆران؛ **ئەبتەر:** دوابراو، بێسەروبەر؛ **حادر:** دەست بەجێ؛ **سوختە:** فەقێلە؛ **سوختە:** سوتاو؛ **لیقاء:** توش هاتن؛ **هێقی:** هومێدو هیوا.

**پوختەی مانا:**

لە ئیشـارەو نازو غەمزەت، حـاڵەتێکـم بەسـەرداهات، کە هەتا دنیادنیایە، بەبێ بادەو پیاڵەومەزە سەرخۆشم، لالامو ناکەم. رازی نهێنی ئەوینێ، وزەو هێزی لێ ئەسـتاندم. لەپر تیر دابارینە دڵو کوژرامو سوتێندراشم. دەڵێن شەهید دەبێ بەخوێنی لەشەوە بنێژرین. چونکە بەو خوێنەگەشـەوە، دەچنە لای یارو بە دیداری یار، شاد دەبن. جـامن پێم خـۆشە هەزارجـار، لە ئـەوینی تۆدا بمرمو دڵەکەم خوێناو هەڵێنێو گیانیشم خـوێن بدەڵێنێ. بەو هومێدە کە بەو هۆیە تۆ ببینمو هەرگیز نابێ ناهومێدی بەلاما بێت.

«کوردی» دەڵێ:

شەهیدی عیشقمو مەمشونو کفنم بۆمەکەن یاران
گەواهی حەشرە بۆ دەعوای شەهادەت بەرگی خوێنینم

«مەولەوی» فەرمویە:

هەرساتێ صەدجار بەوتیر بەو تەرکەش     زیندەگیو مەردەن ئامان وەشەن وەش

**١٩** هێڤیان قەطنابرم جارەك تودینێ شەفقەکی
عەقدی ئیحرامێ دێبینم حادری بەسەجدەیە

**٢٠** سەجدەیا بەر ئەسوەدان نادم بصەد حەج ئەکبەران
سوند بوان زولفانو خالان هەچ وەکی بێژم وەیە

**٢١** سوند بوێ زولفا سیاە ئەز عابیدێ حوسنا تەمە
خەف دنوشم وێ شەرابێ خوەش شەرابو قەهوەیە

**مانای وشە:**

**دین:** دیتن؛ **شەفقە:** مەرحەمەت؛ **عەقد:** بەستن؛ **ئیحرام:** نیەتی حەجکردن؛ **حـەج ئـەکبەر:** حـەجـی هەرە گەورە، ئەگەر شەوی جەژنی قوربان هەینیبێ پێی دەڵێن حەجی گەورەتر، چونکە پێغەمبەر فـەرمویە: «هەینی حەجی هەژارانە» دوحەج پێکەوە رو دەدات؛ **هەچوەکی:** هەروەکو؛ **قەهوە:** بادە؛ **خـوش:** بەتام؛ خۆش: بەپەلە.

**پوختەی مانا:**

هەرگیز لەو هیوایە نانێم. کە تۆ جـارێك بە دیدارێك مەرحـەمەتم دەگەڵ بکـەی. هەر بتبینم،

دەزانم دەبێ وەك حاجی، نیەتی ئیحرامێ بێنم. لەخۆشیانا سوژدە دەبەم. سوژدە بردن‌بۆ بەر خاڵت ـ کە وەك حَجَرالأَسْوَدن بەصەد حـەجـی هەرەگەورەی ناگۆڕمەوە. سـوێندەکەم بەو کەزیانەی‌تۆ، هەرچی دەیڵێم قسەی دڵمە. دیســان ســوێندم بەو پرچو کەزیە رەشـانەت؛ من جــوانی تۆ، دەپەرستم. لە بادەی مەسـتی هێنەری، ئـەوینی تۆ ـ کە لە هەرشـت بەتامترە ـ بێ خـۆگرتن دەخۆمەوە.

**٢٢ عومرەکە دسوژم بخەف چەهڤ نێری یەك پرسەك تەمە**
**دا بەیان‌کەم شەرحی حالی دل بحەرفو نوکتەیە (یان، نوقطەیە)**

**٢٣ صەدهەزار بار شاکرم ئەز کو ژبەلقیسا پەری**
**هودهودی شیرین زەبان ئیرۆ خەبەرداریێ مەیە**

**٢٤ ئیسمو ناڤێ تەی‌شەریف حەی‌کر لمن قەلبێ مری**
**لەو دمەدحێ تەو ثەنائێ بوییمە چەنگو نەیە**

**٢٥ شوبهەتێ چەنگێ دنالم هێژ ژدەست داغا قەدیم**
**هەروەکی مەشعەل دسوژم دوست نزام ئاگە هەیە؟**

**مانای وشە:**

**چەهڤ‌نێر:** چاوەروان؛ **نوکتە:** وردەکاری، باریك‌بینی؛ **بار:** جـار؛ **شـاکر:** بەسـوپاس؛ **شـەریف:** بەرێز، ممبارەك؛ **ثەنا:** پەسن؛ **حەی:** زیندو؛ **مری:** مردو؛ **مەشعەل:** چوڵەچرا؛ **نزام:** نازانم.

**پوختەی مانا:**

من عومرێکە چاوەنوڕم. تۆ هەرجارێك لێم‌بپرسی حاڵت‌چۆنە؛ تا زۆر ورد بۆتی باس‌بکەم.

هەزاربارو هەزار جاران، سوپاس بۆخوا. کە پەپوی گفتو لفـتخـۆش، ئـەمڕۆ منی لەو پەریە ناسكو نازدارە ـ کە وەك بەڵقیس لەسەر تەختی سەروەری جوانان، جێ‌گیرە ـ خەبەردار کرد. هەر ناوی پیرۆزی تۆی برد، دڵی مردوم زیندو بۆوە. وا دەمبینی کە لەپەسـن‌و تاریفـتـدا، دەنگـم وەك چەنگ‌و نەی وایەو وەك بلوێر لەبەر ئـەو داخـەی کە لە مێژە دڵمی پێ کون‌کون کراوە، دەناڵێنم. وەك چوڵە چرا، هەمو ئەندامم بۆتە گڕ. دەسوتێم بەڵام نازانم دۆست هیچ ئاگای لەمن هەیە؟

**٢٦ من دڤێ سەرلاستانێ هەروەکی تولان نەهم**
**بەلکە جارەك کەیل (لەیل) بپرسیت ئەڤ چمەحروم تو لەیە**

**٢٧ گەر بناڤێ تولەیان جارەك ڤەخونت بەندەیێ**
**ب «مەلێ» خوەشتر ژمالو گەوهەرو گەنجینەیە**

## ٢٨ گەوهەرو گەنجێن مەلیٚ حوسن‌و جەمالا دلبەرە صەد (تعالیٰ‌الله تبارك) ئەڤ چحوسن‌و جیلوەیە

**مانای وشە:**

**تولان:** تولەگەل؛ **تولە:** سەگی چکۆلە؛ **نەهەم:** دانیم؛ **کەیل:** هەڵبژاردە؛ **کەیل:** قەیل، فەرمانرەواو سوڵتان؛ **مەحروم:** بەش‌براو؛ **تعالی:** پایەبەرزی؛ **تبارك:** پاکی‌و پیرۆزی؛ **تعالیٰ‌الله تبارك:** بەرزی‌و پاکی‌و پیرۆزی بۆخوا.

**پوختەی مانا:**

بەئاواتم وەك سەگەکانی دەرماڵی، سەرم لەسەر بەر دەرگانەی بسومەوە. شایەت جارێك ئەو سەروەرەی لەناو جوانان هەڵبژاردە، بپرسیٚ ئەو تولە بەستەزمانەیەی بەئاوات نەگەیوە چی‌یە؟ هەر کەجارێك منی‌کۆیلە، بەناوی تولە بانگ‌بکاو، بەو بەزەی بم خوێنێتەوە؛ بۆ منی مەلا لەهەمو دارایی دنیاو گەوهەرو گەنجینەکانی، باشترو دڵخۆش‌کەرترە.

گەوهەرو گەنجینە لای‌من، جوانی‌و لەباری دڵبەرە. ئەی خودایە! پایەبەرزی‌و پاکی‌و پیرۆزی، بۆ تۆیە. کە ئەو جوانی‌و دیمەنە لەبارو ڕێکەت، داوە بەیار. چەند زۆرە؟ هەر خۆت دەیزانی.

# قصیدەی هەشتاو چوارەم

«سینه‌کەبابە»

١ فەلەکا ئەطلەسێ سەرگەشتە دجاما مە حوبابە
مەوج ددەت قولزومی عیشقێ مەلسەر دەست غورابە

٢ دل کەمەربەستەیی عیشقە مەخوە زوننار پەرەستین
مەیو مەعشوقە دوعائێ مەئو سەجادە قیبابە

٣ ژحیجابێ وەرە دەر نازکو مەستانە بمەش‌تو
تەجیهان زیروزەبەر کر بخودێ ئەڤ چحیجابە؟

**مانای وشە:**

**فەلەکی ئەطلەس:** لە زاراوەی ئەستێرەناسانی پێشین لەسەروی هەمو عاسمانانو هیچ ئەستێرەشی لێ نەبون؛ **سەرگەشتە:** سەرگەردان؛ **حوباب:** بڵقی سەرئاو؛ **قیباب:** پەڕۆی ناوگیرفان؛ **قولزوم:** دەریا؛ **غوراب:** پیاڵە؛ **غوراب:** جۆرێك گەمیەی قەدیم؛ **زیرو زەبەر:** ژێرو ژور.

**پوختەی مانا:**

دەریای ئەوین، لە دڵی مەدا شەپۆل دەدا. پیاڵەیەکمان لەسەر دەستە کە دەمانەوێ مەستمان‌کا. هەمو هەردو عاسمانو تەنانەت عاسمانی ئەطلەس، وەك بڵقێکە بەسەر بادەی ناوپیاڵەی سەر دەستی مەوە.

دڵم بۆتە کەمەربەستەی ئەوینی پاك. زوننار یار دەپەرستین. نوێژو نزاو پاڕانەوەم، هەرڕو بەدڵبەرو مەیەو بەرماڵەکەم، پەڕۆی مەی‌سرینەوەیە. لەو پشت‌پەردە، وەرە دەرێ. مەستانەو بەفیزو بەناز، سەیرێ بکەو، بڕوانە چۆن ئەم جیهانەت، بە پیواری دیداری خۆت، سەروژێر کرد. تۆبیو خودا، ئەم لەمپەرەت چۆن پەردێکە کە هێندە دەردی پێداوین.

«خەییام» دەڵی:

بۆ ژانی دڵان هەر مەیە دەرمانی بێ زانا ئەوەیە تامی لەمەی زانیبێ
ئەو کۆنە پەرۆی لێوی لەمەی پێ دەسڕن بەرماڵی هەزار صوٚفی بە قوربانی بێ

٤ دەستی جیبریل هلاڤیت ژبەژنا تەنیقابێ
بیەقین قافە لروژی وەرە، دەرسینە نیقابە

**مانای وشە:**

**جیبریل:** فرشتەی وڵامدەر؛ **هلاڤیت:** لای‌گرت؛ **قاف:** «ق» ناوە بۆ قورعان، ناوی خوایە واتا تواناتر لە هەمو توانایان؛ **قاف:** ناوی کێوێکە دەوری دنیای داوەو دەیانگوت خۆر شەوانە لەپشت قاف ماتە هەڵدەگرێو دەحەسێتەوە؛ **لروژێ وەرە:** لە خۆرەوە.

**پوختەی مانا:**

تۆ وەکو خۆر، چۆن لەپشت کێوی قاف پەنای دەگرتو قاف لێی دەبو بە پەردەیەك، نەمان دەدیت؛ چاوی دڵمان تۆی نەدەدیت. خودا بەدەستی فرشتەی وڵام بەری؛ پەردەی لەبەر بەژنت لاداو، پەردەی سینەی گیانی ئێمەش کە لەمپەرێكبو لەنێوان، وەلا کەوتو توانیمان روناکایی تۆ، بەدڵو گیان، هەست پێبکەین. قورعانو ناوی خوای‌توانا، بونە هۆ ئەتۆ بناسینو لەسینەدا جێگەت بەدڵ بۆبکەینەوە.

شیاوی باسە، من وام مانا لەو بەیتە لێ داوەتەوە، چیترم بەبیردا نەهات. زۆر وێ دەچێ نەم زانیبێو ماناکەی لەمەقوڵتربێ (هەژار)

٥ مە بئیشراقی سوئالەك ژلەبێ غونچە گوشاکر
کو بئیلهامی دزانی دسوئالا مە جەوابە
(یان، گۆ بئیلهامی دزانی دسوئالاتە جەوابە)

**مانای وشە:**

**ئیشراق:** تیشك‌دان؛ **ئیشراقیۆن:** ئەو کەسانەی سەر بە فەلسەفەی ئیشراقن، کە بەخۆیان گوتوە ئیشراقی. فەلسەفەی ئیشراق لای وایە زانستی راستو دروستو بێ‌خەوش، تەنیا لەرێی دەرونی رونو دڵی روناك پەیدا دەبێو هیچی‌ترنا. داهێنەری ئەم فەلسەفە لە ئیسلامدا، شیخ شەهاب‌الدین سوهرەوەردی کوردە کە سالی ٥٨٧ کۆچی مەلاگەل بەگژی‌داهاتنو لای سوڵتان صلاح‌الدینی ئەییوبی بە کافریان لەقەڵەمداو فەرمانی بە «مەلیك ظاهیر»ی کوری خۆی‌دا گرتیو کوشتی. وەك هەمیشە کورد کوردی کوشت. ئیشراقیەکان کاریان بە قسەکردن نەبو. رازی دڵیان دەخوێندەوەو بە تماشای بیچمو کەسم دەیەکتری دەگەیشتن؛ **ئیلهام:** بیرخستنە دڵەوە.

**پوختەی مانا:**

ئێمە هەر لەرێی دەرونەوە، پرسیارێکمان لەو لێوەی ـ کە هەمو خونچەی پێ دەپشکوتن ـ کرد. دەشمانزانی هەر لەرێی دڵیەوە دەزانێ کە وەرام بۆ پرسیارەکە هەر لەناو پرسیارەکەدا. ئەو دەزانێ منچیم دەوێو دەشزانێ کەمن دەزانم ئاواتم بۆ پێك ناهێنێ. یان بەخستنەدڵم گوتی تۆ دەزانی وەرام هەر لە پرسیاری خۆت دایە.

«هەژار» دەڵێ:

گوڵی باخان لەشەرمی کوڵمە سورە    لەروی ئەو پەلکی گوڵ ئەستورە زورە

گوتم مردم نەگەیمە ماچێ فەرموی    هەژار بمپورە دورە ئەو سنورە

٦ توبنیێ سازێ بئاواز چرەنگی مە دخوازت
اللەاللە بخودێ قەط دبهی ئەڤ چخیطابە؟

٧ گوهدە نایێ ژلەبێ لەعلێ بقانونێ حیکایەت
دی چشەهدە بدە فێرا بدرت شەهدە رەبابە

**مانای وشە:**

**توبنیێ:** تۆبڕوانە؛ **دبهی:** دەبیسی؛ **خیطاب:** دواندن؛ **سازو دەفو قانونو رەباب ـ یان، روبابە:** ناوی چەند ئامرازی موسیقان.

**پوختەی مانا:**

تۆ بڕوانە ئامرازەکانی موسیقا، بە دەفەو بلوێرو روبابەو قانونەوە، چۆن دڵو گیانمان دەخوازنو چۆن وەزوان حاڵ دەمان دوێنن؟ چۆن بەناڵەو سوزەی دەرون، چیرۆکی دوری دیداری، لێوە ئاڵەکانی یارێ، ئەدرکێنن؟ ئەی خودایە! سەیر ماوم ئەوانە چەند بەئاشکرا شایەتی لە جوانی یارو دڵی کڵۆڵی دڵدارانی ئەو لێوە جوانانە ئەدەن؟!

«جلال‌الدین رومی» دەڵێ:

گوێ لەبلوێر بگرە دەکرو زێتەوە    زامی دەردی دوری پێ دەکولێتەوە

«هێمن» دەڵێ:

شیوەنێکم پیێە نەی نەی کردوە    بۆیە ناڵەم تێکەڵی نەی کردوە

٨ خوەش پەریشان صیفەتو مەجمەعەیی صورەتی حالین
پیری عیشقینو جوان طەبعو دلێ عەهدی شەبابە

**مانای وشه:**

**خوەش:** سەیر؛ **پەریشان:** بڵاو، شەپرێو؛ **مەجمەعە:** جێگـەی کۆبونەوە؛ **صـورەت:** شکـڵ؛ **صـورەت:** سیایی؛ **عەهد:** زەمان، چاخ؛ **شەباب:** لاوێتی.

**پوختەی مانا:**

ئێمەی دڵدار، زۆر لە بارێکی سەیردایین. چەند شـتی دژ بەیەکترمان لەلا کۆیە؛ لە ئـاکاردا، پەرژو بڵاوو شپرێوین. کەبێتە سـەیری دەرونمان، خـروپرین‌و گردو کۆین‌و سـیایی پەرێشـانیمان لەلا کۆیە. پیربوین لەدەردی ئـەویندا‌و بوینە پیری دەسـتگیری ئـــەوینداران. بەڵام دڵمان هێشـــتا لە ئەویندا لاوەو تەبیات‌و ئاواتەکانمان، هەر پیر نابن‌و هێشتا لەتافی جوانی‌دان.

٩ دوره دەستین ژخەیالان مەدڤیٚ یەك ژخودیٚ را
خەف دبەحتا مەژدل بێت‌و برت عەینی ثەوابە

١٠ مە موشەررەف‌کە دو چەشمێن مە بیساطا قەدەمی‌کە
پورٚ لنك من هەیە مەی، مێژەکە من سینە کەبابە

**مانای وشە:**

**ژدل:** بەدڵ؛ **عەین:** کانی، بەتەواوی؛ **ثەواب:** کاری خێر؛ **موشـەررەف:** بەپیرۆزی گەیشـتو؛ **بیســـاط:** رایەخ؛ **مێژەکە:** برۆانە.

**پوختەی مانا:**

بەخەیاڵ دێمە دیدارت بەڵام دەستی خەیاڵاتیشم نات‌گاتیٚ. خێرەو مەندێکم گەرەکە لەرای خـوادا، نەهێڵی شوفار بزانن بە نهێنی‌و بەدڵ، لەنێوانمان بێت‌و برۆاو داوای دیدارم بۆبکات. زۆر خێرێکـی گەورەدەکا. دەیسا وەرەو بەهاتنت گەورەمان کەو بەسەر رایەخی چاومان‌دا هەنگاو بنیٚ. مەفەرمو، لە وزەی‌دا نیە، میواندارییمان لی‌بکـا. فـــرمێسکی ســـورم بادەیە، لە کوپەی دڵی هەڵ دێنجـــم‌و هەرچەندی بتەویٚ هەیە. دڵ‌و جەرگ‌و هەناویشم لە ئەویندا، بویتە کەباب‌و برژاوە.

«مەولەوی» فەرمویە:

هەمراز ئاخ‌و داخ ناڵە نەوای نەی      دڵ کەواو، چەم جام، خەم ساقی، هون مەی

١١ کەسك‌و صوٚران توینیٚ چەرخ لدوٚرا دو هیلالان
دوقیران مانە بەرابەر شەفەقیٚ پەردە عیصابە

**مانای وشە:**

**کەسك‌و صوٚر:** پەلکەزێرینە؛ **شەفەق:** روناکی ئاسۆ؛ **عیصابە:** هەنیەپێچ.

**پوختەی مانا:**

وادیارە یار تکــای مەلای هەژاری دڵ بریندارى، قبوڵ کردوەو هاتۆتە کۆڕی ســەماوە. مەلا بە دیمەنی یار هەڵدەڵی‌و فەرمویەتی:

دەبرۆانە، خشڵ‌و زەنبەرو پەلکەشۆڕو گوڵینگەو سەرپێچ‌و شەدە، لە دەورەی ئــەو روخســارەدا ـ کە لە رۆژ بەتیریژتره ـ چۆن وەك کوڵکە زێڕینە دەنوێنن، کە دەورەیان لە خۆردابێ. سەیر ئــەوەیە دومانگــی یەکشــەوەی برۆش، لەو ناوەدا دیاری دەدەن. کە ناوی لێ ناون: برۆو رێك‌و پێك‌و بەرانبەرن‌و، سپیایی تەختی هەنیەکەی لەبن بسکــان، وەکو روناکایی ئــاسۆی بەرە بەیان دێنە بەرچاو؛ بەڵام پارچەی توێڵ پێچــی وەك پەڵە هەورێك لەوســەرە بویتە لەمپەرێك لەنێوانی چــاوی من‌و دیداری ئەو هەنیەپاکە.

«نالی» دەڵێ:

دەسرۆکەیی هەوری چیجابیکە کەتێ‌دا (شمسُ فَلَكِالْحُسْن أَنارَتْ فَتَوارَتْ)

عەرعەران تا دشەپالن وەرقان جەذبە یەقێرا
نێرگزان سەر دگرانن، لبنەفشان خەم‌و تابە

١٢ چیچەکێن قەوس‌و قەزەح رەنگ هەزار رەنگ سەمایە
سونبولان گرتی خونافو لگوڵان تازە گولابە

١٣ مەستو هشیار هەمە کەج کولەهن رقص‌و سەماتێن
ئەز نزانم چنەسەق کەیفە نزانم چشەرابە

**مانای وشە:**

تا: لق؛ سەرگران: زۆرمەست؛ خــەم: لارەوەبو؛ تاب: پێچ؛ تازە: هەم نوێ هەم زۆرباش؛ کەج کولەه : کڵاو لار؛ نەسەق: تەرتیب‌و تەکوزی؛ کەیف: دڵخۆشی.

**پوختەی مانا:**

پۆل بەپۆلی کیژی نازدار، باڵا وەك نەمامی عەرعەر شــلك‌و خــونچیلانەو دڵگــر، کە دەلەرن. پەرەنگــی زێڕی خشــڵەکان ـ کە لەبیچمی‌گەڵای دارن ـ وەك من توشــی جــەزمە دەبن‌و دەگەڵ سەریان رادەهەژێن. نێرگسی چاو هێندە مەستن، ســەرگرانن. وەنەوشــە لە شــەرمی بسکــان، خواربونەوەو پێچ دەخۆن‌و لاتوایە ئــەوانیش وێرای ســەماکەران ســەما دەکەن. هەزاران گوڵی پشکوتوی هەمە رەنگە، لەو دەشتی جێ‌داوەتەدا، بە سروە کەرۆیشکە دەکەن. ئێژی ئــەستێرەن لەعاسمان دەدرەوشێن‌و تێکرا وەك پەلکــە زێڕینە، دێنە بەرچــاو. لە خــۆشیان هاتونە ســەما. ســونبول‌و گوڵ، پر ئــاونگن. گوڵاوی نوێ‌و هەرە بەبۆن، بەبارانەو، وەك شــاباشی دڵدارانە

لەبەریاران. هەرچی دیبینی نازدارەو کڵاو لارەو لەسەمادا بەتەمایە لەگشتیان جوانتر هەڵپەڕێ. ئەی خوایە! چەند دڵخۆشکەرەن؟ پیاو لە دیداریان مەست ئەبێ. تێ ناگەم چۆن بادەیە کە لەو روخسارە سادەو پاکانە دەبارێو پیاو سەرخۆشی بێهۆش دەکات.

١٤ خاکیپایێن تە درێزا سەگو تولان خوە دەناسین
مەنەسوچو نەگوناهو نەخەطا ئەو چعیتابە؟

١٥ ژویصالا خوە زەکاتێ بدە میسکینو فەقیران
کو جەمالا تەیە کامیل دکەمالا خوە نیصابە

**مانای وشە:**

**خاکیپا:** خۆڵیڕێباز؛ **عیتاب:** سەرکۆنە؛ **ویصال:** گەیشتن؛ **زەکات:** پیتاکی ئایینی؛ **فەقیر:** نەدار؛ **میسکین:** هەژار؛ **کامیل:** تەواو؛ **کەمال:** تەواوی؛ **نیصاب:** رادەی زەکات لێکەوتن.

**پوختەی مانا:**

وا دیارئەدا یار مەلای لۆمە کردوە کە بۆچی روی لەو وەرگیراوەو پەسنی کیژی تریداوە؟

دەڵێ: تۆنابێ سەرکۆنەم بکەی. بێگوناهم؛ چاوی دڵم هەر دەتۆیەو هەرچی دەگەڵتۆش دەیبینمو لەلام جوانە، بەتیشكو شەبەقی جوانی بەژنو باڵای تۆی دەزانم. من خۆم وەك ئەو توڵەو سەگانەی بەردەرگانەکەت دێنمە حەساو کە دەکەونە ژێر خاكو پاتو بەتۆزی پاڵا واڵاکەت بەختەوەرو سەرفیرازن. من گەدایەکم لەدەرگات. دور لەباڵات گەلێك نەدارو هەژارم. جوانیو نازداریت نامەخوا. هێندە زۆرە، زۆر پێویستە زەکاتەکەی لێ دەربکەی. کەست لەمن مستحەقتر دەسناکەوێ. دەستی من وکەرەمی تۆ.

«حافظ» دەڵێ:

لەرادە دەرکەوت جوانیو لەباریت     هەژاری تۆم بەئاواتی زەکاتم

١٦ عاشقی مەسئەلە خواهی وەرە ئەم موفتیێ عیشقین
دەستەکی سوننەتە تێدا دیەکێ نەصصی کیتابە

١٧ دلبشو توژقێ نیفاقێ کوبدەت سینە بەراقێ
بصەفا هەمرەهی ئەربابی دلو ئەهلی صەفابە

١٨ نەظەرا عەینی عینایەت بمەدا شاهی ویلایەت
ژعینایەت نەظرێ دل مەتژی عیلمو عوبابە

**مانای وشه:**

**خواه:** داواکار؛ **سوننەت:** رەوشــت؛ **ســوننەت:** فــەرمودەی پێغــەمبەر؛ **نەصّ:** دەق؛ **کیتاب:** کتێب؛ **نصّی‌کیتاب:** دەقی ئایەتی قورعان؛ **نیفاق:** دوڕویی؛ **بەراق:** بریقــە؛ **صــەفــا:** پاکی‌و تەبایی؛ **ئــەرباب:** خاوەنان؛ **ئەهل:** خزم‌و ناسیاو؛ **ئەهلی صەفا:** ئاشتی خوازان؛ **إخْـوانُ الصَّـفـا:** کۆمەڵێکـی نهێنی‌بو. لە چەرخی چوارەمی کۆچــی، ناوەندەکەی لەشــاری بەغدا وبەســرابو. لە هەمو وڵاتی ئیســلام زۆرکەس ببونە پەیڕەویان. دەیانەویســت موســوڵمان دژبەیەك نەبن‌و هەمو پێکــەوە تەبابن. تاواش نەبن بەهیچ نابن؛ **عینایەت:** دلۆوانی‌و دڵسۆزی؛ **ویلایەت:** گەورەیی، دۆستی؛ **عوباب:** جێ‌شەپۆل‌و نێرینەی‌ئاو.

**پوختەی مانا:**

رەنگە هێندێك لەلایان خۆش نەهاتبێ، مەلا خۆی لە ریزی سەگی بەردەرگای‌یار، حیساب بکا. لە وەرامی ئەوجۆرە کەسانە دەڵێ: تۆ چوزانی ئەوین‌و دڵداری چــی‌یە؟ هێشــتا زۆرت دەوێ، فێربی. ئەگەر دەتەوێ لەوبارە شت بزانی، وەرە لەلای من هوین ببە. من لەم زانستە بەرزەدا ـ کە ئەوینە ـ بومە مفتی. لە دەستێکما قورعان هەیەو فەرمودەکانی پێغەمبەر بەو دەسمەوە؛ هەرچــی دەیڵێم، هەرچــی دەیکــەم، بەرانبەر بەمانی دەکەم. تۆی بەرواڵە وادەنوێنی کە دڵداری‌و لە دڵیشـــتدا، لەدڵداری بێ‌خــەبەری. دوروی. پیاوی منافــق‌و دوروش، لە کافــران خــراترە. دەس لەو دورویيە هەڵگرە. تیشکێکی رونی ئەوینێ با ئەو دڵە رەشەت رون‌کاو بروسکەیەکی تێ‌بگەرێ. ببە هاورێی خـــاوەن دڵان. لە کۆمەڵی پاکاندا، ببە بەهەندام‌و لەدژایەتی وازبێنەو دەگەڵ ئێمەدا هەواڵ‌بە؛ تا بەپایەی ئێمە بگەی، گەورەی بەرزو خاوەن شکــۆی مەملەکەتی ئــەوینداری جــارێك ســـیلەی چــاوێکی بە بەزەییەوە داوەتە من. لەوســاوە دڵم‌و دەرونم، بۆتە دەریای زانســـتان‌و لە هەمو لا شەپۆل دەدا.

**١٩** لەبی لەعلێن تەدبی هەر بیەکێ نوقطەیێ عیلمن
بخەطی حەرفی ئەلیف جەزمە شوبی حەلقەیی بابە

**مانای وشە:**

**دبی:** دەبێژی؛ **نوقطە:** ماکی ناوەندی کە رەگەز و بنچینەی هەمو شــتێکە؛ **خــەط:** نوســـراو؛ **جــەزم:** درزبردن؛ **جەزم:** بەش؛ **جەزم:** زەنەی هاوکاری سەرو ژێرو بۆر ئاڵقەیەکی زۆر پچوکە (ە) پیتی ئەلف (ا) کە لە چوار نوقطەی لەسەریەك دروس دەبێ؛ دروشمی ناوانی خــوا (اَللّه، اَوَّلَ، ئــاخر. ئــامر، اَحَــد)و دو صیفەتی خوا (ئەزەلی‌و ئەبەدی‌یە)؛ **حەلقەی باب:** ئاڵقەی دەرگا.

**پوختەی مانا:**

لێوی وەك لاڵ ئاڵەکانت، دەڵێی هەردوك بەتێکــڕایی تەنیا نوختەی ناوەندی هەمو عیلمانن. ئــەو

نوختەیە بە نوقطەی سەرەتای پیتی ئـەلفـی ناوی خـودا، درزی داوەو زەنەیەکی کە نیشـانەی راوەستانە، لیّسازبووەو ئەمە نیشـانەی ئـەوەیە کە هەمو ئـافەریدەیەك بەزنجیرە سـەریان بەیەکترەوەیەو لیّوەکانت دەبنە پشـوگەی گیانانو ئیتر لەویّ کە نوختەی بناغەی ئـەلفـە رادەوەسـتن. هەروەها بوّیە لەونوختە بویتە ئـاڵقە، کە بزانین ئـاڵقەی دەرگای زانسـتیمان، بەزانستانی دانستە لیّوی توّیە، تا لەو خـەبەر وەر نەگرین؛ ناتوانین بچینە ژوری بارەگای زانسـتی خودا.

**٢٠ خەتو خالین‌تە بمومو ژمەرا مەسئەلە گوبین**
**مەژوان حاشیەیان سینە تژی شەرحی لوبابە**

**مانای وشە:**

**حاشیە:** پەراویز؛ **شەرحـی لوباب:** توّژینەوە لەکاکڵان؛ **شـەرح:** تویّ کراو؛ **لوباب:** دڵان؛ **لوباب:** چـەند کتیّبیّك لە دەورانی مەلایەتی شیّخی جزیری، بەوناوە هەبون:

١ـ لوباب (کاکڵان): نوسینی ئەبوالحسن محاملی لە شەرعی شافعی‌دا. ئیمام‌الحـرمینو جـەلال بەکری، شەرحیان لیّکردوە.

٢ـ لُباب‌الالباب (کاکڵەی دڵان): ژینامەی ١٦٩ شـاعیرە لەسـاڵی ٦١٨ ی کوّچـی لەلایەن سـەدیدالدّین محمدی عەوفیەوە نوسراوە.

٣ـ لُباب‌الاحیاء: نوسـینی ئـەحمەد غەززالی. پوختەی (أحیاءالعلوم)ی محمدی غەززالی. نوسـەرِ لەسـاڵی ٥٢٠ کوّچی مردوە.

٤ـ لُباب‌المعنوی: هەڵبژاردە لە مەثنەوی. نوسینی حوسیّن کەمال‌الدین کاشفی. کە ساڵی ٩٠٦ یان، ٩١٠ ی کوّچی مردوە.

٥ـ لُباب‌فی‌النحو: ریّزمانی عارەبی، نوسینی ابوالعباس ئـەحمەدی ئیسـفەراینی کە سـاڵی ٤٠٤ یان، ٣٩٨ کوّچی مردوەو زوّرکەس شەرحی لەوکتیّبەی کردوە.

**پوختەی مانا:**

خـاڵو میلیّ توّرژتوتن. هەر مویّکـی موبەمو وەرامی پرسـی دژواری‌من ئـەدەنەوە. ئیّمە لەو پەراویّزانەی کە لە لاجـانگ ئـاویّزانەو بریەتین لە کەزیەکانت؛ سـینەمان هەموی تویّ تویّ‌یەو کاکڵی سینەش ـ کە دڵمانە ـ تویّ کراوەو پرکراوە لە زانستی‌و ئیّستا وەك شەرحی لوبابە.

**٢١ ئابی حەیوان تەدقیّ راست بنوّشی شەبی قەدریّ**
**دەست بەرگەردەنی پرپیچو خەمی زولفی دوتابە**

**٢٢ مە ژبسکیّن تە گریهدار ژبەختیّ خوە گرینە**
**مە ژزولفیّن دخەموتاب ددلدا خەموتابە**

### مانای وشه:

دوتا: دولا؛ دوتا: قەدکراو، بەسەریەکا هاتو؛ دوتا: دولابار؛ گریهدار: بەگریۆ چین لەسـەرچین؛ خـەم: لار؛ خەم: غەم؛ تاب: پێچ؛ تاب: تینو تاو.

### پوختەی مانا:

لەوشتانەی کە شەرحی خەتو خاڵی یار باسیدەکا، یەك ئەوەیە: ئەگەر بەراستی دەتەوێ شـەوی بەرێزی دیدارم، بۆت دەسبداو ئاوی ژیانی دیدارم بخـۆیەوەو هەرگیز نەمری؛ دەبێ لەخـــەمی کەزیەکەی ئاڵۆزاوو چین لەسەرچینو لارەکەم، کزوماتو دەسلەگەردن بۆی دانیشـیو دەسـتی هومێدو ئاواتت، بەشکاوی بکەیتە وەباڵی ئەستۆت. ئـەوسـا بزانین چـــۆن دەبێ. یاری جـــوانم! ئەوامن لەو بسکە رەشە پرگرێیەت، بۆ بەختی رەشی خـۆم دەگریم. لەپێچو لاریو قـەدقـەدی، دڵم پڕە لەپێچی دەردو خەمانو لەصەدلاوە قەدکراوە.

**٢٣** تەدڤێ بەرقو بروسکان برەشینی؛ تو نەظەردە
تەدڤێ رۆژ خویا بت؛ ژشەباکێ تو خویابە

**٢٤** تەدڤێ زیرو زەبەرکی مە؛ دوزولفان بدە بەربا
تە دڤێ قەنج قیامەت لمە رابت. بخوە رابە

### مانای وشە:

شەباك: پەنجەرە؛ بخوەرابە: بۆخۆت هەڵسە؛ قیام: قیامەت، هەڵسان.

### پوختەی مانا:

یاری نازدار! ئەوجار نۆرەی منە بڵێم چیبکە. گەر دەتەوێ تروسکەی عاسمان لێماندا؛ تۆ خـۆت تماشامان بکە، ئەوا بەبروسکەی چاو،دەمرین. ئـەگەر دەتەوێ خـۆر هەڵێ؛ سـەر لە پەنجـــەرە دەربێنەو خـۆت نیشـاندە. گەر بەنیازی هەمو دنیا ژێرو ژورکەی؛ کەزیەکانت بدە بەربا. ئـــەگەر ویستیشت دڵداران قیامەتیان لێرابێ؛ بۆخۆت هەستە. ئەوە قیامەتیش دەقەومێ.

**٢٥** قەصدی سەرچەشمەیی حەیوانی حەقیقەتکە «نیشانی»
بـجیهانێ مەبە مەغرور کوجیهان عەینی سەرابە

**٢٦** سەرکەشی شیوەیی ئەربابی وەفا نینە رحێمن
تە ژدل صوهتی مەلا، بەس بـمەلێرا بجەفابە

**ماناى وشه:**

**قەصد:** نیاز؛ **سەرچەشمە:** سەرچاوە؛ **حەیوان:** ژیان؛ **حەقیقـەت:** راسـتینە؛ **سـەراب:** تراویلکـە؛ **سەرکەشی:** لاساری؛ **وەفا:** ئەمەگ؛ **رحیّمن:** روحی‌من، گیانەکەم؛ **جەفا:** ئازار.

**پوختەی مانا:**

ئاوی ژیانی بەراستی، کەوتن بەسـەر راسـتی‌دایەو ئـەگەر دەتەویّ نەمر بی؛ لەدوی راسـتی هەڵوەدابە، نابیّ بەدنیا بایی‌بی‌و فریوی دنیایە بخۆی. دنیا وەك تراویلکەیە. چاوت بەئاوی دەزانیّ‌و لەراستی‌دا، بیابانێکی بیّرونەو دەم تەڕناکا. ئەی‌یار! هەرچەند ئـازاریشت بەدڵ دەکڕم. بەڵام تۆش بەزەت پیّم‌دابیّ. لە لاساری دەست هەڵگرە. ئەمەگداری واهەڵدەگریّ کە هەروەك ئازارم دەدەی، جاروبار بشم‌لاویّنی. تۆ زۆر بەدڵ مەلات سوتاند، دەبەسیە ئازارم مەدە.

# قصیدەی هەشتاو پێنجەم

## «دەردی بێ دەرمان»

١ موحبەتێ میحنەت دزورن  حوب دبێم بێشك بەلایە
عومروژی خوەش پێ دبورن  صوّتن‌و دەردو جەفایە

٢ صوّتن‌و دەردێ ئەڤینێ  عیللەتێ داغو برینێ
خوەش دبن مائەو بدینێ  شەربەتا لیڤان موفایە

٣ هەردلێ صوّتی بئولفێ  یار نەدەرمان‌کت بزولفێ
تا ئەبەد ئەو بەندو قولفێ  عیشق دەردەك بێ دەوایە

٤ عیشق دەردەك بێطەبیبە لێ موفا وەصلا حەبیبە
کوشتمە جەورا رەقیبە  پوڕ لەعینی روسیایە

**مانای وشە:**

**ژی:** ژیان؛ **عیللەت:** هۆ؛ **موفا:** چارە؛ **ئولف:** هۆگر؛ **قولف:** ئالقەی جۆش‌دراو؛ **جەور:** نارەوایی؛ **رەقیب:** چاونەزێر؛ **روسیا:** رورەش.

**پوختەی مانا:**

مەینەتی دڵداری زۆرن  من دەڵێم دەردو بەڵایەو بێ‌گومانم...

گەرچی دڵداری سەرانسەر دەردو ئازارو سوزانە. بۆ ژیان هۆی سەرگەرمی‌یەو پیاو دڵی پێ شادو خۆشە. چونکە رەنگە یار هەڵێك لێمان وەپێچێو بێتە سەر پێکراوەکانی چاوەکانی. دەردی دڵداری‌و برینی گیان‌و جێ‌داخ‌و سوتانێ هەر بە دیدارێکی یارێ دێنەوە سۆ، خۆ ئەگەر لەو لێوە ئاڵەی، شەربەتێکمان بۆ بنێرێ؛ چاری گش دەردو برین‌و سوتن‌و ئازارو ئێشە. هەر دڵێکی

هۆگری یار، گەر بسوتیێو یار بەپرچان باوشێنی لیێنەکاتوپێی نەچاریێ؛ تا هەتایە هەر دەناو بەندی کەزیدا، وەك لەناو ئاڵقەی بەیەکدا جۆش درابیێ؛ هەر بە دەور خــۆیا ئــەســورێو شــوێنی دەربازبونی‌نابیێ. دەردی دڵداری بەژانەو زۆر گرانە. هیچ بژیشکێك چــاری ناکا. جــا مەگەر یار بێتەهاوارو بەدیداری، کە بۆگش دەردان مەفــایە لێی رەها کات. یار دەهات گەر چــاونەزێران لیێگەڕابان. ئاخ لەدەس دەستەی شوفاران. چەندە شومو روسیان. خوا نەحلەتیان‌کا.

٥ **داغو کەی من لیێ هەزارن  گول ددەست شەو کێن بخارن**
**سوڕپەری دێووی کەنارن  ئەهرەمەن خاتەم رەڤایە**

**مانای وشە:**
**کەی:** داغ؛ **شەوك:** دڕك؛ **خار:** چقڵ؛ **دێو:** عیفریت؛ **ئەهرەمەن:** شــەیتان؛ **خــاتەم:** ئــەنگــوستیلە، کلکەوانە؛ **رەڤایە:** رفاندویە.

**پوختەی مانا:**
داخ لەدەس چەپ گەردی گەردون. لەو هەزارداخم لەدڵدا. گولێ دەداتە دەســتی دڕکان. دێو لەکن پەریان دەبینم. بەچکەشەیتان هەنگولیسکی ڕازڕفــاندو بردی بۆخـۆی. شـیاوی باســە، مەلا لێرە نەقڵی تەختی سولەیمان‌و کلکەوانەکەی باس‌دەکا. کە چـۆن دێوێك لێی رفـاندو تەختەکەی کردە شوێنی خۆی.

٦ **طەبع دیوان دەست گەهشتی  حورو ویلدانین بەهیشتی**
**عاشقی دلبەندی قشتی  جان بدەت یەکجار رەوایە**

٧ **میحنەت‌و جەورا حەبیبیێ  قەهرو ئازارا رەقیبیێ**
**حەق تنیێ دامن غەریبیێ  لیێ شوکور باخوەی وەدایە**

٨ **روهنی یاویێ شەوق‌و تاڤیێ  شەربەتا قەندو گولاڤیێ**
**کەس نهن مەحروم ژناڤیێ  لیێتنیێ بۆمن غەلایە**

٩ **بیێنەصیب من‌دی ژجامی  دوردور مەحروم ژرامی**
**گرتی‌ییێ ویێ قەیدو دامی  ئەڤ غەریبیێ جان فیدایە**

١٠ **دورەدەستم بیێنەصیبم  دلبەرم خانم حەبیبم**
**پورێ ژدیناتە غەریبم  روح‌و راحەت من لیقایە**

### مانای وشه:

**قەهر**: تورەیی، غەم؛ **غەریب**: ئاوارە؛ غەریب: زەبونو بێچارە؛ **باخوە**: خـودا؛ **غەلا**: قـاتیو گرانی؛ **رامی**: ئۆقرەو ئاسودەیی؛ **قەید**: بەندو زنجیر؛ **خانم**: گەورەم؛ **راحەت**: ئاسودەیی؛ **راح**: بادە.

### پوختەی مانا:

دێومیجازی توش‌و بەدفەر چاوەدێری‌کیژولاوانی‌ناو بەهەشتبن؛ دیقی مەرگی‌عاشقانە.

مەینەت‌و ئـازاری یاریٚ، تورەیی‌و ژانی شـوفاران، خـوا لەناو گش دڵداراندا داویەتی بەمنی کلۆلێ. ناشکوری ناکەم بەشی خوایەو ئـەوەندەی داوەپێم. رۆشـنی ئـەو تیشـك‌و تاوەی کوڵم‌و چاوەی، ئەو هەمو شـەکرو گوڵاوەی لێوی‌یارم؛ هەر بەتەنیا بۆمنی بێچـارە قـاتەو هەرکەسـی‌تر، هیچ نەبێ تۆزێکی دیوە. دیتنی ئەو مەسـتە چـاوە، هەر لەمن رێی بەسـتراوەو دەرکی ئـۆقرەو شادیانم داخراوەو هام لەناو زیندانی خەم‌داو گیان لەسەر دەسـت‌و ئـامادەم خـۆم بەقـوربان‌کەم لەرێدا. یاری دڵبەر! میرو گەورەم! خۆشەویسـتم! دەردی دوریت زۆر گرانە. زۆر دەترسـم‌پێ نەوەستم دەربەرم. بۆدیدارت زۆر زەبونم. زۆر بەتاسەم. گیانی من بێ‌دیتنی‌تۆ، چۆن دەمێنێ!

١١ پورٚ مولازم دێم لیقایێ  مامە حەتتا مولتەقایێ
من رحێ شیرین ددایێ  هودهود ئەر مزگین بدایێ

١٢ هودهودێ ریضوانی غەییێ  صەد خەبەر شیرین ژجەیبێ
دادلێ من موردە حەی‌بێ  گوٚە لەرێ من وەك صەبایە

١٣ چەهڤە نێرم گوٚە لرێمە  لێ صەبارێ دایە بێمە
عەرضحالا صوحبەتێ مە  بەندەیەك صادق مەلایە

١٤ جان‌فیدایێ من درێدا  فیرقەتێ دەردەك وەلێدا
قالبەك بێ‌روحە وێدا  کوشت دبێم من لێ رەوایە

### مانای وشە:

**ملازم**: هەمیشە لێ، هەمیشە دەگەڵ؛ **مولتەقا**: توشی یەك‌بون، ژوان؛ **ریضوان**: باغچەگەل؛ **ریضـوان**: رەزەوان؛ **جەیب**: دڵ‌و سینە؛ **موردە**: مردو؛ **حەی**: زیندو؛ **بێمە**: دەبێژم؛ **عەرضحال**: رانانی چلۆنەتی.

### پوختەی مانا:

هەمیشـەودایم لە دەرگام، لاناکەوم؛ بەڵکـو چـاوم بەیارم رون‌ببێتەوە، دەمێنمەوە، ناهومێد نیم. ئەگەر ئەو چاوەنورێەی من، تا رۆژی حەشریش بمێنێ؛ کە لەوێ توشی یەك دەبین. ئـاخ ئـەگەر پەپوی نامەبەر ـ کە باغچەوانی بەهەشـتەو دەتوانێ یارم ببینێ ـ خـەبەرێکـی دڵخـۆشکەرەی

بۆهێنابام؛ صـــەد گیانم‌با، لە مزگێنی‌دا دەمدایە،بەمژدەی‌وا،دڵی مردولەم دەژیاوە. گوێ لەســەر هەستو چاوەڕێم. دەڵێم بەڵکو بەسروەدا، خەبەرێکـی خـۆشم بۆبێت. من لام‌وایە، سـروە دەردو داخـی دڵی‌منی، گەیاندۆتە بارەگای یارو،دڵداریو ئـەمەگداریمی باس‌کردوە. یار فــەرمویە: مەلا کۆیلێکی راستمەو گیانی بە قوربانی منەو دوری لەمن، زەبرێکی وای لەدڵ داوە؛ کە ئێستا لەشـی بەتاڵەو گیانێکی تێدا نەماوە. منم کُشتم، بەڵام ئەگەر دڵبەران دڵدار بکوژن لە ئـاینی ئـەوینداریدا، رەوایە. چی‌تیایە؟

**١٥** دەم بدەم ئەو چەھڤە نێرە  بێتە نیشانەك مەژێرە
دابیت ئەو زیندە ڤێرە  یاری صادق بێ بوهایە

**١٦** عاشقێن صادق دکێمن  ما دبێ صەدجان فدیٚمن
زانم ئەو ناژیتە بێ‌من  عاشقو پڕ موبتەلایە

**١٧** عالمین ئەم ڤێ دزانین  جیسمە ئەو ئەم روحو جانین
قەط ژهەڤ باطین خویانین  گەرچی ظاهیر ئەو جودایە

**١٨** هودهودێ وێ رەمزو رازێ  بابو ئەو چو گوفت بسازێ
قیصصەبر بەحثا مەجازێ  قاصیدەك خۆش طەبع بایە

**مانای وشە:**
**ژێرە:** بۆئەو؛ **ڤێرە:** دەگەڵی، پێرا؛ **بوها:** نرخ؛ **جان‌فـدێ:** گیان‌فیدا؛ **موبتەلا:** گیرۆدە؛ **ژهەڤ:** لەیەکتر؛ **ظاهیر:** رواڵەت؛ **باطین:** بنەڕەتو دەرون؛ **بەحثامەجازی:** باسی دڵداری دنیایی.

**پوختەی مانا:**
هەمیشە واچاوەنۆرە، کە نیشانی لەلای ئێمەوە بۆبچێتو دەگەڵ گەینی نیشـانەکە، بژیتەوە. یاری وا راست، هەرگیز نرخی تەواو نابێت. دڵداری بەراست، زۆر کەمن. لە صـەتان یەکی وەك مەلا، هەڵدەکەوێ گیانی لەرای دڵدا بدات. دەزانم ئەو بێ‌من ناژی.
زۆر گیرای دڵداری منە. تێدەگەم زۆر باش دەزانم ئــەولەشـــەو من بومە گیانی. لە رەگەزو لە دەرون‌دا، من‌و مەلا بەهیچ کەس لێك ناکرێینەوە، هەر یەکێکین، بەڵام بەرواڵەت لێك جیاین.
پەپوی ئەو رازو نیازانە ـ لە بەختتانم ـ ئەوجار بابو. هەرچی بەسەرمن هاتووەو هەرچی ناڵەو دادو هاوارم کردوە، گشتی لەمن وەرگرتووەو بەگوێی سازو بلوێری داسـرکاندوەو بلوێرو سـاز، بەگوێی دڵبەریان داداوەو لەپێشـــەوە وەك چیرۆکی دڵدارانی دنیایی باسـیان کردوە. های لەمنت کەوێ سروەبا! چەند پەیکێکی خاوەن مرخی.

١٩ بادەمی وەقتی مەجال‌دا  چو کو ئەوَیارە بپال‌دا
قیصصەیا حالی بحال‌دا  گوە ددیرت یارەیە

٢٠ موحبەتا مەحبوب‌و لاتان  پوڕ ڤەکر زیوەر صیفاتان
دایە قەلب‌و روح‌و ذاتان  روۆژ دمیرئاتیێ خویایە

٢١ صوحبەتا صوری دوقیسمە  قوفل‌و میفتاح‌و تەلیسمە
هن ژروحن هن ژجیسمە  نارو نورە هن هەوایە

٢٢ حوببی جیسمانی دوروۆژن  گەرچی دل پڕێیێ دصوۆژن
خەف جەگەر پەیکان دنوۆژن  میثلی نەقشی بیێ بەقایە

٢٣ گول حەتا صوهرن بطیێڤە  بین تەبەسسوم پیێڤە پیێڤە
بولبولی سەرخوەش دنیێڤە  نەغمەو نال‌و نەوایە

**مانای وشە:**

**مەجال:** بوار؛ **لاتان:** بتان؛ **ذات:** هەبو، هەرهە؛ **میرئات:** ئاوێنە؛ **صوری:** شکڵی؛ **میفتاح:** کلیل؛ **جیسم:** لەش: **دنوۆژن:** دەسمن، کون‌دەکەن؛ **بەقا:** مانەوە؛ **پیێڤە:** بەویۆە؛ **پیێڤە:** دەگەڵ؛ **نەغمە:** ئاوازی‌بەسوز؛ **نەوا:** ئاوازی بەقەو؛ **طیێ:** تا، لق.

**پوختەی مانا:**

کاتیێ با بواری درایەو یار لەسەر تەختی نازداری، پاڵ کەوتبو؛ ویستی گویێ لە سازان بگریێ. دیتی هەلەو یار ئامادەی گوێگرتنە. چیروۆکیێکی بەزمان بلوێرەوە بوۆگوت. کە پڕیێبو لەباس‌و خواسی دڵداران. چوۆن دڵداران یاری خوۆیان دەپەرستن. باسی ئەو ناسک‌و نازدارە دڵبەرو دڵرفێنانەی کرد کە لە دنیا بەناوبانگ‌بون. وردەوردە، لەباسی خشڵ‌لەبەران کەوتە سەر باسی ئەوانەی بەگیان دڵداری یەکتربون. لە رواڵەت خوۆشەویستنەوە گەیشتە چیروۆکی دڵی ئەویندارانی دەرونی‌و پیێی راگەیاند کە سەرەتای هەمو جوۆرە دڵداریەك دەگەڕێتەوە بوۆ خوداو رومەتی جوان ئاوێنەیەو بەرانبەر کراوە بەخوۆرو تیشکی خوۆرە لە ئاوینەدا دیارە. دڵداری رواڵەت بینیش، دەبتە دوبەش. هەر بەشێکیان چەند قفڵ‌و تەلیسمی هەیە بەکلیلی‌خوۆی دەکرێتەوە. هێندێك ئەوین لەگیانەوەن. هێندێکیان هەر سەربەلەشن. هێندێکیان ئاگرو تیشکن. هێندیکیشیان بادی هەوان.

ئەوینی لەش، هەر دوروۆژە. هەرچەندە زوۆر دڵسوتێنەو بەنهێنی پەیکانی جەرگان کون دەکەن. بەڵام وەك نەخشی سەرئاوەو لەناو دەچیێو زوۆر نامێنیێ. گوڵ هەتا لەسەر چڵانەو گەش‌و ئاڵەو، زەردە خەنەی لەلێوانە؛ بەرەو روی بزەیان دێتیێ. بولبول لەناو دڵبەراندا، لەخوۆشیان مەست‌و سەرخوۆشەو دەناڵێنیێو دەگاڵێنیێو جارجار بەسوۆزەو بە ورتەو جارجار دەنگی‌لیێ هدڵدێنیێ.

٢٤ هەرچی جیلوا بو ژناڤی  نوگولەك دی گرت خوناڤی
وی ژدل چو موحبەتاڤی  ئەو بیادی راتەبایە

٢٥ هەرکەسێ موحبەت ژروحە  موبتەلای نورا سبوحە
وی ددلدا صەد جروحە  جەذبەو لەرزین‌و تایە

٢٦ هەر دوروح یەك نوری طاڤن  چەرخەكو دوستێر دناڤن
هەردو دانەو مورغی داڤن  ئیسمی حەی داڤ لیٚڤەدایە

٢٧ نورە پڕ نادر وجودە  گەرچی ئەووەل نارودودە
بەرقی لامیع دیلکودە  حوب دقەلبان کیمیایە

٢٨ عارفی جەوهەر شوناسی  ئی بڤیٚ وصفو لیباسی
دی قەدر بیهتەر بناسی  مەقعەدی صیدەڤیٚ جەزایە

**مانای وشە:**

**جیلوا:** سیس؛ **نو:** تازە، نویٚ؛ **یادی:** ئەوی‌تر؛ **تەبا:** ئاشناوئاشت؛ **سوبوح:** سوببوح، واتا، پاكو پیرۆز؛ **سوببوح:** ناوی‌خوایە؛ **جروح:** برینگەل؛ **طاڤ:** هەتاو؛ **دانە:** دەنك؛ **حەی:** زیندو؛ **حەی:** ناوی خوایە؛ **دود:** دوکەلٚ؛ **کیمیا:** بەو زانستەیان دەگوت کە مس‌و زیٚو دەکا بەزیٚڕ؛ **جەوهەر:** گەوهەر، رەگەز؛ **مقعَد:** جیٚگەی دانیشتن؛ **صِدق:** راستی؛ خوافەرمویە:«لەخواترس‌و خۆ پاریٚزان، لە بەهەشتان‌و چۆمان‌دا لەجیٚ نیشتنی راستی‌دا، لە لای خودای توانا دەبن».

**پوختەی مانا:**

بەلٚیٚ هەتا گولٚ تورت‌و شەق مابیٚ؛ خویٚن شیرینەو بیٚ دلٚدارو بولبول نابیٚ. بەلاٚم هەر گولٚیٚك سیس‌بیی‌و هەلٚبوەریٚ؛ دلٚداری لیٚ دەتەکنەوەو رودەکەنە گولٚی تازەی دەم بەئاونگ. بەلاٚم دلٚداری گیان بەگیان، لە دلٚداری گولاٚنی دنیایی جیایە. دلٚدار گیرۆدەی پاکی‌یەو رۆشناکی گرتوٚتەوە. صەد برینی دەدلٚدایەو هەمیشە لەجەزمەدایەو گیانی توشی لەرزو تایە. لە ئەوینی پاکی گیانی، گیانی دلٚبەرو دلٚداران، هەرتك تیریٚژی تاویٚکن. دوئەستیٚرەن لەناو عاسمانە ساویٚکن. هەردوك دانەن. هەردوك مەلن. هەردوك داون. هەردوك بەجوت بەداوی خودا گیراون. دلٚداری دوگیان بەپاکی، هەرچەند لەدەس پیٚکردنا ئاگر گرتن‌و دوکەلٚی هەناسەی تیٚدا؛ بەلاٚم ئاکام تیشکیٚکی یەکجار نایابەو تیشکی بروسکەی گیانی پاك، لە هەرچی‌دا، برەوی پیٚپەیدا دەکا. دلٚداری دلٚی ئاسنیش دەکاتە زیٚڕ، کیمیایە. دور ناسیٚکی گەوهەری ئەوینی گیانی، باش بناسیٚ. دەزانیٚ چەندە بەنرخەو دەزانیٚ دلٚداری گیانی، لەناو بەهەشتی خودادا، جیٚگەی بوٚ دیاری کراوەو خوٚشترین جیگا هین ئەوە.

٢٩ دور نەکی داوێ ژدەرێ خوە  وەرنەگێرێ ژوی بەری خوە
بوریە ئەو دسەری خوە  سەر دناڤا رێ نهایە

٣٠ مادبت ئەو دورە دەستبت  دێ ژفینجاناتە مەست بت
جام ژشەهکاسێ بدەست بت  ئەبتەران ئەومەی دەوایە

٣١ یار پوڕ حوسنەك لبال‌بو  دلبەرەك غایەت جەمال‌بو
ئەو بحال ئاگەھ  بحال‌بو  شوبهێ وێ شەفقەو عەطایە

٣٢ مەهدەرا وی خەیر خوازی  نوکتەیەك ژوی رەمزو رازی
وی‌بدل صەح‌کر ژسازی  موغنی‌و قانون‌و نایە (یان، مەغنی‌و...)

**ماناى وشه:**

بەر: رو؛ بەر وەرگێڕان: رو وەرگێڕان؛ بوریە: بوردوە، دەستی هەڵگرتوە؛ ئـەبتەر: دوابڕاو، لێرەدا مەبەست زۆر چارەرەش‌و پەشێوە؛ مەهدەر: تکاو شەفـاعەت؛ صەح‌کر: تێگـەیشـت، پێی‌زانی؛ موغنی: موغەننی، گۆرانی‌بێژ، بەزمگێڕ؛ مەغنی: مەغنا، گۆرانی.

**پوختەی مانا:**

سـروەبا، تکـاکاری‌من، دەگەروی بلوێرەکەدا، بەیارمی گوت. دڵداری وا پاك‌و گیانیت نەکەی لە دەرکی خۆت دورکەی. نەچی روی لی‌وەربگێری. دڵداری وا دەسـتی لەسـەری بەرداوەو دەمێکـە لەگیان بوریوە. سـەری پر دەبازی ری‌یە، کەیار بەسـەریا ببورێ. چـۆن رەوایە دڵداری وا، لەبەر دەستتدا نەوەستی‌و لەپیاڵەی دەسـتت مەسـت نەبێ؟ پیاڵەی چـی؟ بۆ دڵداری‌وا گەرەك مەی بە شاکاشی‌بێ. بۆ نازشـێواوو دوابراوی شـێتی ئـەوینی گیانی پاك؛ بادەی دەسـتی تۆ دەرمانە. چاکترین چـارەی دەردانە. یاری نازدار، ئـەوەندەی جـوان‌و لەبارە، ئـەوەندەش دڵنەرم‌و باش‌و دڵاوایەو صەدئەوەندەش، بەدڵ‌و بەگیان‌و شیارەو لە دەردی دڵ، ئاگادارە. لە دەنگی سازو ئـاوازی قانون‌و بلوێرو سازان، پەی بە هەمو رازان بردو، لە تکای شنەبای خێرەو مەند، زو تێگەیشت. کە لەو بەزمە کێی مرازە.

٣٣ یوسفی دەوروزەمانێ  گو نەسیم هان ڤێ نیشانێ
لێ ژبۆ نەکهێ دەهانی  نەخوەشان ئەو لێ شیفایە

٣٤ ماوەرا بەلگین گولی‌بو  بیهن‌و بویا کاکولێ بو
داروی قەلبی مەلی‌بو  لەو بچەهڤین من جەلایە

٣٥ با نەسیم دێ چی لەزینی  ساغ‌و سالم ماتو بینی
ڤێ کومیدی لێ گەهینی  دا سواربت لێ پەیایە

**مانای وشه:**

**هان:** بگره، ها؛ **نەکهە:** بۆنی خۆش؛ **بیهن:** بۆن؛ **لەزینی:** پەلە دەکەی؛ **کومید:** ئـەسپی کوێت؛ **کومێد:** ئەسپیمرادان؛ **پەیا:** پیادە.

**پوختەی مانا:**

ئەونازدارە تاقانەیەی کە وەك یوسف لەناو خەڵکـــی میصـــرا چـــۆن گرۆی جـــوانی بردەوە؛ لەم رۆژگارەی ئێمەدا، لەچاو هەمو جـــوانی دنیایە، یوســـفەو هەمو کەس بۆ دیداری ئـــەو، دەســـت دەشکێنن‌و دڵیان بەسەر تیغ دادێنن. گوتی: سروە بای تکاکار، بەو نیشانەی کە تۆ لە نزیکی مندا، ئەوەندە بۆنت خۆش‌بوە. هەر نەخۆشێك هەڵتمژێ، دەست بەجێ چاك دەبێتەوە. دەمو زاران بۆن خۆش دەكا. ئەو بۆنە لەگوڵاوی پەلکـی گوڵی سـەر رومەت‌و لە عەنبەری کاکۆ ڵانمەوە بۆ تۆدێ؛ دەرمانی دڵی مەلایە. (یان، دەرمانی دڵی ئێمەبو، چـاویشمانی وەسـەر بینایی خســتەوەو، کۆنە چیرۆکی یاقوب‌و بۆنی کراسەکەی یوسف، روی دایەوە). فـەرموی دە بەو نیشـانەوە، بەپەلە بۆم بگەمەلا، فریای کەوە. باسواری ئەسپی مرادبیۆ چی دی لەشـوێن خێڵ‌وێڵ نەبیۆ نەڵێ پیادەم‌و ناگەمە شۆرە سواران. لەتۆم دەوێ. بەسڵامەتی بۆمی بێنی.

**٣٦** غەفلەتی بایی نەسیم هات خەف ژبال یارێ کەریم هات
پۆر بئیحسانەك عەظیم هات قاصیدی شاهو گەدایە

**٣٧** دل نەفەس دیسان بیەرهات لەو حەکیم لوقمان بسەر هات
نافعێ دەردێ جەگەر هات طالعی کەوکەب نومایە

**٣٨** من کو ئەو نیشان گەهیشتێ ئەڤ دلی صەد داغی رەش‌تێ
ذەرەیەك خەوش لێ نەهیشتی ئیسمی ئەعظەم پێ گەهایە

**٣٩** چومە سەرپشتا کومەیدی من ژێپۆر ئەوژان‌و کەی‌دی
بەحروبەر مەلبەر خوەطەی دی دەشت‌و چۆل‌و کەربەلایە

**٤٠** مەو نەسیم خوەش پەنجەتێکرا وی دچین وەك طەیر ڤێکرا
بەحتێ زولفا یار پێکرا بوری عیشقێ پۆر فرایە

**٤١** گونبەدا نورین خویابو سپێدەیا صادق نومابو
یەك بیەك شەوقێ ڤەدابو قەصرو ئەیوان‌و سەرایە

**٤٢** قومری‌و بولبول دخونن لێ عەجەب ئەو خوەش دەمینن
هەر سەحەر مەحبوب دبینن عەندەلیب ڤێرا تەبایە

٤٣ بوغچەیا صوڕ گول دگەش‌تیٚ  چیچەك‌و ڕەیحانی ڕەش‌تیٚ
دلروبایان بیٚنە گەشتیٚ  سونبولان تاتا سەمایە

٤٤ سەبزەیا شەبنم گولاڤ لیٚ  صوڕ عەقیقان دوڕ خوٚڤاف لیٚ
دلبەران سەیران‌و ڕاڤ لیٚ  عەرعەران سیتاب دایە

**مانای وشە:**

**غەفلەتی:** لەنکاو؛ **خەف:** نهیٚنی؛ **خەف:** سوك؛ **بال:** کن، نك؛ **کەریم:** بەخشندە؛ **عەظیم:** مەزن؛ **نافیع:** بەهرەدەر؛ **طـالیع:** بەخـت؛ **طـالیع:** دەرکەوتو، هەڵاتو؛ **داغی ڕەش:** تیراویٚ، برینارەش؛ **ئیسـمی ئەعظەم:** ناوی هەرە مەزن، یەك لەناوەکانی خوایە تەنیا نزیکان لەخـوا دەیزانن؛ **طـەی:** قـەد، پیٚچـراو؛ **کەربەلا:** ناویٚکی ئارامی ـ ئاثوری‌یە، واتا، نزیکی‌خوا. لەو شویٚنەی کە ئیٚسـتە شـاری کەربەلای عیراقـی لیٚ‌هەیە، بتیٚك هەبوە کە بە بت گوتراوە «اِلە»، جـیٚ‌پەرسـتن؛ **کوٚرب:** واتا نزیك؛ **کوٚرب‌ئیلاە،** بوٚتە کەربەلاو چونکە ئیمام حوسیٚنی لیٚ شەهید کراوە، لەزوٚر دنیادا ناسراوە. لە زاراوەی کرمانجـی‌دا، بە بیابانی چوٚڵ‌و واحیدەلقەهار دەڵیٚن، کەربەلا؛ **طەیر:** مەل؛ **بوٚر:** ئەسپ، ئەسپی مراد؛ **فرایە:** تیژباڵە، زوٚر بەفڕینە؛ **عەندەلیب:** بولبول؛ **تەبا:** بەشویٚنەوە، ئـاشت، هەوالٚ؛ **گەشـت:** سـەیران؛ **دوڕ:** مرواری؛ **سـیتاب:** سیٚبەری کاتی هەتاو.

**پوختەی مانا:**

منی چەمەرای بەتاسە، لەپڕدیتم، سروەی پیروٚز ـ کە لەنیٚوان شای جوانان‌و منی گەدای هەناسـە سـارد، ببوە پەیامنیٚری لەش سـوك ـ بەکزەیەکی نهیٚنی هاتەوە لام‌و ئـەوچـاکەیەی ـ کەزوٚر خیٚرەومەندانە بو ـ پیٚ‌گەیاندم و تیٚی‌گەیاندم؛ کە لای یاری بەخشندەوە مژدەی خـوٚشی بوٚهیٚناوم. دڵی مردوم کەوتەوە هەناسەدان‌و ئاهیٚکی تیٚ گەڕایەوە. سروە لیٚم‌بو بە لوقمان‌و چارەسازی هەرە چاژان، بەرگی ژیانی دەبەر جەرگ‌و هەناوم کرد. توٚزی پاڵای سـوٚلی یاری دەچـاوم کرد. مژدەی ئەو وەك ئیسمی ئەعظەم، بەهرەدەر بو، صەد برینی سەرەتیران لەدڵمدا ـ کە گش ببونە تیراویٚ ـ گوٚشتەزونیان هیٚنایەوەو توٚزکاڵیٚك خەوشی تیٚ‌نەماو هەربومەوە گویٚزی ئازاو ئازا خوٚم ئامادە کردو پەڕیمە سەر خـوانی زینی ئـەسپی مراد. دەردو داخـی ڕوٚژانی دوریم ـ کەدیبوم ـ فـەراموٚش کرد. سروەش دەگەڵما گەڕاوە. بەجوتە فڕین لەدەشـتان، لەسـەر چـوٚڵ‌و کەربەلایان. من‌و سـروە، پەنجەمان تیٚك پەڕاندبو. وەك دو باڵداری زوٚر هەوالٚ، پیٚکـەوە لە شـەقـەی باڵدەن، نەدەکرا لیٚك جویٚ بینەوە؛ چونکە ئەسپە بوٚری ئاوات، زوٚر تیژباڵەو پیاو دەترسیٚ لەو بەرزە بەو خوٚش فـڕینەی چاوی ڕەشکەو پیٚشکە بکاو لەسەر زینەکەی بپەڕیٚ. من‌و سروە لەو ڕیٚگەدا، لەپەستا باسی کەزی یاری نازدارمان، و توویٚژ بو؛ لە ئـاکاما گونبەزی نورین دەرکەوت. سپیٚدەی بەرەبەیانی ڕاسـتیمان هاتە بەرچاوان. کوٚشك‌و سەرسـەراو دیوان‌و بەرییٚلاییی‌و هەیوان‌و باڵەخـانەکان، تیشکیان لەیەك دەگەڕاوە. لە گوڵجاری حەوشی یاردا، هەزاران گولٚ پشکوتبون. ڕەشەریحانەش لەوناوە، دەگەلٚ

گوڵان لاسای کوڵمو کەزیەکانی جوانو بۆنخۆشی ئەویانبو. یاکەریمو کەناریو بولبولو سێرو، سەرمەستی دیمەن ببونو، پەستەو مقامیان خۆش دەگوت. من لەوناوە سەیر مابوم کەچۆن مەلو بولبولەکان، چەندبەیانیان یاریان دیوەو توانیویانە لەخۆشیان گیانیان دەرنەچێو چۆن هێزی خوێندنیان ماوە؟ زۆر جوانی دڵرفێنم دین. لەوناوە سەیرانیان دەکرد. تاتای بسکیان ـ کە وەك لقە سملٚ وابون ـ دەلەرینو لەشادبون بەنزیکییار، کەوتبونە سەماو هەڵپەرین. تنۆکی شەونمی بەیان، لەسەر چلٚچلٚی سەوزەڵان، ببوە گوڵاو، گوڵی ئاڵی بەرەنگی لالٚ، مرواری ئاونگی لەسەر، دڵرفێنان بەدەم گەشتو گەڕانەوە، سەرگەرمی راوی دڵانبون. بەژنو باڵا نەمام عەرعەر، نسیٚیان لە گوڵەکان دەکردو دڵی گوڵیان بەنێچیر بۆ خۆیان دەبرد..

٤٥ بوم شەریف ئەز باستانیٚ شاهیدێن ویٚ گولستانیٚ
ساقیان جامجام ددانیٚ کەوکەبان سەیوان ڤەدایە

٤٦ چەندەکی چیمەن حەرەم (خورەم) بو لیٚمەدام ئەو صوبحە دەم بو
من بهیش باغیٚ ئیرەم بو لیٚ صەبا گومن سەبایە

٤٧ صەفبصەف ویلدان پەریبون بەندی زولفا عەنبەری بون
تێك لدیمیٚ موشتەری بون رەقصو گوڤەندو صەفایە

٤٨ پورٚ عومرمن چو بسەختی لیٚشوکر خوازم ژبەختی
زوهرەیەك بو ئەو لتەختی بەلکو بێم (شَمْسُ الضُّحا)یە

٤٩ پەردەیا خەلویٚ کوهلدا یەنگییەك مندی دملدا
گەزمەیا ژەهری لدلدا قەط نەگو قەتلو خەطایە

٥٠ حادری چوم سەجدە ژێرا لیٚ نیەت ئیٚحرام نەڤیٚرا
عاشقی ئەڤ گەزمە تیٚرا هەرچی طاعەت کت رەوایە

**ماناى وشە:**

**شەریف:** بەرێز؛ **سەیوان:** سایەدەر؛ **حەرەم:** پاوان؛ **مەدام:** هەمیشە؛ **ئیرەم:** بەهەشت؛ **ئیرەم:** بەهەشتی شەدداد؛ **شمس‌الضحی:** رۆژی چێشتەنگاو؛ **بێم:** دەبێژم؛ **خەلوە:** جێی تەنیایی؛ **مل:** شان؛ **حادری:** فەوری؛ **طاعەت:** خزمەتو بەگوێ‌کردن.

**پوختەى مانا:**

بەدیتنی ئاسانەکەی، سەرفرازو ممبارەك بوم. چیببینم؟ هەروا جوانی ناسکو نازدار لەوناو باغە مەی دەگێرنو پیاڵە بەپیاڵەراناگا. لە دەوری یار دێنو دەچن خزمەتکارن، ئەوەندەش شوشو شەفافو رێکو جوانکیلەو لەبارن؛ وادەزانی ئەستێرەی لەدەوری مانگنو بونە چەتری دەوری

سەری. چیمەنی خۆشی بارەگا ـ کە پاوانی چاوانی ئـەویندارانی گیان‌بەگیانە ـ قـەت شـەوی بەسەردا نایەو هەمیشە بەرەبەیانی رون‌و ساوی بەهارانە. بە بیری‌خۆم دەمگـوت ئێرە باغ‌و باغاتی بەهەشتە. بەڵام سروە لەبەر خۆیەوە دەی‌سرتاند، گوڵجـاری باغچـەی سـەبایەو نشـیمەنی بەلقیسـایە. لە دەوری ئـەو سـەرسـەرایە، بەزنجیرەو ریزبەریز هەروا کوڕی‌لاو، کیژی لەباری مەستەچاو، دەبینران لەویلدان‌و حـوریان دەکرد. گش سـادەو پەریزادە بون کە هەموشـیان یەخسیری کەزی عەنبەربۆی یاری منن، گشتیان وەك من، ئەویندار‌ی روخساری بون‌و گیرۆدەی داوی ئەوینیّ. تێکڕا لەخۆشی ئـەو هەلەی کە دڵبەرمیان لیّ‌نزیکـە؛ گەشکـەبیبون. لە دڵشـادی بەسەماوە سوڕیان دەدا. سوپاس بۆخوا هەرچەند لەتەمەنی خۆشما زۆرم پەژارەو خەم دیوە؛ ئێستا بەبەختم دەنازم. کە گەیشتومە ئەوپایەی بەراموسانی ئاسانەی یاری نازار، سەرفیرازم.

یارم لەسەر تەختی نازان، شوّق‌و شەبەقی دەداوە. وەك ئەستێرەی کاروانکوژەی نیوە شەوان، دەدرەوشاوە. نەخێر زوهرەو گەلاوێژو ئەستێرەی چی؟ خۆری دەمەو چێشتەنگاویش، لەتاوی ئەو تاوی نەبو؛ لەشەرمان دەتاوایەوە.

پەردە لەنێوان لادرا یار کەوانێك بەشـانەوە ـ کە بریەتی‌بو لە کەزی رەشـی دڵ‌وگیان گەز ـ بە کەوانی دەبیندران. چۆن کەوانێك؟ هەرتیرێکی کە لەوێوە بێتە ناودڵ، ئێژی بەژار ئـاو دراوە. دڵم پێکراو هیچ نەشی‌گوت کوشتنی هەژار گوناحەو نارەوایە. دەس‌بەجیّ چـومە سـەر سـوژدە بەرەو باڵای، نیازی ئیحـرامم دانەبەسـتو بەنیازی زیارەتی کابەی ئـەو روخسـارە، بەدڵ لەدەوری دەگەڕام. مەڵێن حـەج بیّ‌ئیحـرام بەسـتن رەوا نابیّ. دڵی هەرکەس کە تیری ئـەوی لیّ‌درابیّ، هەرچۆنێك تاعەتی بوّبکا، زۆر‌ـدروستە.

۵۱ چوم زیارەت پیّ‌و دەستی  لیّ نهیشت ئەووەل بقەستی
دا بصوژت روح‌و هەستی  عاشقان صوتن جەزایە

۵۲ شەربەتا وەصلا خوە نادەت  تا هنەك عاشق جەزادەت
دلبەران ئەڤ رەنگە عادەت  مەهروان کەمتر وەفایە

۵۳ پیشەییّ وان غەنجو نازە  صەنعەتیّ عاشق نیازە
یار لبەر زاران ئیجازە  شەربەتا شیرین موفایە

۵٤ چوم طەوافا پیّ ودەستان  شوبهەتی سەکران‌و مەستان
ئەهلی حال‌و خوب پەرستان  وان ژعومر ئەو موددەعایە

۵۵ تللی‌یێن نازك شەمالین  من‌لسەر چاوی خوە مالین
طالبی وەردین بخالین  دل دقیّ فکری تەیایە

**مانای وشه:**

**زیارەت:** ماچ‌کردن؛ **بقەستی:** لەنقەست، بەنیازێك؛ **هەستی:** بون‌وو جود؛ **هەستی:** پێشە، ئێسقان؛ **هنەك:** هێندێك؛ **عادەت:** رەوشت‌و خو؛ **مەهرو:** رومانگ؛ **غەنج:** ناز؛ **نیاز:** پاڕانەوە؛ **زار:** زارە، گریانی بەکوڵ، ناڵە؛ **سەکران:** سەرخۆش؛ **خوب:** جوان‌چاك؛ **موددەعا:** داواو ئاوات؛ **تللی:** تلهی، تبل، قامك، ئەنگوست؛ **شەمال:** مۆم؛ **تەیا:** سەرگەردان‌و لێ‌شێواو.

**پوختەی مانا:**

هەر کەدیتم، سوژدەی سوپاسم بۆخوا برد. کە دیداری یاری شاندام. سەرم لەسوژدە هەڵێناو خۆم دەدەوری سەری گێڕا، باڵا گەردانی باڵای‌بم، کە حەوجار تەوافیشم کرد؛ دەستم دەلاقی وەڕینا کە ماچی کەمو بخوازم دەستیشم داتێ رای‌موسم. بەڵام سەر لە هەوەڵەوە، روی‌گرژ کرد. ئەو تورەییەش بە قەستی‌بو، دەزانم لە ئانقەست وای‌کرد. ویستی گیان‌و سەرتاپای بون‌و نەبونم، تەنانەت ئێسکەکانیشم بسوتێنێ. ئەزمونی دڵداران وایە، لەبەر سوتان خۆ رابگرن. هەمو دڵبەرانی رومانگ، ئەو رێو شوێنەیان هەیە. بەرلەوەی دڵدار ئازاردەن، بواریێ نادەن دڵیان بەدیداری شادکەن. ئەوەی ئێمە ناومان ناوە وەفاو ئەمەگداری یاران؛ لەلای چاوەمەست‌و نازداران، زۆر کەمتر لەدڵدارانەو ئەمەش هەر لەخۆیان جوانە. ئەوان دەبێ نازبکەن‌و دڵدار دەبێ بپاڕێتەوەو خۆ کزکاو بناڵێنێ‌و ئەوسا لەپاش گریان‌و شیوەن‌و ناڵین، ئەگەر لاوێندرایەوە، ئەو پەڕی خۆشی‌و شادی‌یە. وەك خواجە حافظی خۆمان فەرمویەتی:

لەچی‌و بۆچیت نەبێ، هەرکەس بەئاکارێکەوە جوانە

کەیارت روی‌گرژکاو نازبکا، تۆ هەر بپارێوە

بەدوای نازو نیمنازاندا، رێگەی دام دەستی راموسم، توێڵم ڕەپەنجەی پای بخەم. لەخۆشیان هۆشم نەمابووەك سەرخۆش‌و مەستی دەبەنگ، تلم ئەداو بەم‌لاو بەولادا دەکەوتم. ئەوەی من لەو دیدارە دیمو پێی خەنی‌بوم، هەمو ئەهلی حاڵی دیکەو هەمو جوان پەرستانی دیش، لە درێژایی تەمەنیان، گەورەتر ئارەزویانە. یار بەو قامکە ناسکانەی کە بۆمنی پەپولە وەکو مۆمیك‌بون داگیرسابن؛ فرمێسکی لێ سڕیمەوە. من تاوێك بەسەر چاوی خۆمدا ماڵین، ویستم چاوم گەش‌بنەوەو بزانم راست یارم‌دیوە یان خەونێ خۆشە دەبینم؟. بە دەردی «نالی» گوتەنی:

وەها مەستی تماشای چاوتە نالی کەنازانێ      بە بێداری دەبینێ یان لە نەشئەی مەستی‌و خەودا

ئێمە زۆر ساڵ‌و زەمانە، بەدڵ لەشوێن سەیری پەڕی گوڵی ئاڵی کوڵمەی یاری، روبە وردەخاڵ، هەڵوە داین؛ لە بیابانی سەرگەردانی‌دا، سەرگەردان، بێ دەرەتان رای دەبوێرین.

**٥٦** **چو عومر مە دڤێ خەیالێ ماشەڤەك عیدان دسالێ**

**بێم زیارەت زولفو خالێ رۆژو شەو من ئەو دوعایە**

**٥٧** **چەرخ دترسم کت شتابێ زو ئەجەل پیێدەت ریکابێ**
**جان برەت مەدفێ عەذابێ ئەڤ سیاه رەنگ ئەژدەهایە**

**٥٨** **چەندەکی صادق جەمابن ئەر ببێژی جان فیدابن**
**وەك «مەلێ» لازم تونابن وی ژدل جانێ خوەدایە**

**مانای وشە:**

**ئەجەل:** وەختیمردن؛ **ریکاب:** ئاوزەنگی، رکێف، زەنگو؛ **ئـەژدەها:** حـەزیا، هەژدیهـا، زەها؛ **جـەمابن:** کۆبنەوە، کۆمبین؛ **لازم:** سوربزانە، باوەڕبکە؛ **تو:** هیچ.

**پوختەی مانا:**

تەمەنم بەوبیرە بوری‌و خەیاڵ دەکەم، ئاخۆ دەست ئەدا شەوێکی لەساڵاندا، توشـی ئـەو جـەژنە خۆشەبم، بێمە سەیری ئەو کەزی‌و خاڵە ڕەشانەت؟ زۆر دەترسـم زەمانە وەپەلە کەوی‌و مردن بەو پەلە کردنەی، پابنێتە ناو رکێف‌و گیانم لەدوی خـو ڕەکێش‌کاو منی ئـاوات پێکنەهاتو، تا هەتایە، بەو پەژارە بتلێمەوە. مردن وەك هەژدیهای ڕەشـەو بەزەیی بەکەس‌دا نایە. نەوەك بمرم‌و نەت‌گەمێ، پێویستە مەلا بناسی. هەرچەندی دڵداری بەراسـت کۆوە بین‌و بەفـەرمانێك لە لێوانت گیانیان بکەن بەقوربانت؛ لێت رون‌بێ هەرگیز هیچکەسیان ناگاتە من. من هەر بەدڵ، بە ئـارەزو گیانی خۆمت قوربان دەکەم، پێی‌ناوی تۆ پێم بفەرموی.

## قصیدەی هەشتاو شەشەم

### «تونگی شەکر»

١ طوررەیی تابدار عەنبەرکە
خەمری‌یێن شەنگ میسکی ئەذفەر کە
٢ لگولان میسكو عەنبەرێ برەشین
ژگولاڤێ جونەسری‌یان تەرکە

٣ کەسكو صوورێن ژرەنگی قەوس‌و قەزەح
ژسەراپا گولاڤو ماوەرکە
٤ سورمە پوشین سوری بسەرکل‌دە
عاقیلان لێ خەرابو ئەبتەر کە

٥ هەر سەحەر دەستەکی ژنو وەرگر
عەرعەری تێکدا سەراسەر کە
٦ نیرگزێن سەرگران هلین جارك
دوقیرانی لیەك بەرابەرکە
٧ قەدو قاما شەریفو نازكو تەڕ
لێ سەراسەر بفەصصلین، کەرکە

**مانای وشە:**

**تابدار:** بەپێچ؛ **جونەسری:** هێشوی نەوعەدار خورمایەکی بەنرخو هەرەباشە؛ **خەراب:** مەست؛ **خەراب:** وێران؛ **وەرگر:** وەرگێرە، بگۆڕە؛ **فەصل:** بڕینی بەرگ‌درو.

**پوختەی مانا:**

کارێ بکە بسکی بەلادا کراوت، عەنبەر توشی تاووتوێ کەن، با پێچ بخۆن‌و بتروسکێن. بسکۆڵە

هەڵگەراوەکەت، بابیێتە مایەی شۆخو شەنگی میسك. میسكو عەنبەری بسکانت، بەسەر گوڵی رومەتتدا، پەرژ بکە. خشڵەکانت ـ کە وەك هێشوی خورما لەو باڵایەوە دیار دەکەنو گزوفتی چاوان ـ دەدەن ـ با لەناو گوڵاوی شەرما، شەهەڵێنن. با لەسەر تاپا، شمەکی کەسكو سورت بێن بە پەڵکەزێرینەی پاش بارانی پڕلە گوڵاو لە دەوری تیشکی باڵاکەت. چاوت رەشی دەستی خوایەو هیچ کاری بە سورمە نیەو پڕە لە کلی دڵکیشیو رەزاسوکی. بەڵام لەترسی چاوێنی ئەوانەی شێتی تۆنینو خۆیان بەعاقڵ دەزانن؛ بە تۆزیٚ کل، دایان پۆشە. با عاقڵان مەستو هەناو تێکروخاوو دوابراو کات. هەر بەیانیەك دەستێك جلینویٚبگۆڕەو، لەنەمامی عەرعەری باڵای هاڵێنە. دڵی هەمو بەژن نەمامانی شلكو ناسكو خوێنشیرین لە عەزرەتان بەر قەیچیدەو لەتلەتیکە. ئەوچاوانەت ـ کە وەکو نێرگسی مەستن ـ هەڵیانبێنەو هەمو جارێك دو ئەستێرەی بەختەوەری بەرانبەر بەیەکتر بکە.

**٨ تو بمەش کوك بسەردەری قەصریٚ**
**بخوە کو، کی؟ لشاهو قەیصەر کە**
**٩ وەرە وەك رۆژ بسەردەری کەلەهێ**
**عالەمیٚ تێکدا مونەووەر کە**

**١٠ وەك گولەك زەردی بوغچەیاتە مەئەز**
**تومە تێکل خوە وەك گولازەرکە**
**١١ زاهیدی هویشك طەبع سەودایە**
**بدو جامان طەبیعەتی تەرکە**

**١٢ ڤەکە جارەك بخەندە شەککەر تونگ**
**تێك میصرا مە قەندو شەککەرکە**
**١٣ پیٚ لسەر دیدەیی «مەلیٚ» دائین**
**خەلوەیا صوفیان موکەددەر کە**
**١٤ خەطَو خالان نیشان «نیشانی» دە**
**مەژناڤیٚ خوەرا بدەفتەر کە**

**مانای وشە:**

**بمەش:** برۆ؛ **کۆك:** کەیفساز؛ **کۆك:** زۆر پۆشتە؛ **کەلەھ :** قەڵا، کۆشکیمیر؛ **هویشك:** وشك؛ **سەودا:** نەخۆشی کەللەییبون؛ **سەودا:** ئەوین؛ **سەودا:** مامڵە؛ **طەبیعەت:** میجاز، تەبیات؛ **تونگ:** تونگە، کوپەڵەی دەمتەنگ؛ **میصر:** شار؛ **خەلوە:** کونجیتەنیایی؛ **موکەددەر:** تاریكو لیٚلٚ؛ **دەفتەر:** بەڕاو.

**پوختەی مانا:**

زۆر بەفیزو کەیف‌سازی، لە سەربانی دەرکی کۆشکیّ وەرەو بچوّ، بە هەزار پاشاو قەیصەران گەمە بکەو بەم‌بلّیّ: کواچت‌کردوەو لەو پرسە: کابرا ئەتوّ کیّی؟ توّ وەکو خـوّری ناو مالّی لە کۆشکـەوە سـەر دەرێنە؛ هەمو دنیا روّشـن کەوەو دوایی بەتاریکــی بیّنە. مەلّیّ مەلیّ ماتو رەنگ زەردی! دزیوی، گولّی سـور بەتەنیا جـوان نین. من ریّ دەبیّمە باغچــەکەت با زەردی لە ئـــالّان هالّیّو دیمەنەکە لە بارتر کات. وشکە صوّفی کە خوّی بە دلّدار دەزانیّ؛ نەخـوّشیّکی گەلالاییەو سـەودا گەریّکی خەسـیسە. دەیەویّ بە دو دوعاو نوّیژ، بەهەشـت بکـرێ. دوپیالّە بادەی پیّبدە با تەبیاتی تەر بیّتەوە.

دلّم خەلّوەتگەی سوّفیانەو روّشناکی لە دەلاقـەی چـاومەوەیە. وەرە پایەك لەسـەر چـاوەکانم دانیّو لیّلّایی بەچاوی کزی وشکەسـوّفیەکاندا بیّنە. خـالّو میلان نیشـانی نیشــانی بدە. با ناوی مەلای دلّداریش لە دەفتەری دلّداراندا، بیّتە بەرچاو.

## قصیدەی هەشتاو حەوتەم

# گول و بولبول

١ گەرچی بولبول جەوهەری ذاتی گولە
لیٚگولیٚ رەونەق ژعیشقا بولبولە

٢ گوهدە ذیکری حال‌و جوشا بادەییٚ
وی ببولبول‌را دخونت بولبولە

٣ سوسنان صەدرەنگ ئاڤیهتن کەمەند
وان نەگوٚ دل‌بەندی تایەك سونبولە

٤ سونبولان سەیوان لدیمیٚ تازەکر
ئافتاب ئیروٚ دبورجا سونبولە

٥ عەرعەرین رەنگین ژتایێن صوٚرو زەر
قومری‌یان صەدرەنگ شورو غولغولە

٦ زەمری‌یا عیشقیٚ ژبالا هاتە خوار
قودسی‌یان ئاڤێهتە چەرخیٚ هەلهەلە

٧ نێرگزا نازك‌قەدی شەهلایە مەست
دین‌کرم ئەز بولبولان سەودا گولە

٨ زلف‌و بسکان پورژمن دل‌بر بەلیٚ
رشتەیا جانیٚ مەلیٚ ئەو کاکولە

٩ بولبول‌و پەروانە ئەو فەصل‌و دەمن
جینسی عیشقامن تنیٚ دەردی کولە

١٠ من ددل ناصوٚرەکی دا هەستی ییٚ
لاجەرەم هیٚژ نەشئەیا داغا کولە

١١ طەبعی لامیع وەش زمیننەت بو حَسَنْ
من ددەستدا ذوالفەقارو دولدولە

**١٢ هشکەروی بەدفیعل چی هین‌کر عەجەب**
**بارَكَ‌الله خوەش بەزی ئەسپیٚ قولە**
**١٣ قەط ڤەریٚکیٚ ڤی دەمیٚ حاضر دبت**
**قیصصەیا فەصلیٚنە کاری سونبولە**

**مانای وشە:**

**جەوهەری ذاتی:** زێهاتوییو هونەری سەربەخۆ؛ **رەونەق:** برەو؛ **جوش:** قـوڵت؛ **بولبولە:** لولەی لولێنە؛ **نەگۆ:** تۆمەز، تۆمەڵێ؛ **تازە:** زۆرباش‌و جوان؛ **ئـافتاب:** خـۆر؛ **شـورو غولغـولە:** هەراو هوریاو زەنازەنا؛ **هەلهەلە:** تلی‌لیلی‌و هەلهولە؛ **شەهلا:** رەنگـی‌کاڵ بۆچـاو؛ **زەمری:** بەفـو دەموسـیقا، تورێن، وەك بلوێرژەن‌و...؛ **هەستی:** ئێسك، وجود؛ **لاجەرەم:** بێ‌گومان؛ **فـەصـل:** کژی‌سـاڵ، لێك هەڵپچـڕان؛ **نەشئە:** کەیف، نیشە؛ **لامیع:** بەفیز؛ **وەش:** لەچەشن؛ **حەسەن:** باش؛ **بو:** باوك؛ **بوحەسـەن:** کونیەی ئیمام عەلی؛ **من دەدەستدا:** دەدەست مندا؛ **ذوالفەقـار:** دوخدار؛ **ذوالفەقـار:** ناوی شـیری ئیمام عەلی، چونکە دوخی هەبو، وەك ساتۆر نەبو؛ **دولدول:** سیخوڕ کەژوشکێکی گەورەیە؛ **دولدول:** ناوی ئێسـترێکی رەش‌بۆرەی پێغەمبەر (ص) بوە، داویە بە ئیمام عەلی؛ **هشکەرۆ:** وشکەرۆ، رەوتی ئـەسپی تەعلیم نەدراو؛ **بەدفیعل:** تۆسن‌و بەدفەڕ؛ **هین‌کرن:** فێرکردن؛ **خوش‌بەز:** تیژلە غاردان؛ **ڤەرێکی:** بەرێوە؛ **قیصصـە:** سەرگوروشتە؛ **قـەص:** بڕین، هەڵپاچین؛ **قـولە:** کلك کورت، کوێتی قـاپرەش، نارەسـەن؛ **کول:** غەم، هەمو، تەشەنەی دەرد، ژان؛ **سونبولە:** برجێك لەعاسمان، گوڵی وشکی دەغڵ؛ **سونبول:** گوڵی سمڵ.

**پوختەی مانا:**

ئەگەرچـی هەمو هونەرو جـەوهەری بولبول لەگوڵ‌رایەو ئـەگەر گوڵی جـوان نەبوایەو نەبوبا بە ئەویندارى؛ ئەو بەسـتەو گورانیەی ئێسـتای، کوا دەزانی. بەڵام گوڵیش برەوی لەسـای بولبولە. ئـەگەر ئـەو پێی هەڵنەگوتایە؛ ناوی گوڵ وا دەرنەدەکەوت‌و ناوبانگـی بڵاو نەدەبو. واتا، دڵبەرو دڵداریش، هەردوك دەبێ سـوپاسگوزاری ئـەوین‌بن. کە کردونی بەتای یەك‌و بەبێ یەکتر، هیچ کارە نین. تو گوێ‌بگرە کە بادە لە لولێنەوە بە قوڵتە دەرژێتە پیاڵە. ئـەویش چـۆن وەکو بولبولان، چریکەی دێ‌و باسی حـاڵی ئـەوینداری‌و، کوڵی دڵی هەژار دەکا. ماك‌و جـەوهەری هەرشـتێك لەدنیا، بە دڵداریەوە بەسراوەو ئەگەر دڵداری نەبوایە، دەبو دنیا کوندە بەبوی لێ بخوێنێ. هەرچـی بوەو هەرچی هەیەو هەرچی دەبێ، هەم دڵدارە هەم دڵبەرە. سـوێسنەی بۆن‌خـۆش‌و سـوروزەردو هەمە رەنگە، لە گوڵجـاڕان کەمەندی ئـەوین داوێژن، کە دڵی بولبول دەداوخـەن. بەڵام ئـەگەر زوانیان بوایە؛ دەمان‌زانی دڵی خـۆیان بە تاڵێك تای سـونبولێ‌وە ـ کەبسکـی یارەکەی منە ـ هەڵواسراوە. بسکی وەك سونبولێ یارم، سێبەریان لە روخسـاری کرد. کە لەوپەڕی جـوانی دایەو تابڵێی تەڕو تازەیە ـ بەڵام نەخێر سێبەری چـی؟ روخسـاری یارەکەم ئـەمرۆ ـ کە بەبسکـان داپۆشراوە ـ وەکو خۆرە لەناو بورجی سونبولەدا.

نەمامی عەرعەری باڵای لەبەر لەرزانەو پڵپڵەو گوڵینگەو پەلکـەشۆرانی زەردوسـوری، ئێمەی

دڵداری وەك مەلی یاكەریم خستەسەر صەدجۆر هەراو قولەو ناڵەو گاڵە. بلوێرژەنی هەوای ئەوین، لەعاسمان بو؛ خودا ناردیە سەرزەمین. فرشتەكان ئەوكاتەی بەرێیان دەكرد، تلیلیلیو هەلهەلەیان لەعاسمان دەنگیئەداوە.

ئەگەر بولبول شێتی ئەوینی گوڵانن، من بێهەستو شێتی دەستی دو نەرگسی كاڵو مەستی بەژن زراوی بەنازم. كەزیو بسكی بەڵێ زۆرجار دڵیان بردومو دەشیبەن. بەڵام گیانم بەداوی كاكوڵی بەندەو بەو هەمو دڵڕاتەكانە، بەندی ژیانم هەر نەپساوە. پەپولەو بولبول دڵداران، بەڵام لەوەختی گوڵاندا، یان لە سەردەمی شەواندا كە مۆمو شەم داگیرساون؛ واتا دڵداری دەمدەمینو لە گوێن من نین. ئەو بابەتە ئەویندارییەی كە لای منە، لای كەس نیە. دەردو ژانی بێبڕانەوەو گشت لەگشتە. ئەو ناسورەی دەدڵم دایە، ژانی داوەتە ئێسكانمو هەمو وجودی داگرتوم. زۆرژان دەكا، لێشم رونە ئەو دڵخۆشیو نەشەو كەیفەی كەمن هەمە، بەرهەمی ئەو داغو كوڵو خەمو ژانەی دڵی خۆمە. خەمی ئەوین، دەبتە ئامیانی خۆشیانم. میجازی من، طەبعی شیعرم، زۆر لە خۆبایيو سەركێشبو. وەك بارگیری تۆسن دەچو. وشكە رۆشبو. سوپاسگوزارم بۆخودا، كە بۆم هاتە سەر رەدایەو ئێستا باشە. هەروەك چۆن ئیمامی عەلی، زولفەقاری دەخستەكارو چۆن دوڵدوڵی بۆسواری خۆی راهێنابو؛ طەبعی شیعرم ئەوێستا لەدەستی مندا ئاوا بڕاو ئاوا رامە. طەبعی شیعرم كە وشكەرۆو بەد ئاكاربو، نازانم چیبو بەسەبەب، كەوا بەجوانی راهێنیو رەوتی پێشوی پێ بگۆڕیو ئەو رەوانیەی پێڕەوانكا. بەخوا سەیرە! ئەی ئافەریم ئەسپە قولە ئوباڵ بە ئەستۆم خۆش بەزی. لێمرونە فێركارەكەیتۆ، زۆرت دەگەڵ ماندو بوە تا فێری ئەم رەوتەی كردوی. ئەگینا چۆن هەر لەرێداو بێ مامۆستا، گوزو گوممەت وا ئامادەو حازری هەركارێك دەبوی؟ نەخێر، چیرۆكت چیرۆكی گوڵە گەنمی گەیشتوە كە دوكژی ساڵی بری، تازە وەختی درەویەتی.

## قصیدەی هەشتاو هەشتەم

# «داڤادل»

١ یاریْمە پورْ نیشانو سورْ سیما ژدورْ دیم کەوکەبە
ئەو لەب شەکەر نازك بەشەر جەبهەت سەحەر کاکول شەبە

٢ شەب کاکولە خال فلفلە چین سونبلە داڤا دلە
من غەفلەتی دی قبلەتی وەك ماە دتەیسا غەبغەبە

٣ مندی بخەف صوحبەت بدەف شاهی نەجەف، فینجان دکەف
نونێن ژیەنگ بەردان خەدەنگ وی پورْ ژتەنگ شیرین لەبە

**مانای وشە:**

**بەشەر:** پێست؛ **جەبهەت:** هەنیە؛ **شەوە:** بەردێکی رەشی بەنرخە؛ **فلفل:** ئیسوتی رەش؛ **قیبلەتی:** بەرانبەرم؛ **تەیسان:** بریقەدان؛ **غەبغەب:** بەرچیڵە؛ **نەجەف:** تەپوڵکە، ئاوگێڕەوە، دەفری گوشاد؛ **شاهی نەجەف:** ئیمام عەلی؛ **کەف:** لەپ.

**پوختەی مانا:**

یاری‌من خالْ لەروی زۆرن، کە هەمویان زۆر دڵکێشن. سەروسیمای لەدورْ ئەکات. روخساری وەك ئەستێرەیە. لێو شەکرینە، پێست ناسکە، هەنیەی وەك بەرەبەیانە، کاکۆڵی رەشی وەك شەوەن، کاکۆڵی ـ کە وەك شەو وایە ـ خاڵەکانی وەك ئیسوت دلْ دەسوتێنن. چین لەسەرچین کەزیەکانی ـ کە وەك سونبول بەبەرامەن ـ داوی‌دڵن.

من لەنەکاو بەرانبەر چاوم پیْکەوت، بەرچیڵەی سپی وەکو مانگ لەسپیایەتیان دەبریقا. بەدزی دیتم، دەفەی پیْبو... فینجانی مەی لەسەر دەستی، لێوی دەوری دەمی تەنگی هەر شیرنایی لیْ دەباری. برۆی وەکو کەوانی یەنگ ـ کە وەك دونون دەیان نواند ـ بەردەسرێژی تیرانیان دام.

هاوارم کرد: ئیمام عەلی، هانام بەتۆ!

مەیگێڕ بەپیاڵەی زێڕەوە وەرەو بادەکەت بگێڕە. ئەو دڵکێشە جوان‌و شەنگە، وازی لەمەی خواردنەوەیە. با مەست‌بیی‌و روخسارە پڕلە نورەکەی ئاشکراکاو وردەخاڵانمان نیشان‌داو لێوەکانی - کە مەی بەهەشتیان پێوەیە بێتە بەرچاو.

٤ خاڵو خەتی شوّخ قامەتیّ  مە ژڤیّ کتێبو دەسخەتیّ
هەردەم ژنەو دل فەیضە ئەو  ئەڤ عیشق‌و سەودامەو هەبە

٥ من بیّ قەدار ئەو سیر ڤەشار  عیشقا غەدار صوهتی سیتار
میهرا بوتان خاڵو خەتان  صندوقەخان‌و مەقلەبە

٦ دیمیّ بخال ئەو نون‌و دال  ئیسمی جەلال بەژنا شەپال
یەکتا ئەلف نایێ وەصف  من عەقل طفلی مەذهەبە

٧ حەتتا نەمام سالەك تەمام  شیرین کەلام ما دامە جام
بی جەهد قەط تێن ئەمرو خەط  هەرچی‌کو مەطلەب مەنصەبە

٨ دەرماندەییم، حەیران تەییم  پیرانەییم خوەش بەندەییم
زارا بسیر دل ژیم ڤەکر  دەرحەق مەپڕ ئەرزان مەبە

٩ بەرگین گولێ ئەو میسکەلیّ  هور هور وەلیّ دەرحەق «مەلیّ»
بیّ‌پەردەو خوەش مەعدەوو  یەك وەعدەوو پوڕ شەفقەبە

**مانای وشە:**

**سەودا:** ئەوین؛ **مەوهەبە:** بەخششی خودایی؛ **قەدار:** قەدەر، ئەندازە؛ **سیتار:** پەردە؛ **صندوقەخان:** صندوقخانە؛ **مەقلەب:** جێگەی دلّ؛ **دال:** شارەزاکەر؛ **ئیسمی جەلال:** ناوی خودا؛ **مەذهەب:** ئاین، رێوشوێن؛ **ئەمروخەط:** فەرمان‌و دەسنوس؛ **مەطلەب:** نیاز؛ **مەنصەب:** پلەو پایە؛ **زار:** ناڵەو هاوار؛ **ئەرزان:** بیّ‌موبالات، گویّ‌نەدەر؛ **خوەش مەعدە:** روخوّش، رەنگ خوّش.

**پوختەی مانا:**

ئەوین بەخششە لەخواوە، چاوی دلّ، رون دەکاتەوە. من لەسایەی ئەوینەوە توانیم لە پەڕاوی جوانی کە دەست نوسی خودای تواناو دەس رەنگینە؛ بەژنی شەنگی ئەونازدارەو خاڵ‌و میلی سەر روخساری بخوێنمەوەو هەڵیان بێنم. وا لەوساوە هەمو دەمان دڵم پڕیەتی لەبەهرەو هەروا نوێشی بەسەردا دێت.

نهێنی سوّزو ئەوینم. لە صندوقخانەی دڵمدا، شاردبوّوە. زیاتر لەوە کە دەتوانم دەرم نەبری، بەڵام چدەکەی لەئەوین؟ ئەو زوّردارە بو بەئاگر، سەرپوّشی لەسەر لاگرت‌و، نهێنی‌و دڵیشمی

دەگەڵ، ئاگرداو کردیە خوڵەمێش‌و نهێنی هەمو بەبادان. بروکانی، روخساری بەوردەخاڵی، بەژنی زراوی بەرچاوی کە لە بیچمی ئەلفەو بێ هاوتایە لە دنیایە. نامەخوا ئەوەندە جوانن. ناوی خوامان بیردێننەوە، کە چۆنی دروست کردوە. دڵم ـ کە خۆی وەك منداڵەو عەقڵم کاڵەو پێویستی بەفێربون هەیە ـ هەتا بگات؛ وا وەك منداڵێکی بچوك کە تازە دەیبەنە فێرگە؛ خەریکـی دەرسـی ئـەلفـم. هێشتا تەواو رەوانیشـم نەکردوە. ئـەویارە زمان شـیرینەی کە فێرکاری دڵداریمە سـاڵێك رەبەق گوێی پێنەدام، تا هەر نەمام‌و لەناو چوم. ئەوسا پیاڵەی دایە دەسـتم بۆیە مەسـتم. ئـەو ئـازارو جـزیادانەش، زۆر رەوابو. هەرکەس گەرەکیەو بەنیازە لەبارەگای ئـەوینداری پلەو پایەی وەدەس کەوێ؛ نابێ لای وابێ بەبێ‌کار، بەبێ هەڵسورو تەقالا، بەهیچ دەگاو نامەی پایەی بۆ دەنێرن.

ئەی‌یار! بم‌بەخشە کە دەڵێم، جزیام کێشـاو لە توڵەی‌دا، پیاڵەم لەدەسـتی تۆ وەرگرت. مامڵەو سەودا لە بارەگای تۆدا نیە. تۆ هەموت بەزەیی‌و روحمی‌و ئێمەش تەنیا لەسەرمانە، لێت وەپارێین. سەرگەردانتم، بەقوربانتم، هەژارو پیرو داماوم، کۆیلەی خۆتم. گریان‌و ناڵەی نهێنی نیوەشەوان، دڵ‌و هۆشی لێ‌کردمەوە. لەبەرت دەپارێمەوە. بەسە ئیتر دەربارەی من، خۆمەبوێرەو وردەخـاڵی ـ کە وەك میسـك پرژاونە سـەر پەلکـی گوڵی لارومەتت، لە منی نزار مەشـێرەوە. پەردە لادە، بەزەییت بێ. تەنیا جارێك، دەگەڵ مەلای دڵداری خۆت روخۆش‌و بەڵێن شیرین‌بە.

# قصیدەی هەشتاو نۆهەم

## «پەریشانی مەلا»

١ ئیرۆ ژدەربا خەنجەرێ  لازم بئیشانی مەلا!
تەشبیهی زولفا دلبەرێ  زانم پەریشانی مەلا!

٢ زانم پەریشانی ژدل  بیٚحەد بئیشانی ژدل
تەشبیهی بریانی ژدل  بالله نەئینسانی مەلا!

٣ بالله چطەبعەت ئادەمی  یەکسەر دبیٚم یەك عالەمی
دەریای قاف‌و قولزومی  یان چەرخی گەردانی مەلا!

٤ یارەب چوی میحنەت‌کەشی  سەرتا قەدەم تیٚك ئاتەشی
مەجروحی قەوسێ توزرەشی  لەودل بپەیکانی مەلا!

٥ زانم ژعیشقێ دۆژەهی  بەحرەك ژناری ئاسیهی
ئیرۆ لماهی خەرگەهی  تەشبیهی سەیوانی مەلا!

٦ ئەڤ سینەیا وەك نای‌و نەی پورێ لیٚ کشاندن داغ‌و کەی
هێ دل بنائەهلان ددەی  یارەب چنادانی مەلا!

**مانای وشە:**

**دەرب:** زەبر؛ **بئیشانی:** پرژانی؛ **لازم:** بیٚگومان؛ **بیٚحەد:** لەڕادەبەدەر؛ **بریان:** کەباب؛ **دبیٚم:** دەبیٚژم؛ **دەریای قاف:** بەحری موحیط، کە دەیانگوت کیٚوی قاف دەوری دنیای داوەو پیٚشیشی لەهەرچوارلاوە دەریایە؛ **چەرخی گەردان:** عاسمانی گەرۆك؛ **میحنەت:** ئازارو مەینەت؛ **کەش:** کیٚش؛ **ئاتەش:** ئاگر؛ **مەجروح:** بریندار؛ **قەوس:** کەوان؛ **توز رەش:** رەشی بریقەدەر؛ **دوژە:** جەهەندەم؛ **نار:** ئاگر؛ **ئاسیهق:** چاڵوك؛ **ئاسێ:** زۆر دژوار؛ **ماە:** هەیف؛ **ماهی خەرگەهی:** بریەتیە لە جوانی دڵبەر؛ **خەرگاە:** بارەگای گەوران؛ **سەیوان:** سایەدەر؛ **کەی:** داغ؛ **نائەهل:** ناباب، نەگونجاو؛ **نادان:** نەزان.

**پوختەی مانا:**

مەلا! ئەمرۆ لەبەر نوکی خەنجەری سەری مژۆڵان، لێمرونە ژان و سوٚت زۆرن. وەکو پرچی ئاڵۆزی یار، پەرێشان و بیربڵاوی. بەوهەمو ئێش و ژانەوە، بەوهەمو دڵپرژانەوە، بەوگش پەرژو بڵاویەوە، چۆن دەردەبەی؟ بەخوا تۆ وەك هیچکەس ناچی. مرۆ ناتوانێ خۆبگرێت. تۆ هەرماوی!! من ئێژم تۆ ئادەمی نیت؛ تۆ عالەمێکی بەتەنیای. دەریای، یاخۆ ئەو عاسمانەی کە خول دەخوا. ئەی خوا هاوار چەندت دەردو ئازار چەشی. سەرتاپا ئاگری گەشی، بریندار‌ی کەوانی رەشی زۆر رەشی. دڵت بە پەیکان داچناوە. دڵت لەئەوین ئاگرە؛ وەك ئاگری جەحەندەمێ. وەك دەریایەکی ئاگری؛ لەئاگری زۆر دەورەدەرو سوتێنەر. دەڵێی بەدارکە چاڵوکان، نێل‌دراوە. گڕت بەرزە. گەیوەتە تەشقی عاسمانی ئەوبالایەو، خەرمانەیە لەدەوری هەیڤی روخساری یاری خوێن‌شیرین، هالایە. سینگت وەك بلوێر کون‌کونە. داخی دڵداری لێ‌دیارە. ئەگەر بێتو دڵت‌بدەی بەدنیایەو جگەلەیار، هیچ کەسی ترت لەبیربێ؛ دەردەکەوێ کە زۆر نەزان و دەبەنگی.

**١٠** دوڕدانەیا دیم گەوهەرە ئایینەیا ئەسکەندەرە
بێ مروەتی دل‌کرکەرە مەجروحی خالانی مەلا!

**١١** بی‌مروەتی دل‌هەڕشاند تەشبیهی شیشێ لێ‌کشاند
کەرکر جەگەر خوێ لێ رەشاند ئاتەش لسەردانی مەلا!

**١٢** ناری ژرەنگی دوژەهێ حوسن و جەمالا وی مەهێ
مەدپەردەیا ڤێ خەرگەهێ خەف‌کر چعومانی مەلا؟

**١٣** ئیرۆ لعومری خوێ تەلەف بێ‌شاهیدو جاما صەدەف
بێ‌چەنگ و سازو نای و دەف زانم پەشیمانی مەلا!

**١٤** زانم تەکوهی طورە دل لەو هەربنارو نورە دل
شەهکاسەیا فەرفورە دل لەو مەست و سەکرانی مەلا!

**مانای وشە:**

**دوڕدانە:** گەوهەری تاقانە؛ **دوردانە:** قوتوی مرواری؛ **کەر:** لەت؛ **بێ‌مروەت:** بێ‌پیاوەتی، بێ‌ئینصاف؛ **هەڕشاند:** لەبەریەکی‌برد؛ **خەف:** وەشارتی؛ **تەلەف:** فیرۆ؛ **صەدەف:** دایکی مرواری؛ **نار:** ئاگر؛ **سەکران:** سەرخۆش.

**پوختەی مانا:**

دڵی مەلا، کە هەمیشە خەیاڵی ئەوروبەخاڵەی گەوهەرینەی لەناودایەو بوٚتە قوتولکەی گەوهەران و هێندە رونە ـ وەك ئاوێنەکەی ئەسکەندەر ـ لێی برۆانە، هەمو دنیای تێرا دیارە؛ یار

شکاندی‌و بێ‌ئینصاف نەیگوت خەسارە، بۆ لەتی کەم؟ لەپاش لەت کردن، قیمەی کرد. تێکی هەڵشێلا، بە ئیسوتی خاڵەکانی کزاندیەوە. بەشیشی بژۆلیەوە کردو هێندێکیش خوێی لەلێوی نمەکینی خۆی پێوەکردو تینی ئاگری رومەتی، لەسەر دانا، وا لەبرژانەو بەژانە. تۆ بزانە ئاگری ئەوین ـ کە تەواو وەك ئاگری جەهەندەمە ـ جوانی یارم ـ کە لە ئەندازە بەدەرە ـ دەناو بارەگای دڵمدا جێی بۆتەوەو وێك ناکەون. وەشارتیشن کەس پێ نازانێ لەوێدان. بەراستی دڵی تۆ مەلا! هەراوە وەك دەریای عومان. مەلا! ئەمرۆ یارت نەدی. پیاڵەی صەدەفی پڕبادەت، لێ وەرنەگرت. گوێت لە دەنگی سازو بلوێرو دەفو چەنگ، نەگرتوە؛ کە لە کۆڕی ئەودا هەیە. واتا ژیانت بەفیرۆ چو. پەشیمانی لەوژیانە.

دڵت پر ئاگرو نورە؛ دڵی چی هەر کێوی طورە. کە خودا خۆی نیشان‌داوە. لەبادەی ئەوین تژەیەو بۆتە شاکاشی هەڵازناو. بۆیە دەت‌بینم سەرخۆشی.

**١٥** **هەرسینەتا بێ ناتەمام  ناپوختە خام، بی‌میهرو جام**
**غەرقین دخونا دل مەدام  لەعلا بەدەخشانی مەلا!**

**١٦** **پورێ لەعلو دورێ تەژ کلکی عیشق  ئانینە نەظما سیلکی عیشق**
**دەربەڕرو بەحری مولکی عیشق  مەعلومە خاقانی مەلا!**

**١٧** **بی‌حەد لقەلبێ شوبهی نەی  جەوراتە دانین داغو کەی**
**لەو بی‌حەمەل خوش نینە مەی  ئەمما بەشیرانی مەلا!**

**١٨** **میننەت ژطالیع هەم ژبەخت  ئاصەف بتەختو بەختو رەخت**
**بەلقیس ئەوی ئانی بوەخت  ئیرۆ سولەیمانی مەلا!**

**١٩** **ئەو هەردو لەعلو هەردو وەشم  گەهگە بنازو گەه  بخەشم**
**ئەو بەژنو بالا هاتەچەشم  مە دسەیری روحانی مەلا!**

## مانای وشە:

**ناپوختە:** پێ‌نەگەیشتو؛ **خام:** خاو؛ **میهر:** ئەوین؛ **مەدام:** هەمیشە؛ **مەدام:** بادە؛ **لەعل:** لالێ، کە بەردێکی بەنرخە؛ **بەدەخشان:** ناوچەیەکە لە ئەفغانستان سەربە مەڵبەندی فەیضا بادە، لالی زۆرباش لەوێ دێنن؛ **کلك:** قەڵەم؛ **نەظم:** هۆنینەوە؛ **سیلك:** لیزگە؛ **بەڕر:** بەژ؛ **خاقان:** وشەیەکی تورکی جەغەتایە، نازناوە بۆ قەراڵەکانی چین‌و خانەکانی مغول، تەنانەت سوڵتانەکانی ئەستەمبوڵ‌و قوڵە پادشاکانی قەجەریش ناوی خۆیان دەنا خاقان. کە بەکوردی بویتە «قاقان»؛ **حەمەل:** بەرخ؛ **حەمەل:** هەوەڵ‌مانگی بەهار، کە رۆژ لەبرجی کاوڕە؛ **شیرانی:** شیرنایەتی؛ **بەشیر:** مژدەدەر؛ **ئانی:** هێنای؛ **طالیع:** چارەنوس؛ **ئاصەف:** وەزیری دەستی راستی سولەیمان پێغەمبەر؛ **رەخت:** شتومەك؛ **بەخت:** بەختی: لۆکی‌بەربار؛ **بەلقیس:** بەڵکیس، شازادەخانمی سەبا لە یەمەن، کە بەتەگبیری وەزیری دێو بۆ سولەیمانیان بەبوك هێناو پەپو

دەلالّی نێوان‌بو؛ **وەشم:** خالّ؛ **خەشم:** تورەیی؛ **سەیر:** گەشت؛ **روحانی:** گیانی.

**پوختەی مانا:**

هەر سینەیەك، هەر هەناوێك، ئـەویندای نەزانیبیّو تامی بادەی دلّدارانەی نەچێژتبیّ؛ هەرگیز ناگاو پوختە نابیّو ناتەواوەو شل‌و خاوە. خـۆشی هەر لەخـۆتە مەلا! دلّت نوقمی خـوێنی ئـەوینی دلّدارەو ئەوخوێنە لێت بوّتە بادەو هەمیشە سەرخـۆشت دەكات، بەراستی تۆ ئێستاكانیّ لەچـاو خەلّكـی ـ كە وەك خشـتی كالّ ماونەوە ـ وەكو لەعلی بەدەخشـانی. نەك هەرخـۆت بویتە لەعل وبەس؛ لەعل‌و دورت لەنوكی قـەلّەم هەلّدەرژێن‌و بە لیزگەی ئـەوین هۆنراون. لەسـایەی ئـەو نوسینانەت، ناوت لە دەریاو بەژ هەیەو، ئێستا تۆ وەك قەرالێكی لە مەلّبەندی ئەویندااران.

یاری نازدار! زۆرت داغ بەدلّەوە ناوم. سەرەو ژێر حەو كونت تیّكرد. ئێسـتا بلوێرەو دەنالیّ. وا مانگی سەرە بەهارە، جەنگـەی بادە فـرّكردنە. بادەش بیّكەبابی گۆشـتی بەرخ‌و بیّ شـیرنایی، ناتەواوە. جەرگم هەیە بۆ كەبابت، دلّم بلوێرەو لێدەدا. لێوەكەشت لە شـیرینی شـیرین‌ترە، (یان، مزگینی‌و بەلّێنی تۆ كە دەت‌بینم، دەبێتە نوقلّی مەجلیسـیّ). مەلا دا دەنگ! ئـەوا گوێم لە مژدە دەرێكـە، دەلّیّ یار هات. خـودایە لێت منەت‌بارم، دیارە بەختم وەك ئـاصەف بۆ سـولەیمانە، كە بەلّكیسی بەتەختەوە، بەكەل‌و پەلی بەریەوەو بەكاروانی شـرو شـاتالّی جیازەوە، گەیاندە مالّی سـولەیمان. مەلا! تۆش لە مرۆ بەولاوە سـولەیمانی ئـەم زەمانەی. یارهات‌و چـاوم پیّكەوت. دوخـالّ لەدەوری لێوی بون. نازی دەكرد، بەناز خـۆی لێم تورە دەكرد. گیانم كەوتە گەشـت‌و سەیران‌و سەیرانێكی زۆرگیانانەی لەو بەژن‌و بالّا جوانەكرد.

شیاوی باسە، بریان لەناو كرمانجاندا، بەو كەبابە دەلّێن كە گۆشت دەخرێتە قولّكەوەو تۆزێك بەگلّ دای‌دەپۆشن، ئاوری لەسەر دەكەنەوە تا دەپیشیّ.

# قصیدەی نەوەدەمین

## «زولفان شەرکە»

١ ئەی شاهیدی قودسی، ڤەکە بەندێ ژنیقابێ
تاچەند وەسەر گەشتە بمینین دحیجابێ

٢ بسکێن ژحەریری توژنو ماوەرێ لیێکە
زولفێن ژعەبیرێ شەکە باڤێ خەمو تابێ

٣ قشتێن دخوە چینچین بدە بەر میسكو زەبادێ
تایێن دعیصابێ برەشینن بگولابێ

٤ هەریەك بهەزار رەنگ لبەژناتە سەماتێن
خەمرێو لەفو شەترێو تایێن دعیصابێ

٥ من جان یەدێ بەیضایە ژئیسان چخەبەردەم؟
من ئاتەشی موسا دیە گولناری شەرابێ

**مانای وشە:**

**شەکە:** بەشانەبکە؛ **خەموتاب:** خوارو پێچ؛ **عیصاب، عیصابە:** پارچەی توێڵ پێچ؛ **لەف:** پێچراوو لولدراو؛ **گول:** پوڵو؛ **نار:** ئاگر؛ **گولنار:** گوڵە هەنار؛ **ئیسان:** ئایسان.

**پوختەی مانا:**

ئەی دڵبەرە عاسمانیەکەم! بەندی روبەندەکەت وەکە؛ با بتبینینو چیدیکە لەژێر پەردەی دڵ کوێریدا، ماتو سەرگەردان نەمێنین. گوڵاوێکی عارەقی روت، لەو بسکە ـ وەك ئاوریشمانەت بپرژێنە. کەزیەکانت ـ کە هەمو بۆنێکی خۆشیان لیێڵاوە ـ بەشانەکە. پەرچوکە سەرخشت بوەکانت ـ کە چین لەسەر چین وێستاون ـ بۆنی میسكو زەبادیان بالێ بۆن بکەین. ئەو تاڵە

بسکـــانەی ـ کەوا کەوتونە ژێر هەنیەپێچـــت ـ وەدەرخـــە؛ با بۆنی گوڵاو، بڵاو بێ. بسکـــوڵەی داهێڵدراوت، وردەکەزی لولدراوت، تاڵتاڵە موی بەر کڵاوت، تای گوڵینگەی سەرو شەدەت، لەو باڵایەی باڵاتەوە، سەما دەکەن.

چیم لەباسی موسا داوە؛ کە بەنیازی سەلکـەبزوت، بەرەو ئـاگرێك پەل بوە کە دایسـاو ئـاگر گوتویە من خواتمو، موجزاتی دەستی سپی، بە خەڵات لەخوا پێگەیوە؟ من ئەو ئاگرەی کە موسا، لەشـیوی پیرۆزدا دیتی؛ لەبادەی رەنگ گوڵهـــەناری لێوی یارم، خـــۆی شـــانداوم. گیانم ـ کە لەکورەی نێڵی ئەویندا ریدا قاڵبوە ـ لە دەستە سپیەکەی موسا، رۆشنترەو سەرتۆپی موجیزاتانە.

٦ میننەت کو ژبەختیَ خوەو طالع بنصیبم
حوسنا تەیە ئیروَ ژمەرا چویە نیصابیَ

٧ عیشقا مە ژبەر مەوجو عەجاجیَ بوە دەریا
وی زیرو زەبەر کت مە بدەست هیندو غورابیَ

٨ نەهچەرخی سپیهریَ ژهەوایا تەوو میهریَ
سەرگەشتە نەئەو تێك قەمەرا شوبهی حوبابیَ

٩ وەك با دلەزینی تو کومێدیَ دبەزینی
عومریَ مە عەزیزی بخودیَ بەس کەشیتابیَ

١٠ یاپیَ بزیارەت بدەمە، یا سەری ئەنگوشت
دەستیَ خوە مەئاڤیتیە بیَچارە ریکابیَ

١١ من ریَ ژسەرابیَ بشەرابیَ برو مونکیر
حەتتا بئەبەد، تەشنە جەگەرما دسەرابیَ

### مانای وشە:

**نیصاب:** رادەی زەکات لیَکەوتن؛ **نصیب:** بەش؛ **عەجاج:** گێژەڵوکەو فەرتەنە؛ **غوراب:** جـۆریَ گەمیەی بادەوەیی؛ **هیند:** هیندو، هیندی؛ **هیندو:** بریەتیە لە دڵرەشو بیَبەزەیی؛ **نەه** : نۆ؛ **حوباب:** بڵقی سەراو؛ **لەز:** پەلە؛ **لەزین:** پەلەکردن؛ **کومێد:** کوێت؛ **بەزین:** غاردان؛ **شیتاب:** پەلە؛ **ریکـاب:** ئـاوزەنگـی؛ **سەراب:** تراویلکە؛ **مونکیر:** بیَباوەڕ؛ **تەشنە:** تینگ.

### پوختەی مانا:

جوانیت لەرادە بەدەرە. زەکاتی جـوانیت لەسـەرە. ئـەی خـوایە! زۆر منەت بارم، کەمن نەدارو هەژارمو لەوانەیە لە زەکاتی جوانیەکەت، بەشم بەرکەویَو تێر بتبینم.

ئەوینی من، بویتە دەریا؛ شـەپۆل دەداو دەکەوێتە قـەرتەنەوەو گێژم دەدا. لەشـم لەناو ئـەو

دەريايە، وەکو گەميەی بازۆ وايەو نەوسـی‌چنۆکو بەدکارم، لە گەميەوانی بێ‌فـەڕی هێندۆك، زۆر ئەحمەق‌و دڵرەق ترە.زۆر دەترسم شەپۆلی دەريای دڵداريم، لەپڕ سەروژورم بکاو سەرومالم تێدا بچێ.

هەرنۆ نهۆمی عاسمانێ بە خۆرەوە، لەناو دەريای ئـەوينی تۆ، بە منيشـەوە، وەك بلقـی سـەراو ديار ئەدەن‌و سەرگەردانن.

چيتە ئەی‌يار! ئەی سـوکەڵە سـواری نازدار! بۆچ پەلەتە؟ بۆ ئـەسپی کوێت ئـاوا بەپڕتاو غاردەدەی؟ تۆ نازانی عومری منی‌و عومری هەرە خۆشەويستمی؟ تۆبيو خـودا، وا زو مەڕۆ، پەلە کەم‌کە. کەس حەزناکا عومری بەپەلە ببورێ. منی هەژاری بێچارە، لە ناچاری، دەستم دەقـوڵفی ئـاوزەنگيت وەرێناوە. نە وەکا زو بەجێم بێڵی‌و بەسـەرگەردانی‌و بە وێڵی بمێنمەوە. بەزەييم لێ دريغ‌مەکە، يان ئەنگوستت نيشان بدە تارای‌موسم، يان رێم‌بدە، پای ناو ئاوزەنگيت ماچ‌بکەم.

هی‌وا هەيە برۆوای بە دڵداری نيەو لۆمەم دەکا. منيش رۆژێك وەك ئـەوان بوم. لەدوی بەردە تراويلکە، هەڵوەدا بوم. بەڵام وامن لەسەراب رزگارم بوەو لەجياتی ئاو، بادەی ئەوين دەخـۆمەوە. بێ ئاگاش لە دەردی ئەوين، هەروا لەتونيان تل‌ئەدەن‌و لە عەزرەتی تنۆکێك ئاو، جەرگيان رەشە.

١٢ سيرپوش‌و قيبابامەيە تەسبيح‌و موصەللا
وەر دا بدرينين لخوە ئەو پەردە قەتابێ

١٣ لِلّە وەرە ساقی بدو جامان مە جوان‌کە
موطريب بدەفێ رابدە سيگاهو شەبابێ

١٤ وەر گۆهبدە نايێ کو شيرين‌قەد دسەمايێ
پور حەل کرنە مەسئەلە ڤێ فەصلی خيطابێ

١٥ جاما نەشەکەرلەب بمەدەت عەينی حەرامە
فتوا وەنوما حاشيەيا شەرحا لوبابێ

١٦ موفتی‌مە نەی‌و نايەو نەی قەولی قەديمە
باوەڕتە نەهن؟ گوهبدە بەر چەنگ‌و روبابێ

١٧ نەردامە چبازی بنوميتن مە ژی رازی
بەندين دسوئالی‌و گوشادين دجەوابێ

١٨ ئەز چومە سەرايێ کوشيرين قەد دسەمايێ
گۆ ئەڤ نە«مەلايی» مەيە؟ بێ‌پەردە بلابێ

**مانای وشە:**

**قيباب:** گومەز؛ **موصەللا:** جێ‌نوێژ، بەرماڵ؛ **قـەتابێ:** پسـابێ، درابێ؛ **سـيگاه:** ئـاهەنگ‌و هەوايەکە؛

**شەباب:** شمشاڵ، بلوێری ئاسنین؛ **فەصلی خیطاب:** قسەیەك كە هەموقسـان بیرێت؛ **حـاشیە:** پەراویز؛ **شەرح:** راوە؛ **لوباب:** كاكڵان؛ **لوباب:** دڵان؛ **لوباب:** ناوی كتێبێكی شەرعە. ابوالحسـن محـاملی ـ كە لە ٤١٣ هەتاوی مردوە ـ داینا‌وەو ئیمامالحرمین، عبدالملك نیشابوری (٤٢٠-٤٧٩ كۆچی) شەرحـی كردوە؛ قەولی قەدیم لەشـەرعی شـافعی (محمدی كوری ئیدریس (١٥٠-٢٠٤ كۆچـی) بەفتواكانی سـەرەتایی شافیعی دەڵێن. كە بەرلە هاتنی بۆعیراق (١٩٤) نوسیونیو كەمیان مانو لەبرەو نەكەوتن؛ **نەرد:** تەختەی تاوڵی؛ **شەرح:** توێ، لا؛ **بەند:** شەشدەر؛ **گوشاد:** داشی تەنیا كە دەكوژرێ، فەتح.

**پوختەی مانا:**

ئەم تەزبیحو دوگردەمان، كردوٚتە رازپۆشی خۆمانو لە پەنایان هەرچـی نارەوایە دەیكـەین. وەرە صوفی با ئەو پەردەی نێوان خـۆمانو خـەڵكـیتر پسپس كەینو، بدڕێنین. تۆبیو خـودا، مەیگێڕ وەرە! بە دوپیاڵە لەو بادەیە جـوانمكەوە. دەی با كاكی بەزمگێڕیش، بە هەوای شـمشاڵو دەفـە، ئاهەنگێكی سێگا لێدا. كابرای بەپرسیاری لاسار! تۆ ئەوكاتەی كەیارە بەژن نەمامو شیرینەكەم دێتە سەماو، دەنگی بلوێر دەویرێنێ، وەرە سەیرێ. بزانە چـۆن مرقـەت دەبڕێو ناچـارت دەكا كڕ ببی. مەڵێن بادە هەمو دەمان نارەوایە. بەڵێ ئـەگەر یاری شـەكر لێو نەفـەرموێ بخـورەوە؛ نابێ وەخوێن. بەڵام ئەو بۆخۆی بیهێنێو خوڵقم بكـا؛ حـەڵاڵە وەك گەزۆ مازو. باوەڕ ناكەن؟ دە بڕواننە شەرحی لوباب كە مەبەستم ناو توێی دڵی دڵدارانە. تا بزانن دڵی دڵدار فتوای چۆنە؟

مفتی ئێمە ئـەوینداران، بلوێرو شـمشاڵو سـازە. نە قسـەی كۆنو لەكار كەوتوی، لەدڵداری بێخەبەران. باوەر ناكەی؟ گوێ لە دەنگی چەنگو روبابێ بدێرە تاتێبگەی.

نەردێنی ئـەوین زۆر سـەیرە. خـراپیش بۆ دڵداران بێ، قبوڵیانەو زۆریش رازین. بۆ داواكردنی مەبەست، شەشدەرمانە. ناشێ هەر دەم ببزوێنین. لە وەراما كە هەر بڵێین بەڵێ قـوربان، لەگشلا گوشادمان داوەو دڵبەر چۆنی ئارەزوی بێ، لێمان دەداو دەمان كوژێو بەو دۆڕاندنەش دڵخۆشین.

گۆوەندبو لە بارەگای میر. یاری بەژن زراوی رەزا شـیرینم، سـەمای دەكرد. كە منی دیت، فەرموی: ئەوە مەلای خۆمان نیە؟ دەبا بێپەردە، بێتە ناو.

## قصیدەی نۆتویەکەم

# «بەهیشتاییرە»

١ هێڤیو تەوقە دکم ئەز ژخودانا حەشەمێ
وێ نیگارو صەنەمو پادشەهو موحتەشەمێ

٢ جارنان بەندەیی دلصوٚهتییی مەهجور ڤە ڤەنێر
بلەبی لەعلی شەکەربارو ژعەینی کەرەمێ

٣ پرسیارەك لمە جارەك بکە شیرین دەهەنا من
کو پەریهتینە فیراقاتە لسەر دەردو غەمێ

٤ ئەرنە هودهود ژسەبا بێت وەکی بادی صەبا
دی ژهیر کو بگەهت دەست ڤپەیکی حەرەمێ

٥ پرسیارا لمەبت وەرنە خوە مەهجوری غەریب
دێ لکی عەرضە بکم ڤێ غەمو دەردو ئەلەمێ

٦ شەرحی حالی غەمی عیشقاتە ژکو تیتە نویسین
مەدحی ئەو صافی جەمالاتە کوجاتێ رەقەمێ

٧ وێ مەجالێ کو جەمالا خوە تەجەللا دکری
لازمە سەجدە ببین بەرتە دوێ گاڤو دەمێ

٨ سەجدەبن بەرتە رەوایە دحەمی مەزهەبو دینان
کێ دبت موشریكو کافر ژوێ شیرین فەمێ

٩ حاشەللهِ کوبکم ئەشکەرەڤان غوصصەوو دەردان
وەر بصوژم ژغەمی عیشقیتو سەرتا قەدەمێ

١٠ مه بصەحرای ویصالا خوە دەرین تو ژخودیٚ ڕا
وەرنە وەقتە کوببین غەرقەیی بەحرا عەدەمیٚ

١١ ژگولستانی جەمالاتە گولەك بێتە ظهوریٚ
ژدنیٚ دیٚ بچتن ناڤی بەهیشتا ئیرەمیٚ

**مانای وشە:**

**تەوقە:** تَوَقع، چاوەنوڕی پێك‌هات؛ **خودان:** خێو؛ **حەشـەم:** کۆیلەو دەسـتو پێوەند؛ **موحتەشـەم:** بەشەرمو حەیا؛ **موحتەشـەم:** پایەبەرزو گەورە؛ **پەریهتن:** داتوڵان؛ **هیر:** ئێرە؛ **پەیك:** قـاصید؛ **حـاشا:** بەجگە؛ **حاشەلله:** نەبەخوا، خواگیربم، موشکوڵۆزمەبم؛ **کوجا:** لەکویٚ.

**پوختەی مانا:**

ئەی دڵبەرە بەنازەکەم! ئەی بتی‌ڕەزا شیرینم! ئـەی سـەرداری دڵ‌وگیانم! ئـەی دەریای شـەرمو حـەیایە! ئـەی پایەبەرزی بی‌وێنە ـ کە هەزاران دڵداری هەژار کۆیلەتن!ـ لەبەرت دەپاڕێمەوەو هیوادارم، دلۆوان‌بی‌و بەدەنگ لاڵانەوەکەم بێی. جـارجار بە چـاوی مەرحـەمەت، نیوە ئـاوڕێکی بەزەیی، وەسەر منی کۆیلەی دورەدیداری خۆت وەدەی. بەو لێوە ئاڵە تەنکانەی ـ کە لە تونگـەی شەکر دەکەن‌و شیرنایەتیان لیٚ دەباریٚ ـ لێم بپرسـی حـاڵت چـۆنە؟ تا بزانی کە لە دوریت، ژان‌و کولٚ دایان توڵاندوم.

مەلاقسـان دەبزرکێنی، کیٚ گوێی لە پاڕانەوەتە. ئـەگەر شـنەبای بەیانی ـ وەك پەپو سلێمانەکەی سـولەیمانی ـ لەنێوانی یارو تۆدا، نەیەو نەچـیٚ؛ چـۆن تۆ لێرە لەو کونجـی خەمخانەیەدا، دەستت دەگا بە قاصیدی بارەگای یار، کیٚ نامەی پڕپاڕانەوەت دەباتە حەرەمسەرای میر؟ ئەگەر سروە ئەوپیاوەتیەی بکردایەو بەزەی پێمابهـاتایەو بیتوانیایە کارێك بکـا، یار لەدەردم ئاگاداربی‌و ئەوە خوایە لێم بپرسیٚ، کارم باشە. ئەگینا منی بێکەسی ئـاوارەو سـەرگەردان‌و وێڵ، باری دەردو غەمو ئازار، لەلای چکەسیٚ هەڵڕێژمو چۆن دەردی خۆم، بەناموو ئـەغیار بیێژم؟ خـوا ئەیزانیٚ هەزار ئەوەندەش بسوتێمو لەئاگری ئەوینێدا هەڵپروزێمو سەرتاپام ببێتە قەقنەس؛ جگـە لەیار، نهێنی‌دڵ لای هیچ‌کەسیٚ نادرکێنم.

دەسا ئەی‌یار! تۆبیو خـودا، بەدیدارێك لەو دەریای خـەمەم دەربێنە. تا بەجـارێك نەخنکـاومو نەفەوتاوم، بمخەسەرسارای هێمنی‌و ڕێم نیشاندە چۆن دەتوانم تۆببینم. لە گوڵجاری جوانی تۆوە، تەنیا چڵێك خۆبنوێنیٚ، لەدنیادا ناوی بەهەشتی ئەودنیا، لەبیر خەڵك دەچێتەوە.

جوانیەکەی تۆ، تەنانەت لەخەمو کوڵی میش، زۆر زۆرترە. ئەگەر باسـی دەردی ئـەوین، لەبەر زۆری، زۆر دژوارە بێتە نوسین؛ لەتوانای کام نوسـەردایە پەسـنی جـوانی‌تۆ بژمێریٚ؟یان بەکتێبی بسپێریٚ؟

لەوكاتەدا كە روخسارت روبە دنیا خۆ دەردەخا؛ لەسەر هەموكەس پێویستە، دەستەولەجێ سوژدەبەریو كرنوش بكا. سوژدە بردن بەرەو روی‌تۆ ـ كە تاقانەی لە جوانی دا ـ بە هەمو مەزەبو دینێك راستو دروستو رەوایە. ئەوكەسەی برۆا نەهێنێو لای‌وابێ كەس وەك تۆ دەچێو شەریكت بۆ پەیدا بكا؛ هەر بەگفتی لێوە شیرینەكانی خۆت، كافرەو لەدین دەرچوە. چۆن كافرو دڵرەشێكەو چەند خوێن تاڵە ئەو بێ‌تاڵەی، برۆای بەدەمی شیرینت نەهێنابێ، كە وێنەی نەبوەو نەدەبێت.

١٢ گەربیم بەرتە سجودێ ددەما كەشفو شهودێ
مەلدل دێ بدرت پورتەوی نورا قیدەمی

١٣ (قِبْلَتی وَجْهُكَ فی كُلِّ صَباحٍ وَمَساء)
بدو ئەبروی تە جانا دخورم ئەز قەسەمێ

١٤ مویەكی ئەز ژتە نادم بدوصەد زینو شیرینان
چدەبت گەرتو حەسیب كی مە بفەرهادو مەمێ

١٥ تە فەرەنگو عەرەبستانو مەجەر تێك ستاندن
جەلەوێ خوەش وەگەرین هاتی یەنوبا عەجەمێ

١٦ ما ژدیوانێ سەعادەت سەكری شوبهی «مەلایێ»
تو بناقێ مەگەدایێ بكشینە قەلەمێ

**ماناى وشە:**

**كەشفو شهود:** دیاری‌دانو حازربون، لە زاراوەی صوفیان‌دا بەو دەمە دەڵێن كە دەگەڵ خوا تێكەڵ دەبنو لەنیزیكەوە خوا بەچاوی‌گیان دەبینن؛ **قیدەم:** هەرەپێشو: ئەزەل؛ **قِبْلَتی:** روگەی من؛ **وَجْهُكَ:** روخساری‌تۆ؛ **فی كُلِّ:** لەهەمو؛ **صباح:** بەیانی؛ **مساءِ:** ئێوارە؛ **قەسەم:** سوێند؛ **زین:** دڵبەری مەم، كە دڵبەرو دڵدارێكی كوردی بەناوبانگنو بەیتیان بە كرمانجیو سۆرانی هەیەو شێخ ئەحمەدی خانی (١٠٦١-١١١٩ ك. م) كتێبی بەشیعری لەوبارەوە بەناوی «مەم‌وزین» داناوەو بە زۆرزمان وەرگەڕاوەو لە دنیادا بەناوبانگە. هەزاریش ئەوەكەی خانی بە سۆرانی وەرگێراوەو دوجارانیش چاپ‌كراوە.

**شیرین:** ژنی خوسرەوی پاشای ئێران‌بو، حەزی لە فەرهاد ناوێكی كوردی كەڵهوری بەردبڕ كرد. خوسرەو پێی گوت: ژنەكەی خۆمت ئەدەمێ، بەومەرجە كەژی بێستونم بۆ كون‌بكەی. فەرهاد بێستونی كون‌كردو بەتەمابو شا بەڵێنەكەی پێك‌بێنێ. بەڵام درۆی دەگەڵ‌كراو قاو داخرا، كە شیرین‌مرد. فەرهاد لەتاوی شیرینێ، هەر بەو قوڵینگی دەستی خۆی، هەستو خوستی لەخۆ بڕیو لەرێی گیانە شیرینەكەی گیانی شیرینی بەخت‌كرد. پادشای گەواد، سەرەڕای بێ‌ناموسیەكەی قەتڵیشی كرد.

چیرۆكی فەرهادو شیرین، لەلایەن دو بوێژی كورد، یەكیان «ئەلیاسی نیظامی» كە لەنێوان ساڵانی پلەی چوارەمی سەدەی شەشی ـ كۆچی مانگی ـ لە مەڵبەندی گەنجەی ئاران، پای ناوەتە ناو دنیاوەو

لەیەکەمین دەیەی ساڵەکانی چەرخی حەوتەمدا مردوە. شیرین‌و فەرهادەکەی ئەو بەفارسی‌یەو لەراستیشدا دادی داوەو هەمو بوێژو ئـەدیبی فـارسی‌زمانی بوڕداون. دوهەم «**خـانای قـوبادی**» کوردی گۆرانە. که مێژوی ژینی نازانین. بەکوردی هۆندویەتەوەو چاپ‌کراوەو نمونێکی بێوێنەیە.

**مەجەر:** مەجارستان؛ **عەجەم:** خەڵکی ئێران، خاکی ئێران؛ **سە، سەح:** بیسن؛ **سەگری:** بیستراو.

**پوختەی مانا:**

من هەرکاتێ لەگەڵتا روبەرودەبمو چـاوم بەدیمەنی پاکت پیرۆز دەبێو سـوژدەی سـوپاس دەبەمە بەر ئـەو بەژن‌و باڵا بەرزەی‌تۆ؛ نوری هەرە پێشـینەو لە دوا نەهاتوت، تیشـك ئـەداتە دڵمەوەو تاریکیم لەبەر دەرەوێ. هەمو بەیانی‌و ئێواران، سوژدە بەرەو میحـرابی بڕۆی تۆ دەبەم. روی تۆ، تەنیا روگەی منە. گیانە سـوێندم بە دوبرۆت، کەمن تاڵێك لەموی کەزیت، بە صـەد جـوانی وەکو زین‌و شـیرین، ناگۆڕمەوە. دەیسـا خـۆ قیامەت رانابێ کەتۆش ئێمە بەفـەرهاد، یان مەم بزانی‌و بەتیلەی‌چاو، لێم‌بڕوانی. باسی جوانیت عەرەبستان‌و فەرەنگ‌و مەجارستانیشی داگرت. ئـەمجـارە نۆرەی ئێرانە، بەجوانی خۆت، بەرخـۆتی دەی. جڵەوی ئـەسپت بادەوە بەرەو ئێران. با لەجـوانیت بێبەش نەبن.

شـیاوی باسـە، عوثمانیەکان لە رۆژگاری ژیانی مەلا، عەرەبسـتانیان گرتبو؛ مەجـارستان‌و زۆربەشیان لە ئوروپا لەدەسـتابو. هەمیشـەش دەگەڵ ئێراندا، لەشـەڕو مشـتـو مڕدا بون. وەك مەجنونەکەی عامیری، کە لێیان پرسی، دەربارەی ئیمام عەلی‌و معـاویە تۆ چـی‌ئـەڵێی؟ حـوکم بەکامیان رەوایە؟ گوتی: ئەگەر راستو دەوێ، حوکم شیاوی لەیلای‌منەو بۆ هەموکەس نارەوایە. مەلای دڵداری سـەلمایەش دەڵێ: داگیرکردنی دنیایە هەر بۆ جـوانی ئـەو دڵبەرەی‌من رەوایەو تا ئـەو هەبێ، هیچ سـوڵتانێك رێی‌ناکەوێ بڵێ من‌هەم. لەبارەگای بەختەوەری ـ کە سـەراو پەردەکەی تۆیە ـ لە دەفتەری سیایی ناوی بەختەوەران بەدیدارت؛ بیسـتوتە لەشـوێنێك ناوی کوڵکە مەلایەك نوسرابێ؟ ئەگەر هەبو، ئەوا منی پارسەکی بەر بارەگاشت، لەپەنا ئـەودا بنوسـە. یان، زۆر ناجۆرە ناوی گەداو کوڵکەمەلا، دە دەفتەری تۆدا هەبن. رێیان ناکەوێ بێنەناو. ئـەگەر بیستت کەناوی منی پارسەك‌و کوڵکەمەلا، لە دەفتەری دڵدارانتدا نوسـراوە. بۆخـۆت قـەڵەمیان بکێشە، هەر ئەو قەڵەم لێ‌کێشانەت، کە بەو دەستە ناسکـانەت دەیان‌کێشـی؛ گەورەترین مایەی بەخت‌و تالحمانە.

## قصیدەی نۆتو دوهەم

# «کوڤاناگیان»

١ غەما عیشقێ پەریهتم ئەز حەبیبا غەمرەوین کانێ
سەراسەرتێك بەهیتم ئەز ژدەردێ فەرق‌و هیجرانێ

٢ فیراقا دلبەرا رندە بەهیتم ئەز وەکی فندە
موسلمانەك درێ مندە خەبەربت بالی سولطانێ

٣ خەبەربت بال شەکەرخاییێ شەپال‌و خوب‌و زیباییێ
کومیرە بەلکە بیرناییێ ئەسیرەك وی دزیندانێ

٤ ئەسیرم لەرزەیو تاڤێ نەطاقەت ڤێ نە پەرواڤێ
ژحەبساوی قەمن ناڤێ بکم فەریادو ئەفغانی

٥ م ناوی ئەز بفریادکم لظولما دلبەرێ دادکم
صەحی دێ شوبهی فەرهادکم بدم روحێ ژکوڤانێ

٦ ژکوڤانا تە شیرینێ دنالم شوبهی گوێینێ
درێژم هێسترێن خوینێ وەکی طاڤێ دبارانێ

**مانای وشە:**

**پەریهتن:** برژانی لەڕادە بەدەر؛ **بەهیتن:** توانەوەو چوڤان؛ **رند:** جوان‌و لەبار؛ **فند:** مۆم؛ **بال:** نك، کن، لا؛ **لەرزەو تاڤ:** تاولەرز؛ **پەروا:** تابشت، ترس؛ **فەریادو ئەفغان:** دادو هاوار؛ **صەحی:** بەراستی؛ **گوێین:** باڵداریکی شەوبێدارەو هەر دەناڵێ؛ **طاڤێ بارانێ:** تاوی باران، رێژنە؛ **هێستر:** ئەسرین، هرس؛ **کوڤان:** عەزرەت، دەردو کوڵ‌و کەسەر.

**پوختەی مانا:**

گڕەی ئـەوین‌وای برژاندم، لە کەڵك بوم. بەتینی دەردی جـودایی، هەمو لەشــم تواوەتەوەو داتوڵاوە. لەو توانەوەی لەشی کزم ـ کە زەردیشەو وەکموّم دەچیّ ـ دەکریّ شەمم لیّدروس‌کەن‌و داگیرسیّم. خوّشەویســتی خــەمڕەویّنی لەجــوانی‌دا بیّ‌تاو بیّوێنە، لەکویّیە دەفــریام‌بیّ؟ کوا موسوڵمانیّ خێرەوەمەند توشم بیّو لەڕای‌خـودا، خــوّ ماندوکا. دەنگ‌وباسـی کەســاسی من، بەو سوڵتانی گش‌جوانانە بگەیەنیّ. ئـەو ســوڵتانی مەڵبەندی هەمو نازداران، خــونچیلانەو خــویّن شیرین‌و جوان‌و باش‌و بەئـاکارەو لەکاتی قسـەکردنا، شـەکری لەزاری دەباریّ. موســوڵمانەکەی خێرەومەند، بەونیشانانەی من دەڵێم با بیناسیّ. ئەو لەسەر جـوانان ئـەمیرەو، کاروباری دڵبەران‌و دڵداران گشتی لای ئەوە. سەری قاڵە لەوانەیە هەر لەبیریشــی نەمابیّ کە یەخســیرێك لە زیندانی دڵاندا بیّدەرەتانە. بەڵیّ ئەویەخسیرە منم. ســەرەڕای دیلی. لەرزوتای تاســەو ئــارەزوی، تابەتای ئەوکەزیە بەلەرزانەی ئەو، توشــی توشــی لەرزو هەڵچــوّقانیان کردوم. هێزو تابشــتم نەماوە. ناشمەویّ لەبەندی ئەودا، هاوار بکەم. بڵێم زوڵمم لیّکراوە. راستت دەویّ، من دەمەویّ دەرسێك لە فەرهاد فێربم. گیانی خــوّم لەعەزرەت دینی دیداری یاری شــیرینم بەقــوربان کەم. لەعەزرەت توّی گیانی شیرین، شەو هەتا روّژ، وەکو گوّیین دەناڵێنم. وەك رێژنەی تاوی بارانیّ، فــرمێسکی خوێن، لەچاوانم دادەبارن.

٧ وەکی بەرقی بوهاری ئەز ژدەست چەشمێن خوماری ئەز
دکم فەریادو زاری ئەز مەگەر جارەك کی ئیحسانیّ

٨ تو پوڕئیحسان‌و خوەی نەشمی لدەرویشان ئابیّ خەشمی
چبیتن گەر بنیڤ چەشمی نەظەرکی تولا ئاستانیّ (یان، تو لئاستانیّ)

٩ لمن پڕسەك بدلداری دبت هەمپایی دیداری
ڤەڤە وەستایم دفەرواری لعەبدیّ خوە کە فەرمانیّ

١٠ دفەرمانیّ ڤەڤە وەستایم دبەندا خدمەتی دایم
وەکی گوّی بیّ سەروپایم هەمان لیّدی تو چەوگانیّ

١١ لبەر چەوگان‌و کاشویان ژدەربا تورك‌و هیندویان
دبازم هەروەکی گویان دەما ئەوتینە مەیدانیّ

١٢ دەما ئەوتین ببازی تێن دگەل قەوسێن شیرازی تێن
چموکارن؟ دتازی تێن بدەعوا تێنە لێکدانیّ

١٣ بدەعوا تێن مە یەغما کن دعامی شورو غەوغا کن
سواش‌و فیتنەیان راکن بشیر ئەوتێنە تالانیّ

## ١٤ دوتالانچی دمەشهورتیٚ ژمەعدەن عەینی کافورتیٚ
## دتیٚکەل ظولمەتو نورتیٚ مەکوفریٚ دی دئیمانیٚ

### مانای وشە:

**خوَی:** خیٚو؛ **خەشم:** رك؛ **نەشـم:** ناوی بەرزو پایەی بەرز؛ **هەمپا:** بەرانبەر؛ **فـەروار:** فـەرمان؛ **هەمان:** ئیتر ئامادەیە؛ **کاشوَ:** داری سـەرخـواری گەمەی شـەقیٚن؛ **دبازم:** غار دەدەم؛ **بازی:** گەمە؛ **تازی:** روت؛ **موکار:** زوَر تیژ کە مو هەڵدەگریٚ؛ **دەعوا:** شەرٚ؛ **یەغما:** تاڵان؛ **عامی:** ئـاپوَرەی خـەڵك؛ **شـورو غەوغا:** پشیٚوی‌و هەراهەرا؛ **سواش:** شەرٚو دمەقاڵە؛ **مەعدەن:** کان؛ **عەین:** کانی.

### پوختەی مانا:

لەدەست ئەو چاوە مەسـتانەت، کە لەو دیوی پەچـەی روبەندە وە هەر گرشـەگرشـیانەو، وەك بروسکـەی هەوری پری مانگـی گوڵان، دەترووسکیٚن‌و تریشـقەو گرمەو بارانیان بەشـویٚن‌دادیٚ. ئەوامنیش وەکو هەوری بوهاران، ناڵەناڵم دیٚو، بەتاو ئەسرین دەباریٚنم؛ ئەسرینی خـویٚن. دەڵیٚم جاریٚك بەباریٚکدا، بەزەت بەمنی هەژاردا بیٚ. دەزانم هەر پیٚم بزانی، بەزەت دادیٚت. ئەتوَ زوَرچاك‌و پرچـاکەو دلوَوانی‌و لەراسـت روت‌و گەدایان رك لەدڵ ناگری. هەمو ئـاواتی من هیٚندە، کە جاریٚکیان، لە گوَشیٚکرا، بەچاوی کز، لەئاسانەکەت بنورٚم. توَش بەتیلەی چـاوەکانت، توڵەی بەر ئاستانەی خوَت، تماشـاکەی. ئـەگەر واکەی، چناقـەومیٚت‌و بەو دیدارە، دیواری کابە ناروخـیٚ. ئەگەر هەر ناشتەویٚ بم‌بینی، پرسیٚکی لەحاڵم‌کە، کە پرسیارت لەمن، کەمتر لەدیدارت نیە بوَمن. ئیتر دیدارە یا پرسیار؛ بەدەست خوَتە. ئـەمن کوَیلەم، لەخـزمەتدام. چفـەرمانیٚك بدەی، سـازم بەجیٚی بیٚنم. وەکو گوَی‌بازی ئـامادەم لەبەر شـەقتا. سـەری سـەرکیٚش‌و پای راکردنم لانین. بەگیان‌و دڵ، بەئاواتم بەگوَچانت خەڵاتم‌کەی. چخـوَشە دڵ وەکو گوَیەك لەمەیداناو دویاریکـەر، یەکیٚ چـاوت ـ کە وەك تورکان، لەحـاند بیٚ‌دەسـتەڵاتان زاڵم‌و تیژن ـ ئـەویتر کەزیەکانی رەنگ شەوەت ـ ویٚنەی چەتەی هیندی بیٚ‌ئامانن ـ وەبەر کاشوَی دەن‌و رایدەن؟

گەلیٚك‌جار، پرچ‌و بسکی‌توَ، دەگەڵ چاوت، بەشیری خواری دوبروَوە ـ کە وەك جوتیٚك کەوانی کاری شـیرازن‌و تیری مژوَڵان داویٚژن ـ دیٚنە یاری شـیرو تیرو کەوان‌بازی. بەڵام چـەند شـیری موکارن‌و لە کالانیش دەرکشـاون. بەشـیری روت، بەریٚژنەی تیر دەگەنە یەك. پیاو لای وایە، شەرٚیان لەناو خوَیاندایە. کەچی نەخیٚر کیٚشە بوَ دڵی مەلایە؛ هاتون تالاٚنی دڵ‌بکەن. هەراو ئاژاوە بەرپاکەن. قیامەت لەدنیایە راکەن. ریٚزی دڵان بشـیٚویٚنن. هەراو هوریا لەناو خـەڵکـا بنیٚنەوە. سەرتەریدەی ئەو دزانەش، چاوەکانن؛ هەر ئەوانن بوَ تالاٚنی دڵی هەژار، بەناوبانگـن. شـیری بروَ وەکار دەخەن. هەڵدەکەنە سەر دڵداران دڵیان دەبەن. ئەمما چەند تالاٚنچی جوانن؟ دڵدار حـەزدەکا بیان‌بینیٚ‌و صـەدجـار گیانی بدوریٚنیٚ. سپی‌و رەشـن. واتا دوچـاوی بەڵەکن. سپیایەتی لەکانی کافورسپی تر؛ رەشیەتی‌یەکەش وەکو ئەو تاریکستانەیە ئـاوی حـەیاتی تیٚدایە. سـەیرە چلوَن

تاریکـیو نور، گەیونە یەك؟ ئێمە کەلێیان دەڕوانین، کوفـرمان دێتە بەرچـاوان، کەدەناو خواناسیندایە.

١٥ مەکفری دی دئیسلامبێ ژشەرقێ ظولمەتو شامبێ
ژزولفان عەنبەری خامبێ کەناری خالو نیشانێ

١٦ دو زولفی عەنبەر ئەفشانن دو لەعلی شەککەرستانن
دو چەشمی سیحری فەتتانن دلێمن وان خەدەنگ دانێ

١٧ دلێمن وان خەدەنگ لێدا دبورجا روزو شەب تێدا
لسەلوا مارلڤین پێدا بمەستی هاتە سەیرانێ

١٨ لسەلوا مار بلەف هاتن دبورجان تیپ بصەف هاتن
ژباطین تیر بخەف هاتن ژبەر بەندا گریبانێ

١٩ ژبەر بەندا نیقاباوی لبەر فەتلا عیصاباوی
جەمالا ماهتاباوی مەبەدرەك دی دسەیوانێ

٢٠ هەیڤ بو ئەو دظولماتێ دخوَم صوندێ بئایاتێ
کونوریدا سەماواتێ ئەسەد هات راستی میزانێ

٢١ قەمەر هات راستی پەروینان ژبوَ خەملێ شەمال ئینان
م نێرگز دی دنەسرینان دنیڤ باغێ گولستانێ

٢٢ دباغێ من مەدام دلتێ جنەسریو سوسنو گولتێ
بنەفشو طەرحو سونبولتێ چەڤین سەر شوبهی رەیحانێ

٢٣ لدیمێ سونبولان سەردان چەڤین سەرسوسنو وەردان
لماهێ عەقرەبان گەردان دسەردا ئابی حەیوانێ

٢٤ ژعیشقێ لەو «مەلا» خەستە ژحەرفا بادەیێ مەستە
ژهوشو عاقلی رەستە لدەر گوشێن دمەیخانێ

**مانای وشە:**

**شام:** شەو؛ **ئەفشان:** بڵاوکەرەوە؛ **فەتتان:** جوانی دڵشێوێن، ئاژاوەچـی؛ **لڤین:** جـوڵان، بزوتن؛ **لەف:** پێچ؛ **تیپ:** کوَمەڵێکی لەشکر؛ **گریبان:** بەروَك، پێسـیر؛ **فـەتل:** لێكهاڵاو، بادراو؛ **سـەیوان:** سـایەدەر؛ **سەیوان:** خرمانە؛ **خەمل:** رازاندنەوە، رازانەوە؛ **جنەسری:** دارخورمایەکی نایابە؛ **چـەڤین:** خـوار بونەوە، چەمانەوە؛ **گەردان:** لەگەڕدان، بەدەورەدا؛ **خەست:** تیرو توَخ؛ **خەستە:** نەخوَشو ماندو؛ **حـەرف:** کەنار؛ **حەرف:** تیژ لە چێژەدا؛ **حەرف:** پیت؛ **رەسـتە:** رزگاربو؛ **دەرگوش:** جـوڵانەی بەگوریسو پەڕوَ کە منالو

نەخۆشی تێدا دەحاوێنتەوە.

**پوختەی مانا:**

بۆچی دەڵێم کوفرم لەئیسلامدا دیوە؟ زولفی رەشی ـ کە عەنبەری خاو بەردەگرن ـ هاتبونە دەوری خاڵانیو دەت‌گوت تاریکایی شەوێ، دەوری روخساری وەك رۆژی بەتیریژی یارمی داوە. ئەو روخسارە لەپاکی‌دا، وەك ئیمانی موسوڵمانی خوداناسی بەراستی‌یە. زولفو خاڵە رەشەکانیش، وەکو کافر دڵیان رەشە. ئاوا من ئیسلامو کوفرم‌پێکەوە دین.

پرچی عەنبەر دەپرژێنن؛ لێوەکانی هێند شیرینن، تۆ ئێژی بونە شەکراوا. چاوی جادوی دڵ‌شێوێنن، هەر ئەوان بون، دڵی منیان بەرتیران‌دا.

لەو مزگەی عاسمانی روخساری پاکرا ـ کە وەك رۆژ لەناو شەودایە ـ دڵم تیرەباران کرا. دو رەشماری کەزی یارم، لەباڵای راستی وەك سەوڵی، جوڵانەوە. وەك سەرخۆشان تلیان‌دەداو دەیان‌روانیە ئەم تیرهاویشتنەی چاوان. جەرگو دڵ‌پێکانی منیان، بەخۆش‌و سەیر دەزانی‌و سەیریان دەکرد. کەزی رەشمار، هەر دو نەبون؛ زۆر بون. ریز بەریزو تەکوز وەك تیپی لەشکری راهێندراو، هاتنە پێشێ. هێندێکیان لەگەردن هاڵان‌و سەریان گەیاندە سەر بەرۆك. لەبەر دوگمەو بشکۆژی سەر بەرۆکیەوە بەدزیەوە زۆر تیر داباریە هەناوم.

لەبن بەندی روبەندی‌دا، لەژێر ئەو بسکە لولانەی ـ کە بەر توێڵ‌پێچی کەوتبون ـ جوانی هەنیەی وەکو ترێفەی مانگەشەو، دەبریقاوە. هەنیەی یارم، وەك مانگی چاردە شەوێك دی؛ کە هەنیەپێچ خۆی لی‌کردبوە خەرمانە.

روخساری دەناو بسکان‌دا، وەك مانگ لەناو تاریکایی‌دا، دەینواند. بە ئایەتان سوێندێ دەخۆم کە تیشکی روخساری یارم، روناکایی دایە عاسمان. بورجی ئەسەد، خۆی بەرانبەر بەمیزان کرد. وەك چۆن چاوە مەستەکانی، لەراست بروی وەك تەرازوی نازکێشانێ، خۆ دەنوێنن؛ مانگ‌و هێشوی ئەستێرەی کۆ، هاتنە پاڵ‌یەك. تا وەك ناو چەوانی یارو لیزگە مرواری سەرتوێڵی، خۆ نیشاندەن. کۆ ئەستێرەی بورجی میزان‌و ئەسەدو پیرو، مانگیش پیرا. هەریەك مۆمی‌خۆی هەڵکردو لالەبەدەست بە بەهانەی رازاندنەوەی ئەو روخسارە، هاتنە دیدار. کە لەخۆیان جوانتریان چاو پی‌بکەوێ.

ئەدی منی دڵداری ژار، کە پڕکوڵم‌و دڵم بۆگوڵ دەکورکێنێ؛ لەو بەژن‌و باڵاو روخسارە، چیم بەدی‌کرد؟! نێرگسی کاڵی چاوانی، لە کەناریش لاجانگی سپی وەك نەسرین، لەناو باغچەی بەهەشتی ئەو روخسارەدا ـ کە دڵم باغەوانیەتی‌و لێی دەرناچێ ـ بەژنی وەك داری جنەسری ـ کە خورمایەکی زۆر شۆخ‌و زۆر بەرشیرین‌و نایابە ـ هەڵوێستابو. هەر شیرنایی لیێ دەباری. بسکی بۆن‌خۆشی وەك‌سوێسن، گوڵی رومەت، وەنەوشەی خاڵ، چڵی ریشوی سەرو شەدەی، گوڵی سمڵی پەرچوکەکەی، گشتی لەریحان بۆن‌خۆشتر، لە رەشەریحانە رەشتر، نوسەری قودرەتی

خودا، له شێوه خەتی ریحانی، نوسیبونیو سەری خوار کردبونەوە. کەزیه بۆن سونبولەکانی، سەریان لەروخساری دەدا. بەسەر بسکی وەك سوێسنیدا چەمابونو گشتلا دەوری پەڕەی گوڵی سەررومەتی ئاڵیاندابو. کەزیەکانی سەرچەماوەم، وەك دوپشکی لەعەنبەر دروستکرابنو هاتبنەگیان بەدی دەکرد؛ کە پاسی لاجانگی دەدەن. ئەو لاجانگەی ئاوی ژیانی تێدایەو لە دەوری مانگیش دەسوران. کە مانگ لەبورجی عەقرەبدا، زۆر بەتیشکه. بۆیه مەلا ئەمرۆ لەباسی دڵداری، هێنده خەستەو قسەکانی هێنده کرژن. چونکه بادەی توندو تیژو خەستو خۆڵی ئەوینی دەرخوارد دراوەو مەستو کەلەلا کەوتوه. لەوشتانەی کە ناو نراون عەقڵو هۆش، رزگار بوه. هێزی بزوتنی نەماوه. ئەوا لەناو مەیخانەدا، خراوەته جوڵانەوەو رای دەژێنن. بەپیری منداڵ بوتەوه.

«مەحوی» دەڵێ:

لەپێ کەتومو نەفسم بۆ هەوا دەشنێ وەکو منداڵ

لەبەر پیری سەرم خۆی ناگرێ، من تازه پێ دەگرم

شیاوی گێڕانەوەیه:

شەرحدەری ئەم دیوانه بەعەرەبی، نوسیویەتی: شیخ عەلی فەندەکی گوتی: لەخەوما شێخی جزیریم چاوپێ کەوت. گوتم قوربان، تۆ «ئابێخەشمی»ت کە فەرموه، من لاموایه «ئـا» یەکە زیاده. تێ ناگەم. مەلا فەرموی: تۆ نازانی. «ئـا»لە مانای ئـاریدایەو زۆر لەکورد دەکاری دێنن. «ئابێ خەشمی» کەوتوتە بەیتی هەشتەمی ئەم قصیده.

# قصیدەی نەوەدو سێهەم

# «سەمەن سایان»

١ بحوسنا (احسن التّقویم) و ظاهیر صورەتی ذاتی
نەظەردی (عَلَّمَ الأسماء) و باطن عەینی میرئاتی

**مانای وشە:**

**اَحْسَن:** باشترین، جوانترین؛ **تَقْویم:** راستو ڕێككردن، هەڵخستنەوە؛ **صورەت:** وێنە؛ **ذات:** خـوٚ؛ **ذات:** بریەتیە لەخودا؛ **عَلَّمَ:** فێری‌کرد؛ **أسْماء:** ناوان؛ **ظـاهیرو باطـن:** دەرو ژور؛ **عەین:** هەرخـودی؛ **عەین:** چاو؛ **عەین:** خوٚر؛ **میرئات:** ئاوێنە.

**پوختەی مانا:**

خوا فەرمویە: (ئادەم نوێنەری خودایە لە سەرزەمین. هەمو ناوێکیشـی فێرکرد.) فـەرموشـیەتی: (ئێمە مروٚمان جوانترینو ڕێكو پێك‌تر لە هەرشـتێك هەڵخسـتەوە.) پێغـەمبەری خـواش (ص) فەرمویە: (خوا عینسانی لەسەر وێنەی خوٚی سازداوە.)

جا ئەگەر لە دڵبەری من ورد ببیەوەو ئاگایەکت لەو ئایەتو فـەرمودانەی خـوداو پێغـەمبەریش هەبێت؛ زوٚر شتت لێ حـاڵی دەبێ. لە ڕواڵەتە کەی بڕوانەو ئـەو جـوانیو ئـەو دڵرفێنیەی بێنە بەرچاو، تابزانی ئەوکەسەی ئەوی لەشکڵی خوٚی هەڵخستەوە، چوٚن جـوانێکەو چـوٚن هەر تەنیا ئەوە کە دەبێ بپەرستریٚو کەسی‌تر نا. خوٚ ئەگەر بەچـاوی دڵت، وردتر لە ڕواڵەت بڕوانیو قـوڵتر بچیتە ژورەوە؛ تێدەگەی کە جوانیو ڕێکی ئـەندامی ئـەو دڵبەرەی من، جگـە لە ئـاوێنە نیە، کە بەرەو خوٚر ڕاگیراوەو جوانی سیماو بەژنو باڵای، تیشکێکی جوانی خودایە داویەتەوە.

٢ دڕابوسا سەمەن سایێ مەنێری بەژنو بالایێ
(لَعَلّی اَبْلغُ الأسْبابَ، اَسبابَ السَّمواتِ)

**مانای وشه:**

**بوس:** ماچ؛ **سەمەن:** گوڵی یاسەمەنە؛ **سا:** (وشەی پاش‌بەندە)؛ **بەمانا:** وەکو؛ وردکەر، خـوڵێدەر. دێت؛ **سەمەن‌سا:** وەك یاسەمەن، یاسەمەن بەرێ دەر، خـوڵە یاسـەمەن دەر؛ **لَعَلَی:** شـایەتامن؛ **اَبْلغُ:** بگـەم؛ **اسباب:** لایەن‌و پێ‌پیلکەو کەنار؛ **سَمٰوات:** عاسمانان، بڵندایيان.

**پوختەی مانا:**

ئەو پاوپلە ناسکانەی ـ کە یاسەمەن ئەگەر بۆی بلوێ ماچیان کاو خۆیان لێ‌دا، شانازی بە بەختی دەکاو هەمیشە بەو ئـاواتەوە لە رێبازی کەوتوتەوە. پەلامارمدا ماچیان‌کەمو خـــۆم خســـتەســـەر پێڵاوەکەی. لەو خـوارەوە خێســەم لەبەژن‌و باڵای کردو تێم‌هە ڵروانی. دڵی نەزان، ئـارەزوێکـــی بەدڵ‌دا هات؛ کە بەڵکو رۆژێك لەرۆژان، بگـەمە سـەیری عاسـمانی جـوانی لەو باڵایەو بڕوانمە مانگی روخساری. بەڵام دڵەنەزانەکەم وەك فیرعەون لێی شێوابو. وەکو قورئان باسی دەکا، کە لە وەرامی موسادا بە هامانە ـ وەزیرەکەی خۆی ـ گوتوە: هامان بورجێکم بۆ سازکە، بەشکـو بەوێدا بگەمە پلەپلەی عاسمانان‌و کەنارەکانی بگەڕێم؛ تا بزانم ئـەوخـوایەی موسـا لەکوێ‌یە؟! خـەیاڵ پڵاوی دڵەکەم، وەك خەیاڵ پڵاوی فیرعەون، پرو پوچەو دەستی بەباڵا ڕاناگات.

٣ **ژڤێ تەقویمی ئینسانی نەظەردا سیرری سوبحانی**
**(فَهذا اَلْوَجهُ مِنْ اَجْلیٰ بَراهینِ وآیاتِ)**

**مانای وشه:**

**ئینسان:** مرۆ؛ **ئینسان:** ئەم‌جۆرە؛ **ئینسـان:** بی‌بیلەی چـاو؛ **سـوبحان:** پاك‌و دور لە هەڵە؛ **سـوبحانی:** خودایی؛ **هٰذا:** ئەمە؛ **وجـه:** روخســـار؛ **اَجْلیٰ:** رۆشـــن‌تر؛ **بَراهین:** بُرهان‌گەل؛ **بُرهان:** بەڵگـــە؛ **آیات:** ئایەتان، **آیَت:** نیشانە.

**پوختەی مانا:**

هەر چـاوێکی کە خـاوەنی بی‌بیلەیەکی بینایی‌و بەو بروانێتە یاری من ـ کە نمونەی هەرەجـــوانی دروست کردنی ئینسانەو بەوجۆرە کە نهێنی‌خـوا، بۆ نیشـــان‌دانی دەسکـــاری بێ‌هاوتای خـــۆی شانی‌داوە ـ کافریش بێ، ناچاردەبێ ئیمان بێنێ. چونکە ئەو روخسارە پاکە، رۆشن‌ترو بەهێزترین بەڵگەو نیشانەی قودرەتی لەبنە نەهاتوی خودایە.

٤ **کونوری عیشقێ لامیعەدەت لطوری قەلبی جامیع دەت**
**دسەیرا (بَرزَخُ الاسماء، نِهایاتُ بِدایاتی)**

**مانای وشه:**

**لامیع:** تروسکەدەر؛ **جامیع:** کۆ، کۆکەرەوە؛ **سەیر:** گەشت؛ **بەرزەخ:** بەرزەك، نێوان، لەمپەر، ماوەیەك دەناو دودەمدا؛ **نهایات:** پاشینەکان؛ **بدایات:** پێشینەکان.

**پوختەی مانا:**

ئەویندارى راستو دروست، گەرەكبیری بڵاو نەبێت؛ جگەلەیار، هیچشتی بەدڵدا نەیەت. دڵی بۆیار کۆکاتەوەو خروپڕ بیدا بەیارو ئاوڕ وەهیچ نەداتەوە، کە یاری لەبیرباتەوە. جا ئەوسایە ئەبێ هومێدێکی هەبێ کە تروسکەی نوری خودای ئەوینداران، وەك چۆن لەکێوی طوری‌دا، لەویش‌بداو لەبەر روناکی ئەوتیشکە بەناو ناوەکانی خوادا ـ کە هەریەکێك لەوناوانە جۆرە بارو حاڵەتێك لە رێرەوی‌رێ پەیدادەکا ـ پێ‌هەڵێنێ؛ ئەوە خوایە بەشکو بگاتە هەواری بەختیاری‌و بە یەکجاری لەگەڵ یاری هەرە نازداری؛ کۆوە بێت. سوپاس بۆخوا، کەمن لەم گەشتو سەفەرە پرخەتەرە، گەیشتومە دواییەکانی تازە دەست پێکراوەکانم.

نازانم کێ‌گوتویە:

دنیا لەدڵما ناحەوێنمەوە      گشکی دەربەستە وەدۆس دریاوە

**٥ نیشانێن طورەیی طوغرا دوەصفی زوهرە سیمایان**
**(لِعِنْوانِ التَّجَلّی مِنْ بَراعاتِ الْعِباراتِ)**

**مانای وشە:**

**عینوان:** نیشان‌و بەڵگە؛ **تەجەللی:** بە روناکی خۆنیشاندان؛ **بەراعات:** بارع گەل؛ **بارع:** سەرکەوتو لە ئاکاری پەسندا؛ **بارع:** زۆر دەم‌پاراوی قسەرەوان؛ **عیبارەت:** تەرزی‌قسە، قسەدەربڕین.

**پوختەی مانا:**

بۆشایەتی‌و بەڵگەی هەرە زۆپو دیاری، کە نوری خودا داویەتە روخساری پاكو جوان‌چاكو بیچم‌و سیمای زوهرەئاسایان؛ ئەو مۆرە بەقیچەڵ فیچەی قودرەتی‌یە، کە پادشاهی پادشایان بۆی ناردون‌و بۆی‌کردون بە بسكو کەزی. تۆ برۆانیە ئەوبسکانەی لە دەوری رون، فەصیح‌ترین عیبارەتن بۆ ناوونیشانی دەسکاری خودای مەزن‌و زو تێدەگەی کە نوری خوا بە مۆرەوە، بەمۆری لە روخساری جواندا دێتە بەرچاو. پێغەمبەری خوا فەرمویە: (چاکەتان لە روی جوان‌بوێ).

**٦ دلۆ وەر سەیری بالایان دگولزارا سەمەن سایان**
**(بِها تَهْتَزُّ باناتٌ لَنا مِنْ مَیْسِ قاماتِ)**

**مانای وشە:**

**سەمەن‌سا:** وەك گوڵە (یان، چڵە یاسەمەنە)؛ **بِها:** لەوێدا؛ **تَهتَزُّ:** رادەژێ؛ **لَنا:** بۆمان؛ **مَیْس:** لەرینەوەی

بەناز؛ **قامات:** قامەتگەل؛ **قامەت:** بەژن.

**٧ سەمایا جوملە دیم دورتیٚ بئیعجاز ئەهلی سوز پورتیٚ**
**(بِهٰا تَصطَفُ قاماتُ بِعیدانِ وَنایاتِ)**

**مانای وشە:**

**جوملە:** بەتۆپەڵو کۆمەڵ؛ **ئیعجاز:** موجزات شاندان؛ **تَصطَفُ:** ریزە دەبەستیٚ؛ **عیدان:** عودگەل؛ **عود:** ئامرازیٚکی موزیکە؛ **نایات:** نەیگەل.

**پوختەی مانا:**

ئـەیدلٚ! وەرە لەو کۆڕەدا کە بویتە باغچـەی نەمامی بەژنو باڵا لەگوێن قلەیاســەمەنان، تاوێك چاوێك بەو بەژنو باڵاشەنگانەی چەلەنگانەدا بگێڕە. چەندجـوان بەدەم هەڵپەرکێوە دەلەرنەوە؛ تۆ ئێژی نەمامی بانن، رادەهەژێن بەدەمباوە.

چۆن رەقصـێکە؟ سـەرلەبەر روخسـار مروارین، لەوێدا کۆنو، هەمۆیان لە دڵکێشـیدا گەیونە پلەی موجزات نیشاندان. بۆ ئەهلی دڵو دەروێشان، پڕن لە بەڵگەی ریٚشاندەر بۆئەوینیٚ. چـەند جوانو لەبار بەهەوای عودو تارو بلوێرەوە، ریزەبەریز دەستیان گرتوەو باڵایان پێکەوە داوەو کۆڕی داوەتیان جۆشداوە.

**٨ سەماییٚ راستو چەپ تینن شەمالێن خاصە هلتینن**
**(فَیٰا للهِ فی مَیلا تِها مِنْ عَطْفِ باناتِ)**

**مانای وشە:**

**راست:** جوٚرێکە لەرەقص؛ **چەپ:** نەوعێکی تریەتی. لە وڵاتی بۆتان بیستو پێنج جۆر هەڵپەرکیٚ هەیە، کە دوجۆریان ناویان راستو چـەپە؛ **شـەمالێن خـاصە:** مۆمی تایبەتی، مۆمی صـافی زەردی بەژنبڵندی ماڵە میران کە بخـوری تێکـەڵ دەکراو دەگەڵ روناکاییدانیش بۆنی خـۆشی بڵاو دەکرد؛ **هلتینن:** بڵنددەکەن، رایدەدێرن، هەڵیدەکەن؛ **فَیٰالله:** ئەینامەخوا؛ **مەیل:** لارەوەبون؛ **عَطف:** گەڕانەوەو خوارەوبون؛ **عَطف:** بەزەییو خۆشەویستی؛ **بانات:** بانگەل؛ **بان:** دارێکی بەلەنجەولارو شوٚخو شەنگە.

**پوختەی مانا:**

لە سەمادا، بەلای راستو چوٚپەدا دێن. جوٚری راسـتو چـەپ دەرەقصـن. هەمو وەك شـەمی تایبەتی هەڵکرابن، تیشك دەدەن. شەمی تایبەت لەوناوەدا، بەدەست خذمەتکارانەوە هەڵێنراون تا کۆڕی داوەت ببینریٚ. ئەی نامەخوا! لەو نەمامە شلكو بەنازو رێکانە. چۆن بەهەناسـەی دڵداران، دەلەرنەوەو خوار دەبنەوەو راست دەبنەوە! دەڵێی خەڵفی شلکی بانن بەدەم سـروەی بەیانەوە دێنو

دەچن. ئێمەی دڵدار، لەو دیدارو تماشایە، چیمان کەمە؟ هەر تەنیا مەیگێڕو بادە. دەسا زوکەن:

٩ ببێژن غەمزە ئەلماسێ بزەمزەم بینە شەهکاسێ
کوحەلکت مەعنیێین ئاسێ (فَیا هَیّا لَنا، هاتِ)

**ماناى وشە:**

**ئاسێ**: دژوار، عاسێ؛ **فَیا**: دەئەی فڵان؛ **هَیّا**: پەلەبکە؛ **لَنا**: بۆمان؛ **هاتِ**: بهێنە.

**پوختەی مانا:**

بڵێن بەو جوانە مەیگێڕە کە هەر چاوداگر تنێکی، وەك نوکی تیخی لەئەڵماس، جەرگ‌بڕە. بە زەمزەمەی گۆرانیەوە خورخوڕ بادە بکاتە ناو شاکاشیەوەو بمان‌داتێ. تا ئەوبادەی کە هەمو گیروگرفتی سەختو دژواریش هەڵدێنێ، لە نەزانیمان دەربێنێ. دەسا مەیگێڕەشۆخەکە! پەلەبکەو رامەمێنەو بۆمان بێنە.

١٠ دبینی نەغمەیا چەنگێ دەما ئاقیهتە ئاهەنگێ
بقانون وی دخونت مە (لِمیعادِ وَمیقاتِ)

**ماناى وشە:**

**قانون**: ڕێوشوێنی دیاری‌کراو؛ **قانون**: ئامرازێکی موزیك؛ **میعاد**: ژوانگە؛ **میقات**: وەختی دیاری‌کراو.

**پوختەی مانا:**

مەیگێڕ گیانە! دە بلەزەو بادەبێنە. وادەبینی ئاوازەی چەنگ، بە ئاهەنگە تایبەتیەکەی ـ کە تۆش وەکومن تێی دەگەی ـ بەرانبەر بە ڕێوشوێنی ناو دڵداران، بانگ‌مان دەکاتە جێ ژوانیو کاتی بەیەك گەیشتنمان بەگوێی دڵدا دەسرکێنێ.

١١ ژرەمزین غەمزە چالاکی بدل دی بێتە ئیدراکی
(مَعانٍ لَمْ یَسَغها اَللَّفظُ مِنْ ضَیِّقِ العِبارات)

**ماناى وشە:**

**چالاك**: چوست؛ **ئیدراك**: تێگەیشتن؛ **مَعانٍ**: مەعنایان؛ **لَمْ‌یَسَغها**: لەوزەی‌دا نەبوە؛ **لفظ**: وتەی دەم؛ **ضَیِّق**: تەنگی.

**پوختەی مانا:**

هەر بە چاوداگرتنێکی زۆر چاپوکانە لە دڵبەر ـ کە شـوفارو ناباباں هەسـتی پیٚ‌نەکەن ـ دڵ دەزۆر مانای وا دەگا، کە لەوزەی دەمو گوتن بەدەربووەو هەرگیز وتاری وا نەبوە کە بتوانێ ئـەو مانایانە دەربڕێ. زمان لەوە بەرتەنگ‌ترە کە ئەو مانا نهێنیانە ئاشکراکا.

ئەحمەد شەوقی دەڵێ:

زوانی زوان لەسەیری لێوی ئاڵی لاڵ‌و پاڵ داما
بەسرتەی دڵ وتووێژی دەکرد چاوم دەگەڵ چاوی

**١٢** ژنازك دلبەرا نازك دسەهمێ دی مەئیعجازك
(وَكَمْ مِنْ خَشْفِ غِزلانٍ أهابَتْ لَيْثَ غاباتِ)

**مانای وشە:**

**نازك:** نازێك؛ **سەهم:** بەش؛ **سـەهم:** تیر؛ **كَمْ:** چـەند؛ **خَشْـف:** كارمامز؛ **غِزلان:** ئـاسكان؛ **أهابت:** ترساندی؛ **لَيْث:** شێر؛ **غابات:** لێرەوارو جەنگەڵ.

**پوختەی مانا:**

لەکاتێکا کە ئەو یارە نازارەی من، نازی بەسەر دڵدارانی‌دا بەش دەکرد؛ لەو بەشەی کە بەمن بڕاو نازێکی وەك‌تیر هاتە من. ترسـێکی‌وا روی تێ‌کردم، کە بە موجـزاتم زانی. دەشـزانم زۆرجـار کارمامز، شێری جەنگەڵ دەترسێنن‌و زۆر رویداوە شێر لە کارمامز ترساوە.

ابنُ‌الفارض (٥٧٦-٦٣٢) دەڵێ:

وەك لەو دڵە هەژارەی من قەوماوە لەکێ قەوماوە؟
خۆی بە شیرەدڵ دەزانی‌و چاومامزێك راوی ناوە

«نالی» دەڵێ

ئەلا ئەی نازەنین ئاهو بەباهۆ     دڵی صەییادی خۆت هێنایە لەرزە

«هیمن» دەڵێ:

ئەمن دەمگوت لەدنیا تابمێنم     لەبەرکەس ئەستەمە سەر دانەوێنم
کەچی ئێستا لەداوی بسکی تۆدا     گرفتـارم گـوڵم، مو ناپسێنم

**١٣** نەتەنها پێشبەری یارین، ژئەمری کُن خەبەردارین
(وَمَنْ أهْواهُ سارٍ فیِ‌مَساری كُلِّ ذَرّاتی)

**مانای وشە:**

**پێشبەر:** روبەرو؛ **كُن:** ببە؛ **وَمَنْ:** ئەوکەسـەیش؛ **أهْواهُ:** دڵم لەسـەریەتی؛ **سـار:** لەگەڕانایە؛ **مسـاری:**

شوێنانی گەڕیان؛ کُلّ: گش؛ ذَرّاتی: وردیلەکانم.

**پوختەی مانا:**

ئەم ئـەوینە گیان برژێنەی ـ کەمن لەژیانا توشـیبوم ـ کاری ئـەمڕۆ ودوێنێ نیە. لەو ڕۆژەوە کە چاوم بەویارە کەوتو روبەروی بوم، پەیدا نەبوە. هەر لەوساوە خوا فەرمانی بە ئافەریدەکان داوە، «ببە»و ئەوانیش «بون». من گیرۆدەی ئەم ئەوینەم. ئاگادارم کەخوا ئەوینی ئەمجـوانەی چـۆن تێکەڵاوی گیانم کردو، هەمو توسـقاڵە وردیلەی لەش‌وگیانم، ئـەوینی ئـەوی تێکـەڵەو تازە لێك هەڵناوێردرێن.

**١٤** (هُوَالاَوّلْ، هُوَالآخِرْ، هُوَالظّاهِرْ، هُوَالْبَاطِنْ)
(هُوَالْمَعْبود وَالْمَشْهودُ فی‌کُلِّ الْهُوِیّاتِ)

**مانای وشە:**

**هُوَالْاَوّلْ:** ئەو یەکەمە؛ **هُوَالْآخِرْ:** ئـەو دواییینە؛ **هُوَالظّاهِر:** ئـەو دیارە؛ **هُوَالْباطِـن:** ئـەو ناوەرۆکی نادیارە؛ **هُوَالْمَعْبود:** هەر ئەوە دەپەرسترێ؛ **والْمَشْهود:** حازرو بەرچاویش؛ **فـی‌کُلّ:** لەگش؛ **هُوِیّات:** هُوِیَتْ گەل؛ **هُوِیە:** بەڵگەی راستینی بونی شتێك، پێناس.

**پوختەی مانا:**

ئـەوکەسـانەی لایان‌وایە هەوسـاری کارو ژیانمان لەناو لەپی خـۆمان‌دایەو گوناهی دەردی ئەوینمان، دەکەوێتە سەرشانی دڵ‌و چاوانمان؛ زۆر زۆر هەڵەن. ئەوانەیش کە لایان وایە دڵداری یەکێ وەکومن، بۆ کیژێکـی سـەلماناوەو دنیایی‌یە؛ لەوی پێشـوش هەڵەترن. نەخێر بابە، تێ‌نەگەیون. خوا کە هەرگیانەی بەکارێك سەرگەرم‌کرد. ئێمەی کردە ئەوینداری جەماڵی خـۆی. هەر لەرۆژی بناوانرا تا دوامین کات ـ کە ئـەو دوا مینەش هەرنایە ـ ئێمە ئـەوینداری جـوانی خوداین. جا لەکوێ‌دا، یان لەکێ‌دا خۆی نیشانداین، خۆی دەزانێ‌و ئێمە سـوتان‌و برژان‌و گریانی دڵدارانەمان لەسەرشانەو ئەرکێکـە دەبێ بەجـێ‌بێت. یاری سـەرەتایی خـوایە. رواڵەت‌و بەرپیوار خوایە. جێگەی پەرستنمان خوایە. ئەوی دێتە بەرچاو خوایەو ئێمە خۆمان نە خۆمانین، نە دەزانین چین. یاخۆ کێین. هەرخوا ناوونیشانمانەو هەر خۆی بەڵگەی پێناسمانە. ئەوین ئـەوینی خـودایەو مەلاو سەلماو هەمو دڵبەرو دڵداری ئەمجیهانە، بەدەوری جوانی خودادا وەك ئەو تۆزکاڵە تۆزانەن، کە لە دەوری تیرێژی رۆژێ خول دەخۆن...

**١٥** ژلا شَیْئی، ژمەعدومی، مەناسی سیرری قەییومی
(سُجُودی فی‌تُرابِ الْمَحْو مِنْ اَعْلَیْ اُلْمَقامَاتِ

**مانای وشه:**

**لاشیئی:** نەتشتی؛ **مەعدوم:** لەبەین‌براو؛ **قەییوم:** راگرو پارێزەر؛ **قەییوم:** ناوی خوایە؛ **سُجُودی:** سوژدەکانم؛ **تُراب:** خۆڵ؛ **مەحو:** نەمان؛ **آعْلی:** بەرزترین؛ **مقامات:** شوێنان، جێگەیان، پلەوپایەگەل.

**پوختەی مانا:**

رێڕەوی رێگەی خواناسین، تا وشەی منی لەلابیّ‌و بڵێ من دەبم بەدڵدار، من وادەکەم، من وادەچم، من ئیمانم بەخوا هەیە؛ هەرگیز بەهیچ ئاواتێکی دڵی ناگا. دەبێ من‌من‌و خۆخۆیی‌و ئێمەو نامۆیی‌و تۆتۆیی، هەر لەئارادا نەمێنێ. بڕوای وابێ کە یاری نازداری گیانان، هەرخۆی بەکاری رادەگاو دەیپارێزێ. نابێ لەبەرانبەر ئەودا، نقەی هەبێ. بڕو بیانوی بەهەشت چون‌و جەهەندەم نەچونی نەبێ. ئەوینداری بەراستی‌بێ‌و هیچی‌ترنا. هەرچی یار بەسەری دێنێ، دڵی شادکا. با سوتان‌و قورپێوان‌بێ. نابێ بڵێ ئاخ! من‌سوتام. وشەی من لە شەریعەتی دڵداریدا شەریك بۆیار پەیدابونەو بە دەردی کافران چونە.

سا لەسایەی یاری نازدار، رازی نهێنی نازناوی قەییومی خوام‌بۆ دەرکەوت. من‌منی‌و خوێەتیم نەما. ئەگەر خۆم بەشت دەزانی، لەناوم برد. لەسەر خاکی هەرنەمانم سوژدەی سوپاسم بۆیار برد. ئەو سوژدانەم گەیاندیانمە بەرزو بەرێزترین پایە لەناو کۆڕی ئەوینداران، لە بارەگای بەرزی یاردا.

**١٦** **بحەق رەندێ خەراباتم ژدێرێ ڤێ دەمێ هاتم**
**چهێڤی هون دکن ئیرۆ ژڤێ رەندێ خەراباتی**

**مانای وشه:**

**رەند:** گوێ‌نەدەرو گەللایی؛ **خەرابات:** مەیخانە؛ **هون:** ئێوە.

**پوختەی مانا:**

رەنگە هێندێك لەوکەسانەی کە بەعاقڵ ناسراون‌و لەراستیشدا هیچ لە دەردی دڵ نازانن؛ تەوس‌و توانجم تێبگرن، کەمن چۆن قسەی وا دەکەم، کە دەگەڵ ئاوەزی ئەوان یەکتر ناگرن؟ چەندم پێخۆشە تێم‌بگەن، کەمن لەدەستەی ئەوان نیم. راستی دەڵێم من سیپاڵی مەیخانەم‌و تازە لەدێرێوە هاتوم. گوێ نادەمە لۆمەو لەقەم. دەسا ئێوە لە گەللایی ناومەیخانە، چیتان دەوێ‌و چۆن بەهیوان باربگۆرێ؟!

**١٧** **دعیشقێ شێخی ثانیمە بدل بەحری مەعانیمە**
**(لذی‌حِجر وَذی قَلْبِ شِفاءٌ فی اِشاراتی)**

**مانای وشە:**

**ثانی**: دوهەم؛ **مەعانی**: مەعناگەل؛ **ل**: بۆ؛ **ذی**: خاوەن؛ **حِجر**: عەقڵو ئـاوەز؛ **قَلب**: دڵ؛ **شِـفاء**: چـارە؛ **اشارات**: دەسنیشانگەل؛ **شفاءِو اشارات**: ناوی دوکتێبی ابن‌سینایە.

**پوختەی مانا:**

**ئەگەر شێخی صەنعانی یەکەمین کەس‌بو کە لە ڕێگـەی دڵداریدا، دەسـتی لەدنیاو دین بەردا؛ من دوهەمم. داومەتە سەر ڕێوشوێنی ئەو. جا ئەگەر لە ڕواڵەتی‌دا مەستمو زوننار دەبەستمو یارم بتەو دەپەرستم؛ لە دەرونم ئـاگادار بن. دەریای تژی لە زانسـتم. بۆ ئـەوانەی دڵیان هەیەو ئـاوەزیان دڵدارانەیە؛ ئیشارەی من چارەی هەمو ژانو دەردو نەخـۆشیانەو هیچ کارێکیان بە بژیشکـی وەکو ئیبنوسینا نیە.**

**١٨ دئیقلیمی سوخەن میرم دشیعرێ دە جەهانگیرم**
**(وَیعلو مَوکِبَ الْعُشناقِ اَعْلامی وَرایاتی)**

**مانای وشە:**

**سوخەن**: وتار؛ **یَعْلو**: بەرز ئەبێت؛ **مَوکب**: دەستەی سـوارو پیادە پێکـەوە؛ **عُشنـاق**: دڵداران؛ **اعلام**: عَلَم گەل؛ **عَلَمْ**: ئاڵا؛ **رایَتْ**: بەیداغ.

**پوختەی مانا:**

**گوتم دڵم دەریایەکی پرزانستەو ئیشـارەتم دەرمانی دەردی عاقڵانە. واتا: هەم زانام هەم حـەکیم. هەر هێندەش‌نیم. لە مەڵبەندی دەمپاراوو قسـەرەوانان‌دا، میرم. لە شـیعر هۆنینەوەدا، دنیام خستۆتە ژێر دەسـتم. هەرگاش دەسـتەی دڵ‌بەسـتەی داوی دڵداری، سـوارو پیادەو بۆرە پیاگو نەجیمزادە، بەیەکەوە بەرەو دیداری یاربچن؛ من ڕەمکێش‌و هەر لەپێشـمو بەیداغو ئـاڵاکانی من، لە ئاڵای گشت بەرزترو بڵندتر خـۆ نیشـان دەدەن. واتا هەم زانام، هەم بژیشـك، هەم میرم، هەم جیهانگیرم. هەم سەرداری دڵدارانم.**

**١٩ چخوەش نورەك زەلالی تو دقەلبی من شەمالی تو**
**(وَقَلبی حَیْثُ فِیهِ الْحُبُّ مِصباحُ بِمِشکاتِ)**

**مانای وشە:**

**زەلال**: صافو ڕۆشن؛ **وَقَلبی**: دڵیشم؛ **حَیْثُ**: هەرگا، لەهەرکوێ؛ **فِیهِ**: تیا؛ **مِصباح**: چرا؛ **مِشکات**: تاقە، دەلاقەی بەتاق سەرگیراو.

**پوختەی مانا:**

یاری نازدار! ئەو هەمو پایەو پلانەی تۆ بەمنتدا، لە سایەی ئەو نەمانەبو کە لە دڵداری توشم‌بو. دڵم کەدنیاو هیچ‌کەسی تێدا نەما؛ تۆی هاتیە ناو. تۆ چەند نورێکی روناکی. تۆ مۆمێکی داگیرساوی لە تاریکایی دڵم‌داو دڵمت روناك کردۆتەوە. دڵم هەرگا دڵداری تێدا بایسێ. وەك چرایەك لەناو دەلاقە دابندرێ دەلاقەکەش هەر رۆشنە.

خوا فەرمویە: (وێنەی نوری خودایی من، وەك چرایە کە لە دەلاقە دانرابێ.)

**٢٠** **تەقاضا وە دکر حیکمەت کو چەرخو لەولەبی بابن**
**(هُوَالْفَعّالُ لاتَغْتَرْ بِاَسبابٍ وَآلاتِ)**

**مانای وشە:**

**تەقاضا:** حوکم، داوا، رەوادیتن؛ **حیکمەت:** لێزانی؛ **لەولەب:** لۆلەپ، هەرلوسێکی خرهەڵدراو کە لەناو شتێکی دیکەدا، چەرخ‌بخوا؛ **هُوَ:** ئەو؛ **فَعّال:** زۆرکارا؛ **لاتَغْتَرْ:** فریومەخۆ؛ **اَسْباب:** هۆگەل؛ **آلات:** ئامرازگەل.

**پوختەی مانا:**

کابرای خۆ بەعاقل‌زانی دنیاپەرست! کە لاتوایە خۆت دەتوانی هۆی ئاسودەییت پێك‌بێنی‌و هەل‌و دەرفەت بە ژیری‌خۆت بۆ بەهرەی خۆت برەخسێنی؛ زۆر پێچەوانەی تێ‌گەیوی. خودای گەورە. بۆیەی ئەم عاسمان‌و عەردە خستۆتە خول‌و هەر بە بایەك دەیچەرخێنێ، تا هی وەك‌تۆ تێ‌بگەیەنێ کە هەرچی جگە لەخوایە، وەکو خولخولەی بەربایەو بادی هەوایەو بەربادە. بە ئەسباب‌و ئامرازو هزرو بیری خۆت، بەس بنازە. فریو مەخۆ. تەنیا خودایە کارایەو هەرچی ئەو نەیکا، روناداو هەرکەس دەس دەکاری خوادا، لەقەلە بەختی خۆی دەداو چارەرەشە تاهەتایە.

**٢١** **ئەزەل عەینی ئەبەد یەك‌ئان ددەییومی دقەییومی**
**تەنەززول دێتە تەفصیلێ (بآناتٍ و اوقات)**

**مانای وشە:**

**ئان:** دەم، تاو؛ **دەییوم:** زۆر خۆراگر؛ **قەییوم:** راگرو پارێزەر؛ **تەنەززول:** دابەزین، هاتنەخوار؛ **تَفْصیل:** درێژەدان‌و رۆشن کردنەوە؛ **اَوْقات:** دەمان، کاتان.

**پوختەی مانا:**

کاورای خۆت زۆر بەزانا زان! رەنگە بێژی ئەی ئەم هەمو بارگۆڕانەی دەورو زەمانە بۆچی‌یە؟

ژیان‌و مەرگ‌و شادی‌و خـەم‌و زۆروکەم‌و روتی‌و بەرگ‌و دوری‌و سـەبوری بۆ هەیە؟ خـوا بۆچـی ئەم‌هەمو دژەی لەیەکتری کۆکردەوەو؟ ئەم نێوانەی ئـەزەلیەت‌و ئـەبەدیەتی بۆ بەوانە پڕکردەوە؟ دیسان دەڵێم بەهەڵە چوی. بۆ خوا وەخت‌و کات‌و زەمان‌و دەم نیە. نێوانێکیش لەنێوانی ئـەزەلی‌و ئەبەدییەتی ئەودا نیە. خـوا کە هەربوەو هەر دەبێ‌و خـۆی راگرو پارێزەری ئـەم ئـەزەلیەت‌و هەتا هەتایی خۆیەتی؛ نە گۆڕانی بەسەردا دێت، نە گۆڕاوە. بەڵام بۆ تێگەیاندنی ئێمە ئافەریدەکانیەتی، کە وای بە رەوا زانیوەو رەوای دیوە، لامان وابێ نێوانێك دەئـارادایەو گۆڕان بەسـەر دنیاو ژیانی زەوین‌دا دێ. خـوا هەرشـتەی لەکاتی خـۆی، بەرانبەر بە لێبرانی خـۆی لەدنیا، دادەبەزێنێ‌و لە کارایی بێ‌چونی خۆی، ئێمەی نەزان، وردەوردە حـاڵی دەکاو کردونیە محـەکی ئـەزمون بۆ بڕواو هزرو ژیریمان.

**٢٢** **تَعالی‌الله ژئیحسانی بدلداری بدل‌دانی**
**«مەلا» ئیرۆ تەکر پاشا لسەر چەهڤێن مەلێ هاتی**

**مانای شیعر:**

هەی نامە خوا لەو چاکەیەی دەگەڵمت‌کرد؛ کە هاتی‌و بە دیداری خۆت شادت کردم. لاوانتمەوەو زۆرت دڵداری دامەوە. ئەمڕۆ بە خەڵاتی شایان خەڵات کرام. یار بە خێربێی سەر هەردو چاوی من هاتی.

## قصیدەی نەوەدوچوارەم

# «خەیالی خاڵ»

١ ئەی نەسیمی سەحەری مادمەجالا صبەهی
صەد سەلامان بگەهینی ژمەویٚ پادشەهی

٢ عەرعەرا قامەت ئەلیف نەی شەکەرا شوخ‌و شەپال
نازکا سیم‌تەن‌و خوسرەوی زەرین کولەهی

٣ دبەریٚدا توبیوسی بدوصەد زاری‌و لوطف
ئاستان‌و دەرو دیوارو شەباکێن کەلەهی

٤ نامەیا جەورو جەفاوو ئەلەم‌و دەردو غەمان
دی‌بدەستی زەرییٚ موحتەشەمیٚ سەروی سەهی

٥ بەلکو دلبەر ژروی عادلی‌و مەرحەمەتیٚ
رەحمەکی‌کەت بفەقیران‌و بپرست گلەهی

٦ حەق دزانت وشەڤان شوبهەتی ئاڤین دزەوان
مە بدل زاری‌و کالینە حەتا صوبحگەهی

**مانای وشە:**

**کولەهیٚ:** کڵاویٚ؛ **لوطف:** نەرمی؛ **شەباك:** پەنجەرە؛ **کەلەه** : قەڵا، کۆشکی میرنشین؛ **ئەلەم:** ئێش‌و ژان؛ **گلە:** گلی، شکایەت‌و داد؛ **کالین:** زۆرەو دەنگی‌گریان.

**پوختەی مانا:**

شنەبا! دەستم دامانت، لەکاتی بەربەیانیێکدا وەرەو سڵاوی من بەرە بۆ ئەو سەرداری جوانانە ـ کە لە مەڵبەندی جوانی‌دا پادشایە ـ نیشانەشت با پیٚبڵێم. باڵای وەکو تازەنەمامی عەرعەرە. راستە

وەك پیتی ئەلفیکە، کە خەت خۆشی زۆر لە زەبر نوسیبێتی. هەر شیرنایی لیٚدەباریٚ. وەك قامیشە شەکری تەڕە، شۆخو شەنگو شلكو ناسـكو خـونچیلەو ڕەزاسـوكو لەبەردڵە. ئـەوەندە سپیو ناسکە، زیٚو شەرم لە لەشی دەکا. تانجێکی زێڕی نیشانەی پادشایەتی هۆزی جوانان لەسەر ناوە. شنەبا گیان! بەرلەوە بچیە خـزمەتی، خـۆت کزبکـەو تا دەتوانی کزە بایەکی نەرمبە. سـەر لە ئاسانەکەی بسو. دەرکو دیوارو پەنجەرەی کۆشکی شاهانە راموسە.

ئەوساکە ئەو نامەیەی من ـ کە پڕە لە باسو خـواسی دەردو کولٚو ئێشو ژانو سـزاو ئـازارو کۆڤانو کەسەرو عەزرەتو ئاوات ـ بدە دەست ئەو ڕەنگ سـەوزەڵەی پایە بەرزو شـەرمێونە ـ کە لەناو جوانانی دیدا وەك سەولێکی هەرە نایاب لەناو داراندا دەنوێنیٚ ـ ئەوە خـوایە بەشکـو دڵبەر بکەوێتە سـەر دادپرسـیو باری بەزەیی بجـوڵیٚو دڵی بەهەزار بسـوتیٚو بڕیار بدا کە بە دادی من رابگا.

خوا دەیزانیٚ بە درێژی هەمو شەوگاران، بارانی هسرم ڕەوانەو لەتینی خەم، خۆشم تەواو تاواو مەوەو هەر بومە ئاو. وەکو خوڕخوڕی ئـاوی چـەم، دەنگـی گریانم دەبیسـریٚو تارۆژ هەر ناڵەو زاڵەمە.

٧ ماژبەر دەربی فیراقاتە سکونەك مەهەیە؟
جەرگـودل هەردو بنالینە وەکی چەنگو ژیهیٚ

٨ بەردەیا خێلیو چاریٚ تو ژسەردیمی هلین
دا ژشەوقاتە بخەف بت شەفەقا میهرو مەهیٚ

٩ دین ئەگەر بێتە بەها، جان ددرم لیٚ ئەمما
مە هەزار جانی عەزیزی دهلیتن دبەهیٚ

١٠ قەط دبت وەك تە شەپالی نە دشامو نە دشەرق؟
کیٚ نیشاندا دجەهان میثلی تە خوندکارو شەهیٚ

١١ عالەمەك شەهدەئیا حوسنو جەمالا تە ددت
تو زولەیخای زەمانییو چحاجەت مەدەهی

١٢ حەق نیگەهداری تەبت پادشەها سەرو قەدان
بکەناری مە فەقیران بکە جارەك نیگەهیٚ

١٣ خوبیو دلبەریو نازو تەلەططوف بتەشێن
خوسرەوا پادشەهانییو خودانا جەبەهی

**مانای وشه:**

**سکون:** ئۆقره؛ **خێلی:** روبەند؛ **چاری:** چارۆکەی سەر؛ **دهلیتن:** تێ هەڵدێنێ، بارتەقای دەکا؛ **خوندکار:** خونکار، پادشای گەورە؛ **شەهدەیی:** شایەتی؛ **زولەیخا:** ناوی کوێخاژنێکی میصری بوە، کە یوسف پێغەمبەری بۆ کۆیلەیی خۆی کڕیوەو تەماحی تێکردوەو گەلێك فێڵی لێکردوە کە سواری بێ. یوسف خۆی تێ نەگەیاندوەو توشی داوێن‌تەڕی نەبوە. قورعان لە سورەی یوسفدا باسی‌دەکا. بەڵام ناوی لە زولەیخا نەهێناوە. ناوەکە زولەیخا نیە، زەلیخایەو عارەب بەودەردەی بردوەو مانای لوسی جێخلیسکی بچوك دەدا.

**مەددەم** : پەسن، تاریف؛ **نیگەهێ:** تماشایەك؛ **بتەشێن:** شیاوی‌تۆن؛ **خودان:** خاوەن؛ **جەبەهـ** : جبەخانەو قوڕخانە؛ **نیگەهدار:** ئاگادار.

**پوختەی مانا:**

مەفەرمو با ئارام بگرێو هەدابدا. بۆچی لەبەر زەبری دوریت ئۆقرەم ماوە؟ جەرگو دڵم لەبەر ناڵینێ رۆژو شەو، ئێژی چەنگو ئامرازی ژێدار ئەژەنن، بێدەنگ نابن. دە بەزەییەکت پێمابێت. روبەندو سەرپۆشت لادە، با ئەو روخسارەت دەرکەوێو بۆ تەماشات روناکیو تیشکی مانگو خۆر، وەکو من لە سوچێکەوە بێنە سەیرانی جوانی‌تۆ (یان، تا مانگو رۆژ، لە روناکی‌دان بکەونو هەموکەس هەر بڕوانێتە تۆ). ئەگەر دیتنی دیدارت بەکڕین‌با؛ من هەر گیانم هەیەو دەمدا. بەڵام دیارە بێبەهرەو ناهومێد دەمام. چونکە نرخی دیدارێکت هەزار گیانی زۆر بەرێزیش بارتەقانەی نایەتەوە.

خونچیلەو رەزاشیرینی وەك‌تۆ، لەدنیادا نیە. نە بەشەو ئەستێرەو مانگو نە بەرۆژ خۆری خۆرهەڵات، دەگەنە تۆ. وەك تۆ پادشاو خونکاری جوانو نازداران لەدنیادا، نەدیتراوەو ناش بیندرێ. نە هەر من، دنیا سەرانسەر شایەتی جوانیو نازداریو لەباری تۆن. تۆ زەلیخای ئەم زەمانەی. لەپێ هەڵگوتن زیاتریو ئاتاجیت بە تاریف نیە.

ئەی سەرداری بەژن‌شۆڕو پەلکە شۆڕان! خوای مەزن ئاگادارت بێو هێندەت بەزە بخاتە دڵ، سیلەی چاوێك بدەی بە ئێمەی هەژاری دڵداری خۆت. بەراستی پایەی سەروەری پاتشایانی موڵکی جوانی هەر لەخۆت دێ. جوانیو نازو دڵرفێنیو ناسك‌ئەندامیو شەفافی، کاڵایەکن پڕ بەباڵاتو تەنیا لەتۆ دەشێنەوە. بەزەو رحمو دلۆوانیش شیاوی خۆتەو هەر لەخۆت دەوەشێنەوە.

١٤ **حەجەر ئەسوەد بدرت دەست زیارەت بکرم**
**نەذری من‌بت بکرم خواس طەریقا مەکەهێ**

١٥ **ژ ئەزەل حەق «بمەلێ» دایە ژعیشقێ قەدەحەك**
**تا ئەبەد مەستو خەرابین ژمەیا وێ قەدەهێ**

**مانای ئەو دوبەیتە:**

خاڵی گۆنات ـ کە هەر وەکو حەجەرالاسوەد پیرۆزە ـ ئەگەر جارێ دەستی بدایە رای موسم (یان، ئەگەر بەدەست ئیشارەم بۆ بکردایەو دەستی خۆم ماچ بکردایە)؛ مەرجـەو نەزری سـەرشـانم بێ: بەپێ خواسیو بەسەر قۆتی رێگەی مەکەم بگـرتایەو لەمەکەدا لەســـەر حـــاجیان نازو شـــانازیم بەبەختم بکردایە.

خوا هەر رۆژەکەی بناوان، پیاڵەیەك بادەی ئەوینی دا بەمەلا. هەتا هەتایە بەبادەی ئەو پیاڵەیە مەستو سەرخۆشو بێهۆشین.

# قصیدەی نۆتوپێنجەم

## خەدەنگا ئاوران

١ ئیرۆ ژنو پورئاتەشم دیسا ژرەمزا دلبەرێ
مەجروحی قەوسی پەروەشم تیردانە نیڤا جەگەرێ

٢ تیردان ژقەوسێ ئەسوەدە شەهزادەیا شیرین قەدە
کوشتینە وەك من چەند صەدە وێ پادشاهو بەکلەرێ

٣ وێ بەکلەرێ پورێ کوشتنە ئەنگوشت بخونێ رشتنە
ما ئەهلی دل قەط هشتنە؟ صوهتینە میثلی مەجمەرێ

٤ لێ ئەز تنێ سەر تا قەدەم یەکسەر دصوژم دەم بدەم
وەصفێن دعیشقێ ئەز چدەم؟ نایێن حیسابو دەفتەرێ

٥ وەصفێن ئەڤینو عیشقەهێ حوسنو جەمالا وێ شەهێ
نایێنە شەرحو مەدەهێ ئەحسەن ژنەقشی بەشەرێ

٦ ئەحسەن ژحوسنا دیم دورێ شیرینیو گفتو سورێ
صەد زاهید ئێخستن ژرێ وێنازکو لەب شەککەرێ

٧ شەککەر دنیڤ لێڤانەوی ریحان لدۆر سێڤانەوی
مەشعەل دنیڤ شیڤانەوی تەیسێ ژرەنگی فەنەرێ

٨ فەنەر نیە نورا حەقە حوسنو جەمالا موطلەقە
بەرقە سپێدەو شەفەقە زوهرەو شەمسا خاوەرێ

٩ زوهرەو ماهو موشتەری من دین لدیمێ ئەنوەری
زولفا موسەلسەل عەنبەری سەردایە حەوضا کەوثەرێ

١٠ حەوضا ژکەوثەر چەشمەتێ یاجیە درەوضا قودرەتێ
هەردەم ژنو وی سەردەتێ خەمری‌و تایێن عەرعەرێ

**مانای وشە:**

**پەروەش:** پەڕە پرژێن؛ **بێك‌لەر:** گەلەبەگ؛ **بیکلەر، بێگلەر:** نازناوی میری‌میران بو کە بەســەر گەلەبەگێك رادەگەیشت؛ **رشتن:** رەنگاندن؛ **ئێخستن ژرێ:** لەرێ لای‌دان؛ **فـەنەر:** چـرای ناو شـوشە؛ **ئەنوەر:** هەرە روناك.

**پوختەی مانا:**

ئەمرۆش لەسۆنگەی ئیشـارەی چـاوی دڵرفێن، سـەرلەنوێ پڕبوم لەئـاگر. بەکەوانی برۆکانی، تیری‌مژۆڵ ـ کە وەکو تیری پەڕدارن ـ دام‌بارینی‌و دەناو جـەرگم هەڵچـەقین‌و جـەرگ‌و گیانم بریندارن. ئەوشازادە چەلەنگ‌و رەزاشیرینە، هەر بەو کەوانە رەشانەی برۆکانی، چەندین جار صەد لە پاشاو میری میرانی، بەدەردی ئێمە بردوەو لەگیان‌و ژیانی تەکاندون. دەستی بەخوێنی دڵدارانی پایەبەرز رەنگاندوە. هەر میرو پاشای کوشـتوە؟ نەخێر.. ئـەی‌بۆچـی قـرانی دەکۆمەڵی دڵدارانی نەخستوە؟؟ گش لەگشمان وا سوتاوین، هەر خۆمان بوینە ئـاگردان. بەڵام من لەچـاو هەموانیان زۆرتر سـوتاوم‌و برژاوم. بەبێ‌وچــان هەمو دەمان گڕم بەرزەو ســەرتاپام لەســوتان‌دایە. نازانم دەربارەی ئەوین چی‌بێژم؟ لە دەفتەرا جێگەی نابێ‌و بوشـم نایەتە حیســابێ. پەســن‌و تاریفــی ئەوجوانە ـ کە پادشای گش جـوانانە ـ و باســی ئـەوین‌و دڵداریم، بەزمان رۆشــن نابێتەوە. هەر ئەوەندەم لەتوانایە، بڵێم خوایە چەند صنعاتکارێکی چاکی. چـۆن نەخشـێکت لەو بنیادەمە کردوە. شیرینکاری هەر بۆ تۆیە. شیرنایەتی‌و گفت‌و لفتی دڵرفێنن، دڵکێشـی‌و سـیمای وەك دوڕت، داوە بەیار، کە بەبزەی لێوی شەکری‌و تەنك‌و ناسك، صەد سۆفی سەرگەردان کردو لەرێ دەربرد.

شەکر لەلێوی دەبارێ. کوڵمی سوری دەناو بسکاندا دیار ئەدا. وەك ریحـانەی دەوری سـێوی لاسور دەچێ. روخساری لەناو بسکاندا تیشـك دەدا، وەك چـرای دەناو شـوشەدا. شـوشەو چرای‌چی؟ زۆر هەڵەی. نوری خوایە. جوانی بێ‌گەردی خـۆیەتی، بروسکـەی داوەتە سـەرروی. بەرەبەیانی لاجانگ‌و سوراییی ئـاسۆی عاسـمانی، لە کوڵمانیەوە دیاری داو، گرشــەی چـاوی‌و تیشك‌هاوێژی روخساری ـ کە لە زوهرەو خۆر رونترن ـ هاتونەرو. مانگـی هەنیە، زەردی گەردن، تیشکی سپیەتی بەرچەنەی. لەو روخســارە هەرەرون‌و تیشـك‌دارە، وەکو زوهرەو مانگـی چـاردەو مشـتەری دەتروسکێنەوە. کەزی زنجیرەکراوی عەنبەراوی، سـەریان داوە لە قــوڵکەی گەردنی زەردی، کە لەجێی حەوضـی کەوثەرە. بەڵێ ســەرچـاوەی کەوثەرێ لەوێوەیە. جێگـەی کەزیان، لەناو باغچەی دەسکاری خـودای تواناداو هەر لەپەسـتا بسکـۆڵەی بەلادا کراوی لەســەر نەمامی عەرعەری بەژن‌و باڵای سەر دەبزێوی‌و دەروانێتە ئەو روخسارە.

١١ خەمری درەش بسکا حەریر  وەربون لدۆربەدرا مونیر
بورجا کوحاکم لێ دومیر  من دین لتەختی کیشورێ

١٢ تەختی دمیرو بەکلەران  مەیدانی جوقا گۆی گەران
ئەصلان‌و جوتی مەی‌خوران  مەی‌دان شەرابا ساغرێ

١٣ ساغر بدەست، سەرخۆش‌و مەست  وەقتی سەحەرگەهدەست بدەست
غەفلەت دوبەکلەر مەی پەرەست  کوشتم بدەربا خەنجەرێ

١٤ کوشتم بدەربا کەیبەران  گەزمەو خەدەنگا ئاوڕان
رەمزو ئیشارات‌و سوڕان  دان دل ژنیڤا پەنجەرێ

١٥ دان دل ژبەر حوسنا بنور  بەرقا تەجەللایا صودور
لەو صوهتیەم وەك کوهی طور  حوببو ئەڤینا وێ زەرێ

١٦ حوبیا تەما خوەش هشتمە؟  هەررۆ ژنو ئەز کوشتمە
یەکسەر ژخونێ رشتمە  تیرو خەدەنگێن مەجەرێ

١٧ گەزمێن دشیرین نازکی  دەربین دوی رمبازکی
چوبینە نیڤ دل گازکی  من‌داد ژظولما دلبەرێ

١٨ دلبەر چبێ‌حەد ظالمە  جارەك نەکر پرسێ لمە
لازم بحالێ عالمە  لێ‌یورژ ددیرت غەدەرێ

١٩ لازم بقەتلا من دڤی  هێژ ئەڤ ددل ماری شەڤی
پەیکان دجەرگێدا چەڤی  بەندکر بشەوکا عەنبەرێ

٢٠ بەندکر کولاب‌و پەنجەیان  دل‌ما دنیڤ ئەشکەنجەیان
من ئاه ژدەست وان غەنجەیان  کوك‌و کوبارین دین‌بەرێ

**مانای وشە:**

**وەربون:** کۆبونەوە؛ **کیشوەر:** مەملەکەت؛ **جوق:** دەستە، تاقم؛ **گۆی‌گەر:** گۆباز؛ **کەیبەر:** تیخ‌و تیری دەم‌پان؛ **گاز:** گەزی‌پێوان؛ **غەدەر:** پەیمان‌شکێنی؛ **شەوك:** دڕك؛ **شەوك:** قولاپەی سەرلەزەنبەری ژنان؛ **ئەشکنجە:** شکەنج، چین؛ **کوبار:** زۆر بەرێزو بەدەمار؛ **کوك:** سازو تەیار؛ **صُدور:** سینەگەل، لایانی سەرو؛ **چوبینە:** چوبونە.

**پوختەی مانا:**

بسکۆڵەی رەش، کەزی وەکی ئاوریشمی خاو، دەورەیان‌دا لە مانگی چاردەی بەترێفەی ناو چەوانی. کەزی لەم‌لاو لەولای توێڵی، وەك دوحاکم لە مەملەکەتی مانگی‌دا حوکم بکەن، وام

دەدیتن. یان ئەو هەنیە پاكو ساوەو دانەی خاڵی رەش لەو ناوە، وەك مەیدانێك لەعاسمانی ساودا دەچـو، گۆیەکی رەشـی لێ دیاربیۆ میرو بەگلەری کەزیانی، دەگەڵ بسکـو پەرچـوکانی، بوبنە دودەستەی گۆیەنیۆ بەکاشۆ بەرەو ئەوخاڵە هێرش بەرنو کایەبکەن.

چـاوەکانی ـ کەوەك دوشـێری مەسـت وانە ـ بەپێوانە بادەیان لەکۆڕ دەگێڕا، لە بەیاندا کە بایبسکـان کەزیەکانی دەلەراندنو دەگەینە لای پیاڵەی پربادەی چـاوانیو سـەرخـۆش ببون. لەهەردولا بەجوتە، یەکتریان گرتو دەسـت لەدەسـتا ئـەو دومەسـتە هەڵیان کردە منی هەژار. بەرخەنجەری تاڵی سەری زولفـانیان دام. تیرو پەیکـانی ئـاوڕان، کە هەروا ئـاورینگیان دێنان، چاوداگرتنو ئیشارەو نازی دڵکێش، کە لە پەنجـەران دەدیتران گشـتی وەکو تیری دەمپان، دەناو دڵو جەرگم چەقین.

لەو جوانیەوە کەتیشکی جـوانی خـودایەو دەرون رۆشـن دەکاتەوە بروسکـەیەکم بەدی کرد. ئەوینی ئەو سەوزە رەنگەی دایەسینەم. بۆیە وەك طوری سینایە ـ کە کەوتە بەر تەجـەللایە ـ بەو تەجـەللایە گری گرت. یاری نازدار! لێم مەپرسـە ماوی یاننا؟ خـۆت دەزانی، خـۆتی هەمودەم کوشتوتم. بۆ هێشتوتم قـەت زیندوبم؟ بڕوانە تیرەکانی خـۆت ـ کە لەتیری کاری خـەڵکـی مەجارستان بڕاترن ـ هەمو بەخـوێنم شـەڵاڵنو بەرەنگـی ئـاڵ رەنگ کراون. تیری نازی ناسكئەندامی خوێن شیرین، زەبری رمبی بژۆڵی ئەورم هاوێژە: هەریەك گەزێك بە دڵمدا چوبونە ژور. هەی داد لەدەس ئەو ناهەقیەی یار لێم دەکا. بەراسـتی دەردم دەداتێ. دەزانێ حـاڵم چلۆنەو جارێك بەدەردم راناگاو لێم ناپرسێ. بەراستی پەیمان شکێنە، فەرموبوی برینیتیرم بە پرسـیاران دەرمان دەکەم. کەچـی نایکا: دیارە گەرەکیە بمکوژیۆ تازە نەیەمە بەرچـاوی. بۆیە هێشـتـا سەرەتیری ماری رەشـی بەرەنگ شـەوەی، لە هەناوما چـەماونەوەو بە ئـاڵقەی داوی عەنبەرین بەستونیە وە؛ کە نەلەقێنو دەرنەچن. قـولاپەی سـەری بسکـانی، پەنجـەیان لەدڵ داگیرەو دڵ گیرۆدەی چینچینی یەك لەسەریەکی پرچـانیەتی. هاوار لەدەسـت ئـەو نازانە، هاوار لەو چـاوە بازانە، کە هێندە سازو تەیارو بەحورمەتنو کاریشیان ئیمان بردنە.

٢١ رەمزو سورێن شیرین لەبان تیرۆژو بەرقێن کەوکەبان
رێزا موسەلسەل عەقرەبان گەردان لە دۆرا قەمەرێ

٢٢ مندین لدۆر بەدرا تەمام حەرفێن دمەکتوب دالو لام
وی پێشرەوی باطن رەقام یەغما کرم سیمین بەرێ

٢٣ سیمین بەرانەی شەکەری ئەو حوریا نیسبەت پەری
بەژنا شیرین دیمی زەری بو ژگولابو ماوەرێ

٢٤ بو ماوەرو شیرین لەبێ وی خوبو نورین غەبغەبێ
بەدرا دبورجا عەقرەبێ کەنگی ژبەر پەردێ دەرێ

٢٥ بەدرا ژقودرەت لێ دونون ئەو قاتلا ئەسوەد عیون
پوڕ راکرن وی قەتلو خون عالەم پەریهت یەغما کرێ

٢٦ هەردەم بظولمێ وە دسوژی قەلبێ ژحوببا تەی تژی
لازم دبێم منڕدێ کوژی کەس نینە چیتن مەهدەرێ

٢٧ کەس نینەرەت مەهدەر بکت بەس گرتیان ئەبتەر بکت
خەملێ ژزێری زەر بکت شەفقەت ژیەکتا بدرێ

٢٨ شەفقێ بدیداری خوەکت قەستا بریندار خوەکت
شەهیدی رەشماری خوەکت ئیسەر لفەتلا پیشتەرێ

٢٩ فەتلی سیاه ماری شەڤین ریحان بدور سەروان چەڤین
ئاخر بسەلوێدا رەوین خەفبون دتایێ چەنبەرێ

٣٠ خەفبون دنیڤ تورا قزل ئیلان میثالی سەر لەمل
کوشتین وژەهر ئاویتە دل هێژ کوشتیێن رەمزا بەرێ

٣١ کوشتینە ئەم شیرین لەبێ تەحلی کەشین روزو شەبێ
گەر ئەز ببینم ئەوبخوەبێ ناکم ژدل هێژ باوەرێ

٣٢ ئەو نازکا نیسبەت گولێ جامەك ژکەوثەردا «مەلێ»
مەستم ژبەر قالو بەلێ حەتتابروژا مەحشەرێ

**مانای وشە:**

**گەردان:** خولدەر؛ **گەڕدان:** گەڕیان؛ **نیسبەت:** بەرەگەز؛ **عیون:** چاوان؛ **مەهدەر:** تکا؛ **ئەبتەر:** دوابراو؛ **پیشتەر:** لەپێشەوەتر؛ **قزل:** سور؛ **ئیلان:** مار؛ **مل:** شان؛ **تەحلی:** تاڵی؛ **کەشین:** خۆرەوەین.

**پوختەی مانا:**

غەمزەو نازی زۆر دڵکێشە. لێو شیرینە، تیشكو بروسكەی ئەستێرەی سەر روخساری، کە بریەتین لەخشڵی سەرتوێڵو گوارەی، ریزی بەزنجیرەهاتوی بسکی، وەك دوپشکی رەشی لەعەنبەری خاوکراوی، کە لە دەوری روخساری، وەك مانگی چاردەی دەگەڕان‌و دەوریان دابو؛ بسکی وەك دال «د»و لابسکی وەك لامم «ل» دین کە واتا دڵ لێرە بەندن. ئیتر لەپێشدڵدارانداو منبوم لە تەهی دەرونم رفێندراو سینگی لەزێو چەرموگ‌ترو نەرمو بەشۆق، دڵو دینی تاڵان کردم. سینەو بەرۆکی وەك زێوە، باڵای وەکو چڵەقامیشێکی لوسە شەکری پێوە. حۆریەو بەرەگەز پەرییە. بەژن شۆخو رەنگ زەرییە. بۆنی گوڵاو بڵاو دەکا. لێوی شەکرەو بۆیگوڵ دەدا. تیشکی بەرچەنەو لاجانگی، لەدڵ دەدا. هەنیەی لەژێر پرچۆکانی وەك مانگی چاردە لەبورجی

عەقرەبی عاسمانی ساودا، پەناگیرە. خوایە کەی ئەو مانگە جوانە، لەپشتی پەردە دێتەدەر. لەسەر مانگی چاردەی هەنیەی دونونی سەرەو بەرەژێر لە خەتی خودا دەبینم. کەلێم بونەتە کەوانو بەهانە دانی چاوانی کە لە کافران رەشترنولە کوشتنی ئێمەدا بیٚبەزەترن؛ دەستیان بەکوشتو کوشتار کرد. دنیا پربو لە ئاژاوە. هەمو ناوچەو مەلبەندی دڵانیان سوتاند. هەرچی وەبەرگیریان کەوت، تالانیان کرد. ئاخر یارە دڵرەقەکەم! خۆت دەزانی دڵم پڕە لە ئەوینت. چۆن رەوایە هەمیشە ئاوا بەناهەق ئەنوای ئەوین بسوتێنی؟ من دەڵێم بڕیارت داوە، نەمهێڵی لەسەر دنیایەو خۆشت لەچاری مننایە. کەسی واشم پیٚشکنایە، رۆژێك بینێرمە تکایەو تکات لەخزمەتدا بکاو چیدی دیلی ئەوینت دوابراو نەکەی. بۆ چاری دڵی دیلانیش، هێندە بەسە خۆت بە زەنبەری زێڕی زەرد، وەرازێنی، بیستنی خرمەی خشڵانو دیتنیان لەو بەژنە جو ەت، دەرمانی دەردی دڵانە. منی تەنیاو بیٚکەسو بیٚدەرو دیلیش، کە دەردم یەکجار گرانەو لە دیلیتر هیلاکترم؛ بە دیداری روخساری خۆت، چا دەبمەوە، دەسا وەرە منی مەلای ئەویندارو کۆیلەو دیلو بریندارت، بەدیدارت دڵخۆشبکە. من نامەویٚ ساغبمەوە. من ئاواتمە تۆ خۆت بێیتە سەرسەرینمو بەهۆی سەری بە قولاپەی کەزیەکانت ـ کە وەك سەری رەشماری بەژەهر دەچن ـ تەواوم کەی، ببمە شەهیدی ئەوینت.

ئەو کەزیانە کەمن دەڵێم ماری رەشی سەربەئالقەن. بۆنیان هێند خۆشە دەشتوانم بێژم چاکترین رەشەریحانەی بۆن خۆشنلە دەوری باڵای وەك سەوڵا لار بونەوە. لەولاشەوە وەکو ماری پاپۆکەدەر لە سەرشان پاپۆکەیانەو، بەپرچ بەندی سورو ئالٚ شێراونەوە. رەشماری ئەو جوتە کەزیە، درێشوکەیان هاتەدلٚ. ژەهریان پژاند، لایان وایە من ماران گەستەی ئەوانم. بەڵام نەخێر منهەر زۆر لەمێژینەوە هەر ئەو ساتەی کەوتومە ناو گێژی ئەوین، دەستم لەگیانم بەربوە. ئێستاش لەپاش گیاندەرچونیش، شەوو رۆژ لەتاو ئەو لێوە شیرینانە تاڵیکێشو بەئازارمو ئاخ هەڵکێشم. نازانم تکاکارەکەم بەکام باردا چارەم دەکا؟ ئەویارەی کەمن دەیناسم، ئەگەر ئێستا هەر بە چاوی خۆمبیبینم، لەبان سەرینم وێستاوە، لە خۆشیانا باوەر ناکەم. هەرجارێکیش چاوم بەچاوی بکەویٚ؛ حەو روحمبیٚ، تازە نازیم. گەشکە دەگرمو بۆی دەمرم. ئەوناسکۆڵەی رەگەز گوڵە، بەرلەوە خوا گیانی ئێمە دروس بکا؛ پیاڵەیێکی لەئاوی کەوثەریٚ دامیٚ. منی مەلای دڵدارو هەژارو بیٚکەسو زەبون، هەتا رۆژی عەشریٚ مەستم. ئەغیار بونەوەم بۆ نیە.

# قصیدەی نۆتو شەشەم

## «سولطانی بۆتان»

١ لاتی حوسنیو شەهی خوبانی
بخوە هەم خانیو هەم خاقانی

٢ یوسفی ثانی تو ئیرۆ خانم
کو بحوسنا خوە نەدیری ثانی

٣ بسورۆ هەیبەتو سەهمی خوە پوری (پەری)
بتەشینت لبوتان سولطانی

٤ بطەبل خانەیی شاهی وەرە تەخت
کو تو ئیرۆ شەهی کوردستانی

٥ کاکولێ بەردە بسەر خالو خەتان
کو موسەلسەل بنومێت رەیحانی

٦ ئیسمی ئەعظەم تەدڤێ چلئیسمێ (چلئیسمێ)
ژدوحەرفان بموعەمما زانی

**مانای وشە:**

لات: بت؛ نەدیری: نیتە؛ بتەشیتن: بەتۆ دەشێت، بۆتۆ رەوایە؛ طەبلخانە: نەقارەخانە، دەستەی موزیکی شایانە.

**پوختەی مانا:**

تۆ نمونەی خودای جوانیو، جوانان دەبێ بتپەرستن. خونکاری گش نازدارانی. چاوجوانان ناوی

خان بێنن، بەتۆ دەڵێن. ئەگەر باسی قەراڵو قـاقانانیان کرد؛ تۆ مەبەسـتی. خـانمە ناسـكو نازدارەکە! تۆ ئـەمڕۆ یەکەمین جـوانی لەدنیادا. ئـەگەر لە مێژووش بنۆڕین، تۆ لەپاش یوسـف دوهەمیو بۆخـۆت هیچ دوهەمت نیە. بەدڵکێشـیو هەیبەتو سـامێك کە هەتەو ـ لەو بابەتەدا زۆرزۆری ـ سولطانی هەمو نازداران شیاوی خۆتەو بۆت هەیە پەڕی سوڵتانی لەسەرت دەی.
دەسا با نەقارەخانە، تەپڵی شادیو خـۆشی لێداو تۆ لەسـەر تەختی سـەروەری هەمو جـوانان جێگیرببە. ئـاشکرایە کە کیژە کورد، لە جـوانیدا لە هەمو دنیا بێ وێنەن. تۆش لەچـاو گش کچەکوردێك، وەك پادشای لەچاو گەدایان. واتا: ئـەمڕۆ تۆ خـونکاری کوردسـتانی. کاکۆڵەکەت بابێتە سەر خاڵو میلت. تا ڕەشەریحانەی بۆنخۆش، بەزنجیرە خـۆ بنوێنێ؛ ببنە نمونەی دوشـێوە خەتی ریحانیو موسەلسەل، بەرێكوپێکیو بەجوانی.
تۆ بۆ دنیا هێنانە بەر فـەرمانی خـۆت، بۆ ئیسـمی ئـەعظەم مەگەڕێو گوێ مەدەرەێ کەدەڵێن دەبێ چلناوان لەناوی خودا لەبەرکەی. شایەت لەناو ئـەو چلەدا، توشـی ئیسـمی ئـەعظەم ببیو بەجامی چلکلیل ئاوێ بخـۆیتەوەو بەخـۆیداکەی. تۆ لە دوپیتی روخسـارت، ئـەو مەتەڵۆکە هەڵدێنی. صادی چاوت ـ کە صاد خۆی ناوی قورعانە ـ ئەلفی بەژنت ـ کە بەڵگـەی زۆر لەناوانی خوایگەورەیەو دوجاران لەناوی گەورە (اسمی ئەعظەم)دا هاتوە ـ بەڵگـەت بەسـە، کە تۆ تونیو نوری خودا، لەتۆی داوەو ئەو هەمو جوانیەی پێت داوەو دەتوانی لەسـەر دنیایە شانازی لە زەمین بکەی کە بەو جوانیە خودا دادەت، هەنگاوی لەسەر هەڵدێنی.

٧ **چبەراتبو وەبسەردا کاکول**
**چینبچین میسك بطوغرارانی**

٨ **تە چحاجەت بسولەیمانییێ حوسن**
**خاتەمەك (خاتَمَكْ) لەعلە بگەوهەر ئانی**

٩ **چخەط ئەشکستە موسەلسەل یارەب**
**کو تەپێ نەسخ کری دیوانی**

**مانای وشە:**

**خاتَمَكْ:** ئەنگوستیلەی تۆ؛ **خاتەمەك:** ئەنگوستیلەیەك؛ **خەتی شکستەو موسەلسەلو نەسخو دیوانی:** چوار شێوە خەتی هونەریو جوانن؛ **نەسخ:** سرینەوە، لەناوبردن؛ **نەسـخ:** نوسینەوە؛ **شکسـتە:** شکـاو؛ **موسەلسەل:** بەزنجیرە؛ **دیوان:** بارەگای مەزنایەتی؛ **دیوان:** کتێبی شیعر.

**پوختەی مانا:**

ئەو کاکۆڵە چین لەسەر چینەی تۆ هەتە، مۆری پادشـای شـاهانە بۆت بەخـەڵاتەوە نراوە. خـەتی

بەرات‌و مۆرەکە، نە رەنگە نە مەرکەفە. میسکی چینە، چین لەسەرچین داندراوەو لە سەر سەری تۆ نراوەو لەبەر چاوان رانراوە. تۆ هیچ کارت بە ئەنگوستیلەی سولەیمان ـ کە بەهۆی ئەو، حوکمی لەسەر دنیا دەکرد ـ نابیٚ‌و نیە. تا بەجوانی، لەسەر جوانان داوای سولەیمانی بکەی؛ ئەنگوستیلەی سەرداری‌و فەرمانرەواییت لەسەر عالەم، لێوی ئالی رەنگ لاڵتەو لە بنیادو ریزە گەوهەر، ریز کراوە. هەرچی بەلێو بیدرکێنی، هەمو خاوەن ژیان‌و گیانێك، بەگیان‌و دڵ پێکی دێنێ‌و دێویش ناتوانێ بیرفێنێ‌و ئەو کەتنەی بە سلێمان‌کرا، بەتۆش بکرێ.

ئەی خودایە! چنەخشکێت لەروی یاری من شان‌داوە؟ بسك‌و پەرچوکەو کاکۆڵ‌و کەزیەکانیت، بەهەمو شێوە خەتێکی دەستی قودرەتت کێشاوە. هێندێك شکاون بۆجوانی، هێندێك هۆنراو بەزنجیرە، هێندێك رێك‌و پێك، وەك نەسخ. هێندیٚ‌وەك خەتی دیوانی، لەبەر چاو ئاڵۆزو تێکەڵ. لە راستیشدا مولەموتیٚ نەپەڕیوە. هەمو نەخشی هونەراوی خەڵکی زەویت پیٚ سڕیەوەو لەدیوانی شاعیراندا، وات‌کرد هەر ئەو بنوسنەوە. یان، لەبەری بنوسنەوە.

١٠ گەرچی پورخال‌و نیشانی ئەمما
بنیشانی کو تو بیٚ نیشانی

١١ ئەی پەری حور سرشتیٚ هەرچەند
بیەشەر ئادەمی‌و ئینسانی

١٢ سوزی (سیرری) سوبحان تە ژحوسنی دنومێت
(أحسنَ‌ألله) ژسورا (سیرا) سوبحانی

١٣ چحەدی عەقلە قیاسی تەکرت؟
ئەڤە بورهان کوتو بیٚ بورهانی

**مانای وشە:**

**سوز:** دڵکێشی؛ **سیرر:** حیکمەت؛ **سوبحان:** پاك؛ **سوبحان:** ناوی خودا؛ **احسن‌الله:** بنازم بەکاری خوا، خوا چەند جوانی‌کرد؛ **حەد:** کەوشەن، سنور؛ **بورهان:** بەڵگەی زۆر رون.

**پوختەی مانا:**

ئەگەرچی چاو لە رواڵەتدا، خاڵ‌و خەتی تۆ دەبینێ‌و لای‌وایە بونە نیشانەت، لە خەڵکی دیت جیاکاتەوە؛ بەڵام چاو بە هەڵە چوە. نیشانەی تۆ لە بیٚ‌نیشانی تۆدایەو رەنگت نیەو دەهەمو رەنگانیش‌دا هەی. هەرکەسیٚ دەڵیٚ من دیومە، دیارە نەی دیوی‌و نات‌ناسیٚ. هەرکەسیٚ کە تۆ ناسیٚ، هەر هێندەی لیٚ حاڵی دەبیٚ. کە تۆ هیچ نیشانت نیەو نازانیٚ تۆ وەك‌چی دەچی.

بەریەکەی ئامیان حۆریەکەهەرچەند لەرواڵەتا مرۆی، پێستی مرۆت دەبەردایە؛ بەڵام ئەو

دڵکێشیە پاکەی دەتۆدایە، نوێنەری رازی نهێنی سوری هونەری خـودایە. ئـەی نامەخـوا لەو حیکمەتەی خوا نواندویە! صەد ماشاالله لەو دەسکارە جوانەی خودا.
لەرادەی عەقل بەدەرە، بەراوەردت دەگەڵ ئافەریدەکان بکرێ.! بەڵگە لەسەر جـوانی بێ وێنەت لەدنیا، بێ بەڵگەییو سەرگەردانی دڵدارانتە.

١٤ مە تەمەننا ژنەسیم خاکی رەهە
پیٚبکین دیدەیی دل نورانی

١٥ نەفەسەك بیٚتەمە نابی بِالله
نەتنیٚ روحی تو روحو جانی

١٦ صەد هەزاران ژتە پەیکان ددلن
لیٚ لسەرویٚ مەتنیٚ دەرمانی

١٧ تە برینێن مەکە واندن دیسا
ژنو ئاگرتە لداغان دانی

١٨ تە «مەلا» پور دجگەر گەزمە نەلوٚ (لەو)
وە پەریشانیو پرئێشانی

**مانای وشە:**

**روح:** گیانی ماك، کە خوا فەرموی: هەر خوٚم دەیزانم چلوٚنە؛ **جان:** گیانێکـە دەزگای لەشـی زیندوەری، لە ماوەی دیاری کراوی ژیانی ئەم سەرزەمینەدا پیٚ سپێراوەو دەبەر فەرمانی گیانەکەی سەرەکیدا. کە فارس بە رەوانو جان ناویان ناون؛ **کەواندن:** داغکردن؛ **لوٚ:** بوٚچی؛ **لوٚ:** کابرا، لاووٚ؛ **لەو:** بوٚیە.

**پوختەی مانا:**

دەسـتەو داوێنی شـنەباین. توٚزێك لەتوٚزی رێبازت بوٚمە بێنیٚ. تا دەچـاوی دڵمانی کەین، دڵمان روٚشن ببێتەوە. سوێند بەخودا، هەناسێکیش بیٚتوٚ ناژیم. توٚ هەر روحی بەتەنیامنی. توٚ روحیشـمو رەوانیشـمی. زوٚرم سـەرەتیری دوریت لەدڵدایە. دەرمانی برینی دڵم، لەدەسـت دیداری توٚدایەو بەکەسیتر چارم نایە. فەرموت ناتوانی بمبینی. ئەی خوا هاوار. برینە جیٚ داخەکانی جەرگو دڵم، هێشتا هەر خوێنیاٚن دەدەڵاند. سەرلەنویٚ داغت پێوەنانو ئاگرت تیٚ بەردانەوە.
کاورای مەلای دڵداری ژار! چیتە هێندە پەرێشـانو دەم بەهاوارو پرژانی. دڵبەرت توٚی خوێندوٚتەوە کە جەرگی بەتیر هەنجنیت. کێیتر وەكتوٚ بەختەوەرە، یار بەتیرانی وەخـوێنیٚ؟ چـوٚنە بەچاکە نازانیو گلە دەکەی؟

## قصیدەی نەوەدو حەوتەم

# چین و ماچین

١ مزگین ژمەرا بیتە ژسور شیرینیٚ
جانی خوەیی شیرین ددرم مزگینیٚ

٢ صەدچین دخوەدا گرتی‌یە زولفاتە بچین
شیعرا مە وەحەق لەو چو حەتا ماچینیٚ

٣ نەقشێن فەلەکان گوهدەدرن ڤیٚ نەظمیٚ
تەنها نەبەشەر هەر دکرن تەحسینیٚ

٤ عیشقی ژخودیٚدا تو بخازی ژێرا
گەردی لنەیارەك خوەبکی نەفرینیٚ

٥ یەك سەجدە تنیٚ فەرضە ددینیٚ عیشقیٚ
بن بەرقەدی یاریٚ دمەجالی دینیٚ

٦ عاشق کوبدل فاتیحەیا عیشقیٚ خوێند
ئایات یەکایەك دکرن ئامینیٚ

٧ مە ژلەعلی لەبی یاری خوە ڤەخار ئاڤیٚ حەیات
ئەغیار بلاتیکی بچن دارینیٚ

**مانای وشە:**

**چین:** قەدیم بریەتی‌بو لە مەڵبەندی کاشغەرو خوتەن، کە بە ئـاسکی میسـك ناسـرابون؛ **ماچین:** کورتەی مەهاچین، چینی گەورە. کە ئێستا مەهاکە فرێدراوەو هەر چین ماوە؛ **تەحسـین:** ئـافەریم؛ **نەیار:** دوژمن؛ **نەفرین:** توك.

گوتی: دەبرۆ تۆش هەر وەکو پەپولە وای؛ هیچ دەنگ‌و هاوارت نیە. پێم خۆشە دڵداری سوتاو لەئەوینم، هاوار بکاو ناڵەو گاڵەی شایەتی ئەوینداری بن.

گوتم: تۆ سۆمای چاوانمی. هێزی بیستنم لەتۆیە.

گوتی: دەزانم من گیانم لە لەشتداو تۆ قەفەسێکی گڵینی.

**تێبینی** = هەرکەس تۆزێك شیعرناس بێ‌و ئەو دوقەصیدەی خوێندبێتەوە کە بە (جاناژجەمالاتە موقەددەس قەبەسم ئەز)و (وەرەجانم کوچنازك وەرەسین) دەست پێ دەکەن. دەزانێ ئەم شیعرانەی لێرەدان هی‌مەلانیەو هی‌کابرایەکە دەمەلاسکەی مەلای کردۆتەوەو نەشی پێکاوە ـ هەژار.

# «چاوی دەرەش»

١ دلبەری سەرداری خوبان | ئەز نزام ئاگە هەیە
عارفە بحالی قلوبان | عالمە بحالی مەیە

٢ عالمە بداغێ فوئادان | گەزمەیین‌وان نون‌و صادان
چونە دل حەتتا پەرادان | یەنگی‌یێ رەش گوشەیە

٣ گەزمەیین وان صادو نونان | ئاورێن ئەسوەد عیونان
رادکن ئەو قەتلو خونان | من دیەو دل شەهدەیە

٤ لازمە لسولتان‌و میران | پورس‌کرن حالی ئەسیران
ئەم کرین ئامانجی تیران | سوختەیین دەرماندەیە

٥ هێژ نزانم میر دبیرین | زانت‌ئەم‌سی‌سال‌ئەسیرین
چەهڤنێر پرسەك ئەمیرین | لەو بروحم‌و شەفقەیە

٦ پور دبێم شەفقە لبالە | عارفەو صاحیب کەمالە
جارنان بینە خەیالە | پرس بکت چی لێ‌هەیە

٧ شەفقە کت جارجار نهێنی | تولەیی ئاستان ڤەخونی
داڤەکەم داغا ببینی | نارو پێت‌و شوعلەیە

٨ دابزانت پێت‌و نارم | کوشتی‌یێ جوهتی خومارم
موحبەتێ صوهتم بوارم | لازم ئەو زانت ڤەیە

٩ عالمە بدەردو برینێ | مادەما دیدارو دینێ
خەف دبت رەمزا ئەوینێ | ڤێ بزان بێ شوبهەیە

١٠ هەردەما دلبەر دیاربت | جان‌و دل تێك تاروما بت
دی چرەنگ موحبەت ستاربت | خەف کرن بێ فەیدەیە

**ماناى وشه:**

**فوئاد:** دڵ؛ **بوار:** پشو لەسەر خۆ، رازى؛ **بوارم:** بواردمى.

**پوختەى مانا:**

ئەو دڵبەرەى سەردارى هەمو جوانانە، ئاخۆ بەحاڵى دڵىمە ئاگادارە؟ دەزانىٚ داخمان لە دڵەو، تيرى برۆو چاوەكانى هەتا پەڕان، لەناو دڵماندا جىٚگيرەو لە گۆشەى كەوانى يەنگى هاوێژراون. تيرى چاوو برۆيان‌و ئاوُرى چاوى رەشى ئەو، پياو دەكوژن‌و، خۆم بەڵگەى ئەوقسەى خۆمم، كە كوژراوى ئەو چاوانەم. منى كردە نيشانەى تير؛ منى سوختەى ژارو فەقير. ئەو ئەميرە دەبو لەحاڵم بپرسێت؛ چاوەنوڕى ئەو پرسينەم. دەزانم بەزەيى هەيە. زانايە، لە دەردى من شارەزايە، هەر جارێك بێمە خەياڵى، بپرسىٚ چيم لىٚقەوماوە، وەك سەگى ئاسانەكەى خۆى، بانگم بكا، تاجىٚ داغى لەشم ببينى‌و بزانىٚ بە گريەو پوڵوى ئەوينى ئەو بومە قەقنەس. كوژراوى چاوى خومارم. سوتاوم‌و پشو لەسەرخۆم. بەڵام هەركەسىٚ بمبينىٚ، دەزانى من ئەويندارم. چونكە هەرگا يار دەبينم، گيان‌و دڵم بەرباد دەبێت.

**١١** هەردەما مەحبوب ظهور بت — زێدە مەظهەر بىٚ قصوربت
دىٚ تەجەللايەك لطور بت — بەرقى لاميع جەذبەيە

**١٢** جەذبەيىٚ دل ژوجود بر — خەف‌ژبەرعەينى حەسود بر
من دميحرابىٚ سجود بر — لىٚ حەجەر نيشانەيە

**١٣** سەجدەيا بەرنون‌و دالان — من‌طەوافا زولف‌و خالان
ئەڤ‌بەسەصاحيب جەمالان — دابچين لىٚ عومرەيە

**١٤** ئى يەكى صادق حەبينى — بىٚحيجاب گەر ئەو ببينى
ما لهشيارى دمينى — سەرخوەشى بىٚبادەيە

**١٥** عيشقە طوغرايا نهينى — هەردەما مەحبوب دبينى
دىٚ بدل لازم بخونى — ئەڤ چئيسم‌و نوسخەيە؟

**١٦** لاميعا وىٚ حوسن‌و نورىٚ — گەرچىٚ‌دل‌تىٚ،شوبهىٚ‌طورىٚ
باطينا نايىٚ ظهورىٚ — لىٚحيجاب‌و پەردەيە

**١٧** عارفن مەعنا شوناسن — لىٚ بصەد صورەت ليباسن
غەيرى‌مەحبوب‌وان‌نەناسن — خەف ژوان زانى مەيە

**١٨** ئى لمن يەنگى كشاندى — صەدخەدەنگ ڤيرا رەشاندى
دل ژدەربىٚ هەرشاندى — ئەز كرى ئەختەر مەيە

**١٩** لازم ئەو زانت بحالى — دلبەرو يارى موالى
گەزمەيێن‌قەوسى هيلالى — دەرب لنيڤا سينەيە

**٢٠** هيژ دبيٚم مەحبوب نزانى — من ئەوە روحا گيانى
پرس نەكر بيرا خوە نانى — ئەڤ چرا پەركەندەيە؟

**ماناى وشه:**

**ئەخترمه:** یەخسیر، چوڵەچرا، یەلموم؛ **موالی:** دۆست.

**پوختەی مانا:**

هەرکاتێ یار خۆ دیاربکا، دیداری بێ کەمایەسی، کێوی طوری پێ دەسوتێو، پیاو دەچێتە حاڵی جەزمە. جارێ یارم خۆی نیشان‌دام، تەواو دڵی لەناو بردم نەشی هێشت شوفار بزانن. خاڵێکم لەبەر برۆی دیت؛ سوژدەم بۆبرد. لە دەورەی خاڵانی گەڕان؛ دەوری بسكو کەزیەکانی پیاوی پێ دەبێتە حاجیو عومرەی خۆی بەجێ هێناوە.

دڵداری راست، ئەگەر ئەویارە ببینێ، لێت رون‌بێ هۆشی نامێنێو بادەی ناوێ، سەرخۆش دەبێت. ئەوین موری لای خودایەو هەرگا یارت لێ دیاربێ، دەزانی کاری خودایی چەند جوانەو خودا چەند جوانە. تروسکەی جوانی خودایی، هەرچەند خۆی نیشان دڵ دەدا، بەڵام بەچاو نابیندرێو پەردەی بەسەردا کشاوە. دڵدارانی زۆر دڵ وشیار، ئەو تیشکەی خوایە دەناسن. با لەصەد لیباسیش‌دا بێت؛ ئەوانە گوێ نادەن بەجل، هەر تەنیا دڵبەر دەناسن. منیش لەوانم زانیوە کە یاری بەراست کامەیە. یارەکەی من ئەو کەسەبو، کەوانی لەمن کشاندو صەد تیری هاویشتە دڵمو، منی‌کردە یەخسیری خۆی. دڵبەرم ـ کە دۆستی خۆمە ـ دەزانێ چیم لێ قەوماوە. کەوانی مانگی برۆکەی تیریان لەنێوان سینگمدا، هێشتان دەڵێم دڵبەرم خەبەردار نیە. ئەودڵبەرەی گیانی گیانمە. چۆنە نەهاتۆتە بیری بڵی فڵان بۆ ئەوەندە پەرێشانە؟

| | | |
|---|---|---|
| ٢١ | چەندەكی تاقەت ددێرم<br>گەر ژچەهڤان ئەز بوێرم | بەغوبار بەدرێ، ڨەشێرم<br>من زەنەخدان تەڵبەیە |
| ٢٢ | دابنوشم من ژلیڤێ<br>لوئلوییێن شەككەر دنیڤێ | ماوەرا رەیحانو سێڤێ<br>ئابی حەیوان چەشمەیە |
| ٢٣ | چەشمەیا ئاڤا حەیاتێ<br>من لداغان ئەو موفاتێ | شەربەتا قەندو نەباتێ<br>جان ژبۆ شوكرانەیە |
| ٢٤ | لەو وەكو سەوداو دینم<br>دین دبم، حەیران دمینم | هەردەما دیمێ دبینم<br>موشتەری یا زوهرەیە |
| ٢٥ | شەمس‌دنیڤبورجاشەرەفدا<br>موشتەری هاتی برەفدا | صەدكەواكیب چار طەرەفدا<br>ئیستیوا چو قیبلەیە |
| ٢٦ | ئافتابی دەستیوایێ<br>جاں‌فیدا تێمە لیقایێ | ئەززبەرضەرب‌وجەفایێ<br>شوبهەتی پەروانەیە |
| ٢٧ | من توی مەقصود ژژینێ<br>صەد دكم دیدارو دینێ | من ژبەر مەوجا ئەڤینێ<br>مەظهەرە بەس زێدەیە |
| ٢٨ | روهنی‌یا چەهڤێ نەبینان | مرشیدی مەجذوب‌و دینان |

| | | |
|---|---|---|
| | داروی دەردو برینان | من طەلەب دینا تەیە |
| ٢٩ | بینەپێ نازك موبارەك | دەینەسەرچەهڤێن مەبارەك |
| | من‌جروح‌خوەش‌بن‌بجارەك | روهن‌ببن پێ دیدەیە |
| ٣٠ | بین کەفا نازك ژنورێ | تللی‌یین جاما طەهورێ |
| | بیهن ژماوەردو بخورێ | من زیارەت تەوقەیە |
| ٣١ | دالسەر چەهڤان بمالم | بولبولی وەردێن بخالم |
| | جارەکێ روحمێ کە ظالم! | شەفقە خوی. حەقی وەیە |
| ٣٢ | ئەر نەکی رەحمێ‌تە میروٚ | دی‌چبت حالێ‌مە ئیروٚ |
| | قەط نەبی چارەك ئەسیروٚ | گرتی‌یێ سی‌سالەیە |

**مانای وشه:**

**زەنەخدان:** چەنە؛ **موفا:** چارە؛ **رەف:** پۆل؛ **دەینە:** دای‌بنێ؛ **کەف:** لەپ؛ **تللی:** قامك؛ **تەوقە:** ئاوات، تەوەقوع؛ **میروٚ:** ئەی‌میر.

**پوختەی مانا:**

بە هەمو توانا دەکۆشم بیمە تۆزی سەر رێگەت‌و مانگی روت لەروی شوفاران داپۆشم. ئەگەر لەترسی چاوانت بەوێرایە، دەم‌گوت چەنەشت ببینم. خۆش‌بو، لە ریحانەی بسکت ـ کە وەکولمی وەك سێوی سورت دەکەوێ ـ و لەو لێوە وەکو شەکرانەت ـ کە مرواری ددانیان وەبن خۆداوە ـ فرێکم هەڵبمژیایە ـ کە وەك ئاوی ژیان وایەو بۆ هەمو داخان دەرمانە ـ بەگیان سوپاسم دەکردی. هەتا روخسارت دەبینم، هەر شێت دەبم. سەرگەردانم، نازانم کام ئەستێرەیە؟ موشتەری‌یە یان زوهرەیە، یان رۆژە لە بورجی شەرەف، دەست‌و پێوەند وەك ئەستێرە لە چوار تەرەف، دەوری داوەو موشتەریش دەگەڵ ئەو پۆلە هاتوتە سەیرو تماشاو رۆژ راستەرێگەی ون‌بوەو، لەلای قوبڵەوە دیار ئەدا. من گوێ نادەمە ئازاران. گیان دەکەمە قوربانی دەمی دیدارت. وەك پەپولە لە دەوری گرت دەسوتێم. هەر توێ ئاواتم لە ژینا. دەریای ئەوین شەپۆل دەدا، بەئاواتم صەدجار چاوم پێت بکەوێ‌و دیارە زۆر زیادم ئاواتە. تۆ سوٚمایی چاوی کوێری، رێ‌شاندەری شێت‌و جەزمە لێهاتوانی، دەرمانی هەمو دەردانی. بۆیە دەمەوێ بت‌بینم. عەرزت‌بکەم لاقت لەسەر چاوم دانێ، تا برینم چاك ببنەوەو، چاوم رۆشنتر بێتەوە. لەپی دەستت رابکێشە با ئەو قامکە ناسکانەی بادەی بەهەشتێ دەگێرن‌و، بۆنی بخورو گوڵاویان لێ‌بڵاوە؛ زیارەت بکەم؛ بەسەر چاومی‌دا بماڵم. من بولبولی پەری‌کوڵمی نەخشێنراو. بە وردەخاڵم. بێ‌ئینصاف دەسا بەزەت بێ، بەزەیی ئاکاری خۆتە. ئەگەر بەزەت پێما نەیە، من چۆن بژیم؟ قەت نەت فەرمو ئەو ئەسیرەی سی‌ساڵە لە بەندی مندا، حاڵی چۆنە؟

٣٣ شون‌جیهی‌پەیکان‌ونەصلیٚ     ژتلیین یاقوت‌و فەصلیٚ
ئەر نەکی دەرمان بوەصلیٚ     ضەربی تیرو گەزمەیە

٣٤ گەزمەییٚن یاری کوباقیٚ     نەژمەی‌و قەندو گولاقیٚ
بیٚت دەواکت وان دگاقیٚ     ما حەیا تەك لیٚ هەیە؟

٣٥ نە تنیٚ قەندو نەباتی     مەظهەری روح‌و حەیاتی
هەم بت‌و عوززاو لاتی     لەو مە دل بتخانەیە

٣٦ خوٚندی لاتی ئازەری تو     بیٚ چشیرین دلبەری تو
هەرجیهیٚ لیٚ بیٚوەری تو     بیٚ خیلاف ئەو کەعبەیە

٣٧ ما دبت بیٚخن خیلافیٚ     سەرددت باقیٚ نیصافی
ئەربکی بیٚمە طەوافیٚ     من بئەسوەد سەجدەیە

٣٨ دا زیارەت‌کم نیشانیٚ     بەر زوحەل بیتن قیرانیٚ
تولەیم سەر لاستانیٚ     چەهڤنیری موچەیە

٣٩ ما بزەهری شەککەرینی     موچەدا دیٚ خەف بخونی
دا رەقیب مەلعون نەبینی     پورٚ (عَلَيْهِ‌اللَّعْنَه)یە

٤٠ گەر ببەخشی دل موڕادیٚ     ژەو حەیات‌و خەمرو بادیٚ
دا نەکم گللەهو دادی     دادمە دیسا بەرتەیە

٤١ گوهبدە گلەهو دادان     حاکمی شەرع‌و بیلادان
دی تو داخوازو مرادان     دی کەسی بیٚچارەیە

٤٢ دی‌تو دیساشەفقەتی‌کی     بەو نیشانا جەبهەتی‌کی
مەژ حەریمین‌خدمەتی‌کی     مەحرەمین بیٚ پەردەیە

٤٣ بیٚ‌نیشانین مە نیشان کی     ماهو خورشیدیٚ‌قیران‌کی
بەندە کەلبیٚ ئاستان‌کی     دور نەکی خوەش تولەیە

٤٤ دادەما صوحبەت‌بجوش‌بیٚ     جام‌بخوەش‌لەعلان‌بنوش‌بیٚ
مەژ حەبیب‌صەددەنگ سروش بیٚ     دین‌بەرو پورٚ عیشوەیە

٤٥ شەربەتاویٚ جام‌و طاسی     یار کوتیٚ بیت ئینعیکاسی
بیت مەژی‌فەیضەك‌ژکاسی     ئابی‌حەیوان ئەو بخوەیە

٤٦ ئی ژویٚ ظەرفیٚ ڤەخاری     خوٚندی‌ئەو خەطی غوباری
مەستی‌یاچەهڤیٚن‌خوماری     ڤەنج دبیٚ ئەو زیٚدەیە

٤٧ من‌لدل تیرەك موغول‌دی     تیٚك ژبەر خونیٚ قزل‌دی
لیٚ‌دبیٚم دەردیٚ‌کودل‌دی     هیٚژ ژچەهڤیٚن شەهلەیە

٤٨ روهنی‌یا چەهڤیٚن مەلاییٚ     خالقی حوسنا تەداییٚ
حوب‌تنیٚ دامن گەداییٚ     حوسن‌وحوب‌یەك‌چەشنەیە

٤٩ دیتی‌یە نورا یەقەق‌مە     صەد نەسەق لەوتیٚن سەبەق‌مە
پورٚ نەبی ئەرزان لحەق‌مە     لیٚ‌مەلا خوەش بەندەیە

**ماناى وشه:**

**نەصل:** سەرەرم؛ **فەصل:** بەند، بەندی ئەنگوست؛ **خـوند:** خـاوەن؛ **بیوەری:** جـی‌گیربی؛ **نیصـاف:** **ئینصاف؛ موچـە:** جیرە؛ **زەهر:** دەم، زار؛ **گللە:** گلە، شکـایەت؛ **بلادان:** وڵاتان؛ **حـەریم:** مەحـرەم؛ **ئینعیکاس:** تیشك‌دانەوە؛ **خەطی غوباری:** شێوە خەتێکی زۆر وردە.

**پوختەی مانا:**

جێ سەرەتیرو رمبم لێن، ئـەگەر بەو بەندی قـامکانەی یاقـوتیانەت هەتوانی لەسـەر دانەنێی و، لەبادەو قـەندو گوڵاوی لێوەکانتم دەرخـوارد نەدەی، ـ کە چـابونم یەکاوەیەکە ـ تازە ناژیمەوەو دەمرم. تۆ نە هەر قەندو نەباتی، تۆ گیان‌و ژیانت لایە. تۆ بوتی، تۆی گەورەی بتی ئـازەری مامی برایمی. تۆ لەدڵمای. دڵم بویتە بتخانەیەك. تۆ هێند جوانی بچیە هەرکوێ ئـەوجیگـایە کابەیەکە. هەرکەسێکی ئینصافی‌بێ، دەزانێ ئەم قسەم راستە. ئەگەر چی وەك زوحەل شـومم، رێگـەم بدە خاڵت ماچ‌کەم، با بڵێن زوحەل لەگەڵ رۆژ بەرانبەر بون. توڵەی تۆم سەر لەبەر دەرگا، چـاوە نۆڕم جیرەم دەیتێ. بەزارە شیرینەکەی خۆت، بانگم بکە بەدزیەوە، یا شـوفار بەڕاز نەزانێ؛ خـودا وەبەر نەحلەتی خا. ئەگەر لەو ئاوی حەیاتەو لەو بادەیەی لێوەکانتم، پێ ببەخشی‌و، دڵم بە ئارەزو بگات، شکات ناکەم. شکاتیشم هەر لای خۆتە. خۆت فەرمانڕەوای وڵاتی، هەر توی مراد پێك هێنەری. منیش بی‌کەسو بێچارەم. بەزمت هەبێ، سوێندت دەدەم بەو خـاڵانەی لە هەنیەتن. وابکـە لە ماڵدا مەحرەم بم، خۆتم لەبەرچاو ون‌مەکە. هەنیەو روخسارت بەجوتە بێنە بەرچـاو، واتا خـۆرو مانگـی تەواو، بەرانبەرن. من بکە سەگی دەرگای خـۆت، سـەگی چـاکم. تا ئـەگەر بەزمت گەرم‌بو، بەو لێوانەت بادەت فڕ کرد، گوێم لە دەنگە خـۆشەکەت بێ ـ کە وەك دەنگـی جـوبرایلە ـ نازی زۆرت دینم دەبات. ئەگەر وێنەت لە کاسەی مەیدا ببینم، بەهرەی بۆمن یەکجار زۆرە، وەکو ئاوی ژیانێ وایە. هەرکەس لەو دەفرەی خواردەوەو، خاڵ‌و میلی وردی توی بەچاوانی دیت ـ کە وەك خـەتی زۆر وردی هونەراوی وان ـ لە دیتنی چاوت مەسـتبو، باوەر دەکا کە بادەی تۆ، لە ئـاوی حـەیات زیاترە.

تیرێکی دەست‌کاری مغول، لە دڵی‌دام. خـوێنی گەشـم لەبەر هەڵنیشـت. بەڵام دەڵێم: ئـەو خوێناوە، لەو چاوە کاڵەی تورایە، دڵی من هەڵی هێناوە. روناکایی چاوی مەلا! خودا ئەو جوانیەی بەتۆدا، بەمنی گەداش دڵداری دا. جـوانی‌و دڵداری چـون یەکن؟ من نوری زۆر سپیم دیوە، زۆر رێك‌و پێك بەرەو من بەپەلە دەهات. هێندە بەهیچم مەزانە، مەلا کۆیلەیەکی باشە.

# «گوڵی بێ درک»

| | |
|---|---|
| ١ ئیرۆ مەدی وەقتی سەحەر | ئەو دلبەرا سوندوس دبەر |
| دەیسا دلەبسێ صوورو زەر | نورەك مونەززە بو بەشەر |
| بسکێن سیاه خالێن دقەر | ڕەش کاکولی زولف چونە سەر |
| ئەسوەد بو دایم سەجدە بەر | من بەستی عەقدا نییەتی |
| غەفلەت بسیرر من دا نەظەر | میران بقەتلێ کر غەدەر |
| تیردانە دل شاهی مەجەر | بێمروەت ئامانج کر جەگەر |
| فەریادو ئەفغان صەد کەسەر | وەصفان نەشێم لێ ئەوقەدەر |
| زانم کو ڕۆژبو هاتە دەر | سوبحان ژشاهی قودرەتی |

**مانای وشە:**

**سوندوس:** حەریری تەنك؛ **عەقد:** بەستن؛ **نەشێم:** ناتوانم؛ **میران:** میری گەورە؛ **مەجەر:** کاکێشانی عاسمان؛ **شاهی مەجەر:** خۆر.

**پوختەی مانا:**

ئەمرۆ لەدەمی بەیاندا، دەیاری دڵبەرم ڕوانی. بە بیچم بنیادەمێك بو؛ بەڵام ئەگەر ڕاستت دەوێ، پرشنگی جوانی خودابو، دەناو بەرگی سورو زەردی حەریری تەنكو ناسكدا دەدرەوشاوە.

بسكو کەزیو کاکوڵی ڕەش، بەرەو خاڵی ڕەش چەمابون؛ کە وەك «حَجَرالأَسْوَد»ێ ڕوگەی بەودمو پیرۆزە لاموابو سوژدەی بۆ دەبەن. منیش نیەتی خۆم دابەست، کە سوژدە بەرمە بەر خاڵیو ببمە حاجی. ئەو سەروەرو میری میرانی جوانانە، لە نەکاوێك گۆشەو تیلەچاوی دامن، زۆر بەناحەق فەرمانی کوشتنم دەرچو. تیری ئەو ڕوخسار وەك خۆرە، بێ بەزەیی دامبارینێو جەرگمیان کردە نیشانە. هاوارو دادو هەزار داخ. چیم بەسەرهات، ناتوانم هەر باسی بکەم. هەر

ئەوەندەی لێ دەزانم، کە چاوم لێبو خوڕ هەڵات. هەی‌نامەخوا! لە توانایی خودای مەزن. کە جوانی وای خوڵقاندوە.

٢

| | |
|---|---|
| سوبحان ژتە شاهی جەلال | هۆستایی پر قودرەت لبال |
| خاصا تەدایی ئەڤ جەمال | دیمێ ژقودرەت خەطو خال |
| کفش‌بو دقەوسێدا هیلال | ڤێرا مەدی بەدرا کەمال |
| لێبون‌نیقاب چەوگان‌و دال | وان یەك بمەستی دایە پال |
| لێ سەییری بایێ شیمال | پیچانە سەر نورا زولال |
| قەط کەس دی‌یین ئەڤ رەنگ میثال | موطریب‌وەرە وەقتە مەجال |
| زازە بنائی‌را بنال | ساقی وەرین خەمرا حەلال |
| جارەك لسەر دیمێ ڤەمال | زولفێن لدۆرا جەبهەتێ |

**مانای وشە:**

**هۆستا:** وەستا؛ **لبال:** لەکن؛ **سەییری:** هەڵیکرد، رابرد؛ **زازە:** ئەی‌ساز.

**پوختەی مانا:**

خودای گەورەو خاوەن شکۆ! پاکی‌و پیرۆزی هەر بۆ تۆ. چەند وەستایەکی بەکارو دەس‌رەنگینی. ئەو خوێن‌شیرینی‌و لەباریەت بەتایبەتی دابە یارم. خاڵ‌و میلت بەدانستە لە روخساری نەخشاندوە. مانگی یەکشەوەی برۆکەی، لە بورجی کەواندا هەڵات؛ مانگی چاردەی هەنیەکەشی تیشك ئەدات. بسکی سەر وەکو کاشۆیان، پەرچوکەی وەکو دال شکاو، بونەتە پەردە لەسەر روی‌و، لە خۆشیان مەستو کەلەلا پاڵیان بە یەکەوە دابو. سروەی شەماڵێ هەڵیکرد؛ بسکی بەرەو سەری رادان. نوری پاکی خوا دەرکەوت. قەت کەس نمونەی وای دیوە؟ لێم رونە: نا. بەزمگێڕ! وەختەکەی وەختە با سازو بلوێر بناڵن. مەیگێڕ دەستت مەگێڕەوە! بادەی حەڵاڵم بۆتێکەو، هەر بەو دەستە ناسکانەت، بسکان لەسەر هەنیت لادە.

٣

| | |
|---|---|
| زولفێن موعەنبەر کاکولین | بسکێن سیاە رەنگ سونبولین |
| تاتا بداڤ داڤ فەتتلین | چین‌چین بمەستی سیلسیلین |
| دایێ نەسیم تێك مەییلین | وی قەستە خالا فلفلین |
| ئەبلەق ژقودرەت خەمملین | وی بوغچەیی گول کەمملین |
| تێ عەندەلیبو بولبولین | رۆژ هاتە بورجا سونبولین |
| غەفلەت مەدی لەو خەجلین | مەحرومو مەهجور دل‌کولین |
| مەجروحی تیرێن قزلین | رەحمێ‌کە پور صوهتی دلین |
| ڤێ پەردەیێ جارەك هلین | باڤێ نیقابا ظولمەتێ |

**مانای وشه:**

**فەتتلین:** لولیان‌خوارد؛ **سیلسیلین:** بونە زنجیرە؛ **مەییلین:** خوار بونەوە؛ **عەندەلیب:** بولبول.

**پوختەی مانا:**

بسکی رەشی وەکو سونبول، کەزیو کاکوڵی وەك عەنبەر، تاڵ‌بەتاڵ لەیەکتر هاڵانو، مەستانەو چین لەسەر چینو بەزنجیرە دەبیندران. سروە لێی‌دان، خوار بونەوە. بەرەو خاڵان ـ کە لە فلفل رەشترو تیژو توندترن ـ رەشو سپی رازایەوە. باغچەی گوڵان بەوپەری جوانی خۆی‌نواند.

بولبول دەستیان‌کرد بە خوێندن. خۆر کەوتە بورجی سونبولەو لەپر دیتم، شەرمەزار بوم، رەنگم پەڕی. یاری روخسار وەکو رۆژم! لە دوری‌تۆ دەردەدارم، دڵ بریندارو هەژارم. تیری دوریت لە خوێنی دڵم شەڵاڵە؛ رەنگی سورە، دڵ بەگرە، وەك تەندورە، دەسا بەزەییەکت هەبێ، ئەو روبەندە لەرو لادە! با تاریکی لەسەر روناکی برەوێ.

٤

| | |
|---|---|
| پرسێ بمیهداریْ خوەکە | لمەجنوببوحالداری‌خوەکە(یان،لمیهرداری) |
| بەس قەهرو ئازاری خوەکە | قەستا برینداری خوەکە |
| شەفقێ بدیداری خوەکە | تێك غەرقی ئەنواری خوەکە |
| لێ ئەمرو فەرواری خوەکە | شەهیدی نۆباری خوەکە |
| گەستی‌یی رەشماری خوەکە | لەعلی شەکەرباری خوەکە |
| بلەفظو گوفتاری خوەکە | دەرمانی کولداریْ خوەکە |
| لی کەشفی ئەسراری خوەکە | مەخموری خەمماری خوەکە |
| حەیرانی رەفتاری خوەکە | کوشتینە تیرا موحبەتێ |

**مانای وشە:**

**میهدار:** کوترێك کە دەخوێنێ؛ **میهردار:** خۆشەویست؛ **فەروار:** فەرمان: **کولدار:** خەمبار، بەژان.

**پوختەی مانا:**

پرسیارێك لە شێتو حاڵ‌لێ‌هاتوت‌کە! لەوکەسەی زۆر خۆشیدەوێی وەك کۆتر بۆت دەناڵێنێ. بەسم غەزەبێ لێ‌بگرەو چیدیکە ئازارم مەدە! ومرە سەر برینداری خۆت! ئیجازەی بدە شەهیدبێو فەرمانی پێ‌بدە بمرێ. رەشماری کەزیت پێوەی دات. بە لێوی شیرینو ئاڵت بیدوێنە. خەمباری تۆم، چارم بکە. لە نهێنیم ئاگادار کە. بمکە بە مەستی بادەی خۆت، با لەخۆت‌دا سەرگەردان بم. بەتیری ئەوین کوژراوم.

٥ وەر سەردە جارەك کوشتی‌یان ئەختەر مەیێن وان بەنگیان

| | |
|---|---|
| بەردە بملدا خەمری‌یان | بادەت سەحەر رەیحانی‌یان |
| داغێن شەهیدو صوهتی‌یان | دانینە لیْوان تللی‌یان |
| کوژ موعجیزا خەماری‌یان | روح بیْتە دیسا سەرگیان |
| هیْژ نابرم قەط هیْڤیان | وان شەفقەوو دلداری‌یان |
| باللە ژنالو زاری‌یان | ضەربا فیراقو بیهری‌یان |
| تەشبیهی توتاکێن چیان | خەو ناکرین شەفْتاری‌یان |
| لیْهیْژ دخوازین شوکری‌یان | چەندی کورودین قیلەتیْ |

**مانای وشە:**

**ئەختەرمە:** یەخسیر، چوڵەچرا؛ **بادەت:** باڵیدا؛ **بیهری:** بەتاسە؛ **توتاك:** مەلێکی شەوبیدارەو تابەیان دەنگیدیْ.

**پوختەی مانا:**

جارێك سەری کوشتەت بدە؛ ئەسیری تازە کەوانتم. بسکت لەشان پەخش بکە؛ با با لە ریحانان بدات. قامکت لەسەر داغو برینی کوشتەی خوت بکە هەتوان؛ با گیانم بیتەوە بەرم. هیشتا هومیدم نەبریوە، چاوم لە بەزەیی تویە. بەخوا لە دەردی دوری‌تو، لە تاسەی دیداری جوانت، وەکو توتاك شەو هەتا روژیْ دەناڵم. قەت خەو لەچاوم ناکەویْ، بەوحاڵە شرا سوپاس دەکەم هەتا رو دەکەمە روگە.

٦

| | |
|---|---|
| دەردیْ غەدار بیْم فیرقەتە | فیرقەت ژجان پور زەحمەتە |
| عاشق مرن هەر ساعەتە | یا سەهل عاشق روحدتە |
| لیْ دلبەر ئەڤرەنگ عادەتە | هەرچی دبەندیدا کەتە |
| ئەووەل ددت پیْ ئولفەتە | ذەوقو صەفائو صوحبەتە |
| گاڤەك گوئەو ڤیْرارەتە | ئانجا ژناگە غەفلەتە |
| شیری جەفاییْ لیْدەتە | اللە چوی بیْ مروەتە |
| رەحمیْ بعاشق نایەتە | وی قەستە جان یەغما کەتە |
| حەتتا کو دل قەنج ژیْبتە | ئینصاف ژمەهرویان نەتیْ |

**پوختەی مانا:**

دەردی دوری زورگرانە؛ لێك جیایی لەش‌و گیانە. عاشق گیان‌بدا هاسانە. دەنا هەمو دەم مردوە. کرداری دلبەران وایە؛ پیاو بەرو خوشی دەکیشن، قسەی خوشی دەگەڵ دەکەن، لەپر بەئازار دەیکوژن. بەزەیان بەپیاو دانایە، نیازیان گیان تاڵان کردنە. جوانان قەت ئینصافیان نیە.

٧

| | |
|---|---|
| یار قەستەجان یەغما کرت | دا موعجیزێ پەیدا کرت |
| رەمزەك ژرەنگ عیسا کرت | یا سیحرێ بوسینا کرت |
| ژەو لەعلی شەککەرخا کرت | دیسا شەهیدان راکرت |
| ڤان کوڵەیان ئازا کرت | جارەك غەریبان شاکرت |
| راستی یەدی بەیضا کرت | میسکی دجەرحان داکرت |
| داخۆش بکت ئیحیا کرت | شەفقێ کە یارەب داکرت |
| رەش کاکولان تاتا کرت | صەد حەلقە چین‌چین باکرت |
| هەمیان لدیم طوغرا کرت | ئەمری هومایون سەرمەتێ |

**پوختەی مانا:**

یار بۆیە گیان تاڵان دەکا؛ ویستی موجزات بنوێنێ، لاسای عیسا بکـاتەوە، یان ابن‌سـینا ئـاسایی خۆمان لێ‌پکا بە جادوگەر. بەو لێوانەی مردو زیندو بکاتەوە. بە دەستە سپی‌و ناسکـەکەی میسـك بە برینان‌دا بکات. کۆیلان هەمو ئازاد بکاو دڵی غەریبان شادبکا.

دەخـوایە وابکـەی وا بکـات. کاکۆڵی رەش تاتا بکـات؛ چین‌چین هەمویان بابداو بەربابدات. بیان‌کاتە مۆری سوڵتانی‌و فەرمانی پێ ئیمزا بکات.

٨

| | |
|---|---|
| ئی‌گویی مەیدانێ تەبت | وەك من دزندانێ تەبت |
| سەربەندی چەوگانێ تەبت | مەجروحی پەیکانێ تەبت |
| یەغماو تالانێ تەبت | هەر روژێ قوربانێ تەبت |
| بیماری موژگانێ تەبت | موشتاق‌و حەیرانێ تەبت |
| صوهتی ژهیجرانێ تەبت | دی مەست‌و فینجانێ تەبت |
| وی بەهر دنیشانێ تەبت | موچە ژبەر خوانێ تەبت |
| لێ لوطف‌و ئیحسانێ تەبت | هەردەم بخونی حەضرەتێ |

**پوختەی مانا:**

کەسێ وەك من سـەری گۆیێ لە مەیدانت، لە زیندانی تۆ دەرنەچـێ، بە گۆچـانی تۆ هەڵسـورێ، برینداری تیری تۆبێ، هەمو رۆژ بەقـوربانت بێ، بەدڵ‌و بەگیان تاڵانت بێ، دایم لەژێر فـەرمانت بێ، کوژراوی مژۆڵانت بێ، حەیران‌و سەرگەردانت بێ، مەسـتی چـاوی فینجـانت‌بێ، بۆ خـوت نیشانت کردبێ، لەبەر ماوی خوانت بخواو جارجارە بی‌لاوێنیەوەو بانگـی‌کەی‌و خـۆت ببینێ؛ چـی تێدایە؟

٩

| | |
|---|---|
| جانان بئەغیاران نەدی | خەمرێ بخون خواران نەدی |
| وەردان بە مرداران نەدی | وان‌رێ دگولزاران نەدی |
| رەیحان‌و گولناران نەدی | بۆوان ژژەین خاران نەدی |

| | |
|---|---|
| تو رەمزو ئەسراران نەدی | کوران تو ئەنواران نەدی |
| بنونەکی یاران نەدی | نیڤمەو خوە ئەستاران نەدی |
| تیران ژنوباران نەدی | دەردان بیبماران نەدی |
| ژغەیری سیٚجاران نەدی | ریشن نەدیرن طاقەتیٚ |

**پوختەی مانا:**

بادەی نەدەی بە نامۆیان‌و خـوێنمژان، مەهێڵە مردار بێنەباغ؛ گوڵ‌و ریحـانیان نەدەیەی. جگـە لە درۆ مەیان دەریٚ. مەهێڵە بەڕاز بزانن. مەهێڵە کوێران ببینن. عاشقانت ئازار نەدەی، لە بەدکاریان بپارێزە. یاری خۆت هەرزان مەفـرۆشە. خـۆتیشمان لیٚ دامەپۆشـە. بە کەوان تیرمان تیٚمەگرە. دەردمان لەسـەر گران مەکە. لەسـیٚ پیاڵەش زیاتر بادەمان مەدەیە. برینداریـن، تاقـەتی مەسـت بونمان نیە.

۱۰

| | |
|---|---|
| بەس عاشقان مەهجور بکی | شوبهەت مەلیٚ رەنجور بکی |
| قەلبی شکەستی هور بکی | شونا برینان کور بکی |
| شەمعا مەژی پرنور بکی | بزەهری خوە مەئمور بکی |
| تەنها مە بیٚ دەستور بکی | مەحرەم سەرایی حور بکی |
| وەصلا خوە دا فەغفور بکی | ژوی بادەیی مەخمور بکی |
| نیڤ کاسەیا فەرفور بکی | فەیضی لدلدا فور بکی |
| دیمیٚ ژرەنگ کافور بکی | دالان ژخالان دور بکی |
| پیٚ عالەمیٚ مقهور بکی | وەقتی سەحەر کو بادەتیٚ |

**مانای وشە:**

ژەین: غەیر، جگە؛ کور: قوڵ.

**پوختەی مانا:**

بەس عاشقان دور خەرەوە، بە دەردی مەلایان مەبە. دڵی شکاو بەس ورد بکە، شوێنی برین قوڵتر مەکە. مۆمی مە چاکتر هەڵبکـە؛ بۆخـۆت فـەرمانمان بدەریٚ، با هەر تەنیا ئێمە بێینە ناو حـەرەم سەراوە. بە دیدارت بمانکە شا. لە بادەی خۆت مەسـتمان بکـە. بادە دەپیاڵەی چینی‌کە. بەهرە لە دڵ بە فیچقە بیٚ. روت وەك کافوری سپی‌کە. بسکان لە خاڵان دورخەوە. دنیایە بێنە بەر حوکمت. دەمی بەیان کە سرودیٚ.

# «باخ جودایی»

| | | |
|---|---|---|
| ١ | ڤێ فیرقەتێ ئەبتەر کرین | فەریاد ژدەستی فیرقەتێ |
| | ژارو ضەعیفو زەرکرین | فەریاد ژدەستێ فیرقەتێ |
| ٢ | پور زەرکرین وەك زیرمام | چەهڤێن دلوطفی پیرمام |
| | دایم لرێ چاونیر مام | فەریاد ژدەستی فیرقەتێ |
| ٣ | چاڤنێری رەفتارا تەبوم | موشتاقێ گولزارا تەبوم |
| | لەو دور ژدیدارا تەبوم | فەریاد ژدەستی فیرقەتێ |
| ٤ | دوربوم ژوی رەفتو چنێ | وان عیشوەیا گفتو کەنێ |
| | نایی بچەهڤان من دنێ | فەریاد ژدەستی فیرقەتی |
| ٥ | دنیا بمن مژبو، غەمام | خەو ژیلچەهڤان‌من‌حەرام |
| | عومرەك بڤێ حالی هەمام | فەریاد ژدەستی فیرقەتێ |
| ٦ | ساعەت لمن تێك سال بون | دائم لسەردەست فال بون |
| | حەرفێن دهاتن دال‌بون | فەریاد ژدەستی فیرقەتێ |

**مانای وشە:**

**زەر**: زەرد؛ **ژار**: کزوزەبون‌و بێچارە؛ **زیر**: داوەتێلی ساز کە دەنگی زۆر باریك‌و نزمە؛ **چاڤنیر**: چاوەروان، چەمەرا؛ **رەفتار**: رەوت؛ **رەفتو چن**: هاتوچو، رۆیشتن‌و چون؛ **گفت**: قسەکردن؛ **کەن**: خەنین؛ **غەمام**: هەور؛ **فال**: بۆ بەخت روانین، فاڵنامە.

**پوختەی مانا:**

دوابڕاوی دەس جوداییم؛ زەردو دەردەداری ئـەوم. وەکو سـیمە باریکـەکەی کەمانچـەو تار، کزو لاواز، هەمیشە چاولەرێی یارم. هانام بەپیری مەیخـانە دەفـریام بێ، هاوار لەدەس ئـەمدوری‌یە. دەمەوێ رەوتت ببینم؛ لە باغچەی جـوانیت بروانم. هەر چـونکە ئـەو نیازەم بو، لە دەرکی خـۆت

دورت كردم! هاتو چوٚكانت نابينم. قسـەو دەنگـی پێكـەنينت، نايەنە گوێم. وەك لەدنيا نەبم وايە؛ دەردی جودايی بەڵايە. هاوار لەدەستی جودايی. دنيا بەمن هەورەو مژە؛ چاوم لەگەل خـەودا دژە. عومرێكە بەو ژانەی دەژيم. دەوەرە لامو بم كوژە!

هەرساتێكم لیٚ بەساڵە. چاوم لەفـاڵنامەو فـاڵە. هەوری دەوری تاڵم تاڵە. هەر پيتیٚ بوٚمدیٚ، هەر داڵە. لارو خوار، چەوتو چەواڵە. واتا دوری، واتا دڵە دەردی دوسـەر، دەرچـون لەدەرمانو دەوا. بەڵام وادیارە دالێكيان واتای ديداری دەگەياند.

٧ ئیروٚ تنیٚ دەرهات ئەليف    مەعنی دچو بەژنا شەريف
يا خارە لیٚ كيمخەو قەديف    فەرياد ژدەستی فيرقەتیٚ

٨ ڤیٚ فيرقەتیٚ پردل شەواند    جەرحێن قەديم ديسا كەواند
شيشێن دصوٚر تێدا طەواند    فەرياد ژدەستیٚ فيرقەتیٚ

٩ داغێن مەديسا رەش‌كرن    يەكيەك ژنو ئاتەش كرن
لیٚ زێدە پەنجو شەش كرن    فەرياد ژدەستیٚ فيرقەتیٚ

١٠ سەوداو سەوسو گێژ كرم    پوڕ هەر ددل خونرێژ كرم
چەندان وەبو لیٚ هێژ كرم    فەرياد ژدەستی فيرقەتیٚ

١١ باللە ژنالەو زاری‌يان    گەزمێن دەوان خەمماری‌يان
خەو ناكرين شەو طاری‌يان    فەرياد ژدەستی فيرقەتیٚ

١٢ شەڤبو دنیٚ چەشمیٚ مەدا    حەتتا بەشير مزگينی‌دا
دیٚ بیٚ سەحـەر شاهی گەدا    فەرياد ژدەستی فيرقەتیٚ

١٣ مزگين كـودا من ئەڤ قەدەر    روحی شيرين من هاتە سەر
خەيلەك لمن رون‌بون بەصەر    فەرياد ژدەستی فيرقەتیٚ

١٤ رون‌بو بديداریٚ تە دل    بو غەرقی ئەنواریٚ تە دل
نارەت ژفەرواریٚ تە دل    فەرياد ژدەستی فيرقەتیٚ

١٥ مينەنەت مە دلداریٚ خوەدی    ديسا ژنو ياریٚ خوەدی
سوڵتانو خوندكاریٚ خوەدی    فەرياد ژدەستی فيرقەتیٚ

١٦ رەش كاكولێن سونبول لەڤين    مينەنەتمە ديسا غەم رەڤين
نو بو لدل حوبيو ئەڤين    فەرياد ژدەستی فيرقەتیٚ

**مانای وشە:**

**ئەليف:** هوٚگر؛ **ئەليف:** پيتی يەكەمی ئەلفوبێتكە؛ **خاراو كيمخە (يان، كيمخوا):** دو پارچـەی بەقيمەتن؛ **شەواند:** برژاند؛ **كەواند:** داغ كرد؛ **طـەواند:** خـوار كردەوە؛ **بەشـير:** مژدەدەر؛ **سـەوس:** دەمدەمیو گەللايی، وازوازی؛ **خەممار:** بادە فروٚش؛ **خەيلەك:** زورێك، ئەندازێكی زوٚر.

**پوختەی مانا:**

ئەمرۆ لە کتێبی فاڵنامە، ئەلف دەرهات. واتا: ئەو بەژن وەك ئەلفەی خاراو کیمخواو حەریرو مەخمەردە بەرە، تەشریف دێنێ؛ دەیسا بابیێو دادم لەدەست دورەدەستی، لای ئەو بکەم. دڵ برژاوە، کۆنە برینم کولاوە، دیسانەوە داغ کراوە، شیشی سورەوە کراوم. دەناو دڵی داچەماون، جێ داخیش رەش هەڵگەراون، ئاگریشی تێ بەرداون. نەهەر جارێك پێنج جار، شەش جار. هاوار لەدەستی جودایی.

سەودا سەرو هێرو گێژم، هەر خوێنی دڵ هەڵ دەرێژم. خۆم هەر هیچ بوم؛ دەردی جودایی توشم هات، لەوتۆزە هیچەشی کردم. تیری ئەو چاوە مەستانە، ئەو مەستە لەسەر هەستانەو، پیاڵەی شەراب لەدەستانە، خەوی شەویان لێ تاراندم، هەر دەگریمو دەبارێنم، نازانم لەدەستی دوری هەتا کەنگێ وا دەمێنم؟ هاوار لەدەردی جودایی.

دنیام شەوبو لەبەر چاوان؛ گوتیان هات نازداری باوان. هەر بەو مژدە دڵرفێنە، گیانم هاتە سەر گلێنە، چاویشم پێ رون بونەوە. تیشکی رون دەدڵم گەڕا، لە روناکی دا نوقم بو، ئامادەی هەر فەرمانێکە، چۆن دەفەرموی تا وا بکات.

سوپاس کە یارمان دیتەوە؛ جوانی خونکارمان دیتەوە. کاکۆڵ لە سروەبا نەوین. سوپای کوڵو کەسەر رەوین. دڵ پربولە خۆشیو ئەوین، هاوار لەدەستی جودایی.

۱۷ دەردێ غەدار بێم فیرقەتە ... فیرقەت ژجان پوڕ زەحمەتە
یا سەهل کو عاشق روح دەتە ... فەریاد ژدەستی فیرقەتێ
۱۸ ناری فیراقو صوهتنێ ... ئێشا خەدەنگێ نوهتنێ
پرس کن ژعوششاقان تنێ ... فەریاد ژدەستی فیرقەتێ
۱۹ عاشق ئەون هەردێ مرن ... چەندێك درەمزێن دلبەرن
کەیبەر لدل من بێترن ... فەریاد ژدەستی فیرقەتێ
۲۰ یارەب بدیداری خوەکی ... من واصلی یاری خوەکی
بەس صوهتنیێ ناری خوەکی ... فەریاد ژدەستی فیرقەتێ
۲۱ مەژدوست ساتەك دورنەکی ... پەرکەندەیی مەهجور نەکی
دیسا ژنو دل هور نەکی ... فەریاد ژدەستی فیرقەتێ
۲۲ خاکا ریا دلبەر مەلا ... بکشین دچاوان وەك جەلا
دیدار قیسمەت بو هەلا ... فەریاد ژدەستی فیرقەتێ

**مانای وشە:**

غەدار: گران، زۆردار؛ زەحمەت: دژوار؛ نوهتن: سمین؛ بێتر: زۆرتر؛ پەرکەندە: بڵاو؛ پەرکەندە: بێبەرۆبو؛ جەلا: سورمە؛ هەلا: هۆشت بێ.

**پوختەی مانا:**

دەردی دوری زۆر گرانە. لەلەش جیابونەوەی گیانە. هێشـتا گیان دانیش هاسـانە، بەڵام ئـەو زۆر بەسوتانە. تیری جەرگان کون‌کون دەکا؛ کونانیش خەم ئاژن دەکا. کەسێك خـۆی دڵدار نەبوبێ‌و ژانی بەدڵا نەچوبێ، چوزانێ دوری چتامە؟ هاوار لەدەستی جودایی.

زۆر دڵدار هاتن‌و رابردن؛ بەنازی دڵبەران مردن. بەڵام من لەناو هەمواندا، پتر جـەفـــاو دەردم دیوەو تیری دوریم تێ‌چەقیوە. هاوار لەدەستی جودایی. خوایە بەزەییت پێما بێ؛ یارم لەگەڵما تەبا بێ، جەرگم لەسوتان رەهابێ، تازە لەمەش وردتر نابێ. هیچ کاتێ لێم هەڵماوێرە، چونکە ئـەو بە توران فێرە. هاوار لەدەستی جودایی.

مەلا ئەگەر بوت هەڵکەوت، دیسان چاوت بەیار کەوت، خاکی رێبازی دابێژە، چاوی خوتی پێ برێژە، هوشت بێ لەبیرت نەچێ! هاوار لەدەستی جودایی.

# «فرشتەی بەشەری»

١ صەنەما سورێ ژصەمەد نەیشەکەرا لەب ژنەبات
(أَحْسَنَ‌أَللهُ تَبَارَكْ) ژسورا وێ صەنەمێ
ئەنوەرا رەنگ فرشتە بەشەرا حور سرشت
یا ژمیسکی خوتەنێ خالو خەطو کاکولو قشت
گەر خوە نیشان سەقەری دەت دگرت حوری بەهیشت
کەعبەیا تێ نەبت ئەو پوتکە دەیەو دێرو کەنیشت
کو نەصیب دا ژئەزەل حەق ژمەرا عیشق نویشت
فەیدە ناکن لمە ئیسمو نەطەلسمو نە نویشت
ظاهیریدا مە عەذابەك وەکو باطین ڤە بەهیشت
صوهتنێ دا بە هەناڤانو جەگەر تێك بریشت
قەصدی وەصلێ مە بجان‌کر کو ڤەداییینو نەهیشت
دەست نەهلین ژطەلەب گەرمە درێ چت سەرو تشت
پشت نادەین دوهەزار خەنجەرو تیرو رمو خشت
مەسەری داینە رێئو بخودێ بەستییە پشت
ئەوە من روحو حەیاتو ئەوە من قیبلەیی ذات
صەنەما سور ژصەمەد نەی شەکەرا لەب ژنەبات
(أَحْسَنَ‌أَللهُ تَبَارَكْ) ژسورا وێ صەنەمێ

**مانای وشە:**

**أَحْسَنَ‌أَللهُ تَبَارَك:** ماشەالله لە شیرینکاری خوا؛ **نویشت:** نوسی؛ **بریشت:** برژاندی، براژتی؛ **ڤـەداییین:** دەری‌کردین، رای داین؛ **سەروشت:** سەرومالێ؛ **خشت:** نێزە؛ **پشت نادین:** را ناکەین.

**پوختەی مانا:**

بوتە بەلارو لەنجەکەم بەژنی وەك نەیشەکەر رێکەو لێوی وەك نەبات شیرینە. هەی‌نامەخوا! لە دڵکێشی بتی جوانم. ئەو دڵکێشیەی لە خواوەیە. تیشك دەرە، رەنگی لە فرشتە دەکا؛ ئاکاری وەك حۆری دەچی‌ۆ بنیادەمە. خاڵ‌ۆ میل‌و کاکۆڵ‌ۆ پەرچوکەی هەنیەی، لە میسکی خوتەن رەشترو بۆن خۆشترن. ئەگەر خۆی شان جەهەندەم دات؛ حۆری جەهەندەم دادەگرن. کە لە بەهەشت خۆشتر دەبێ.

خودای گەورە، رۆژی بەرێ، ئەوینی لە چارەم نوسی. بەدوعاو نوشتەو هەیتو هوت، لە دڵی من ناچتە دەرو هەرچی بکەن بێ‌بەهرەیە. ئەوین ئەگەر بەرواڵەت دەردو ئازارو سزایە؛ لەراستی‌دا بەهەشتێکە خودا دەیدا بە دەرونمان. کەیفم سازە کە بە ئاگری ئەوینێ جەرگ‌و هەناوم برژاوەو هەڵقرچاوەو پروکاوە. ویستم بمرم؛ لەرێی ئەوین، بەگیان بگەم بە دیداری. لەخۆی دور کردمو نەی‌هێشت. بەڵام هەرگیز دەست هەڵگر نیم. سەرو سامانیشم بروات، گوێ نادەمە تیرو رمو نێزەو خەنجەر. یا هەزارانیشم بوێن، سەرم لەسەررێ داناوەو پشتم بەخودا بەستوە. یارە گیان‌و ژیانی من. روگەم ئەوە. بتە بەلارو لەنجەکەم، بەژنی وەك نەیشەکەر رێکە؛ لێوی وەك نەبات شیرینە. هەی نامەخوا! لە دڵکێشی بتی جوانم. ئەو دڵکێشیەی لە خواوەیە.

٢ زەری‌یا دیم دورۆ لەب شەکەرا عیشوە پەری
یا ژسەر تا بقەدەم تێك ژعەیبانە بەری
ژسەراپەردەیی لاهوت بصەد شیوە گەری
بێتەبەر عەینی شهودێ دلیباسی بەشەری
(حاشَ لله) تو کسان دی‌بتن ئەڤ رەنگ زەری
دایە بەر قەندو نەباتێ ژدو لەعلێن شەکەری
بێ، تو یا لەب‌شەکەری یاتو نەباتا بەتەری (یان، تەبەری)
الله الله چتەجەللایە ژسیررا قەدەری
حاجیان سیلسیلە بەستینە لدۆرا قەمەری
دۆری بەیتێ ژصەفا تێنە سەمایا سەحەری
بێ‌سرووەت کودو میران ژسوری مەی دسەری
نهیلن چینە طەوافی‌ۆ زیارەت حەجەری
زەمزەمو غولغولەوو عومرەو عیدو عەرەفات
صەنەما سور ژصەممەد نەی‌شەکەرا لەب ژنەبات
(أَحْسَنَ اللهُ تَبَارَك) ژسورا وی صەنەمێ

**مانای وشە:**

**لاهوت:** خوایی؛ **کسان:** چلۆن؛ **بێ:** بیژە، بلێ؛ **بەتەر:** کورتەی بێتر، کە بە مانا زۆرترە؛ **تەبەری:** نەباتی تەبەرزە، تەشوێ تاش؛ **حاجب:** برۆ.

**پوختەی مانا:**

سـەوزەڵەی روخسـار مرواری، بەنازو غەمزەی لێوشـەکر. سـەرتاپا بێبەش لە عەیبان، پەری خوایەو ناردراوە لە بیچمی بنیادەمان دا دێتە بەرچاو. ئەگینا چـۆن هیچ ئـەو رەنگـە سـەوزەیەیو هەردو لێوە ئاڵەکانی ـ کە نەباتو شەکرو قەندیان بەرگرتوە ـ دەکرێ لەرێزەی خەڵك بێت؟!

تۆ بڵێ: شەکرە لە لێوت، یان لە نەباتی تەبەرزەس. ئەی خودایە چنهێنیت لە توانایی خودالایە.

دو برۆی لەیەك پەیوەندت دەوری لەمانگی روت داوە. هەر بەیانیەك کە بسکـانت بەدەم سـروەوە دەلەرنو لەسەر هەنیەت ـ کە وەك عاسمانی سـاو دەچـێ ـ حـەجـێ دەکەنو دڵان پردەکەن لە خۆشی؛ ئێمەی دڵدار، زۆر بەتاسـەین کە لە دەوری سـەرت گەرێین، خـاڵی رەشـت وکو بەردە رەشیمالی کابە، رابموسین. بەڵام دو چاوە مەستەکەت ـ کە سەرمەسـتن ـ ناهێڵن ئـەو حـەجـە بکەین. هەراو هوریای دڵدارانە، دیداری تۆ بۆ ئـەوان جێژنی قـوربانەو، زیارەتی تۆ وەکو عومرەو عەرەفاتە.

بتە بەلارو لەنجەکەم، بەژنی وەك نەیشەکەر رێکە. لێوی وەك نەبات شیرینە. هەی نامەخو ! لە دڵکێشی بتی جوانم. ئەو دڵکێشیەی لە خواوەیە.

٣ من بدل صورەتی جاندی ژبتان ئەو بتەنێ
ئەو تنێ سەروی رەوان دی ژظەریفێن چەمەنێ
سوسنو سونبولو گول چەرخە لدۆرا سەمەنێ
خەمریبان حەلقەئو چین دانە ژمیسکا خوتەنێ
سەر ددن چەشمەیی حەیوانو بزەمزەم دەرەنێ
لێ چشیرانییە (الله) تەژوی کەفتو چەنی
ئەز دبێم بەدرە بدیم لێ دکەتن گوفتو کەنێ
یا یەقین روژە لشەرقێو شەفەق دانە دنێ
غەلەطم روحی قودوس هاتییە نیڤ وێ بەدەنێ
دکەت ئیحیای مەواتان لسورۆ رەفتو چونێ
تەنهن باوەرو ئیمان نەظەرێ دێو بنێ
چتەجەللایە بوێ قیبلە مەلەك رو ددەنێ
ئازەری گەر بدیا هور دکرن لاتو مەنات

ضەنەما سوژ ژصەمەد نەیشەکەرا لەب ژنەبات
(أَحْسَنَ ٱللّٰهُ تَبٰارَكَ) ژسورا وی صەنەمێ

**مانای وشە:**

دەرنێ: دەچنێ؛ کەفت: لامل؛ مەواتان: مردوان؛ بنێ: برۆانە؛ ئازەر: باوك یان مامی برایم پێغەمبەر کە بتی دەتاشین.

**پوختەی مانا:**

لەچاو جوانان، ئەو بە تەنیا شکڵی گیانە، لە باغان‌دا، هەر ئەوە سەروی رەوانە. گوڵی سویسنەو سمڵی کە پەرچوکەن، لە میسکی خوتەن رەشترو بۆن خۆشترن. لە لاجانگی گوڵی یاسەمەن ئاسایی دێن‌و دەچن. سەر دەگەیەنتە سەرلێوان، کە سەرچاوەی ئاوی ژیان‌و، وەك چاوەی زەمزەم پیرۆزە. ئەی خوایە! لامل‌و چەنەی چەند جوانن. من دەڵێم روی مانگی چاردەس. بەڵام گفت‌و پێکەنینی لەمانگ زیادە. یان وەکو خۆرە، لە خۆر هات‌و، جیهان رۆشن ئەکاتەوە. لەمەش هەڵەم، دەڵێم رەنگە جوبراییلی هاتبێتە ناو لەشەوە، رەوت‌و چونی وەکو عیسا مردو وەگیان دێنێتەوە.

گەر لەگفتم بەگومانی، تۆش وەرەو لەیار بروانە! تیشکی خوایەو لەفرشتان بۆتە روگەی پیرۆزو جوان. باوك یان مامی برایم کە ئەتۆی دیبا بە چاوان، بتەکانی هەمو دەشکاند.

بتە بەلارو لەنجەکەم، بەژنی وەك نەیشەکەر رێکە. لێوی وەك نەبات شیرینە. هەی نامەخوا! لە دڵکێشی بتی جوانم. ئەو دڵکێشیەی لە خواوەیە.

٤ نیرگزا مەست‌و شیرین‌و گوڵو نەسرینە ژرەنگ
شەکەرو لوئلوی مەنشورو بدل ئاهەن‌و سەنگ
مە ژبەر ضەربی ئەڤینیْ بوە دل پێت‌و پەرەنگ
لەومە شەب تا بسەحەر نالەیە وەك مەغنی‌و چەنگ
دامە صەد رەنگ عەذابی‌و نەهات دەر ژمە دەنگ
هەستی‌یان گرتی‌یە ناسورو مەژیدا هەیە ژەنگ
لەو نەهشیارو خومارین مە نە خواری مەی‌و بەنگ
لمە ئیروْ دو کەمانداری حەبەش هاتنە جەنگ
تینە قەتلا مە ددەستان دوسیە قەوسی ژیەنگ
درەشینن مەوتێن‌مە دوهەزار تیرو خەدەنگ
جەگەری کون دکن‌و تیْ دبەین میثلی تفەنگ
میثلی وی کافرو ظالم قەدیەن کەس دفەرەنگ
نازکو خوبو شەکەر خەندەئو شیرین حەرەکات
صەنەما سورْ ژصەمەد نەی‌شەکەرا لەب ژنەبات
(أَحْسَنَ‌ٱللهُ تَبارَك) ژسورا وی صەنەمیْ

**مانای وشە:**

ئاهەن: ئاسن؛ مەژی: مێشك؛ تیْ‌دبەین: بەنێواندا دێت.

**پوختەی مانا:**

چاوی وەك نێرگزی مەستە؛ خوێن شیرینە، بە ڕەنگی گوڵو نەسرینە. ڕو مرواری، لێو شەکرینە. دڵی وەك ئاسنو بەردە. من لە ئەوین دڵم بوٚتە گرو پەنگر. شەو هەتا ڕوٚژ، وەك دەنگی چەنگە ناڵینم. صەد جورە جەزرەبەی داوم، دەنگم نەهات. ئێسکم توشی برین بونو مێشکم ژەنگی هەڵێناوە. نە بادەم خواردوە نە بەنگ. دو بروٚی ڕەش ـ وەك دو کەوانداری حەبەش ـ هاتنە جەنگم.

دو کەوانی یەنگیان لەناو دەستان هەیەو، دو هەزار تیریان پێوەنام. جەرگم کون‌بو، وەکو گوللە بەناویدا دەرباز دەبن. کافری وا کێ لە فەرەنگستانیش دیویە؟! ناسکە، جوانە. بزەی وەکو شەکر وایەو ڕەوتی لەبەردڵ شیرینە.

بتە بەلارو لەنجەکەم، بەژنی وەك نەیشەکەر ڕێکە. لێوی وەك نەبات شیرینە. هەی نامەخوا! لە دڵکێشی بتی جوانم ئەو دڵکێشیەی لەخواوەیە.

**٥** دریا دوست مەلا یەك جیهەتو سادە دلین
مە حەتا جان هەیە حاشا ژطەلەب دەست بهلین
یا درێ سەر بدرین یا بمرادێ وەصلین
مە چپەروای ڕمین بەر وەشی شیرین قزلین
تا ئەبەد مەستو هیلاکێن ژشەرابا ئەزەلین
ژجەفاو ستەماوی ژجەگەر پوڕ دکولین
پەردەیا گوشە قەصەب لێ تو ژسەردیمێ هلین
کو دشەرقێ مەهو خورشید ژشەوقی بطلین
لەو ژسوڕ سورمە ددیرینو نەموحتاجی کلین
مەست دنیڤ تورّو لەفان مار لسەلوێ فەتلین
سورمە دارین ژسوری مەست ژقودرەت کەملین
مە ژغەفلەت دوژها دینو ژسەهمێ خەجلین
عیشوەگەر شیوەنومایا مەژوی ڕوحو حەیات
صەنەما سور ژصەممەد نەی‌شەکەرا لەب ژنەبات
(أَحْسَنَ ٱللَّهُ تَبَارَكَ) ژسورا وی صەنەمی

**مانای وشە:**

**بهلین:** هەڵگرین؛ **وەصل:** گەیشتن؛ **بەرەوەش:** لەپیشەوە وەشێن؛ **قەصەب:** پارچەی ئاوریشم‌چن؛ **بطلین:** دەست هەڵگرتن؛ **فەتلین:** پێچیان خوارد؛ **ژها:** هەژدیها.

**پوختەی مانا:**

مەلا! ئێمە لەرێی یاردا، راستو لەروینو دڵ ساکار. هەتا دەمرین دەست لە دڵداری بەرنادەین. یان بەئاواتی دڵ دەگەین، یان سەریشمان دەدۆڕێنین. گوێ نادەینە ڕمبی نوك تیژی خوێناوی. هەتا هەتا لەبادەی ئەزەلی مەستین. لەدەست ئازاری دەستیی‌یار، دڵ پرغەمین.

روبەندی ئاوریشم چنت لەرو لادە! با رۆژو مانگ، لە تیشکدان رابوەستن. چاومان پرە لە جوانی تۆ، ئیتر کارمان بەکل چیە؟ ماری کەزیت لە بەژنی سەوڵت پێچیان خوارد. چاوی مەستت کلی خودای تیّکراوە، بۆیە مەستن. دو هەژدیهای پرچتم دین، لە ترسان رەنگ لەروم نەما. زۆر بەنازی، نازان دەکەی. گیانو ژیانمان لەتۆرایە.

بتە بەلارو لەنجەکەم، بەژنی وەك نەیشەکە روایە. لێوی وەك نەبات شیرینە. هەی نامەخوا! لە دڵکێشی بتی جوانم. ئەو دڵکێشیەی لە خواوەیە.

# "سوێند بە بالا"

١ ئەی نەسیمی صبەهی ما دمەجالا سەحەری
صەد سەلامان بگەهینی ژمەوی لەب شەکەری

٢ نیرگزا نازك وتەر نەی‌شەکەرا مەستو خومار
دیم دوڕو لەعل لەبو موحتەشەمو موعتەبەری

٣ بسكو گیسو ژحەریرن قەصەبن طُرَەو زولف
نەژكافورە بەدەن خال ژمیسکی تەتەری

٤ دیم بەدرو ئەنی‌یێ، زولف لسەربونە هەلەك
ئەرقەمان حەلقەو گەڕدانە لدوڕا قەمەری

٥ ئاستانی‌و شوباكو كولەكو پەنجەرەیان
دابمسکینی‌و زاری توبیوسی دبەری

٦ توزەکی بین بخوەڕا تا بکرین کوحلی بەصەر
لطەریقا قەدەما، دلبەری وی رەهگوزەری

٧ دابیینی صەنەما من تەبگین خوە بدەخەت
بکە تەلخیص جەوابی مە ژڤیٚ موختەصەری

٨ لەو کوپور شەفقە ددیرت کەرەمو لوطفو کەمال
ئاە ژدەست رەمزو سوڕێن وی دوڕو گەوهەر خەبەری

٩ ما بزەهری شەکەری دۆست بخونت جارەك
عەرضحالا کو نڤیسی مە بخونی جەگەری

١٠ قەدەرەك شەفقە ژلوطفاتە تەمەننا دكرین
دامە مەحروم نەدیری تو ژلوطفو نەظەریٚ

١١ بخودیٚ قەط تە ددلدا ژخودیٚ ترس نەهن
دكری ظولمو جەفاییٚ تو لمن ڤیٚ قەدەری

١٢ ئەز بویٚ قامەتو بەژنیٚ لتە صوندیٚ دخورم
بەس كە ئەی پادشەها من لئەسیران غەدەری

١٣ ژبەر ئاهیٚن مە دنیٚ ئاگرو دود بت نەعەجەب
مە ددلدا هەیە نارەك كو دصوژت سەقەری

١٤ نە بوینە نەدبن وەك تەشەپالی دجەهان
كی دی‌یە میثلی‌تە سیمین تەن‌و زەررین كەمەری

١٥ پاشی‌وان گەزمەیی چەهڤیٚن تە مەلا پیٚ كوشتی
ما خەدەنگن دكرن قەط لمەئیدی ئەثەری؟

**مانای وشە:**

**قەصەب:** زەری، پارچەی زیٚڕ تیٚوەدراو؛ **ئـەرقـەم:** ماری جنجیر؛ **كولەك:** كولانچكـە، ڕۆچنە؛ **كوحـل:** سورمە؛ **بگین‌خوە:** خۆ بگەیێنە؛ **تەلخیص:** پوختەكراو؛ **موختەصەر:** كورت‌كراو؛ **تەلخیص:** كتێبێكە لە كتێبێكی بە ناوی موختەصەر وەرگیراوەو پوختەی موختەصەرە؛ **خەبەر:** گفتو دوان.

**پوختەی مانا:**

سروە! لە بەرەبەیاندا، صەد سلاوم لەو لێو شەكربارە بكە. بەژنی وەكو نەی‌شەكەرە. شـلكو تورتە وەكو نێرگس. مەسـتە چـاوە، رومرواری لێوی لالە، پایەبەرزەو زۆر بەرێزە. كەزی‌و بسـكو لابسكو پەرچوكەكانی، وەك ئاوریشم دەگەلٚ زیٚڕان تێكەلٚ دەبن. لەشی لەكافور سپی‌تر، خـالی وەك میسكە بۆن خۆش‌و شەوە ڕەنگە. روخسار مانگە. هەنیەی بەو ئالقە بسكانەی لەسـەریەتی، هەر دەلێی ماری جنجیرن لەدەوری مانگـیٚ هالاون. سـروە! زۆر بەكزی ببورە، لە پێشـانا دەركو پەنجەرەو كولانچكەو لێوی دەلاقەكان ماچكە. تۆزێكـی سـەررێی یاربێنە. تا بیكـەینە سـورمەی چاوان ـ هەر خۆت بچـۆ خـذمەت یارم، نامەكەمی بدە دەسـتی وەرامەكەم بە پوختەیی بۆ بێنەوە. زۆر بەبەزەو ئیلتیفاتە. ئاخ نازانی چەند دلٚكێش‌و پڕلە نازەو گفتی وەكو گەوهەر دەچن!.

ئەگەر جارێك بەزاری مبارەكی خۆی بانگم بكاو، ئەو عەریضەم ـ كە بە خوێنی دلٚ نوسراوە ـ قبولٚ بییٚ؛ چەند خـۆش دەبیٚ؟ نوسـیومە تۆزێك بەزەت بیٚ. لە بەزەت بیٚ‌بەشـم مەكە. جـارێك ئاورێكم ویٚ‌بدە. بەخوا تۆ لەخوا ناترسی؛ دەنا هێندەت ئەو دەردە بەمن نەدەدا. سوێندت ئەدەم بەو

بەژنە شۆخو شەنگەی خۆت، تۆ پادشای چاوجوانانی، هێندە لەمنی یەخسیری خۆت ظولمێ مەکە. لەبەر ئاهم ئەگەر دنیا پڕ لە دوکەڵو ئاگربێ، سەیر نیە. ئاوری دڵم جەهەندەمیش دەسوتێنێ. کێ لەدنیا لەش زێوینو کەمبەر زێڕینێکی وەك تۆی بەچاو دیوە؟ ڕەزا سوكو جوانی وەك تۆ، نە هەرگیز بوە نە دەبێ. دوای وەی مەلات بەتیری چاوەکانت کوشت؛ ئیتر تیری دیم بۆچیە. تیر هاویشتن بەهرەی‌نیە.

**بەیاری خوا، شەرحی د یوانی جزیری، دوایی هات.**

خوایه ئـەی بینایی چـاوان! سـوپاس بۆتۆ، که بەزەییت بەمنی هەژاردا هاتەوە. ئـەو هێزو توانایەت دامێ، لەپاش مەموزینی خانی، دیوانی شێخی جزیریش ـ بەسـۆرانی‌ـشـی کەمەوە، که زۆری بۆ بەئاوات بوم. ئۆخەی ئیتر خەمم نەما، ئاواتم نەبردە ژێر گڵ؛ بشمرم ئـارخەیان دەمرم. لەقیامەتێش دەس‌بەداوێنی خاوێنی ئەو دو خۆشەویستەت دەگرم، لێم رونە خۆم لێ‌نابوێرن.

لەچاپ‌و بەرهەم‌هێنانی ئەم‌کتێبە، چـەندکەسـێکی هەژارپەروەری خێرەومەند، یارمەتیان دام. ئەگەر چاکەیان لەبیرکەم، خۆم بەبێ‌ئەمەگ دەزانم.

سوپاسی‌زۆر بۆ: «کاك‌ماجدی روحانی» که وەختە بێژم بەقەدخۆم خۆی ماندوکرد، پاك‌نوسـی ئەو خەتەپیسەم، هەڵەو پەڵە هەڵگرتنەوەی، بەسەرچـاپ راگەیشـتنی، وەئـەسـتو گرت. هەر ئەویش بوی دامەزراندم، کرێی چاپیان لێ نەستاندم.

سوپاس بۆ کارگێڕی سروش، «ئـاغای زەورەق»، بۆ بەرپرسـی چـاپخانەی ادارۀ سـروش «مهرپرور»ی خوێن شیرین، بۆ کیژی یەکجـار هونەرمەند «ئـابگینە» که بەراستی لەپیت‌چنینی کوردیدا موجزاتە.

پێشەکیش سـوپاسی زۆرم بۆ ئـەو کوردە لاوانەیە، که بەچـاوی رەخنەگری، لە نوسـراوەکەم دەڕوانن‌و هەڵەکانم دەدۆزنەوە.

پازدەی پوشپەڕی ساڵی ١٣٦٠ هەتاوی.

عبدالرحمن شرفکندی

هەژار